01

بیرەوەری

# لە دووگردکانەوە بۆ بنی دونیا

## هۆمەر دزەیی

HOMER DIZEYEE

دەزگای فام

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری





چاپی یەکەم - 2021

لە دووگردکانەوە بۆ بنی دونیا

بیرەوەری و تێڕامان

نووسینی

هۆمەر دزەیی

بابەت: بیرەوەری

پێوانە

15*23سم (658) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (806)ی ساڵی 2020ی پێ دراوە.

# مام جەلال تاڵەبانی

## سەرۆك كۆماری پێشووی عێراق

مام جەلال ئەوها باسی هۆمەر دزەیی دەكات كە بۆ یەكەم جار ساڵی 1948 لە كۆیە چاوی پێی دەكەوێ:

"نەورۆزی حشع لە هەولێرەوە وەفدێكیان بۆ هێنابوو. یەكێكیان لاوێكی ژیكەڵەی ئێسك سووك و دەنگ خۆش و بە تەمەن بچووك، كە دوو لە براكانی شیوعی بوون و لەگەڵ خۆیان هێنابوو: ئەویش بولبولی خۆش ئاواز و دەنگ زێڕین، كاكە هۆمەری دزەیی بوو.... سەیر ئەوەبوو ناودارانی وەفدەكەی هەولێری (حشع)، كوڕە ئاغاكانی دزەیی بوون نەك كرێكاران و جووتیارانی هەولێر..... بەڵام كاكە هۆمەر لەوانە نەبوو ، نە ئەوسا شیوعی و نە پاشانیش دژیان بوو. بەڵكو هەتا دەهات ژیرتر و هوشیارتر دەبوو، تا بووە لاوێكی كوردپەروەری پێشكەوتنخوازی مۆدێرن، كە نەك هەر لە چالاكییەكانی دەرەوەی وڵات و لە هەردوو فێستیڤاڵی لاوان و خوێندكارانی دنیا لە ڤارسۆڤیا و مۆسكۆ شۆڕەسوارێكی گۆڕەپانی لاوانی كوردستان بوو، پاشان لە بواری سیاسەت و خوێندەواری و ئەدەب و مۆسیقا و گۆرانیش شۆڕەسوارێكی ئەوتۆی لێ دەرچوو، گەر كوردستان جۆری فیدراڵ یان سەربەخۆیی هەبا، ئێستا ئەویش یەكێك دەبوو لە ئەستێرە پرشنگدارەكانی ئاسمانی دنیای هونەر و گۆرانی و سینەمای جیهانی. هەر وەك ئێستاش ئەستێرەیەكی گەشی هونەر و گۆرانی و مۆسیقای ئاسمانی كوردەواری و كوردستانی گەورەیە".

گۆڤاری خاك، ژمارە 13 ساڵی دووەم 10/تەمموز/ 1998، لاپەڕە 8.

# دکتۆر بەرهەم ساڵح

**سەرۆك کۆماری عێراق**

یادەوەرییەکانی هۆمەری دزەیی تۆمارێکی گرنگی خەباتی سیاسی و گەشەکردنی هونەر و ڕۆشنبیریی کوردە و وێنای چەندین کەڵەمێردی ئەو سەردەمە و چیرۆکی دڵداریی بە سۆزن. هۆمەر ڕاشکاوانە وەک خۆی باسەکان ئەکات، تەنانەت لەسەر خودی خۆیشی ناپۆشێ و نایشارێتەوە. دیارە لەم یادگارانەدا هۆمەر گەڕۆک و دونیا دیدەیە، بەڵام هەر شەیدای کوردستان و دووگردکانە! مەگەر هەر هۆمەری دزەیی بزانێ ئاوا بە زمانێکی پاراو و بە چێژەوە ئەو بەسەرهاتانە بگێڕێتەوە!

## حەمەدەمین پێنجوێنی

شاعیر و نووسەر و توێژەری سیاسی

کاک هۆمەر جگە لەوەی هونەرمەندێکی گەورەیە، شۆڕشێکیشی بەرپا کرد لە ساز و ئاوازی ڕەسەنی کوردیدا، زمانزان و مێژووزان و سیاسەتوانێکی لێزانە، ئەو زاراوەکانی کرمانجیی سەروو و خوارووی زمانی کوردی بە باشی دەزانێت.

زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی و ئازەری جگە لە زمانە ڕۆژئاواییەکانی وەك ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی و ئیسپانی بە ڕەوانی دەزانێت، ئاخر هەر کەسێ ئەم زمانانە نەزانێ، ناتوانێ پسپۆڕیی لە زمانی کوردیدا پەیدا بکات.

هۆمەر بە زۆربەی ئەو زمانانەش ئەتوانێ گۆرانی و ئاواز بچڕێ.

بۆیە بە لای منەوە هۆمەری دزەیی، سامانێکی کوردستانییە.

سلێمانی 2020

# غەریب پشدەری

## شاعیر و نووسەر و وەرگێڕ

بۆ هونەرمەندی ناوازە و جوان کاکە هۆمەری دزەیی

کە چووی ...شلکە نەمامێکی تازە چرۆکردووی بەهاری تەمەنت بوو...
دەگەڵ هەر شنەبایەکی حەز و ئارەزوو و تەزوو و موچڕکەی هیوا
و ئومێدە چڕ و پڕەکانتدا دەشنایتەوە و دەکەوتیە سەما. بەرەو
هەندەران ... بەرەو دیاری غوربەت و ونبوون...
ئەسپی سەرکێشی لاوەتی جڵەوی لە دەست دەرێنای و نەتزانی بۆ
کوێی هەڵگرتووی و بۆ کوێت دەبا. ئەوەی جێ دەما تەنیا شوێن
پێیە کەروێشکییەکان بوون هەزارەیان کردبوو.
کە هاتیەوە... پیرەدارێکی بێزار لە سێبەری خۆت.
نە لاوەتی و نە حەز و ئارەزوو و نە تەزوو و موچڕکە و نە ئۆخژنێک...
تەنیا و تەنیا مشتێک بیرەوەری و یاد و یادگاریی پڕ حەسرەت و
کوانووی تەمەنێکی ساردوسڕ و بێ ئەنوا...
نە دوێنێ ما، نە شوێن پێ،
نە خۆشیی ڕۆژ و مانگ و ساڵانی پڕ کەفوکوڵ، هەمووی سڕابوونەوە
و هەروەک نەبووبن...
ئەوەندە ماوە پێکەوە بڵێین:
بەخێرچی سەردەمی لاوی و
خورپەی دڵی بێ وچانم،
بەخێربێی وەرزی پاییزی...
لەرزۆکی دەست و گۆچانم.

لــــه تـــــه‌مه‌ن فــــێر بــــووم

ئـــــاوی ڕووبـــــار بـــــم

نــــه‌ك زۆنــــگاوی مــــه‌نگ

ئــاوی وه‌ســتاوی قه‌وزاویــی

پێـــــرار و به‌ســــــترپێرار بــــم

**هۆمه‌ر دزه‌یی**

# چیرۆکی ئەویندارییم

ئــەرێ ئــەی کـــوردی پـــــــەنابەر
ئـــــەی لــە هــەندەران دەربـــــــەدەر
هـــۆ کــورِ و کــــچ ، خـــــــانمینە
بـــەخـــــــۆڕایـــــی نـــــەگـوتــراوە
بـــــــەرد هــەر لـە جێی خۆی سەنگینە
ئــەمن بـــەم هـــەموو ئـــــــەزموونە
بـــــــەم ئـــاموشۆ و بــەم قـــاڵبوونە
بـــەو هـــەموو گـــەشت و گـــــەڕانە
بـــــۆم دەرکــەوت و بـــوو بــە وانە
نــــە رۆژئــاوا ، نـــە رۆژهــــەڵات
قــــەت نابـــــــــێتە پــیرە وڵات
هــــــەر ســــوارێ مــەیدانی خــۆی
هــــەر کـــلچووکێ کـــلدانی خـۆی
جـــــــیهان با هـەر بۆ خۆی خۆش بێ
پـیرۆزی مـــــــیللەتانی خـــــــۆی
مـــــــنیش وەک ئــا.....ئـەو خـەڵکانە
خـــۆشـیـــم وڵاتـــــی کـــوردانــە
مـــــن کۆرپـــەم و کـــۆرپەی ساواش
لـــــەنـاو ژنـــی ئـــــەم جـــیهانە
هــــەر دایـــــکی خــــۆی لـــەلا جوانە.

**هۆمەر دزەیی**

## دیاری

ئـەم بیرەوەریانـەم دیارییـە بـۆ هـەر چـوار جگەرگۆشـەکانم، لـە بچووکترەکەیانـەوە: کۆچـەر، کاروان و فامیلـی، لارا، نـازدار و دایکـی میهرەبانیـان، رووناکـی حوسـێنی عەلیاغـای هاوسـەرم، کـە ژیانـی ویـڵ و سەرلێشـێوان و سـەرگەردانی سـاڵانی نەوجەوانیمیـان لـێ کـردم بـە بەهەشـتی سـەر رووی زەمیـن. خـوا پشـت و پەنایـان بێـت لـە رێـڕەوی ژیانیـان دا.

هەروەهـا دیارییـە پێشکەشـی هەمـوو ئـەو خوێنـەرە بەڕێزانەشـی دەکـەم کـە تامـەزرۆی زانینـی کـون و کەلەبـەری شـاراوەی مێـژووی کۆنـن.

## سوپاسنامه و پێزانین

بۆ سوپاس و پێزانین بەڕاستی نازانم روو لە کێ و لە کوێ بکەم. ئەوەندە زۆرن ئەو بەڕێزانە و ئەو دەزگایانەی کە لە دەرگایانم داوە بۆ پشتیوانی کردنم لەو رێگە دوور و دژوارەی بیرەوەری نووسینەوە کە دەترسم ئەگەر ناوڕیزیان بکەم هەندێکیانم بێ ناوهێنان بەسەردا تێپەڕێت. بۆیە بە ناچاری وا چاوپۆشی لە ناوهێنانی یەکە یەکەیان دەکەم و، نەک دوویات، بەڵکو فرەپاتی دەکەمەوە کە خۆم بە قەرزاری هەر هەموویان دەزانم و بەشدارییان لە بەردەستکردنی زانیاری گرنگ مایەی پێزانینی تا هەتایی مە.

بەڵام ناکرێ سوپاس و پێزانینی تایبەتم بۆ ئەم بەڕێزانە دەرنەبڕم:

بەرهەم عەلی، ئاراس ئەکرەم، هۆزان جاف، عومەر جاف و تەواوی ستافی هەفتەنامەی باس، کە بۆ ماوەی نزیکەی پێنج دانە ساڵ لاپەڕەیەکی هەفتەنامەکەیان بۆ ئەم بیرەوەرییانەم تەرخان کردبوو و لە هەموو رووێکەوە کۆمەکیان کردووم، بیرەوەرییەکان بازنە بە بازنە بە رێکوپێکی بڵاو بکرێتەوە.

زۆر نەنگیش دەبێ گەر ناوی کاک دکتۆر مەهدی محەمەد قادر و رەوان شاد مەلا خالیدی مورتکە نەهێنم کە بێ سەرچاوە زۆر گرینگەکانی ئەوان ئەم باڵاخانەی بیرەوەرییانەم بە لاکەل دروست دەبوو.

لە رووی تەکنیکیشەوە بۆ ئامادەکردنی ئەم نووسینانەم بۆ کتێب بێ یاریی ئەم چوار بەڕێزانە: رزگاری برازام، محەمەدی برازازام، هەردی برازازام و عەبدوڵای کاکەحمەدی دارەتووی ئامۆزازام کە دەسنووسە کەس پێ نەزانەکەی مەلا خالیدی مورتکەی بەردەست کردم ئەمن بەخۆم لەم بوارەدا هیچم بۆ نەدەکرا، چاکەیان لە بیر ناکەم.

هۆمەر دزەیی

هەولێر 2020/7/23

# ناوەڕۆك

## بەشی 3



## بەشی 4

## بەشی 5



## بەشی 6

## بەشی 7

## بەشی 8

## بەشی 9

## بەشی 10



## بەشی 11

## پێش وشە

بیرەوەری نووسینەوە، بە چەند ڕێگای جیاجیا کراوە. هەندێ کەس هەن هەر لە تەمەنێکی زۆر زووەوە، بە منداڵی یان بە نەوجوانی، دەستیان کردووە بە یادداشتکردنی ڕۆژبەڕۆژی هەرچییەکی کردبیان یان بینیبیان. جا کە لە پاشەڕۆژدا هەموو ئەو یادداشتە ڕۆژانەیە ریزبەند دەکەن و چ لە وێبسایتی خۆیان بڵاویان دەکەنەوە، چ لە دووتوێی کتێبێکدا بە چاپیان دەگەیەنن، شتێکی یەکجار بەتام و سەرنجکێشی لێ دەردەچێ کە خوێنەر وا بەخۆیەوە دەبەستێتەوە، حەز نەکات کتێبەکە دابنێ تا سەروبنی نەکات. ئەم جۆرە بیرەوەری نووسینەوەیە، بەتایبەتی لای سیاسەتکاران و ژن و پیاوانی بواری کولتوور و زانست باوە و نووسینەکانیان دەبن بە بەشێکی مێژوو. ئەم جۆرە یادداشتە، بەزۆری جێی باوەڕ پێکردنیشە، چونکە ناکرێ تۆ لە ماوەی تەنیا لەخەوهەڵسانی بەیانیت تا خەوتنی شەوێت، شتەکانی ئەو ڕۆژگارە و ئەو شەوگارەت لەبیر چوویێتەوە بەتایبەتی کە تۆ لە زووەکانی تەمەنتدا بیت. ئەم جۆرە یادئاوەری نووسینەوەیە جاران زیاتر لای ڕۆژئاواییەکان باو بووە، بەڵام ژن و پیاوی ڕۆشەنبیر و ناوداری ڕۆژهەڵاتیش لە هەر بوارێکیٚ ژیاندا بوویێت، ئەوانەیش هەر هەبوون و هەشن کە ئەم ڕێگایەیان بۆ نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیان گرتووە. ئەمەیان یەك.

ڕێگایەکی تر هەیە بۆ نووسینەوەی بیرئاوەری کە تێکەڵەیەکە لە یادداشتکردنی ڕۆژانە، یان هەفتانە، یان ئاوا جاروبار و هەر کاتێکی ڕێك کەوت. ئەم نووسەرانە، کە لەبەر هەر هۆیەك بێ ئەوەندە بەڕێکوپێکی وابەستەی تۆمارکردنی یادگارییەکانیان نین و لەوانەیە بۆ ماوەیەکی درێژ دەست هەڵبگرن لە نووسین و ڕەنگە لەو ماوە درێژەدا تەنیا چەند ڕووداوێکیان لەسەر کاغەز تۆمار کردبێ، ئینجا

زۆر درەنگتر هەڵدەستن، سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە سەریان و هەوڵ دەدەن ڕۆژانی دێرین پاش تێپەڕبوونی ئەو هەموو ماوە درێژە بێننەوە یاد. ئەمەشیان دوو.

ڕێگایەکی سێیەمیش ئەوەیە کە بە منداڵی یان بە نەوجوانی بەدەگمەن شتێکت یادداشت کردبێ کەچی بە پیری بچیتە بەر هەویری و دابنیشیت سەری خۆت هەڵکرێنیت و مێشکت بگوشیت بۆ ئەوەی بتوانیت بیرت بگەڕێنیتەوە بۆ دواوە بۆ دەیان ساڵی رابردوو تاکو بەسەرهاتە کۆنەکانت بێنەوە یاد. ئەمەیان ئەرکێکی گرانە، بۆیە نووسەر دەبێ زۆر وریا بێت و ئەوەی کە بە دڵنیایی لای روون بووەتەوە کە راست و دروستە با ئەوە تۆمار کات و ئەوەی کە گومانیشی لێ دەکات با لە کەسانی هاوزای یان نزیك لە تەمەنی خۆی پرسیار بکات کە ئەوانیش رەنگە لە هەرەتی نەوجوانییاندا ئاگایان لەو رووداو یان لەو بەسەرهاتانە بووبێت کە تۆ وا خەریکە باسی لێوە دەکەیت. هەڵبەت وەك دەشڵێن بیری منداڵی تیژە جا زۆر لە گوێنە کە رووداوەکانی رۆژگارانی هەنگێنێت بەخێرایی بێنەوە بەرچاو، بەڵام دواتر کەمتر. لێرەدا نووسەری یادئاوەری دەبێ باسی ئەو سەرچاوانە بکات، ئەگەر ناویانی بیر مابێت دەنا با بنووسێ کە ئەو چیرۆکانەی لە کۆنەوە بیستووە و لەبیری ماوە.

پنتکێکی زۆر گرنگ لە یادئاوەری نووسینەوەدا هەیە کە ناکرێ بە هیچ جۆرێك پشتگوێ بخرێت. تۆ کە چیرۆکی گوزەشتەی خۆت دەگێڕیتەوە ئایا مەبەستت تەنیا گێڕانەوەیەکی کرۆنیکلی بەسەرهاتەکانی ژیانتە وەك حیکایەت، بێ ئەوەی بچیتە ناو بنج و بنەوانی هۆکاری رووداوەکان و کاریگەرییان لەسەر هەرچییەکی بووبێت، یان دەتەوێ لەسەر ئەو بەسەرهاتانە بوەستیت، ڕووناکییان بخەیتە سەر و تەنانەت وێنەیەکی ئەو ژینگە و هەلومەرجانەش پیشان بدەیت کە مەیدان و گۆڕەپانی بەسەرهاتەکان بوون و تا بکرێت بە وردەکارییەوە شییان بکەیتەوە و لێکیان بدەیتەوە. ئەگەر ئەمەی دواییان هەڵبژێریت،

بیرەوەرییەکانت دیمەنێکی زۆر جوانی ئەو سەردەمە بەسەرچووانە دەخەنە بەرچاوی نەوەی ئەمڕۆ و دوارۆژیش و بە ڕاست و ڕەوا دەبن بە مێژوو. جا پنتکە گرنگەکە ئا لێرەدایە. تۆ ئەگەر هاتو بە تێگەیشتنی ئەمڕۆت ڕووداوێکی با بڵێین پەنجا ساڵ لەمەوبەرت لێکدایەوە، پێویستە دوو بیروباوەڕی خۆت بۆ ئەم لێکدانەوەیە بخەیتە ڕوو:

یەك، بیروباوەڕی پەنجا ساڵ لەمەوبەرت کە ئەوسا چۆن لە ڕووداوەکە گەیشتبوویت و لەوانەیە هەنگێ هێشتا لە تەمەنێکی منداڵی یان نەوجوانیدا بوویت و ئەڵبەت هەر هەڵگری عەقڵیەتی ئەو تەمەنەت بوویت.

دوو، بیروباوەڕی ئەمڕۆشت کە زۆر ڕێی تێ دەچێت دوای تێپەڕبوونی نیو سەدە ئەگەر بەتەواویش ئاوەژووی ئەوەی جارانیشت نەبێ، ڕەنگە هەندێ گۆڕانکاریی هەر بەسەردا هاتبێ، بەڵام دووریش نییە هەر وەك خۆی مابێتەوە. جا ئەگەر هاتو هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆت بۆ بەسەرهاتێکی پەنجا ساڵ لەمەوبەرت لەگەڵ ئەوەی جارانت جیا بوون، دەبێ بۆ نموونە شتێکی ئاوا بڵێیت «ئەمن لە کاتی خۆی ئەوها لەو کێشەیە، یان لەو ڕووداوە، یان لەو سیاسەتکارە، یان لەو هونەرمەند و شاعیر و نووسەرە گەیشتبووم، بەڵام بیروڕای ئەمڕۆم لەسەریان و هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆم، یان بەتەواوی یان بە جۆرێك، پێچەوانەی ئەوەی پێشانمە، چ بە ئەرێتی چ بە نەرێتی.»

پنتکێکی دیکەی دیسان زۆر گرنگ هەیە کە دەبێ لە تۆمارکردنی یادئاوەری لەبەرچاو بگیرێت، ڕاستگۆیی.

لای گەلانی ڕۆژئاوا، ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی، مۆرکێکی زۆر زەق و دیاری گێڕانەوەی بیرئاوەرییەکانیانە بەبەراورد لەگەڵ گەلانی ڕۆژهەڵات. کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان بۆیە لە ڕۆژهەڵاتییەکان ڕاستگۆترن، چونکە نە ترسی دەسەڵاتی سیاسییان لەسەرە نە ترسی دەسەڵاتی ئایین و نە ترسی حوکمی کۆمەڵگاکانیان بەسەریاندا. بەکورتی، لای ئەوان کەس

لێت ناپرسێ بۆ وات گوتووە یان بۆ وات کردووە؟ بەڵام کۆمەڵانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەبەر ئەوەی کەچاوی تیژی دەسەڵاتی سیاسی و سوننەتەکانی ئایینی ئیسلام و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی (عەیبە) ڕێگایان نادات هەموو شتێك بەڕاشکاوی وەك خۆی ئاشکرا بکەن، بۆیە ناچار دەبن یان دەبێ درۆ بکەن، یان ڕاستی بشارنەوە و هەر باسی نەکەن، چونکە ئەگەر وا نەکەن لەوانەیە خۆیان لە هەرسێ لاوە تووشی کێشە بکەن: (دەوڵەت و دین و دونیا) کە من بە ( د د د ) کورتم کردۆتەوە. درۆکردن و ڕاستی شاردنەوەش دوو شتی جیان. تۆ کە قسە دەکەیت یان شتێك دەگێڕیتەوە دەبێ ڕاستگۆ بیت، بەڵام لەسەریشت نییە هەموو ڕاستییەك ئاشکرا بکەیت. ئەوەی کە دەیڵێیت دەبێ ڕاست بێ، بەڵام مافی خۆشتە هەموو شت نەڵێیت و بەسەر هەندێ ڕووداودا باز بدەیت کە هۆی شاردنەوەی لەناو دڵی خۆتدایە، ناتەوێ بیخەیتە ڕوو و کەسیش مافی نییە بەرۆکت بگرێت و بەسووربوونەوە داوات لێ بکات بۆچی نایڵێیت. بەکورتی لای تۆ شت هەیە دەگوترێ و شت هەیە ناگوترێ، یان هەر نەبێ بۆ ئەمڕۆ ناگوترێت کە ئەمەش بە درۆ ناژمێردرێ، گرینگ ئەوەیە ئەوەی گوتووتە، ئەوە ڕاست بێ.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم جیاوازییە لەنێوان فەرهەنگی ڕۆژئاوا و فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتدا، دەکرێ بڵێین کە یادداشتەکانی کەسانی ڕۆژئاوایی لە زۆر، نەك لە هەموو، ئەوانەی ڕۆژهەڵاتییەکان پتر جێی باوەڕ پێکردنن و پتر بایەخی مێژووییان هەیە. ئەوان بێ باکن، شەرم ناکەن و ناترسن هەرچییەکی کردبیان ئاشکرای بکەن و هەرچییەکی گوتبیان ئێستەش بیڵێنەوە، ئەمان شەرمیش دەکەن و دەشترسن. دەبێ ئەوەش بڵێم کە لەم چەند دەیانەی دوایی و گەیشتنی تێکنۆلوجیای مۆدێرن بۆ ناو کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکانیش، ئەم ترسانەی کە لەسەرەوە باسم کردن، بەتایبەتی لە بواری سیاسەتدا، تا ئەندازەیەك ڕەویونەتەوە، بەڵام هێشتا ماویەتی.

گومانیشــم لــەوەدا نییــە کــە ڕێگاگەلــی دیکــەش بــۆ نووســینەوەی بیــرەوەری دەبــێ بــەکار هاتبــن و مــن لێیــان بــێ ئــاگام.

ئەمــن ســەرەڕای ئەزموونــی دوور و درێــژم بەنــاو دونیــای پــان و بەرینــدا، هێشــتا هــەر خــۆم بــە کەمــزان دەزانــم و تــا دەشــمرم هــەر بــە کەمزانــی دەمێنمــەوە، چونکــە شــتی نــوێ ئەوەنــدە بەخێرایــی ســەر هەڵــدەدەن و دەگۆڕێــن، کــە ئێمــە بــەو تەمەنــە سنووردارەمان نایگەینــێ «فالکمــال والعصمــة للــه وحــده.»

**هۆمەر دزەیی**

**سلێمانی، مانگی پێنجی 2015**

رحلة ريج
في
العراق عام ١٨٢٠

الجزء الأول

كلوديوس جيمس ريج

نقلها الى العربية

بهاء الدين نوري

TWO YEARS IN
KURDISTAN
Experiences of a Political Officer
1918–1920

W. R. Hay
Captain, attached 24th Punjabis,
Political Dept., Government of India

LONDON: SIDGWICK & JACKSON, LTD.
3, ADAM STREET, ADELPHI, W.C. 1921

بلاد
ما بين
النهرين
بين ولاءين
خواطر شخصية وتاريخية

تأليف : سر ارنلد تي . ويلسن

نقله الى العربية ، قدم له ، وعلق عليه
فؤاد جميل

الجزء الثالث

## هەبوو نەبوو

هەبوو نەبوو هیچ شتێک لە ئەرز و لە ئاسمانا لە خودای گەورەتر نەبوو ; هیچ ژنێك لە دنیای فرەوانا لە کافیە خانی دایکم جوانتر نەبوو ; هیچ شوێنێك لەم سەر زەویە پۆڕ و پانە لە گوندی دووگردکانی زاگەم خۆشتر نەبوو.

کە دەڵێم هەبوو نەبوو، دیارە من باس لە سەردەمانێکی بەسەرچوو دەکەم، سەردەمی منداڵیم و نەوجوانیم و ئێستاش. خۆی کە دەڵێم هەبوو نەبوو، هەبووەکان بە ڕاستی و بە فیزیکاڵی هەبوونە و نەبووەکانیش لەڕاستیدا نەبوونە، باشترە بڵێم بۆ من نەبوونە و ئەمن تەنیا لەناو خەون و خەیاڵی فانتازیی خۆشی خۆمدا، خەون و خەیاڵی فانتازیی خۆشی ئەو سەردەمە دەمئافراندن و هەروا لە ئافراندنیشیان بەردەوامم، یانیش لە پیرەکانم بیستووە کە لای ئەوان بەڕاستی هەبووە، بەلام بۆ من بوونەتە دونیایەکی فانتازیی پڕ لە خەون و خەیاڵی خۆشی مەخمەڵیی پەمەیی کە تیایدا خۆمم وەك شۆڕەسوارێکی نەبەزی بێ وێنە دێتە بەرچاو. جا ئێستا وا ئەو "نەبووانەش" لێم بوون بە هەبوو و دەبێ بیانخەمە ناو بیرەوەرییەکانم.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونانەی کە لە پێشەکیی ئەم بیرەوەرییانەدا باسم کردن، هەوڵ دەدەم بە سەروسەربردەی خۆمدا بچمەوە و لەو گێڕانەوەشمدا وا دیارە کە من دەکەومە ناو خانەی سێیەمەوە (بڕوانە پێش وشەکە) چونکە من یەکێکم لە زۆر ئەوانەی کە لە تەمەنی لاویمدا تەنیا کەم شتێکم لەناو لاپەڕە چکۆلەکانی ساڵنامەکانی گیرفانی ئەوان سالانم، یانیش لەسەر چەند پەڕە کاغەزێکی جیا جیا یادداشت کردووە. هەموو ئەوەی دی کە باسیان دەکەم، ڕاستییە مێژوویی و جیۆگرافی و دێمۆگرافیەکانی لێ بترازێ، یان ئەوانەی کە بەبەڵگە و دۆکومێنت چەسپێندراین، ئەگینا ئەوی دی هەمووی

دەرئەنجامی گوشار و پەستارێکی زۆری مێشك و بیری خۆمن، کە تەمایەکی زۆرم پێیانە بە ئەمانەتەوە قۆناخ بە قۆناخ بمگەڕێننەوە بۆ دواوە، بۆ سالان و رۆژگارانی بەسەرچووی مندالی و مێردمندالی و جوامێری و تەمەنی ئێستام.

سەروسەربردە گێرانەوەش هی هەچ کەسێ بێت لەوانەیە خۆش و بەتام و بۆ و بەکەلکیش بێت، لەوانەشە زۆر بێتام و بێ واتا بێت، بەلام خۆش و ناخۆش، ئەگەر هەمووی لێك بدەیتەوە، رەنگە ببێت بە مێژوو. مەرجیش نییە هەر بیرەوەریی پیاوانی لە بواری جیاجیای ژیاندا گەورە و ناسراو بۆ مێژوو خۆش و بەکەلك بن. زۆر لە گوینە گێرانەوەی چیرۆکی ژیان و بەسەرهات و خەون خەیالەکانی گەسك لێدەرێکی ناو کووچە و کۆلانەکان شتی وای تێدا بەدی بکرێت کە زۆر راستر و راشکاوانەتر و خۆشتر و سادە و بێ پێچ و پەناتر بێ لە گێرانەوەی پڕ لە پێوەنان و خۆهەلکێشانی سیاسەتکارێکی پلەبەرزی کۆمەلگایەکی رۆژهەلاتی.

کافیه خانی شێخ مارفی بەرزنجی
دایکی هۆمەر دزەیی (1900 - 1963)

گوندی دووگردکان - 1951

یەکەم قوتابخانەی هەولێر

# بەشی 1

## کورتەیەکی جۆگرافی و تۆپۆگرافی جارانی دەشتی دزەیی، ئەوڕۆی دەشتی هەولێر.

بۆچی ئەم دوو ناوە؟ دواتر کە دێمە سەر باسی مێژووی دانیشتوانی ئەم دەشتە، هەنگی لەم بابەتە دەدوێم.

بەڵام جارێ با بە پوختەیەکی جیۆگرافی و تۆپۆگرافیی دەشتی دزەییەوە دەست پێ بکەم کە من خۆم لەوێ لەدایك بوویم، بە لایلایەی ناو لانکێی ئەوێ فرچك دراوم و ساڵانی منداڵی و نەوجوانیم تا تەمەنی نزیکەی بیست ساڵیەکیش زیاتر هەر لەو دەشتە بەسەر بردووە. یادگارەکانی منداڵیم لە زۆرێکی گوندەکانی (مرکیە و شەمامك و کەندێناوە و قەراج) دا هێشتا کۆنە برینم دێنەوە سوێ و تێکەڵ بە هەست و هەناو و خوێنم بووین، ئەگەرچی بێ گومان، خۆ لەو هەموو گوندانە نەژیاوم و هەموویانیشم نەدیوە، بەڵام ڕەنگە ئاوا جاروبار بەناویاندا یان بەلایاندا گوزەرم کردبێ، یان خۆ هەر نەبێ لە حەیراناندا ناوەکانیانم بیستووە. لەبەرئەوە ناتوانم هەر ئەوها، بەسەرڕێیی، بەسەر ئەو ناوچانەدا ڕەت ببم و بەسەریان نەکەمەوە.

کە منداڵ بووم، قوتابخانە هێشتا لە گوندەکەی ئێمە دووگردکان نەکرابۆوە. ساڵی 1942 منیان ناردە هەولێر و لە قوتابخانەی یەکەمی هەولێر ناونووسیان کردم. لەوێ هەمیشە خۆم بە غەریب و نامۆ دەزانی. غەریبیم بۆ ئەو گوندانە هەڵدەستا و هەر گوندییەکی کورتەك شڕی کڵاش لەپێی کەروبار لەپێش، لەبەردەمی قوتابخانەکەم تێ بپەڕیبا، یەکسەر دڵەکوتەم دەگرت، دەمناسییەوە دەمزانی لەو دەشتەوە هاتووە و پڕ بەدڵ خۆشم دەویست و ڕام دەکردە لای شیشبەندە نزمەکەی

دیواری حەوشی قوتابخانە، لێم دەپرسی: "ماندی نەبی خارە، خەرکی کێندەرێی؟" گرنگ نەبوو بۆ من لە کامە گوندی ئەو دەشتەوە هاتووە، چونکی ناوی هەر گوندێکی بهێنایە، خۆم بە خەڵکی ئەوێ دەزانی و بە دەنگ نا، بەڵام لەناو دڵمدا دەکورکامەوە. چاویشم هەر دەبڕییە خارەی دەشتەکی کە دوور دەکەوتەوە تا لەبەر چاوم بزر دەبوو و لەناو دڵی خۆمدا بە ئاخێکی پڕ لە داخ و هەناسەیەکی ساردەوە دەمگوت: «چەند خۆشە لۆ خۆتان دەچنەوە دەشتێ، بریا لەگەرتان بام خارۆکە و کەرۆکە.»

شاری هەولێر لای باکوری و خۆرهەڵاتی و باکوری خۆرئاوای، هەم دەشتاویە هەم هەرد و تەلانیشە و ئەوێ زیاتر ناوچەی خێڵی گەردی و زراری و مەنتکە. زیاتر هەڵکشێیت ئیتر تۆپۆگرافیی ناوچەکە بەرەبەرە بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە چیای بڵند و مەڵبەندی جۆرەها خێڵی دیکەی کورد. ئەو ناوچە و مەڵبەندانە بابەتی ئەم باس و بیروەریانەی من نییە. خۆرئاوای هەولێر کە بۆ موسل دەڕۆیت، ناوچەی بەڕانەتیی پێ دەڵێن، ئەوێش مەڵبەندی چەند خێڵێکی دیکەی کوردە و ئەمەشیان بابەتی ئەم باسەی من نییە. لای باشوور و خۆرئاواکەشی بەگشتی دەشتە بەڵام لەو دەشتە کاکی بەکاکیەی باشووریش شاخێکی لە شاخان دابڕاوی لێ قوت بووەتەوە (قەرەچوغ) لەگەڵ زنجیرە زوورگێکی باریکەلەی درێژ (زوورگەزراو) و هەندێ هەرد و تەلان.

خودی دەشتی دزەیی لە سێ ناوچەوە پێك هاتووە، مرکیە (مولکیە)، کەندێناوە، قەراج. هەر لەناو مولکیەش بە بەشی ڕۆژئاوای ڕێی هەولێر - مەخموور دەڵێن (شەمامك).

## یەکەم: موڵکیە (بە شەمامکیشەوە)

ئەمەیـان لـە باشـووری شـاری هەولێـرەوە دەسـت پـێ دەکات و لـە زوورگـەزراو تـەواو دەبـێ ئەگـەر ڕێـی مەخمـوورت گرتـە بـەر، ئەگـەر لـە هەولێـرەوە بـۆ کەرکووکـیش بڕۆیـت، لـە شـارۆچکەی پـردێ (ئاڵتـون کۆپـری) تـەواو دەبـێ. زوورگ بـە شـێوەزاری هەولێـر بەرزاییەکـی زوور و زبـر و بەردەڵانـە، چونکـە ئـەم زوورگـە باریکەلـە و درێژیشـە، بۆیـە ئـەم نـاوە (زوورگـەزراو)ی وەرگرتـووە کـە وشـەی ( زراو)یـش، بـە شێوەزاری کرمانجـی (زراڤ)، واتـا باریـك بـە سـۆرانی. بـەڵام ڕۆژئـاوای ڕێـی مەخمووریـش کـە هـەر دەشـتی دزەییـە، ئەمەیـان ناوێکـی تایبەتـی خـۆی هەیـە (شـەمامك)، بۆیـە دەکـرێ بـاس لـە چوار ناوچـەش بکەیـت. هەروەهـا ڕۆژهەڵاتـی ڕێـی کەرکووکـیش کـە گوندیـەکان (پشـت ڕێ) ی پـێ دەڵێـن، ئەوەیـان چەنـد گوندێکـی ئاغاکانـی دزەیـی لـێ یـە بـەڵام ئـەوی دی تێکەڵەیەکـە لـە گوندەکانـی خێڵـی مەنتـك و شـێخان و کـورد و سـاداتی بەرزنجـی و هەنـدێ خێڵـی دیکـە تـا دەگاتـە وڵاتـی کۆیـە. بـە ڕۆژئـاوای ئـەو ڕێیـەی کەرکووکـیش دەڵێـن (بـەر ڕێ). مـن کـە بـاس لـەم دابەشـکردنە جیۆگرافـی - بەشـەرییە دەکـەم، هەمـوو کـەس، بەتایبەتـی شارنشـینەکان، ئـەم وردەکارییـە نازانـن، تەنانـەت لادێیەکانـی ئەمـڕۆش مەگـەر ئێختیـارەکان، دەنـا گەنجەکانیـان ئـەم ناوانەیـان هـەر نەشبیسـتووە.

هەندێکـی ئـەو ناوانـە لـە نـاو تۆمـارە ڕەسـمییەکانی دەوڵەتی عوسـمانی، هەبوونیـان بـەم جـۆرە بـووە: ملکیـة، سـنیة، امیریـة.. بـەڵام گوندییەکانـی ناوچەکـە خۆیـان نـاوی کوردییـان بـۆ دانابـوون و هـەر ئەویشـیان بـەکار دەهێنـا: مرکیـة، پشـت ڕێ، بـەر ڕێ، شـەمامك، کەندێنـاوە، قـەراج، کـە ئەمـەی دواییـان وشـەیەکی تورکیـی عوسـمانییە.

نـاوی موڵکیـە، دەوڵەتـی عوسـمانی بـۆ ڕێکخسـتن و دابەشـکردنی

زەوی و زاری کشتوکاڵی داینـاوە کـە هەمووی مولکـی سـوڵتان بـووە و سـوڵتان خـۆی بەسـەر سـەرەك خێڵـە بەهێـز و دەسـەڵاتدارەکاندا دابەشـی دەکـردن و لـەو زەمانـە بـە (قۆچانـی ڕەش) تاپـۆ دەکـران. بـەڵام لـەو زەمانـە هـەر سـەرەك خێڵێکـی کۆچـەری بەهێزیـش ئەگـەر زووتـر ناوچەیەکـی پـڕ پـاوان و لـەوەڕگای باشـی بـۆ خـۆی گـرِ بدابـا، ئـەوە دەبـووە مولکـی خـۆی و لەپاشـان بـە فەرمانـی سـوڵتان بـە قۆچانـی ڕەش لەسـەری تاپـۆ دەکـرا، هـەر وەك کـە حەننـا بطاطـو لـە کتێبـی (العـراق...) کـە بـە ئینگلیـزی نووسـیویە و عفیـف الـرزاز کردوویـە بـە عەرەبـی، لـە لاپـەڕە 98دا دەڵـێ «وفـي كردسـتان، كانـت للعشـائر الرحـل أراضـي رعي مكتسـبة لهـم بالتقـادم...» کوردییەکەشـی ئەمەیـە "لـە کوردسـتانیش، خێڵـە کۆچـەرەکان دەبـوون بـە خاوەنـی ئـەو پاوانانـەی کـە پێـش ئەوانـی تـر خۆیـان گەیاندبـوێ."

لـەو زەمانـە زەوی زۆر بـوون و بەشـەریش کـەم بـوون. جـا مـەڕدارە بـە هێـزەکان کـە زووتـر خۆیـان دەگەیانـدە ئـەو زەوییانـە دەبوونـە گـەورەی لاوازەکان. لـە سـەردەمی سیسـتەمی فیئۆدالیزمـی ئەوروپاییشـدا هـەر وا بـووە و پـێ دەچـێ تورکـە عوسـمانییەکانیش پێـش هاتنیـان بـۆ ئـەو ناوانـە لای ئەوانیـش هـەر ئـەو سیسـتەمە فیئودالیزمـە بـاو بـووە. لـە تەمەنـە ناوەندییەکانـی ئەوروپـا زۆرترایەتـی زەوی و زاری وڵاتێـك مولکـی شـایەک، ئیمپراتۆرێـک، میرێـك، بارۆنێـک یـان هـی هـەر خانەدانێکـی دەسـەڵاتدار بـووە کـە بـە ئینگلیـزی پێـی دەگوتـرا (ڕیێـال ئیسـتەیت real estate = زەوی و زاری مەلەکـی یـان شـاهانە) چونکـە وشـەی( re ڕێ) وشـەیەکی لاتینـە، واتـا مەلیـك و یەکێـك لـە واتـا زۆرەکانـی (ئیسـتەیت) یـش زەوی و زارێکـی گەورەیـە.

لـەڕووی تۆپۆگرافییـەوە، مولکیـە بەگشـتی دەشـتێکی ڕاسـتە کـە چەنـد کەندێکـی لـێ یـە وەك شیوەسـوور، بەسـتی قەتـەوی، قوڕەبـەگ، کـۆدەرە، شیوەشـار، خوڕخـوڕە کـە هـەر ئەگـەر زسـتان بارانـی زۆر بـێ ئاویـان پێـدا دەڕوات، ئەگینـا وشـکن. تەنیـا ناوچـەی پشـت ڕێ نەبـێ کـە هەتـا بـەرەو وڵاتـی کۆیـە هەڵکشـێت، پتـر هـەرد و تـەلان دەسـت پـێ دەکات.

## گردە بڕاوەکانی موڵکیە

کورد بە دەستی خۆی مێژووی خۆی دەسڕێتەوە.

ئەگەر تۆ بەناو دەشتی موڵکیەدا گوزەر بکەیت، ناوە ناوە گردێکی جوانی خنجیلانەت بەرچاو دەکەوێت. دیارە ئەم گردانە هەمووی لە سەردەمانی کۆندا، بە توورەکەڕێژی بە مەبەستی سەربازی و خۆپاراستن دروست کراون و ئێستاش ناوە ناوە خەڵکی ناوچەکە گۆزەی گەورە و بچووك و پارچەی شکاوی کەلوپەلی ناوماڵی ئەو سەردەمە دێرینانە، تەنانەت دراوی زێڕ و زیوی ئیمپراتۆراتییە کۆنەکان لەسەر ئەو گردانە یان لە لاپاڵیان دەدۆزنەوە. لە جیهانی پێشکەوتوودا، ئەم جۆرە شوێنانە گشتی لەلایەن دەزگای تایبەتی (پاراستنی شوێنەوار) ی سەر بە دەوڵەتەوە، دەستیان بەسەردا گیراوە، بودجەی تایبەتیان بۆ تەرخان کراوە و بە قانوون قەدەغەیە کەس هەڵکۆڵینیان لێ بکات. کەچی کاربەدەستانی ئەم بوارەی حکوومەتی هەریمی کوردستانەکەی خۆمان، دیارە لە لاساییکردنەوەی سیاسەتەکانی بەعس بەولا، بیریان بۆ هیچ ڕێگایەکی دیکە بڕی نەکردووە و ئەوانیش بەعس ئاسا هەندی لەو گردانەیان لەبەر بەرزاییەکەیان کە بۆ چاوەدێریکردن باشترە، بە شۆفڵ تاشیوە بۆ ئەوەی خانوویەکی بۆ پاسەوانانی لوولەی نەفت و گاز یان پاسەوانانی هەر دەزگایەکی کە خۆیان بە شوێنی هەستیاری بزانن، لەسەر دروست بکەن. بەم جۆرە زۆرێك لەو گردە خڕە جوانە مێژووییانەیان هەموو تاشیوە یان کەلیان کردوون و ئەو هەموو گۆزە و کەلوپەلە مێژووییانەش لە ئەنجامی ئەو داتاشین و هەڵکۆڵینانەوە، یان ورد و خاش کراون، یان کەس نازانێ چییان لێ هاتووە. کاربەدەستانی ئەم بوارە، نابێ ئەوها بەبێ ئەزموون دەست بۆ کاری وا هەستیار و گرنگ ببەن، ئەوانە دەبێ لەو کەسانە بن کە کەمێك دنیادیتە یان دنیابیستە بن. خۆ ئەوانە بەئاسانی دەتوانن

لەو شوێنانەی مەبەست تاوەر (بورج)ێکی لە شەلمان دروستکراو قیت بکەنەوە بۆ چاوەدێریکردنی دەوروبەر و خانووێکی چکۆلانەش لە خوارەوەی تاوەرەکە بۆ نووستن و ژیانی خۆیان دروست بکەن. بەداخەوە ئەمانە وا دەزانن کە شوێنی بەرز دەبێ هەر لەسەر گرد بێت و گردەکەش بۆ دروستکردنی خانوو دەتاشن، چ ئاگایان لەوە نییە کە تێکنۆلۆژیای مۆدێرن هەزار و یەك ڕێگای لەپێش داناون.

راستە لە سەردەمانی کۆندا کورد هەر حەزی کردووە گۆڕستانی خۆی لەسەر گردێکی نزیك گوندەکەی خۆی - ئەگەر گردی لێ بوا - دابنێ، ڕاستە ئاغاکانی دزەییش ئەگەر گوندەکەیان گردێکی لێ بوا، دیوەخانی خۆیان هەر لەسەر گردەکە بنیات دەنا، بەڵام ئەمە چەند سەد ساڵێك پێش ئەمڕۆ بووە کە کەس بیری بۆ نیشتمانپەروەری و پاراستنی شوێنەوار نەدەچوو، بەڵام بۆچی ئەمڕۆ لە سەدەی بیست و یەکی پڕ لە تێکنۆلۆژیای پێشکەوتوو ئەمە بکرێت؟

لە گردە ناسراوەکانی ئەو دەشتە کە چ لەناو ئاوایی چ لە دەرەوەی ئاوایی بن و ئاواییەکەش هەر بەناوی گردەکە کراوە یان پێچەوانەش. ئەمانە هەندێکیانن و ناوی زۆریشیان لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە دانـدراون و تورکین و ناشزانین پێش هاتنی تورکە عوسمانییەکان چ ناوی دیکەیان هەبووە: گردی ساراوە، گردی شێراوە، گردی پیرداود، گردی دۆغان، گردی ئیلیاس تەپە، گردی تاژیەڕەش، گردی دوزتەپە، گردی عارەب کەند، گردی سەعداوە، گردی شەمامەر، گرد عازەبان، گردی هێلاوە، گردی قوشتەپە، گردی دووگردکان، گردی ترپەسپیان، گردی باقرتە، گردی قازیخانە، گردی قشاغلو، گردی سۆربەش، گردی باشتەپە، گرد پێشکە، گرد قەڵغان، گردمەلا، گردی مەلا فاریقی، گردلانکە، گردەشینە، گردەڕەش، گردەسۆر ... بێ گومان زۆر گردی دیکەش هەن، بەڵام من هەر ناوی ئەوەندەم پێ پەیا کراوە، داوای لێبووردن لە دانیشتوانی ئەو گوندانەش دەکەم کە گوندەکانیان گردی لێیە و من پێم نەزانیوە، یان لەبیرم چووە.

لەو گردانە هەندێکیان بڕاون، بەڵام هەندێکیان هێشتا سەلامەتن. (ناوی هەندێ لەو گردانەم لە برادەری منداڵیم شێرکۆی محەمەدی مەولود هەولێری و قەرەنی حەسەنی حەمەداغای دزەیی وەرگرتووە و پڕ بە دڵ منەتباریانم. سوپاسی تایبەتیشم بۆ برای خۆشەویست و دۆستی لەمێژینم کاک مومتاز حەیدەری کە کتێبخانە نایابەکەی سەرچاوەیەکی زۆر گرینگ بوو بۆ دۆکومێنت و توێژینەوە و یارمەتییەکی زۆر پێویست بوو بۆ من.) ئەمەیان مولکیە بوو.

## دووەم: کەندێ ناوە

لە دۆکومێنتەکانی پۆلاندنی زەوی و زاری دەوڵەتی عوسمانیدا، ئەم ناوچەیە زیاتر بە (سەنییە) ناوی هاتووە، کەندێناوە ناوە کوردییەکەیە کە هیچ پەیوەندییەکی بە پۆلاندنە زەوی و زارییەکەی عوسمانییانەوە نییە. ئەمەیان کەوتۆتە باشووری مولکیە و کەندێکی گەورەی بەناودا تێ دەپەڕێ، بۆیە ئەو ناوەی وەرگرتووە. ئەم ناوچەیە لە زوورگەزراوەوە دەست پێ دەکات تا چیای قەرەچوغ، چونکە کەوتووەتە نێوان دوو بەرزاییەوە، دەبینی کە لە ڕووی تۆپۆگرافییەوە وەك مولکیە ڕاست و ڕێك نییە و کەند و هەوراز و نشێوی هەیە.

## چیای قەرەچوغ

قەرەچوغ چیایەکی تاکوتەنیایە کە لەناو پێدەشتێکدا قوت بووەتەوە و ئەگەر لە دوورەوە بیروانیێ سادە و بێ سامت دێتە بەرچاو بەڵام کە دەچیتە ناوەوەی، دۆڵی زۆر سەختی لێیە، دەڵێن جاران ئەو دۆڵانە پڕ بووین لە دارهەنجیرە کێوی و دارەبەن (قەزوان). لەو دۆڵانە ئەمانە هەندێکیانن: گەلی سەنگەران، گەلی ئازی کەندی، گەلی عەلی ڕەش، گەلی حاجی فارسی، گەلی بۆر، گەلی سۆر،

گەلـی دارەخورمـا (ئـەم زانیارییانـەم لـە وریـای حەویـز ئاغـای جـوکل ئاغـای دزەیـی وەرگرتـووە ( بـن ئامـۆزای مـن) کـە ئەویـش لـە باوکـی پرسـیوە و خەڵکـی ناوچەکـەن. بـە سوپاسـی زۆرمـەوە بـۆ بـاوک و کـوڕ). نەوراییـەك لـە ناوەڕاسـتدا ئـەم چیایـە دەکات بـە دوو کەرتـەوە، لـە ناوەنـدی نەوراییەکـەش دیـارە دەسـتی مـرۆڤ دەربەندێکـی لـێ بڕیـوە بـۆ ئـەوەی ڕێـگای هەولێـر - مەخمـور بەوێـدا بچێـت و بـەو دەربەنـدەش دەڵێـن بازاڕگـە. قەرەچـوغ لـەلای ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوای بەرەبـەرە شـۆڕ دەبێتـەوە، بـە ئەندازەیـەك تـا لەگـەڵ ڕووی زەمینـدا هـاو - ئاسـت دەبێتەوە، بـەلام بەپێـی جیۆلۆجیسـتان قەرەچـوغ لەژێـر ئـەرزدا هـەر هەیـە و بـە دەمـار لەگـەڵ چیـای حەمرینـدا یـەك دەگرنـەوە، جـا ئەگـەر وابـێ دەبـێ قەرەچـوغ هـەر بەشـێك بـێ لـە زنجیـرەی حەمریـن، بـەلام بـە زۆری لەژێـر ئەرزدایـە تـا دەگاتـە نێـوان دەشـتی کەندێنـاوە و دەشـتی قـەراج ئینجـا لەوێـدا سـەری هەڵداوەتـەوە و ئـەم قەرەچوغـەی لـێ پەیـدا بـووە. شـۆڕبوونەوەکەی قەرەچـوغ لـەلای ڕۆژهەلاتـی پێـی دەڵێـن کلکـەی دارە بزمـارە، شـۆڕبوونەوەکەی لای ڕۆژئاواشـی پێـی دەڵێـن کلکـەی کانـی وەکازە. کلکـەی دارە بزمـارە بایەخێکـی مێژوویـی هەیـە، بۆیـە دەبـێ هەڵوەسـتەیەکی لەسـەر بکـەم.

## کلکەی دارە بزمارە

لـە سـەردەمی گەرمیـان و کوێسـتانکردنی شـوانکارەکانی خێڵـە کوردەکان، کلکـەی دارە بزمـارە یەکێـك بـووە لـە سـەر ڕێـی ئـەو کـۆچ و کۆچبارانـە. خـۆی دارە بزمـارە گـۆڕی چاکێکـە (چـاك و پیـر) کـە نەزانـراوە هـی کێیـە و ئـەو درەختەی کە سێبەری دەکردە سـەر مەرقەدەکە و ئێسـتا کۆلکەیـە، هـەزاران بزمـاری نیـاز و مـرازی نەزرگرتووانـی تـێ کوتـراوە، بۆیـە ئـەم نـاوەی لـێ نـراوە. ئەمـەش نەریتێکـی سـەدان سـاڵ کۆنـی گەلێـك کۆمەڵـگای دونیـا بـووە کـە باوەڕیـان بـەم جـۆرە ئەفسـانانە

هەبووە. بۆ نموونە هەر لە شاری ڤیەننای ئەمڕۆ، لە چەقی ناوەڕاستی شاردا، کۆلکە دارێکی سەدان ساڵ کۆن ماوە (شتۆك ئیم ئایزن = Stock im Eisen) کە بە هەزاران بزماری ژەنگاویی ئەو سەردەمانە بزمارڕێژ کراوە و دەزگای (پاراستنی شوێنەوار) بە شووشەبەندێکی پتەو و ئەستوور چواردەوری داوە و بووەتە یەکێك لە زیارەتگای توریستەکانی ئەو شارە و فۆتۆی لە لا دەگرن. ئەم دارە بزمارە لە چەند شوێنی دیکەی کوردستانی عێراقیشدا هەیە (یەکێکیان لە ناوچەی زرارییە) و لە کوردستانی تورکیاش درەختی وا زۆرە کە لەوێ پێی دەڵێن (داریێ مرازان).

بەرزترین لوتکەی چیای قەرەچوغ پێی دەڵێن (بیژینگ بەسەر) و دوو لووتکەی نزمی دیکەش کە بەرزترینی زوورگەکەی بناری قەرەچوغن، بەوانەش دەڵێن (قەرەبێتك) و (قەرەبۆتك) کە دەکەونە بەرامبەر دارە بزمارە. ئەم سێ لووتکەیە پێکەوە لەگەڵ زوورگەزراویش لە زۆر لە حەیرانەکانی ئەو دەشتە باسیان کراوە. تۆ ئەگەر لە ترۆپکی یەکێک لەو لووتکانە بڕوانیتە خوارەوە لایەکت کەندێناوەیە و لایەکەی ترت قەراجە، ئەوجا هەنگی، بەتایبەتی لە وەرزی بەهاردا، جوانی و ڕەنگینیی ئەو ولاتەت دەکەوێتە بەرچاو کە سەیر نەبووە ئەوها بووەتە ئیلهامی حەیرانبێژان.

قەرەچوغ جاران بەرلەوەی ئەوەندە ترومبێل و چەکی ئاگر پەیدا بن، پڕ بووە لە بزنە کێوی و بەرازە کێوی، پشیلەی کێوی و گورگ و ڕێوی و کەمتیار و کەروێشك و سیخوڕ و بزنمژ. لە باڵندەش کەو و پۆڕ و باز و سەقەر و شەهێن و دووبرا و سوێسکە و کۆترە کێویلکە و حەبارە و خەرتەل و هەروەها زیندەوەری خشۆکی وەك مار و شەوگەرد و ئی تریش. دەڵێن کەوی سپیشیان لەو چیایە بەدی کردووە. قەرەچوغ چەند کانیاوێکیشی لێ بووە کە هەر یەکە ناوی خۆی هەبووە وەك: کانی دێوار، کانی خەزەران (ئەم دووانە بەردەوام ئاویان هەبووە)، کانی کۆتکە، کانی مەمکە، کانی سێسەربەشاخ، کانی

تەوشیتراش، کانی سۆرك (ئەمانە هاوینان وشك دەبن). ئەم زانیارییانەم لە حەویز ئاغای حاجی جوکل ئاغای دزەیی ئامۆزام بە ڕێگای وریای کوڕیەوە، بۆ هاتووە کە خەڵکی ناوچەکەن. بۆ پتر زانیاریش لەسەر چیای قەرەچوغ و ڕاو و شکاری ئەو چیایە، بڕوانە کتێبی (ڕاو و شکار) نووسینی هەر ئەو حەویز ئاغایە (لەدایکبووی 1927) کە پێکەوە لەگەڵ دۆستێکی دێرینی خۆی (ڕەحمانی حەسەنی شەحەلی) کە بە (کەچەڵ) دەناسرا هەرچەندە کە کەچەڵیش نەبووە، ڕاوچی و نیشانچیی بەناوبانگی چیای قەرەچوغ بووینە. حەویز ئاغا خۆی بۆی گێڕاومەتەوە کە زۆر جار نان و نوێژیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و چەند شەوێك بۆ ڕاوکردن لە ئەشکەوتەکانی ئەو چیایە دەمانەوە. حەویز ئاغا دانەری حەیرانان و شاعیریشە. ڕەحمان لە ساڵی 2007 کۆچی دوایی کردووە و لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسراوە کە ساڵی 1910 لەدایك بووە، بەڵام دوایی بیستم کە ئەو ساڵە ڕاست نییە و ڕەحمان ئەوەندە نەژیاوە.

شایانی ئاماژە پێدانیشە و خۆم لەبیرمە کە حەویز ئاغا لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەو کتێبەی نووسی لەژێر ناوی (ڕاو و شکار لە کوردستاندا) بەڵام کە ڕەشنووسی کتێبەکەی بۆ (لجنە الرقابة)ی سەردەمی بەعس نارد بۆ مۆڵەتی لە چاپدانی ئەوان وشەی کوردستانیان لێ قرتاند و پێیان گوت تەنیا بە ناوی (ڕاو و شکار) دەتوانێ چاپی بکات. بەداخەوە هەر واشی لێ هات.

جاران ئەو چیایە بەهەشتی ڕاوکەرانی بەسواری وڵاخ و تاژی بووە، بەڵام مخابن لە پاش زۆربوونی چەکی ئاگر و لرمەی تۆپ و هاتوچۆی شەو و ڕۆژی تانك و فڕۆکە بۆمبئاوێژەکانی عێراق، ئەو هەموو ئاژەڵە کێوی و مەلە جوانانە، تەبای هەموو ئاژەڵە کێویەکانی ناوچەکانی دیکەی کوردستان، دیارە هەستیان کردووە کە ئەو هەوارە تازە ئیتر بۆ لەژیان مانەوەی ئەوان دەست نادات، ناچار وردە وردە و زۆر بەنابەدڵییەوە، باریان کردووە بۆ کەس نازانێ بۆ کوێ. سەیر ئەوەیە

کە لە پاش کۆچکردنی ئەم ژینەوەرە ڕەسەنانەی قەرەچوغ، تەنانەت کانیاوەکانیش لەوێ چکیان کرد. دەڵێن ئێستا لە پاش کۆتایی شەڕ و شۆڕ و سەپاندنی قانوونی ڕاوکردن لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە کە مایەی دسخۆشییە ئەگەر بەتوندی دابسەپێنرێت، دەڵێن نیشتەجێ ڕەسەنەکانی قەرەچوغ (حەیوانە کێوی و باڵندە) ئەوانیش وا خەریکە وردە وردە ڕوو لە هەواری باب و باپیرانیان دەکەنەوە.

هیواداریـن کە چیای قەرەچوغ بەمانە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی و ببێتەوە بە بووکی ڕازاوەی ئەو دەڤەرە.

## سێیەم: قەراج

قەراج لە وشەی تورکی (قراج) ەوە وەرگیراوە و بە تورکی واتا شوێنێکی بێ ئاو و وشك و بێ خێر و بێر و دوور لە ئاوەدانی کە بۆ چاندن و لێ ژیانی ئینسان هەرگیز دەست نەدات.

خۆی لەراستیشدا هەر وابووە چونکە قەراج ناوچەیەکی ئارانە و دەکەوێتە ناو هێڵی کەمبارانییەوە و لە باشوورییەوە ئیتر بیابانی عەرەبستانی عیراق دەست پێ دەکات و نزیکترین شارۆچکەی عەرەب لەوێ ناحیەکانی (شەرگات) و ( گەیارە) ن.

جا قەراج کە دەشتێکی پانی کاکی بە کاکییە لە سەردەمی کۆندا لەبەر کەمبارانی ئاوەدانیی لێ نەبووە و نە کورد و نە عەرەبیش هەوڵی کێلانیان نەدەدا بۆیە ئەم دەشتە هەمیشە بە بەیاری دەمایەوە و بەهاران دەڕازایەوە بە جۆرەها گوڵ و گوڵیلك و لەوەڕگای پڕو چڕو ڕەوە مامزی لەژمار نەهاتووی و هۆبە ڕەشماڵی شوانکارەی خێڵ و خێڵاتی کوردی خاوەن پەز و هەندێ عەشایری کۆچەری عەرەبیش کە گەرمیان و کوێستانیان دەکرد. فوئاد حەمە خورشید لە کتێبی ( خێڵە کوردیەکان، چاپخانەی الحوادث، بغداد 1979) کە لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە عەرەبی لە لاپەڕە 51 50- دا دەڵێ"

ئەو زەمانە زەوی و زارەکانی مەخمور و کەندێناوە وشك بوون و نەدەچاندران و بریتی بوون لە لەوەڕگای گەورەی پڕو چڕ کە لە وەرزی بەهاراندا ژمارەیەکی زۆری خێڵە کوردە کۆچەرەکانی بۆ خۆی رادەکێشا کە لە بەرزاییەکانی فارسەوە دەهاتن." حەمە خورشید لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ "... تەنها چەند ساڵێکی کەمی برد کە برایماغا بینی وا نزیکەی سەت گوند لە مەخمور چواردەورەیان داوە و نزیکەی نیوەی ئەو ژمارەیەش لە کەندێناوە. خۆی برایماغا، یان با بڵێین باوکی {بایزاغا}، لە راستیدا مەملەکەتێکی نوێی لەو ناوانەدا بۆ خۆی دامەزراند" هەر بۆ زانیاری خوێنەر، ئەم برایماغایە مامی نووسەری ئەم بیرەوەرییانەیە و ئەڵبەت باوکیشی، بایز اغا، باپیرمە.

ئەو ساڵەی کە ئەم دۆکومێنتەی بە ئینگلیزی لێ نوسراوە کە فوئاد حەمەخورشید وەریگێڕاوەتە سەر عەرەبی ساڵی 1919 بووە و ئەو وەختە کە 300 ساڵێك تێپەڕیبوو بەسەر هاتنی دزەییەکان بۆ ئەو دەشتە، قەراج ئاوەدان کرابۆوە و شارۆچکەی مەخموریشی لێ دروست کرابوو و لەپاشان حکومەتی عیراق کردی بە قەزا و ناوی قەراجیش لە دوکومێنتە دیوانی (رەسمی) یەکانی دەوڵەت بوو بە مەخمور.

ئەمن کە خۆم هێشتا منداڵ بووم لە پیاوە بەناوساڵچووەکانی ئەو رۆژگارانەم دەبیست کە زۆر بە شێوەیەکی رۆمانتیك ژیانی بەهارانی ئەو دەشتی قەراجەیان دەگێڕایەوە دەیانگوت: دەشتی قەراج بەهاران پڕ دەبوو لە هۆبە رەشماڵ، هەر هۆبەیەکیش هی یەکێك لە خێڵە کۆچەرییە خاوەن پەزەکان بووە وەک هۆبەی دزەییان، هۆبەی مامە سێنییان، هۆبەی سیانان، هۆبەی شێروانییان، هۆبەی بندیانان و زۆری دیکەش. جا دەیانگێڕایەوە کە چۆن کیژوکاری نازدار و شوان و شوانکارەی ئەو خێڵانە تێکەڵ بە یەکتری دەبوون و چ لەبەر مەڕی لەناو پاوانی، چ لە کاتی کردنی کەنگرو کاردو و دومەڵانی، دەمی ئێوارن لە کاتی مەڕدۆشینا، یان سەر لە بەیانییان لەکاتی مەشکەهەژینا

کە شوانە کورە لاوەکە کۆتکە دۆیەکی ساردی لە دەستی خانمە مەشکەهەژێنەکە وەردەگرت یان دۆدانەکەی لا پڕ دەکرد، یان لە کاتی شایی و گۆڤەندی دەمی حەسانەوەیان حەزحەزۆکێی ئەو نەوجوانانە دەستی پێ دەکرد و دەبووە هەوێن و ئیلهامیش بۆ حەیران بێژان و شاعیران. ئەدی ئەو رەوە مامزانەی کە دەڵێن بەهەزاران بووە و بەو پەڕی بەختەوەرییەوە جلیتبازییان لەو دەشتە وەك بەهەشتەدا دەکردا!

ئاغای جوکل ئاغای دزەیی(1907-1992) ئامۆزام (براگەورەی حەوێز ئاغای ناوبراو) چەند هەڵبەستێکی کەم بەڵام زۆر جوانی داناوە کە پارچەیەکیان وەسفکردنی ئەم دەشتی قەراجەیە لە وەرزی بەهاراندا. شیعرەکە لەم چەند بەندە درێژترە بەڵام من تەنها چەند کۆپلەیەکی پەیوەندیدار بە قەراجەوەم لێ هەڵبژاردووە.

بای وەعدە وا هات    دەیدا لە داران
بەهار ئەوا هات    مژدە لە یاران
زستان باری کرد    لەشکری شکا
کردیانە شایی    بووکی بەهاران
ئەی دڵ هەڵستە    هەروە قەراجی
بەڵام بە رێگای    دارە بزماران
لەسەر کەرکێ دا    سەرنجێ بدە
ئەوجا بڕوانە    کۆچ و کۆچباران
هێستری باڵەبان    لەپێش کۆچێ دا
سەریان دەکێشن    مەمك هەناران
بە کەوێی تاقە    بنکەوێی خامەك
بەرامپیل مەرەز    دەستووری جاران
خرینگەی بازنیان    عالەم کەڕ دەکا
هەر کە دەکوتن    سینگی رەشماران

شـــەو و رۆژ بەزمە — شـــایی و لۆغانە
ســـەرچۆپی دەگرن — كـەمـــبەرە داران
بــە رەفـت و رۆیین — هەروەك ئاسـكن
كــە چـێـشتەنگاوان — دەڕۆن بۆ كاران
شەو درەنگ داهات — پێم تەواو نـــابێ
(ئـــاغا) تــــەعریفی — ســـیمین عوزاران

ئەفسـەری سیاسـی بریتانـی لـە هەولێـر لـە سـاڵانی 1918-1920 دەبلیو.
ئـار. هێـی لە كتێبی (دوو سـاڵ لـە كوردسـتان) W.R.Hay, Two Years in Kurdistan لـە لاپـەڕە 18 ئەویـش بـەم شـێوە جوانـە باسـی دەشـتی قـەراج دەكات " لەسـاڵی بـە بارانـی چـاك، نزیكـەی لـە سـەرایی مانگـی مارتـەوە سـەرتاپای ئـەو بیابانـە گوڵاڵەپـۆش دەبـێ وەك بڵێـی لەپڕێـكا مافوورێكـی رەنگاوڕەنگـی نەخشـینی زۆر نایـاب راخرابێتـە سـەر رووی ئـەم زەمینـە. جـا لـەم وەرزەدا كوردەكانـی دەشـتی هەولێـرێ مێگەلـە مەڕەكانیـان رادەدەن لەبـۆ ئـەم پـاوان و لەوەڕگایانـە و لەهـەر شـوێنێكی بیانـەوێ رەشـماڵە گەورەكانیـان لـێ هەڵـدەدەن. ئـەو گۆمیلكانـەی كـە لەپـاش بارانـی زۆر هێشـتا پڕئـاون ئەوانـەش دەبنـە سـەرچاوەی ئاویـان. كـوڕە گەنجەكانیـان كـە سـوار دەبـن و سوارییەكەشـیان زۆر جـوان لـێ دێ هونـەری سـوارچاكی خۆیـان لـە سـەر زینـی وڵاخەكانیـان نمایـش دەكـەن یـان راوی كەروێشـك و مامـزان دەنێـن..... بـۆ مانگێـك یـان مانگێـك و نیـو ئـەو بیابانـە دەبێتـە هەوارێكـی تەندروسـتی بـەڵام لـە دوادواییەكـەی مانگـی نیسـانەوە ئیتـر هەتـاو دەسـت پـێ دەكا دەسـەڵاتی خـۆی بسـەپێنێت و لـە مـاوەی یـەك هەفتـە یـان دووان تـەواوی ئـەو هەمـوو گیایـە سـەوزەو ئـەو هەمـوو گوڵاڵانـە زەرد و سـیس دەبنـەوە"

هــەر لــە دامەنــی چیــای قەرەچــوغ، دیوەكــەی لای قەراجــی، گۆڕسـتانی (حوسـێنی غـازی) هەیـە كـە گۆڕسـتانێكی زۆر گـەورە و زۆر كۆنــی بــە كێلـی بەردینــی شـكاوی كــورت و درێــژ و لێــرە و لــەوێ

کەوتـووە و بـە هەمـوو لایەکـی بنـاری شـاخەکەدا هەڵکشـاوە و لـەوە دەچێ هـی سـەردەمی فەتحی ئیسلامی بێ. لـە ناوەڕاسـتی گۆڕسـتانەکە گوومەتێکـی زۆر جوانـی هـەر لەبـەرد دروسـتکراو هەیـەو لەنـاوەوەی دوو سـێ قەبـری کێـل شـکاو مـاون کـە رەنگبـێ هـی ئـەو حوسـێنی غازیـە بێـت و ئێسـتاکە بووەتـە چـاك و پیـرو مـەزارگای خەڵکـی ئـەو ناوچەیـە. ئەمـڕۆ کـەس بەتـەواوی نازانـێ ئـەم حوسـێنی غازیـە کـێ بـووە. ئـەو گۆڕسـتانە مێژوویـە پێویسـتە بەزوویـی بخرێتـە نـاو (دەزگای پاراسـتنی شـوێنەوار)ی حکومەتـی هەرێـم.

لـەم دەشـتی قەراجـە چاکێکـی تریـش هەیـە بـە نـاوی (سـوڵتان عەولای عارەبی) کـە بەهـاران رۆژانـە پـڕ دەبـوو لـە زیارەتکارانـی ناوچەکـەو بـە خاوخێزانـەوە بـۆ مـراز و مەخسـوودان روویـان تـێ دەکـرد و کەرەسـتەی خواردنیـان لەگـەڵ خۆیـان دەبـردو هـەر لـەوێ چێشـتیان سـاز دەکـردو تـا درەنگانـی ئێـوارە لـەوێ دەمانـەوە یـان هـەر شەوەکەشـیان لـەوێ بەسـەر دەبـرد. ئـەو زیارەتانـە بۆنەیەکـی گونجاویش بـوون بۆ دەسـت تێکەڵکردنی کـوڕو کچـی جەحێڵـی ئـەو خێزانانـە و دەبوونـە بابەتێکـی زۆر چاکیـش بـۆ حەیرانبێـژان و شـاعیرانی وەك کاک ئاغـای ناوبـراو. بـە پێـی ئەفسـانە ئـەم سـوڵتان عەولایـە گوایـە سـوڵتانی کـوڕی عبداللـەی کـوڕی عومـەری بنـی خەتـاب بـووە. وا دەڵێـن.

هـەر چـوار ناوچـەی دزەییاتـی (مولکیـە، شـەمامك، کەندێنـاوە و قـەراج) پێکـەوە لەگـەڵ ناوچـەی گەرمیـان و دەشـتی (ناوکـوڕ) ی لای ئاکـرێ بـە (سـەبەتەی نـان) لـە کوردسـتان و لـە عێراقیـش دادەنـدران. ئەگـەر سـاڵ تـەڕو بەبـاران بـوا گەنـم و جـۆی ئـەو دەڤـەرە نـەك هـەر بـۆ ناوخـۆ، بەڵکـو هەنـاردەی عێـراق و وڵاتانـی دراوسـێش دەکـرا. سـامانی ئاژەڵیـش هـەر وەهـا. لـە کتێبەکـەی Two Years in Kurdistan واتـا (دوو سـاڵ لـە کوردسـتانا) ئەفسـەری سیاسـی بریتانـی، دەبلیـو. ئـار. هێـی، کـە پۆسـتە سیاسـیەکەی لـە سـاڵانی 1918-1920 لـە هەولێـر بـووە، لـە لاپـەڕە 20 دا ئـاوا باسـی کشـتوکاڵی دەشـتی هەولێـر دەکات "ئەگـەر لـە وەرزی بەهـارا رێبوارێـک بچێتـە سـەر یەکێـک لـەو گـردە لەمێژینانـەی

کە لێرەو لە وێی ئەو دەشتە قوت بوونەتەوە، بەدەر لە ڕێیەکان کە سپی دەچنەوە، ئەوی دی سەرتاپای ئەم وڵاتە هەتا چاو حوکم دەکا بە چاندراوی بەدی دەکا، یان سەوزە و دەغڵەکە بەژنی کردووە، یانیش کێڵدراوە و بۆ تۆوکردنی پایز ئامادەکراوە. ئەم دەشتە ئاوەدانیی پڕوچڕی لێیە و ئەوە 300 ساڵیشە مەڵبەندی خێڵی دزەیی بە هێزە".

چونکە دزەییەکان و هەموو ئەو خێڵانەی کە لەو ناوچەیە دەژیان لە سەردەمی کۆندا شوانکارە بووینە بۆیە کە بوون بە ئاوایی نشینیش مەڕدارییەکەی جارانیان بووبوو بە کولتور و هەر خێزانێکی خواپێنەداویش خەونی بە دووسەر مەڕ و بزن هەر دەدی. جا تەبای دانەوێڵەکەیان، مێگەل و بزنەگەلیشیان دەفرۆشتە دەرەوەی کوردستان. بە کورتی دەشتی دزەیی لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر دەوڵەمەند بووە و سەرباری ئەوەش کە لە بەرەبەری سەدەی بیستەم نەفت لە کوردستان دۆزرایەوە دەرکەوت کە کەندێناوە ئێستاشی لەگەڵدا بێ لەسەر دەریایەکی نەفتە. خۆ (خورماڵە) لە کەندێناوەیە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە سدام حوسێن بەخێرایی ناوچەی کەندێناوەی لە دانیشتوانی کورد چۆڵ کرد، پڕی کرد لە عەرەبی هاوردە و بەشێکی خستە سەر موسڵ و بەشێکیش سەر کەرکوك و کەرکوکیشی عەرەباند. ئەدی شەڕی بەبان و دزەییانیش لە ساڵی 1823 هەر لەسەر دەغڵ و دانە لەمشەکەی ناوچەی دزەییان نەبووە؟ (بڕوانە دەسنووسەکەی مێژوونووسی دزەییان جەنابی، مەلا خالید بێناو، کە لە لاپەڕە 21-22 زۆر بە وردەکارییەوە باسی ئەو شەڕە دەکات).

مایەی پرسیارە کە جاران خاوەنەکانی کوردستان بێگانە بوون و لەژێر باڵی ئەواندا جوتیاری کورد بەرهەمی کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵی خۆی هەناردەی دەرەوەش دەکرد کەچی ئەمڕۆ، کە کورد خۆی خاوەنی کوردستانە، جوتیارە داماوەکەی کە تەماتەکەی دەباتە گومرگ ئەوەی کە دەستی دەکەوێ بەحاڵ ئەگەر کرێی پیکەپەکەی پێ بدرێ !! ئەوەش لەلایەکەوە لە ئەنجامی هاوردەکردنی ئەو بەرهەمە کشتوکاڵیانەیە کە «خاوەنە نوێ یە کوردەکانی کوردستان» لە

دەرەوە هاوردەی دەکەن لەسەر حیسابی - بەمەبەست - پشتگوێخستنی بەرهەمە خۆمالییەکان و لەلایەکی تریشەوە لە ئەنجامی بەدەنگەوە نەهاتنی پێداویستییەکانی جوتیارەکانی خۆمانە وەك پەیین و داو و دەرمان و کەرەستەو ئامێری ئاودێری هەرزان و ڕاهێنانی جوتیاران بە میتۆدی مۆدێرنی چاندن . کاربەدەستە نوێ یە کوردەکەی خۆمان هەڵدەستن و دادەنیشن لە کەناڵە تیڤیەکاندا ڕوو لە جوتیارە کوردە داماوەکەی خۆمان دەکەن: «ئێمە هەمیشە لە خزمەتی ئەم گەلە بەشخوراوەین.»!! کورە حەزرەتی گووگل (google) خۆشبێ ئەمڕۆ کەس هەیە نەزانێ کێ بەشەکەی دەخوا ! تۆ تەنیا بڕۆ بۆ ڕێگای مەخمور و تەماشایەکی ڕیزی لۆری و تریلەی باری گەنم وجۆ بکە کە تا نزیک گوندی کۆزە پانکە ڕۆیشتووە و جوتیاری داماو بەتەمایە ڕادەستی سایلۆی بکات بەڵکو شتێکی بۆ بێنێت گوزەرانی ساڵێکی خێزانەکەی پێ دابین بکات، کەچی بەشەوان و ڕۆژان دەبێ چاوەڕێ بێ تا لێی وەردەگرن و پارەکەشی، کە هەندێکیان تا دوای دوو سێ ساڵ وەریناگرن. هۆیەکی ئەو سرە درێژەش ئەوەیە کە کاربەدەستە نوێ یە «دڵسۆزەکانی کوردستان» تریلەی پڕ گەنم و جۆی خۆیان کە لە دەرەوەی کوردستان بە هەرزانیان کڕیوە پێش هەموو سرەکە دەخەن و بێ چاوەڕێ کردن لە سایلۆ بۆیان وەردەگیرێ. جا ئەگەر خەرجیی تراکتەرو کۆمباین و پەیین و دەرمان و کرێی گواستنەوەی بۆ سایلۆ و گرتنی ریزە لۆری بۆ شەوان و رۆژان کە هەمووی بە پارە لەسەریان حیسابە ئەگەر ئەو خەرجیانەی لێ دەر بێنی ئیتر جوتیاری بەدبەخت چی بۆ دەمێنێتەوە؟ هەقی نییە لە گوندەکەی خۆی بار بکات و بچێ لە شار تاکسیاتی بکات !! ئەمەیە سیاسەتی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانمان؟. سەیر ئەوەیە عێراقێك لەسەر حاڵی خۆی کە وەك دەوڵەت هەر وجودی نەماوە کەچی ڕیزی لۆریەکانی بۆ سایلۆی کەرکوکی زۆر باشتر لەوەی هەرێم ڕێکخستووە.

ئەگەر سەبارەت بە باری شەڕی داعش و باری نالەباری ئابووریی هەرێم لەبەر کێشەی لەگەڵ بەغدا ئەمڕۆ جۆرێك لە پاکانە بۆ ئەم

دیـارده خەفەتناكـه قەبـول بكرێـت بـەڵام خـۆ پێـش ئـەوەش ئـەو بـێ سـەرو بەرییـە هـەر هەبـووە.

ئایـا كـه پـاره زۆر بـوو نەدەكـرا لـه جیاتـی - یـان كاكـه قەینـاكا لەتـەك - قیتكردنـەوەی هوتێلـه پێنـج ئەسـتیرەكان و چەندەهـا مـۆڵ و باڵاخانـه بیسـت نهۆمییـەكان و گونـده مۆدێرنەكانـی دەورو پشـتی شـارەكان و دوو تێلێكۆمـه زەبەلاحەكـه (كـورەك و ئاسیاسـێل) و پاڵاوگـه خۆكردییـه ژەهرئاوێـژەكان و هاوردەكردنـی ئـەم هەمـوو تاكسـیانه بـێ ئـەوەی حیسـابێک بـۆ هەبوونـی شـەقام و رێ و بانـی كافـی بكـەن و رەحمێكیـش بـه هاوولاتـی دامـاو و ژینگـەش بكـەن، كـه دیـاره ئەمانـه هەمـووی راسـتەوخۆ و بەئاسـانی پـاره دەخەنـه نـاو باخەڵـی خاوەنەكانیانەوە و هەمـوو كـەس دەزانـێ هـی كێـن كـه بـه ئینگلیـزی بەمـه دەڵێـن ( easy money = پـارەی ئاسـان) دەڵێـم نەدەكـرا ئاورێكـی جدیتریـش لـه كەرتـه پێویسـترەكانی ژێرخانـی ئـەم هەرێمـه بدرێتـەوە كـه دروسـتكردنی چەنـد سـایلۆیەكی دیكـه بەشـێكه لـەو ژێرخانـە؟ یـان پەییـن و ئاورشـێن (مـەرەش)، كـه زۆر گرانـن، بـه نرخێكـی هێمایـی یـان زۆر هەرزانتـر بدرابـا بـه جوتیـار! خـۆ پـاره زۆر بـوو و دەڵێـن بودجـەی هەرێـم لـه بودجـەی هەنـدێ ولاتـی دراوسـێ كـه هەرێـم كەلوپـەل و كاڵایـان لـێ دەكـرێ زیاتـره!! راسـته ئـەو پرۆژانـەی كـه لەسـەرەوە باسـم كـردن ئەوانـەش هەمـووی دەكەونـه نـاو خانـەی ژێرخانـی ئابوورییـەوە (كەرتـی بینـا و توریـزم) و پێویسـتن و ناكـرێ نكۆڵیـش بكرێـت كـه هەنـدێ رێوبانـی دووسـایدو تونێلـی پێویسـت كـراون كـه ئەوانـەش بەشـێكی ژێرخانـن بـەڵام كەرتـی كشـتوكاڵ، دەبـێ لەسـەرەوەی پلانـی ئابـوری هـەر ولاتێكـدا بێـت چونكـه مسـۆگەر كردنـی خۆراكـی پێوەیـه (food security). بەداخـەوە كشـتوكاڵ، كـه بـه نەفـت و گازێكـی لـه بـن نەهاتـوو دادەنـدرێ، بـه تـەواوی پشـتگوێ خـراوەو هـەر قسـەی لەسـەردا دەكرێـت بـەڵام كـه چێنـەر دەچێتـه ئۆفیسـێكی كشـتوكاڵ یـان بانكـی كشـتوكاڵ هـەزار لەعنـەت لـه خـۆی و لـەو فەلاحەتییـەی دەكات كـه ساڵەهای سـاڵه خـۆی پێـوه خەریـك كـردووه ئەوەنـده دەردی دەدەنـێ.

ئەمەش زۆر بە ئاشکرا دیارە کە قازانج لە کشتوکاڵ بۆ سەوادی میللەت و هەڵبەت بە ڕێگای ئەوانەوە بۆ ئابووری نەتەوەیی وڵاتە و قازانجیش لەو پرۆژانە و لە هاوردەکردن کە لەسەرەوە باسم کردووە تەنیاو زۆر بە سووک و ئاسانی بۆ "خاوەنە نوێیە کوردەکانی کوردستان" و ئەعوانەکانیانە و مۆڵەتی بازرگانی و هاوردەکردنی شتە "چەورەکان"یش هەر بە خۆیان دەدرێت و بۆ ماوەی بیست، سی ساڵیش قۆرخکراوی خۆیانە.

ناوچەی دزەییاتی ئەگەر هەندێ کارێزی لێرەو لەوێی لێ بترازێ کە بۆ مەرەزە بەکار دەهاتن و چەمی بچووکیشیان ئاو دەدا و ئەمڕۆ ئەو کارێزانە هەر هەموویان کوێر بوونەتەوە، ئەگینا ئەو دەشتە هەر دێمەکار بووە بۆیە بەدەگمەن دارێکی لێ دەڕوا و بۆ مێوەجاتیش ڕەزەوانانی خۆشناوەتی هاوینان و پایزان بە حەچە حەچی کەرێ دەچوونە دەشتی دزەیی و بازرگانیی ترێ و مێووژ و هەنارو هەنجیرو گوێزو مێوەی ترو سماقیشیان بە گەنم و جۆ ئاڵو گۆڕ دەکرد.

کەش و هەوا لەو دەشتە زستانان مام ناوەنجی و جارجاریش زۆر سارد دەبێ، هاوینان زۆر گەرمە بەڵام شەوانی هاوینانی فێنکە. وەرزی باران لە مانگی ئۆکتۆبەر (مانگی 10) ەوە تا مانگی مایس (مانگی 5)ە. دوو چەشنە (با) ش لەو دەشتە هەڵدەکەن: شەماڵ و هوڕە. بای شەماڵ بای ڕۆژئاوایە و چونکە نەرم و لەسەرەخۆیە شەنەبای لەبەر دەکرا، هەرچی هوڕەیە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکات و بە گوڕە ئەمیان کەڵکی شەنەباکردنی لەبەر نەبوو چونکە گەنم یان جۆیەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد.

ئەمن چەند کوپلە شیعرێکم لەسەر ئەو شەنەباکردنەی سەردەمی پێشان نووسیوە کە دەڵێ:

چەند خۆشە ئێستا ڕاکشان
لەژێر کەپری کاکی سەپان
کڵاشت بکەیتە سەرین

ڕووی خۆت بدەیتە سەرجۆخین
شنەی شەماڵ بیزوێنێ
شەنەباکەر شەنەو هووردەی
بە شێنەیی بوەشێنێ
باوکێك جارجار بانگی کوڕ کا
"کورە هۆ هۆ
عەسەن عەسەن!
هەی توخمەسە، ئەو کەرانە
لۆ دەرناکەی، لەسەر ڕەوسەن؟"

## گەردە لوولە

ئەو دەشتە چونکە خاکەکەی زوو وشك دەبوو و وەکو کلیش ورد دەبوو بۆیە هاوینان و پایزان ئەگەر گەردە لوولە هەڵیکردایە هەندێکیان زۆر بەخێرایی ئەوەندە چڕ و پان و بڵند دەبوون کە لە ئاواییان دەدا زۆر لە کەلوپەلی ماڵانیان تێك دەشکاندو لەگەڵ خۆیانیان ڕادەماڵی. ئێمەی منداڵیش دڵمان خۆش دەبوو کە گەردە لوولە لە گوندەکەی بدابایەن و خۆمان دەخستە ناوی هەرچەندە کە سەرو گوێلاك و پشتی ملمان پڕ دەبوو لە دڕکە زەردە. ئەمن حەیرانێکم لەسەر ئەم دیمەنی گەردە لوولەیە داناوە دەڵێ:

* حەیران ئەنگۆ لۆم برێنە گەردەلوولەکی گەلە برند لەگەرم یار بی...

* ئەمن خۆمی لۆ دەکەمە گلۆرە دڕکە زەردەکی پەرێزە جۆیان دەبا سەری خۆیم لۆ نەوی بکا، هەرمگری بمباتە تاقی عاسمانێ بەشکو دەشتەکەی پیرە هەولێر و کەندێناوە و قەراجم لێ دیار بی...

* ئەوجا ئەمن هەینێکە خۆم بە قوربانی ئەوێ گەردەلوولێ دەکەم وەکی بەگەر خۆیم بدا، بمگێڕی بەناو هەموو کۆرانەکانی

ئەو گوندانە، وەرمدا لە خۆرەپۆکی هەوێزی مارە کیژجوانان، بەر کوندەرانی مارەبابی حەیرانێ، ئاخ چبکەم حەیران چەند خۆش دەبوو ئەمن تازە مووم لێ هاتبی، ئەتوش مندار بی...

## حەیران و موزیک

لە بواری هونەری موزیک و گۆرانیش دەشتی دزەیی و ناوچەی گەردیاتی بە ئاوازێکی زۆر دڵڕفێنی کوردی بە ناوبانگن، حەیران. حەیران هەم لەلایەن جوتیار و سەپان و شوان و گاوانیش و هەم لە لایەن کوڕە ئاغایانیشەوە دادەندرا و دەگوترا. ژن و پیاویش حەیرانیان دەگوت. لە حەیرانبێژە ناودارەکانی سەردەمی کۆن ئەمانە ناویان ماوە: زایەر (کوڕە ئاغایەکی بەرەی مام زێندینی دزەیی بوو). خوشکێکی زایەر کە ناوی (خوچێ) بووە، ئەویش حەیرانبێژێکی چاک بووە، جوامێر، هەمینەی مەولود هەولێری، ڕەسوڵ گەردی، جەمیل و حوسێنی عەلی ئاغای دزەیی. مەولود عەدێ . لاوکیش هەرچەندە کە بە شێوەزاری کرمانجییە بەڵام لە ناو دزەییانیش هونەرێکی زۆر خۆشەویستە و دوو لاوکبێژی ناوداری ئەم هونەرە هەبوون، حەمەد ئاغای مەندۆ و عەزیز ئاغا کە هەردوکیان خەڵکی دزەیاتی بوون. لە هونەری موزیکی ئامێریش حەمە سوور و خدری عەولا مەرجانێ هەموو ئامێرە فووکارییەکانیان لێ دەداو شایی و زەماوەندی گەورە گەورەیان گەرم دەکرد. بەند و بەیتیش هونەرێکی باوی ناوچەی دزەیی بوو و جاران شەڕوشۆری نێوان عەشایران یان حەزلێککردنی دوو گراوی کە بە تراژیدی کۆتایی هاتبێ ئەوانەش هەمووی دەبوونە چیرۆک و بابەتی بەیت و لە دیوەخانی ئاغایان تا درەنگانی شەو دەگوتران. حەمەد شابان یەکێک بووە لە بەیتبێژە ناودارەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەناوچەی دزەیی. ڕاستییەکەی لاوک و بەند و بەیت، بۆ سەردەمی خۆی، مێژووی نەنووسراوەی کورد بوون . ئەم

دەشـتە هەروەهـا بەناوبانـگ بـووە بـە بەنـدی فۆلکلـۆری کـە بـە بۆنـەی دروێنـە و سـاوەرکوتانەوە و شـایی و زۆر بۆنـەی تـر دەگوتـران.

پایـزان کـە دەغلـودان دەدرواوە (هەڵبـەت هەنگـی دروێنـەی ئـەو دەشـتە هـەر بـە داس دەکـرا ) بـە هـەزاران هـەزار قەتـێ کـە پێـم وایـە لـە عەرەبسـتانەوە دەهاتـن و ئەوەنـدە زۆر بـوون سـێبەریان دەخسـتە سـەر زەوی، لەپرێـکا هەموویـان پێکـەوە دەنیشـتن و بـە دوای دەنکـە گەنـم و جـۆی لەپـاش درۆینەکـردن لێـرەو لـەوێ کەوتـوودا دەگـەڕان و هێلانەشـیان هـەر لەنـاو پەرێـزان دەکـرد. لێـرەش دیسـان دەبـوو بـە جەژنـی منـداڵان چونکـە فاقـە و داومـان بـۆ دادەنانـەوە و دەمانگرتـن. کـە پایـز بەسـەر دەچـوو ئیتـر ئـەو قەتێیانـە باریـان دەکـرد دەگەڕانـەوە بـۆ وڵاتـی خۆیـان تـا پایزێکـی دیکـە دیسـان پەیـا دەبوونـەوە..

تێ بینییەکی زمانەوانی:

بـای (هـوڕە) کـە لـە سـەرەوە باسـم کـرد، لـە ئەمەریـکاش شـتێکی وەک ئـەوە هەیـە و پێـی دەڵێـن (هوڕیـکان) و لەوێـش ڕەشـەبایەکی زۆر بـە گـوڕە بـەڵام لـە ئەمەریـکا لەنـاو دەریـاو ئۆکیانۆسـدا هەڵـدەکا.

مومتاز حەیدەری

ڕاوچی بەناوبانگی چیای قەرەچوغ حەوێزی جوکل ئاغا لەگەڵ هۆمەر دزەیی

وریای حەوێزی جوکل ئاغا لەگەڵ هۆمەر دزەیی لە دارە بزمارە

گۆڕستانی حوسێنی غازی له دووره‌وه‌ش گومه‌تی قه‌بری برایم ئاغا دیاره

داره بزماره‌که‌ی ڤیه‌ننا (شتۆک ئێم ئایزن)

داره بزماره‌ی قه‌رمچوغ

ئاغای حاجی جوکل ئاغای دزەیی 1907-1992

قەرەچوغ

گوندی کۆزە پانکە

گۆڕی مام ڕەحمان لە گۆڕستانی شێخ سمایل لە کەندێناوە

ڕیزی لۆرییان لە ڕێی مەخموور

بازاڕگە

زوورگەزراو

گردە بڕاوەکەی ساراوە

گردی خەجیلە بڕاوەکەی دووگردکان

گردی قوشاغلوو، گۆڕستانی ئەحمەد پاشا

گردی باقرتە

التاريخ

| التسلسل | المسألة والحل | السويد |
| --- | --- | --- |
| | ناسینی دزەیی | |
| | بوماخوی خالد بیناو | |
| | میژووی دزەییان لە سەرەتای سالی ١٦١٣ ی م | |
| | تا سالی ١٩٤٥ بەکوردی نوسراوەوە لەبابت ناسینیان | |
| | سالی هجری ١٣٦٤ | |
| | سالی میلادی ١٩٤٥ | |
| | لە ٦ ی مانگی حزیران ١٩٤٥ تەواوبو . | |

دەستنووسەکەی مەلا خالید

# بەشی 2

## دزەییەکان کەی و چۆن کەوتنە ئەو دەشتە

«... لەوانەیە هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆمان بڵێن: بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە بابەتە مێژووییانە، گیانی عەشیرەتگەری لەناو کورددا دەژیێنێتەوە و، مێژووی نەتەوەکەمان دەکات بە مێژووی خێڵ و هۆز و سەرەك عەشیرەتان! بەڵام لە بەرپەرچدانەوەی ئەم جۆرە ڕا و بۆچوونانەدا دەڵێم: مێژووی نەتەوە بریتییە لە هەموو ڕووداو و جووڵانەوەیەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی هەموو هۆز و چین و دەستەیەکی ئەو نەتەوەیە و هەرچەندە ئێمە بە جودا ئەو ڕووداوانە وەرگرین و لێیان بکۆڵینەوە، دەبینین هۆ و ئەنجامیان هەر تێکەڵاو بە مێژووی گشتیی نەتەوە دەبنەوە و، لێدوان لە مێژووی ئەردەڵان یان بابان یاخود سۆران، کە دزەیی لقێکن لەوان، وەکو لێدوانە لە مێژووی بادینان یا بۆتان یاخود هەکاری و ئەنجامی پوختەکردنی مێژووی ئەو میرنشینییانەی کورد، مێژووی سەردەمێکی دیاریکراوی نەتەوەکەمان پێکەوە دەنێن.»

**کەریم مستەفا شارەزا 2015 - 1928**

لەپاش کورتە نمایشکردنێکی جۆگرافی و تۆپۆگرافیی دەشتی دزەیی، ئینجا با بێمە سەر مێژوو. هەر کەسێکیش لەم بوارە بەدوای پتر وردەکاریدا بگەڕێ، دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆکومێنتانەی کە من وەك سەرچاوە بەکارم هێناون.

ئەم دزەییانەی کە ئێستا لە دەشتی دزەیی باشووری هەولێردا نیشتەجێن، ئەمانە خێڵ نین، بەڵکو بنەماڵەیەکن کە 400 ساڵێك بەر

لـە ئیمـڕۆ لـە شـوێنێکی تـری کوردسـتانەوە هاتوونەتـە دەشـتی هەولێـر و خۆیـان لـەوێ داچەسپاندووە و لـك و پۆپێکـی زۆریـان لـێ بووەتـەوە کـە وەك خێڵیـان لـێ هاتـووە (بڕوانـە لاپـەڕە 20 لـە کتێبـی W.R.Hay,Two Years in Kurdistan). بـێ گومـان بـەر لـە کۆچکردنیـان بۆ ئـەم هەوارە تازەیەیـان، خـۆ دەبـێ سـەر بـە خێڵێکـی کـورد بووبـن، چـون.- تەبـای هەمـوو کۆمەڵگایەکـی دیکـەی جیهـان _ کۆمەڵـگای کوردەواریـش لـە سـەردەمانی کۆنـدا بریتـی بـووە لـە خێڵـی جیاجیـا، چ کۆچـەر و ڕەوەنـد، چ نیشــتەجێی ئاوایــان. ئەمانــەی خــوارەوە هەندێــك لــەو بۆچوونانــەن لەبـارەی بنەچـە و ڕەچەڵـەك.و هـەواری دێرینـی ئێمـەی دزەیـی ئەمـڕۆی دەشـتەکەی پیـرە هەولێـرێ.

مێژووناسـی عیراقـی عبـاس العـزاوی لـە کتێبـی (عەشـایرێ عیـراق 2 - کوردییـەکان، چاپخانـەی المعـارف، بغـداد 1947) دەڵـێ " ڕاسـتییەکەی ئەمەیـان میرنشـینە و بـە دیزەیـی بەلێـو دەکرێـت و لـە مێـژوودا بـە(دزدی) ناســراو بــووە و گۆیــا لــە بنەڕەتــدا دزدتــەی بــووە و ناوەکــە لــەوەوە گۆڕانکاریــی بەســەردا هاتــووە. بــەڵام ئەمــە ڕاســت نیــە و قســەکە بایەخێکـی وای نیـە. دیزەیـی یەکێکـە لـە میرنشـینە گرنگەکانـی دەڤـەری هەولێـر و بـە ڕچەڵـەك لـە گونـدی (دزە)، یـان لـە ناوچەیەکـی هـەر بـەم نـاوە لـە ئێرانـەوە هاتـوون. خۆیـان ڕەشماڵنشـین بوویـن و پایـە و پلەیـان لـە زەمانـی تقـی الدیـن پاشـا پـەرەی سـەندووە و سـەرۆکەکەیان تایتلـی پاشـای پـێ دراوە. کـە هاتـن هەواریـان لـە گونـدی (گردمـەلا)ی سـەر بـە ناحیـەی (قـوش تەپـە) لـێ داکوتـا و دواتـر بـڵاو بوونـەوە بـۆ نـاو خـودی قـوش تەپـە و لەوێـش نیشـتەجێ بـوون. ئەمانـە لـە کوێسـتانان هاتبـوون و سـەرۆکەکانیان لـە خێڵـی (قەرەنـی ئاغـا) بـوون. ئـا لەوێـوە ئیتـر ئیمارەتێکیـان لـێ دامـەزرا کـە پایەیەکـی ناسـراویان لەنـاو ئیمارەتەکانـی هەولێـردا پەیـدا کـرد. ئـەو خێڵـە زۆرانـەی کـە سـەر بەوانـن کاری کشـتوکاڵ و بەخێوکردنـی ئـاژەڵ دەکـەن. زمانەکـەی ئەمانـە سـۆرانیە کـە هەنـدێ جیاوازیـی هەیـە لەگـەڵ زمانـی سـلەیمانی. ئـەم خێڵـە کـە لەنێـوان هـەردوو زابـدا نیشـتەجێن ناوێکـی گەورەیـان بـۆ خۆیـان پەیـدا کـرد"

## مێژووی دزەییان لە نووسینی مەلا خالیدی مورتکە

مێژونووسی بنەماڵەی دزەییان جەنابی مەلا خالیدی شێخ مەمونـد کـە لـە گونـدی مورتکـەی عەلیاغـای مەحمـودی کاکەخانـی دزەیـی دادەنیشـت، دەسنوسێکی لەپاش بەجێ ماوە بـە تایتلی (ناسینی دزەیی) کـە لـە سـاڵی 1945 لەژێـر نازنـاوی (خالیـد بێنـاو)دا نووسـیویەتی، بـەڵام خـۆی لەنـاو خەڵکـدا هـەر بـە مـەلا خالیـدی مورتکـە دەناسـرا.

ئـەم دەسنوسـە مێژووییـە بایەخـدارە تـا هەشـتاکانی سـەدەی بیسـت کـەس پێـی نەزانیبـوو. خۆشـبەختانە لەپـاش ئـەو هەمـوو سـاڵە کوڕەلاوێکی پەرۆشـی مێـژوو (عبداللـەی کـوڕی حاجـی کاکەحمـەدی دارەتـووی دزەیـی) دۆزییـەوە و لـە ونبوونـی ڕزگار کـرد. نـەك هـەر ئەندامانـی بنەماڵەی دزەیی، بەڵکـو تـەواوی مێژونووسـانی کـورد و کـورد بەگشتی، دەبێ منەتبـاری جەنابـی مـەلا خالیـد بـن کـە سـەربردەی هەرێمێکـی کوردسـتان و دانیشـتوانەکەی بـەم وردەکارییـەوە تۆمـار کـردووە. مـەلا خالیـد نـەك هـەر زانایەکـی ئایینیـی زۆر شـارەزا بـووە، بەڵکـو نیشـتمان و کوردپەروەرێکـی زۆر چالاکیـش بـووە و دڵـی زۆر بـەوە خـۆش بـووە کە عەلـی ئاغـای مەحمـودی کاکەخانـی دزەیـی خاوەنـی گونـدی مورتکـە دەسـتی لەگـەڵ شۆڕشـی شـێخ مەحمـودی حەفیـدا تێکـەڵ کردبـوو و پێشـمەرگایەتیی ئـەو سـەردەمەی دەکـرد. مـەلا خالیـد بـۆ سـەردەمی خـۆی، تەبـای زۆرترایەتیـی ڕۆشـەنبیرانی ئـەو زەمانـە، بـە چەپڕەویـش دادەنـدرا و بـۆ 70 سـاڵ لەمەوپێـش کوردییەکـی زۆر جـوان و پاراویشـی نووسـیوە و وشـەی زۆر پەتیـی بـەکار هێنـاوە. ئەمـن جەنابـی مـەلا خالیـدم هـەر لـە سـاڵانی چلەکانـەوە زۆر چـاک لەبیـرە و لـە هەنـدێ دانیشـتنی ئاغـاکان و نیشـتمان پەروەرانـی ئـەو سـەردەمە گوێـم لـە قسەکانیشـی ڕاگرتـووە، پیاوێکـی بەتەمـەن جوامێـری کـەوا و سـەڵتە لەبـەری قسـە نەرمـی ئێسـک سـووک بـوو.

مەلا خالید لە لاپەڕە 9ی دەسنووسەکەیدا دەڵێ: «خان ئاودەل لە دوای شەهیدی مستەفا بەگی بووە میری سۆران. پیاوێکی گەلێك بەدین و میللەت پەروەر بوو. زۆر حەزی لە خێر و چاکە ئەکرد، دائیم بۆ پێشکەوتنی میللەتی سەعی ئەکرد. وە چەند عولەمای موچەخۆری هەبوو. کوڕەکی بوو ناوی لێنا میر مستەفا، بەناوی مستەفا بەگی سۆران کرد. لە ساڵی 1069ی هیجری وەفاتی کرد."

جا بەپێی مەلا خالید، کە درەختی بنەماڵەی دزەییانی زۆر بەوردی داناوە، ئەم خان ئاودەلەی میری سۆران کە 400 ساڵێک بەر لە ئیمڕۆ ژیاوە، دەبێ باپیرە هەرە گەورەی دزەییەکانی ئەمڕۆ بێت.

هەر لەگەڵ دۆزینەوەی دەسنووسەکە، مێژوونووس و نووسەر و توێژەری کورد کەریم شارەزا (یادی بەخێر) دەستوبرد قوازتییەوە و لە گەردی مێژووی داتەکاند، لە کۆڤاری کاروانەدا بڵاوی کردەوە و تێبینیی خۆیشی لەسەر دا. (کۆڤاری کاروان، ژمارە 67 ئابی ساڵی 1988).

ئەمەی خوارەوەش بەرگی کاغەزینی دەسنووسەکەیە و ڕزگاری ئەحمەدی حەمەدەمیناغای دزەییش کە برازای منە و زۆر بەوردی لە درەختی بنەماڵەی دزەیی کۆڵیوەتەوە، ئەویش هەر ئەم دەسنوسەی جەنابی مەلا خالیدی کردووەتە سەرچاوەی سەرەکی.

ئەو دەشتەی هەولێری پێش هاتن و پاش هاتنی دزەییەکانیش ژمارەیەکی زۆر لە عەشرەتی دیکەی کوردی لێ بووە و تێ کەوتووە. ئەوەی کە من لەبیرم مابن هەندێکیان ئەمانەن و بۆ پتر زانیاریش هانام وەبەر کتێبەکەی (عباس العزاوي) بردووە: سیان، مامە سێنی، شێخ بزێنی (ئەم سیانە خێڵی گەورەن و ئاغای خۆیان هەیە)، پاڵانی، ئۆرمزیار، کەلوڕ (کەلهوڕ)، لەك، کارەش، نانەکەلی، گۆران، کورد، بامەند، گەلاڵی، شوان، شێخ مەموند، ئاری کوتکی، فەقێ ملکی، زەیدبەگی، بلباس، پێوە، سنجاوی، ڕۆژبەیانی، ئۆمەربل، سوورچی، گردوان، بندیان، پیرەبابی، سارمەم، مەرزان، مەمان، مەموند... زۆری

تریش کە ڕەنگە هەر چەند خێزانێکی کەم بن و ناویان لە هیچ تۆمارێکدا نەهاتووە. لە لاپەڕە 150ش عباس العزاوی لەژێر سەرناوی (قبائل دزەیی) دا ئەمە دەڵێ " سەرۆکایەتیی گشتی یان سەرۆکەکانی ئیمارەتی دزەیی ئەو خێڵانەی بەیەکەوە ناوە و ئەمانەش بەناوبانگترینی ئەو خێڵانەن:ـ" جا ألعزاوی لێرەدا ناوی ژمارەیەکی زۆری ئەم خێڵە (نا -دزەییانە)ی ڕیز کردووە و لە هەندێکیاندا ناوی سەرۆکەکانیشیانی داناوە.

عباس العزاوی لە دامەنی لاپەڕە 152ی کتێبەکەیدا دەڵێ " ئیتر بەم لیستەیە دەردەکەوێ ئەو خێڵانە چۆن تێکەڵ بە یەکتری بووین و هەموویان یان زۆرترایەتییان هیچ پەیوەندییەکیان بە دزەییەکانەوە نییە، بەڵام ئەو خیلانە زۆر لەمێژە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بووین و میرە دزەییەکانیش سەرۆکایەتیی گشتیانیان کردوون... ئەمانە تێکەڵەیەکن لە زۆر خێڵی جیا جیا ...."

لێرەدا بە هەلی دەبینم لە ناوەندی مێژووەوە کەمێك ڕووەو پەڕگەکەی لابدەم و سەرنجی خوێنەر بۆ چەند تێ بینییەکی زمانەوانیی هەر پەیوەندیدار بە بابەتەکەوە، ڕابکێشم. پێشم وایە ئەگەر خوێنەری بەڕێز چاوێک بە لاپەڕەکانی پێشتری ئەم بیرەوەرییانەدا بخشێنێتەوە، ئینجا بێتەوە ئێرە بخوێنێتەوە، ڕەنگە هەنگی زنجیرەی بابەتەکەی باشتر پێ پێک بلکێندرێ و باشتر لەم تێ بینییە بگات.

یەکەم: ئەم خێڵانەی کە هەر ئێستا باسم کردن، بە پێچەوانەی دزەییەکان، هەم سەوادی خەڵکەکەیان کە لە هەولێر و لە موکریان پێیان دەڵێن کرمانج و لە هەندێ ناوچەی دیکەی کوردستانیش پێیان دەڵێن (مسکێن، ڕعیە)، هەم برا گەورەکانیشیان پاشماوەی هەر هەمان باب و باپیرانی لەمێژینی خۆیانن، واتا خزمی یەکترن، بەڵام هەندێکیان خواپێداوتر، بۆیە دەسڕۆیشتووتر بووین لەوانی تریان. جا زۆرێک لەو خێڵانە بەو چینە گەورەپیاوانەی خۆیان دەڵێن کێخوا، هەندێکیشیان

ئاغایان پێ دەڵێن وەک سیان و مامە سێنی و شێخ بزێنی. ڕاستییەکەشی ئەم وشەی کێخوا کە تایتڵێکی خانەدانی بووە لە کوردەواریدا هەر ئەوە کوردییەکی ڕەسەنە و ئەوانی دی (ئاغا، بەگ، میر، پاشا، خان) ئەمانە گشتی - میری لێ بترازێ کە کوردی و فارسی یە - تایتلی خانەدانی یان تورکی عوسمانی، یان مەغۆلی بووین، کە سوڵتانەکانی عوسمانی و شایەکانی ئێرانێ بە سەرەك عەشیرە گەورەکانی کوردیان دەبەخشی، کەچی سەرۆکی خێڵە کوردە بچووکترەکان کە دیارە بایەخی ئەوتۆیان نەبووە بۆ بەرژەوەندیی سەربازیی سوڵتان و شایەکان، ئەمانە ئەو تایتلە گۆیا « ئەریستۆکرات »ەیان پێ نەدەبەخشرا و هەر بە تایتلە کوردییە خۆماڵییەکەی خۆیان (کێخوا) دەمانەوە.

لێرەدا ڕەنگە جێی خۆی بێ چەند دێڕێك لە کتێبەکەی حەننا بطاطو بخەمە ڕوو کە ئەو بە زمانی ئینگلیزی نووسیویە و عفیف الرزاز کردوویە بە عەرەبی بەناوی (عێراق، چینە کۆمەڵایەتییەکان و بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە تا دامەزراندنی کۆمار) کە لە لاپەڕە 98دا دەڵێ "لە کوردستانیش، خێڵە کۆچەرییەکان دەبوونە خاوەنی ئەو لەوەڕگا و پاوانانەی کە زووتر لەوانی تر بۆ خۆیانیان گر دابوو و دەستیان بەسەردا گرتبوو. هەرچی زەوی و زاری گوندەکانە، ئەوانە یان لەبن دەستی ئاغا خێڵەکیەکاندا بوون کە خۆیان گەورەی خۆیان بوون، یانیش — بە تیئۆری - هەتا هەتایە لەبن دەستی بنەماڵە کوردییەکاندا بوون و... ئەو خاوەندارییەش بەو مەرجە بووە - دیسان هەر بە تیئۆری - کە ئەو بنەماڵانە هەر کاتێکی داوایان لێ کرا، دەبێ ژمارەیەك لە پیاوەکانی خۆیان بۆ کاری سەربازی بۆ عوسمانییەکان یان بۆ پاشا مەملوکەکان بنێرن"

ئەم قسانەی حەننا بطاطو، پەیوەندیی نێوان تورکە عوسمانییەکان لە لایەك و ئاغا و بەگ و میرە کوردەکان و سەرەك خێڵە کوردە بچووکەکانیش لە لایەکی ترەوە وەك بەرژەوەندییەکی سەر بە سەرمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

پنتکی دووەمی زمانەوانی کە دەمەوێ هەڵوەستەیەکی لەسەردا بکەم، خودی وشەی (کێخوا)یە لە ڕووی ئێتیمۆلۆژییەوە etymologically.

وشەی کێخوا وشەیەکی کوردی و فارسییە بە فارسی پێی دەڵێن (کتخدا). وشەکە لە هەردوو زمانیشدا وشەیەکی تێکهەڵکێشراوە (کێ خوا) بە کوردی و (کت خودا)ش بە فارسی. لە زمانی کوردیی کۆندا (کێ، کەی، کا) واتا ماڵ وەك کە دەگوترێ ئەم کۆترە کەیی بووە (هەندێك دەڵێن کەوی بووە) واتا ماڵی بووە، یان وشەی (کابان) ی کوردی و (کیبانو)ی فارسی کە ئەمەش هەر تێکهەڵکێشراوە و لە هەردوو زماندا واتای (خانمی ماڵ) یان (خاوەنی ماڵ) دەگەیەنێ. وشەی دووەمیش (خوا) ئەمەیشیان لە (خودا، خودان، خوتان) ەوە وای لێ هاتووە کە واتاکەشی دەکاتە (خاوەن) و تا ئێستاش بە شێوەزاری کرمانجی هەر ئەوە بەکار دێت و لە سەردەمی ساسانییەکانیش (خوتان) بەکار دەهات کە بە عەرەبیش پێی دەڵێن (رب) وەک کە دەڵێن (رب البیت). جا وشە تێکهەڵکێشراوەکە بە کوردی و فارسی دەبێتە (خاوەن.ماڵ) بە عەرەبی (رب البیت) بە ئینگلیزیش (لاند لۆرد Land Lord) کە لەهەموو ئەو زمانانەشدا هاو - واتان.

سێیەم پنتکی زمانەوانی خودی وشەی (پنتك) خۆیەتی.

ئەمن هەتا منداڵ و نەزان و نەخوێندەوار بووم، هەر وشەی (پنتك) یان (پنت)م بۆ (نوقتە)ی عەرەبی لە گوندیەکانی ئەو دەشتی هەولێرە دەبیست. کەس گوێی نە لە (نوقتە)ی عەرەبی نە لە (خاڵ)ی بەم دوایيانە بۆ نوقتەی عەرەبی دروستکراوی کوردی بووبو. خاڵ بۆ مەبەستێکی دیکە بەکار دەهات و ئێستاش بەکار دێ. گوندییەکان بۆ نموونە دەیانگوت "ئەم شاڵە یان ئەم کوتاڵە پنتك پنتکە" (بە عەرەبی: مونەقەتە) . یان دەیانگوت " ئەوەندە بچووکە هەر هێندەی پنتکێکە " جا ئەوەی کە لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە لادێیە کوردەکانی خۆمان وشەیەکی هیندۆ -ئەورووپایی

زۆر ڕەسەنیان بەکار دەهێنا، چونکە لە زۆرترایەتیی زمانە هیندۆ -ئەوروپاییەکاندا هەر وشەیەکی لەو ( پنتکە) یان (پنت)ە کوردییەوە نزیك بەکار دێتن. بە ئینگلیزی (پۆینت point)، بە فرانسی (پوان point) بە ئاڵمانی (پونکت punkt)، بە زمانە لاتینەکان -ڕۆمانەکان (پونتۆ punto) . جا کە من وشەیەکی هیندۆ -ئەورووپیی ڕەسەنم هەبێت و لە لادێی کوردەواییکەی خۆشمان بەکار هاتبێت، بۆچی بە گوێی مامۆستای "زمانەوان" یان "ڕۆشەنبیرێك"ی کوردی بێ ئاگا بکەم کە ئەم وشەی (خاڵ)ەی بەم دواییانە بۆ نوقتەی عەرەبی داناوە؟ ئەم کەمزانییە زمانەوانییە تەنانەت گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کە لادێییە نەخوێندەوارەکەی خۆشمان، ئەویش پێی شەرم بێ وشە کوردییە ڕەسەنەکە بەکار بێنێ نەوەکوونێ "ڕۆشەنبیرە شارستانییەکان" بە جاهیل و نەزانی بزانن. بەداخەوە هەندێ لە زمانەوانەکانی پێشوومان یان بەدەر لە عەرەبی هیچ زمانێکی دیکەی بیانییان نەزانیوە، یان خۆیان ئەوەندە ماندوو نەدەکرد بزانن لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان چی بۆ (نوقتە)ی عەرەبی و زۆر شتی دیکەش بەکار دێت و هەڵساون ئەم (خاڵ)ەیان داناوە، کە من پڕ بە بەشی خۆم قەبووڵم نییە بۆ ئەم مەبەستە بەکار ببردرێت و هەرگیزیش بەکاری نایەنم.

ئەمن تێ بینیم لەسەر وشەی (وشە) و وشەی (زۆرینە)ش هەیە کە خۆم بۆ ئەمەی دوایان وشەی (زۆرترایەتی) بەکار دێنم و بەڵگەشم بە دەستەوەیە بۆچی ئەوە بەکار دێنم، بەڵام جارێ نامەوێ پتر لە بابەتەکە لابدەم و زنجیرەی وردبوونەوەی خوێنەر بپچڕێنم، جا با ڕوو بکەینەوە بابەتەکەی خۆمان، دزەییەکان.

لە مێژووی کۆندا، مێژووی هەر میللەتێکی جیهان، دەوڵەت و میرنشین و ئیمپراتۆراتی، هەر بەناوی ئەو کەسە دەکرا کە خۆی دایمەزراندووە و هەر خۆیشی خاوەن و حاکمی موتڵەق بووە لەوێ و لەپاش خۆیشی کوڕەکانی یان بە ناوی بنەماڵە خانەدانە دامەزرێنەکەوە دەکرا. ئەوسا کەس باسی لایەنە نەتەوەییەکەی ئەو

دەوڵەتەی نەدەکرد و وەك ئەمڕۆ ناوی قەوم و نەتەوە نەدەخرانە پاڵ دەوڵەت و ئیمارات بەڵکو دەگوترا دەوڵەتی عوسمانی، دەوڵەتی عەباسی، دەوڵەتی ئەمەوی، دەوڵەتی ئەیوبی و لە ئەورووپاش هەر وا بووە: بنەماڵەی بوربۆن و رۆمانۆف و هەپسبورگ و هۆهنچۆلەرن و ساڤۆی و ئی تریش. لە کوردەواریشدا میرنشینەکان هەر ناویان سۆران و بادینان و ئەردەڵان و بابان و بەدرخان و ئی تریش بووە و هەندێ هەرێمیش هەر ناوی ئەو خێڵەی وەردەگرت کە ئەو لەوێ بە ژمار زۆرترایەتی یان دەسەڵاتدار سەرەکی بووە، وەك خۆشناوەتی، جافاتی، گەردیاتی، دزەییاتی، باڵەکایەتی و ئی تریش.

جا وەک دەبینی، هیچ یەکێک لەم ولاتانە یان هەرێمە نیمچە سەربەخۆیانە، ناوی میللەتەکەی خۆی (وەک نەتەوە و نەژاد) پێوە نییە، یان بە ناوی سەرۆکەکەیە یان بنەماڵەکەی یانیش خێڵەکە.

جا هەر بەم پێوەرە، ئەم دەشتی هەولێرەش کە کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەم بنەماڵە بەهێزە تازە هاتووە، زۆر زوو ناوی بوو بە دەشتی دزەیی یانیش هەر دزەییاتی. ئەو خێڵە نا -دزەییانەی کە پێش دزەییەکان لەوێ بووین و ئەوانەی کە لەپاش ئەوانیش دەهاتن لەبۆ بەرژەوەندیی خۆیان کە لە گێچەڵ و شەڕ پێفرۆشتنی عەشایرە عەرەبە دراوسێکانیان بیانپارێزن، ئەو دەشتەیان بەو ناوە پێ بە ڕەوا دەدی و سەفەری هەر شوێنێکی دیکەی کوردستان یان عیراقی عەرەبیشیان بکردایە، هەر بەشانازییەوە دەیانگوت: ئێمە خەڵکی دزەییاتین یان هی دەشتی دزەیین کە خۆیشیان هیچ پەیوەندییەکی خوێنیان بە بنەماڵەی دزەییانەوە نەبووە.

ئەم قسانە بە بۆچوونی (عباس العزاوی)ش زۆر بەڕوونی پشتراست دەکرێتەوە کە لە لاپەڕە 145ی کتێبی ناوبراویدا دەڵێ " خۆی عەشیرەتی تەی هەر ئەو لە لیوای هەولێر دەسڕۆیشتوو بووە، بەلام هێزی ئەم میرنشینە پاش ئەوەی کە چەندین خێڵی دیکەش ڕەگەڵی کەوتن، تەنگی بە عەشیرەتی تەی هەڵچنی و لەوێی هەڵتەکاند و

دەستی بەسەر هەوارەکانیدا گرت، لەپاشان بەردەوام لە بەهێزبووندا بوو، تا وای لێهات ئەمڕۆ بووەتە یەکێك لە گەورەترین و بەتواناترین خێڵی لیواکە.."

بەڵام پێموایە کە ئەم دەشتە لە بەڵگە و دۆکومێنتی دیوانی (رەسمی) ی دەوڵەتی عیراقیدا کە بریتانیا دواتر دایمەزراند و بە زمانی عەرەبی بوو، دەبێ هەر (سهل اربیل = دەشتی هەولێر)ی بۆ بەکار هاتبێ، واتا ناوە دزەییەکە تەنیا هەر لەناو خەڵکدا بووە نەك دیوانی . لێرەدا تێبینی یەکی زمانەوانی: ئەمن وشەی دیوانی کە لە دیوان وەرگیراوە بۆ وشەی ڕەسمیی عەرەبی بەکار دێنم، نەک وشەی فەرمی کە لە فەرمان وەرگیراوە. دواتر کە کڕی هات بە وردەکاریی باس لەم بابەتە و هۆی ئەم بۆچوونەم دەکەم.

هەرچۆنێکی بێت، لەپاش کودەتا سەربازییەکەی چواردەی تیرمەهی ساڵی 1958 لە بەغدا کە یەکسەر گۆڕا بە شۆڕشێکی گەلی، قانوونی چاکسازیی کشتوکاڵ، زەوی و زارێکی زۆری لە هەموو خاوەن موڵکە عەرەب و کوردەکان سەند و بەسەر جوتیارەکانیدا دابەش کرد.

هەر پێش 1958یش پەیوەندی و پێکەوەژیانی ئاشتییانە لەمێژینەکەی ئاغاکانی دزەیی و ئەو عەشیرەتانەی کە لەژێر سایە و دەسەڵاتی ئەواندا بوون (کە زیاتر بە کرمانج ناو دەبردران) بە هەردوو لایەنە ئەرێتی و نەرێتییەکەیەوە، تا ڕادەیەک لێک ترازابوو و تێک چووبوو. هەر لەپاش دووەم جەنگی جیهان و سەرکەوتنی بەرەی سۆسیالیزم بیر و باوەڕی مارکسیزم و کۆمۆنیزم و بزووتنەوەی چەپڕەوی بەگشتی، سەرانسەری کۆمەڵگاکانی ئاسیا و ئافریکا و ئەمەریکای لاتینی تەنیبۆوە. ئەم دیاردەیەش بە ڕێگای چینی ڕۆشەنبیری ئەو وڵاتانەوە ئەنجام دەدرا، چون هەر ئەوان خوێندەوار بوون و هەر ئەوان لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەم بیر و ئایدیۆلۆژییەی سۆسیالیزم و یەکسانیدا بوون. سەوادی میللەتەکە کە نەخوێندەوار و کەمزان بوون، شتی وایان نەدەزانی.

لە ناوچەی دزەییاتیش هەر وەها. ژمارەیەکی زۆر لە خودی کوڕە ئاغاکان خۆیان و هەندێ مەلای لیبراڵی گوندەکانیش، کە هەر ئەوان خوێندەوار بوون و هەر ئەوان بە ڕۆشەنبیری ئەو سەردەمە دادەندران، دەستیان کرد بە ڕێکخستنی جووتیارانی گوندەکان لەناو پارتی کۆمونیستی عیراقی و پارتییە چەپڕەوە کوردییەکاندا و کار گەیشتە ئەوەی کە لە ساڵی 1953دا بزووتنەوەیەکی جووتیارانی دزەیی لە دژی دەسەڵاتی ئاغاکانیان ڕووی دا، بەڵام تەنیا چەند مانگێکی خایاند و حکوومەتی عیراق کەوتە ناو و سەرهەڵدانەکە دامرکێندرایەوە.

بەرامبەر بەم دۆخە تازەیە و گۆڕانی ڕێژیمی عیراقیش ساڵی 1958 لە بەغدا، ئاغا دزەییەکان ناچار گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە شاری هەولێر.

ئەمڕۆ لەپاش تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە و نەمانی دەسەڵاتی چینە ئەریستۆکراتە خاوەن زەوی و زارە زۆر و زەوەندەکەی ئاغاکانی دزەیی و کۆتایی هێنان بە دەسەڵات و پێکەوەژیانیان لەگەڵ کرمانجەکانیان (مسکێنەکانیان)، ئەگەر پیرەکانی لێ بترازێ، ئەگینا گەنجەکانی ئەو دەشتە لەوانەیە هەر ناوی ئاغاکانی دزەییشیان نەبیستبێت و دەشتەکە بەزۆری ناوی بووەتە -یان بووەتەوە - دەشتی هەولێر.

جا دزەییەکانی ئەمڕۆی هەولێر، چ لە شار و چ لە دەشتەکەدا مابن، تیرە و بەرەبابی زۆریان لێ کەوتۆتەوە و هەر هەموویان نەوەی ئەو خان ئاودەڵەی میری سۆرانن کە لەم دوو درەختەی بنەماڵەکەیان دەردەکەوێ. یەکێك لەو درەختانە بەپێی دەسنووسەکەی مەلا خالیدی مورتکەیە کە کەریم شارەزا و ڕزگاری ئەحمەدی حەمەدەمینی دزەیی برازام بە جیاجیا لەسەریان نووسیوە و ئەمەیان لە میری سۆرانەوە - پێش هاتنیان بۆ دەشتی هەولێر - دەست پێ دەکات. ئەوی تریان لە کاتی خۆی ئینگلیزەکانی سەردەمی یەکەم جەنگی جیهان کە لە کوردستان بووین دایان ناوە و ئەوەی ئەوان ئەوەندە دوور ناگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ میرنشینی سۆران، بەڵکو لە یەکەم میری ئەم بنەماڵەیە

(قەرەنـی ئاغـا) کـە هاتـە دەشـتی هەولێـر و لەوێـدا میرنشـینێکی نوێـی دامەزرانـد، ئا لەوێوە دێتـە خـوارەوە. جا ئەمرۆ ئەم دزەییانـە بـە هەمـوو تیـرە و بەرەبابەکانیانـەوە، زیاتـر خۆیـان بـە (وجاغـی قەرەنیاغـا) دەناسـێنن و ئەوەنـدە دوورتـر نـاڕۆن بـۆ لای خـان ئاودەلـی میـری سـۆران و زۆریشـیان ئـەو ناوەیـان هـەر نەشبیسـتووە. شـایانی ئامـاژە پێدانـە کـە مـەلا خالیـد لـە دەسنووسـەکەیدا دەڵـێ دزەییـەکان هەتـا نەهاتبوونـە دەشـتی هەولێـر، هـەر بـە تایتلـی میـر ناسـراو بـوون بـەڵام لەپـاش هاتنیـان بـۆ هـەواری تازەیـان، ئیتـر پتـر بـە ئاغـا ناوبانگیـان دەرکـرد. وەک پێشـتریش باسـم کـردووە وشـەی میـر کـوردی و فارسـی یـە کـە لـە ( مهـر)ەوە هاتـووە و ئاغـاش تورکـی یـە.

ئەگـەر پەڕەکانـی مێـژووی کۆنـی میللەتانـی دونیـا ئەمدیـو ئەودیـو بکەیـت، دەبینـی کـە زۆرێـک لـە پادشـا و خەلیفـە و سـوڵتان و کایـزەر و میـر و مارکیـزەکان، هەمیشـە لـە شـەڕی دەرودراوسـێی خۆیـان و ناوچـە و هەرێمـی فیئۆداڵـی دووری وڵاتـی خۆیشـیاندا بوویـن، چ لەپێنـاو بڵاوکردنـەوەی ئاییـن، چ بـۆ پەلهاوێشـتن و فرەوانترکردنـی مەملەکەتـی خۆیـان و دەسـت بەسـەرداگرتنی خێروبێـری ئـەو هەرێمانە. لەو سـەردەمەی کـە ئەورووپـا بـە سـەردەمی (سـیتی سـتەیت city state) واتـا (دەوڵەتـی شـار) دەناسـرا، هـەر بنەماڵەیەکـی خانەدانـی دەسترۆیشـتوو، فەرمانڕەوایـی ناوچەیەکـی بچـووک یـان گـەورەی دەکـرد کـە لـە بـاب و باپیرانییـەوە بـۆی مابـۆوە و قـەڵا و بـورج و شـووره و تـەلاری سـەخت و دژواری دروسـت دەکـرد، بـۆ ئـەوەی هەرێمەکـەی لـە دوژمنـان بپارێـزێ. زۆریـش ئاسـایی بـووە کـە هەنـدێ جـار ئـەو دوژمنانـە هاوڕەگـەزی خـۆی بوویـن، چونکـە هەیێنێکـە بیـری ناسـیۆنالیزم هێشـتا نامـۆ بـووە و چ UN یـش نەبـووە تـا ئەگـەر لـە پڕێکا بەسـەریاندا درا بـە هانایانـەوە بێـت. ناسـیۆنالیزم وەک ئایدیۆلـۆژی لـە سـەدەی نۆزدەهـەم لـە ئەورووپـا سـەری هەڵـدا پـاش ئـەوەی کـە سیسـتەمی سیاسـی بەرەبـەرە دەگـۆڕا بـۆ (نەیشـن سـتەیت nation state) واتـا (دەوڵەتـی نەتـەوە).

زۆر جاری وا بووە کە دوژمنداریی ئەو زەمانە لەنێوان باب و کوڕ، برا و برا، مام و برازا، ئامۆزا و ئامۆزاشدا بووە و زۆر بەدڵڕەقی و بێ بەزەییانە، سەری ئەو دوژمنانەی خۆیان دەبڕی، یان هەردوو چاویان دەکوڵین و تا مردن لە زیندانێکی تەنگ و تەنیایاندا دەپەستان، دوژمنیان لەناو گونییەیەک گرێ دەدا و پڕیان دەکرد لە گاشەبەردی گەورە و بە ئاوێیاندا دەدا. تۆ تەنیا گوزەرێکی ئاوا سەرپێیی بەناو مێژووی سەردەمی تەمەنە ناوەندییەکانی ئەوروپادا بکە و سەردانێکی موزەخانەکان و قەڵا و بورج و تەلاری وڵاتەکانیان بکە، تۆ وەرە مێژووی دەوڵەتانی عەرەبی ئیسلامی و دەوڵەتی عوسمانیی ئیسلامی و ئیمپراتۆراتی شاهنشاهی فارسیی ئیسلامی بخوێنەوە، هەنگی بۆت دەردەکەوێ ئەو حاکمانە لەسەر سەروەت و سامان و دەوڵەت و ماڵی دونیا، یان، هەر لەسەرەوە، لەپێناو ئایین و ئاینزا چییان بە یەکتری کردووە. ئەو زەمانە هیچی لەپێناو نەتەوە و نیشتمانپەروەریدا نەبووە.

ئەمن ئێستا وا خۆم هەستی پێ دەکەم کە بەم لادانەم لە بابەتە سەرەکییەکە، ڕەنگە خوێنەرم وەڕس کردبێت، بەڵام من ئەم لادانەم بە مەبەستە و بە پێویستی دەزانم وەک ڕێخۆشکردنێک بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستانەکەی خۆمان لەو ڕۆژگارە بەسەر چووانەدا.

تەبای ئەو سیستەمە فیئۆدالیزمەی کە ئەو زەمانە لە دونیادا باو بووە، هیچ یەکێک لەو دەوڵەت و میرنشین و دەڤەرە دەرەبەگییە کوردییانەی کە لەمێژووی کۆنماندا تۆمار کراون، وەک ئەیوبی و مەڕوانی و سۆران، ئەردەڵان، بابان، بەدرخان و بادینان و ئامێدی و جاف و شکاک و هەرچییەکی تریش هەبووبێ، ئەگەر جاروبار هەوڵی سەربەخۆییشیان لە دوو زلهێزەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (عوسمانی و فارسی) دابێ، ئەوەیان لە ڕۆحییەتێکی نەتەوەپەروەرییانەی کوردییەوە نەبووە و ناشکرێ بۆ ئەو سەردەمە بووبێ، مەبەستم ئەوەیە گلەییان لێ ناکرێ. هەمووی لەسەر بەروبووم و باج و خەراجی ئەو هەرێمانە بووە کە سوڵتان و شایەکان لەو میرانەیان دەویست، یان داوای هێز

و کۆمەکیان لێ دەکردن بۆ شەڕوشۆڕەکانیان. تەنیا شاعیری گەورەی کورد، ئەحمەدێ خانی، لەو سەردەمە کە هێشتا کەس لە ئەورووپاش بیری لە ناسیۆنالیزم وەک ئایدیۆلۆژی نەدەکردەوە، ئەو لە شوێنێکی (مەم و زین)ەکەیدا بەم بیرە بۆ ئەوسا نامۆیە پەرۆشیی خۆی بۆ پەرتەوازەبوونی میللەتی کورد دەربڕیوە:

**گەر دێ هەبووا مە ئیتیفاقەک**

**فێکرا بکرا مە ئینقیادەک**

**ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی**

**هەمیا ژ مەرا دکر غولامی**

**تەکمیل دکر مە دین و دەولەت**

**تەحلیل دکر مە عیلم و حیکمەت**

جا با بگەڕێینەوە بۆ ناو دزەییەکان. بەگوێرەی دەسنووسە مێژووییەکەی مەلا خالید، میر مستەفا بەگی میری سۆران، بەر لە کوژرانی لە بەغدا ساڵی 1613؟ خان ئاودەلی کوڕی عیزەدین شێر (یەزدان شێر)ی لەبەر ئازایەتی و نەبەزیی بێ وێنەی لە شەڕ و شۆڕاندا، کردبوو بە جێگری خۆی. خان ئاودەل کە تەرمی میر مستەفای بردەوە بۆ سۆران و خۆیشی بە ڕا و تەگبیر و ڕەزامەندیی ڕیش سپی و پیاوماقوڵانی سۆران کرا بە میری نوێ، لەبەر ئەوەی کە میر مستەفا خۆی بە جێگری خۆی دانابوو، هەروەها چونکە دیار بوو ئەو پتری تێدا هەبوو لە کوڕەکانی میر مستەفا. هەڵبەت ئەمە بە دڵی کوڕانی میر مسنەفا نەبوو و هەر ئەوان خۆیان بە میراتگری ڕەوای بابیان دەزانی. بەم جۆرە ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیە. خان ئاودەل کوڕێکی بوو ناوی نا میر مستەفا و لەپاش مردنی خۆی، میر مستەفای کوڕی کرا بە میری نوێ. بەڵام لەبەرئەوەی کە هێشتا منداڵ بووە و ئەو کەسایەتییەی نەبووە وڵات بەڕێوە ببات، کوڕانی میر مستەفای یەکەم، ئەمەیان بە هەل بینی و لێی هەڵسانەوە و بوو بە شەڕیان. لەو شەڕەیان کوڕانی میر مستەفای یەکەم لە لایەن

عوسمانییەکان و میر مستەفای نوێش لە لایەن شای ئێرانەوە پشتگیری دەکران. ئەو دوو دەوڵەتەش کێشەی سوننی و شیعیان لەنێواندا هەبوو و لە هەلی ئەوها دەگەڕان بۆ لاوازکردنی یەکتری. میر مستەفای نوێ شکا و بۆ دڵدانەوە، شای ئێرانی چەند گوند و زەوی و زارێکی زۆری لە دەوروپشتی دەریاچەی ورمێ دایە و خۆی و کەسوکاریشی لە گوندی (دزێ) دامەزران. جا لەبەرئەوەی کە دوو سێ گوند لەو دەڤەرە بە ناوی دزێ هەیە (دزێی دۆڵێ)، (دزێی مەرگەوەڕێ) و دزێیەکی دیکەش هەیە ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم (دزێی سیاووش)ی پێ دەڵێن، ئێستاش یەکلا نەبووەتەوە، میر مستەفا لە کامە لەو دزێیانە دانیشتووە و بە لای منەوە ڕەنگە هەر دزێ ی مەرگەوەڕێ بووبێ چونکە دانیشتووانی دوو دزێ کەی تر عەجەمن. بەڵام پاش ماوەیەک شای نوێی ئێران، شاە تهماسب، لە سیاسەتەکانی بابی هەڵگەڕایەوە و هەموو ئەو موڵکەی کە بابی دابوویە میر مستەفا هەمووی لێ سەندەوە و ئەمیش ئەوێ بەجێ دێڵێت و بە موهاجیری ڕوو دەکاتە وڵاتی ڕواندز و کۆیە، بەڵام لە ڕێگادا دەمرێ. لەپاش ساڵەهای ساڵان یەکێک لە نەوەکانی کە قەرەنی ئاغا بوو لەو ماوەیە مەڕو ماڵات و سامانێکی زۆری لە کۆیە پێکەوە نابوو و خزم و کەسێکی بێ شوماریشی دەورەیان دابوو و گەرمیان و کوێستانیان دەکرد.

قەرەنی ئاغا، کە هەمیشە بە دوای لەوەڕگەی تەڕ و پڕدا دەگەڕا، کۆیە بەجێ دێڵێت و دێتە گوندی (گردمەلا)ی لای قوشتەپەی نزیک هەولێر و لەوێ هەواری لێ دادەکوتێ. چونکە لە کۆنەوە لە گوندی (دزێ)وە هاتبوون، بۆیە هەم لە ڕواندز و کۆیە و لە پاشان لە دەشتی هەولێریش ناویان بوو بە دزەیی.

# پرۆفایلی ئاغا ناودارەکانی دزەیی

## قەرەنی ئاغا

مەلا خالید دەربارەی قەرەنی ئاغا دەڵێ: "لە دوای وەفاتی مامەراغا، قەرەنی ئاغا بووە رەئیس و براگەورە. لەگەڵ ئەو خێلاتی لەسەریان بوو، هاوینان بۆ مەروبزن بەخێوکردن ئەڕۆیشتنە کوێستانێ، زستانان ئەگەڕانەوە گەرمێنێ. چەند ساڵ لەسەر ئەم ڕەوشتە دەوامیان کرد بەڵام لە ئاخیریدا لەسەر بەعزە کاری ناوخۆیان، هەرسێ برایەکان لە یەکدی عاجز بوون. عیساغا لەگەڵ چەند ماڵە خزمەتکاری کەوا عایدی خۆی بوون، باریان کرد و ڕۆیشتنە وڵاتی سلەیمانی.... و ئێستاش نەتەوەی لە سلەیمانی ماوە پێیان ئەڵێن ماڵی ئاغای گەورە. پیرداوداغاش بەوەندە خێلاتی کە تابیعی بوون، ڕۆیشتنە وڵاتی دیاربەکر و جزیرە و...... ئێستاش نەتەوەی لەو وڵاتە ماوە پێیان ئەڵێن هەرتووشی. بەڵام قەرەنی ئاغا وەقتی برایەکانی هەر یەک بۆ لایەک ڕۆیشتن، هیچ موبالاتی پێ نەکردن، چونکە زۆرترینی عەشیرەتی لەلای قەرەنی ئاغا بوون. واقیعەن پیاوەکی ئیدارەباش بوو، گەلێک سەخی و بەعەتا و محبوب القلوب بوو."

جا لەپاش هاتنیان بۆ هەواری تازەیان لە دەوروپشتی قوشتەپە، ڕۆژێکیان قەرەنی ئاغا و کوڕەکانی و کۆمەڵێک لە پیاوماقووڵ و سوارچاکەکانی بۆ گەشتوگوزار و ڕاو و شکار، سەردانی دەشتی شەمامک و کەندیناوە دەکەن. هەم خۆی مەست و حەیرانی جوانی و پاوانی ڕەنگینی ناوچەکە دەبێت، هەم کێخواکانی ئەو خێڵانەش کە پێشتر نیشتەجێی ئەوێ بووبوون و هەمیشە کێشەیان لەسەر ئاو و لەوەڕگاکانی دەشتی قەراج و کەندیناوە لەگەڵ خێڵە عەرەبەکانی

ئەودیو دەشتەکە دەبوو، زۆر بەخۆشییەوە ئامێزیان بۆ ئەو میرە کوردە بەسام و هەیبەتە کردەوە و کردیان بە گەورەی خۆیان تاکو لە هێرش و شکاندنی سنووری پاوان و چێرگەکانیان لە لایەن عەرەبەکانەوە بیانپارێزێ.

مەلا خالید لە دەسنووسەکەیدا زۆر بەوردەکارییەوە باس لەم هاتنەی قەرەنی ئاغا دەکات بۆ دەشتی هەولێر: "رۆژەکی بە ناوی ڕاو و شکار و دنیادیتن، خۆی و کوڕەکانی لەگەڵ کۆمەڵە سوارەکی بژاردە بۆ گەشتی شەمامک و کەندیناوە هاتە خوارێ. زۆر وڵاتەکی جوانی هاتە بەرچاوی و لەبۆ فەلاحەت و دەغڵ چاندن گەلێک بە فائیدە بوو. وای خەیاڵ کرد لەم وڵاتە دابنیشێ، دەست بکاتە جۆت و گا و ڕەعیە بەخێوکردن. وە چ کەسی واشی لێ نەبوو لە هاتن مەنعی بکەن. واقیعەن هێندە عەشیرەتی کوردی تێدا هەبوون وەکو سیان، مامەسێنی، ساڵمەمی، فەقێ ملکی، پووکەسەری، بەڵام ئەوان زۆر حەزیان ئەکرد قەرەنی ئاغا دانیشمەند ببێ و لە شەڕ و شۆڕی عارەبانیان بپارێزێ. ئەم عەشیرەتانە یەک یەک قەرەنی ئاغایان کردە میوانی خۆ. هەموویان سوێندیان دا کە چیدیکە نەچێتە کوێستانێ و ئێمەش بە گەورەت قەبوڵ ئەکەین. قەرەنی ئاغا لەسەر ئەم فیکرە بۆ ماڵێ گەڕاوە و عەینی واقیعەی بۆ ڕیش سپیانی خۆی نەقل کرد. ئەوانیش زۆریان لەلا خۆش هات و قەبوڵی دانیشتنیان کرد. ...چونکە ئەسلەن لە دزێ ڕاهاتبوون، هەموو خەڵک پێیان ئەگوتن دزەیی، هەتا ئێستاش وا مەشهورن"

قەرەنی ئاغا هەم خۆی و لەپاش خۆیشی مەحموداغای لە چوار کوڕان کوڕە هەرە بچووکەکەشی سیاسەتێکی زۆر حەکیمانەی لەگەڵ ئەو خێڵە کوردانە و عەشیرەتە عەرەبانە بەکار هێنا، لە لایەکەوە ژنی لێ دەخواستن و زۆری لەوانە دەکرد بە لەشکری خۆی و لە لایەکی تریشەوە ئەو عەرەبەی سەری بۆ شۆڕ نەکردایە، نەیدەهێشت جارێکی دی ڕوو لەو دەشتە بکاتەوە.

بەم جۆرە دزەییەکان ئیمارەتێکی بەرفرەوانی بەهێزیان لەو دەشتانە دامەزراند کە بوو بە مایەی ڕێزی هەم خێڵە کوردەکان و هەم هەندێ لە عەشیرەتە عەرەبەکانی وەك (تەی، عوبێد، جبور، لهێب، البومحمد و ئی تریش) و هەم سوڵتانی عوسمانیش لە ئەستەمبوڵ. جا کە میر مەحمودی پاشای بەبە بە ئامۆژگاریی داودپاشای والیی عوسمانلی لە بەغدا لە ساڵی 1826داوای لە دزەییەکان کرد باج و خەراجی دەغڵ و دانی بدەنێ و ئەوانیش نەیاندا، لێیان بوو بە شەڕ و ئەویش بەسەر میرنشینی دزەییدا دا، لەشکری دزەییان بریتی بوو لەو هەموو ڕەعیە نادزەییانە و ئەو عەشیرەتە عەرەبانەش کە لەژێر حوکمڕانیی ئیمارەتی دزەییدا بوون.

شایانی ئاماژەیە کە محەمەد پاشای میری سۆران (پاشای کۆرە) پشتی دزەییەکانی دەگرت لە دژی بەبان، چونکە هەر یەکەیان دەیویست سنووری میرنشینەکەی خۆی بەرفرەوانتر بکات، بە تایبەتی بۆ ناوچە بە گەنم و جۆ دەوڵەمەندەکانی وەک دزەییاتی، چون دانەوێڵە لە ناوچە شاخاوییەکان کەمتر دەچێنرێ. وردەکاریی ئەم شەڕە لە دەسنووسەکەی مەلا خالید دا گێڕدراوەتەوە.

لێرەدا ڕاستییەکی مێژوویی دیکەی سەرنجکێش هەیە کە پێویستە ئاماژەی پێ بدرێ. لەپاش هاتنی ئەو دزەییانە و تێکەڵیان لەگەڵ ئەو خێڵانەی کە پێش خۆیان لەوێ بوون، دوو چینی کۆمەڵایەتی سەری هەڵدا، ئاغا و کرمانج، چینی ئاغا دەسەڵاتدار و چینی کرمانج بێ دەسەڵات و لەژێر سایەی ئاغاکاندا دەژیان. ئەمن نازانم ئەگەر پێش هاتنی دزەییەکانیش ئەم دوو تێرمە (ئاغا و کرمانج) لەو ناوە هەر بەکار هاتبێ. بەڵام بێجگە لە سێ چوار خێڵی گەورەی ئەو ناوچەیە (سیان، مامە سێنی، شێخ بزێنی، مەنتک) کە برا گەورەکانیان تایتڵی ئاغایان هەبوو، تەواوی ئاغاکانی دیکە لە وجاغی قەرەنی ئاغای دزەیی بوون و ئەمانە بە هەموو ڕعیەتەکەی خۆیان، کە دزەیی نەبوون، دەگوت کرمانج. ئاغاکانی دزەیی بەتایبەتی بەرەبابە دەستڕۆیشتووترەکانیان، بۆیان

هەبوو ژن لە کرمانجەکانیان بێنن بەڵام کچی خۆیان نەدەکرا شوو بە کرمانجێک بکات، نەک هەر کرمانج، بەڵکو نەیاندەدا بە هیچ ئاغا و بەگ و میری عەشرەتێکی کوردی دیکەش، یان شارستانی هەولێری، کە دزەیی نەبوو. لەوانەیە هۆکاری ئابووری لەپشت ئەم سیاسەتەیان بووبێ. ئەم ژن نەدانە بە ئەندامی چینێکی کۆمەڵایەتیی ئەوسا "ئاست نزمتر" لەوەی خۆت لە ئەورووپاش هەر وابووە، هیچ پرینس و کۆنت و مارکیز و چینی ئەریستۆکراتی ئەورووپی، کچی خۆیان نەدەدا بە ئەندامێکی ئەو ڕەعیەتەی کە حوکمیان دەکردن، بەڵام بە پێچەوانەی خانەدانی دزەییەکان، ئەوان دەیاندا بە چینێکی ئەریستۆکراتی دیکەی ئەورووپایی با خزمی خۆیشیان نەبوایە. بەم جۆرە ئەمڕۆ زۆرێک لە بنەماڵە خانەدانەکانی ئەورووپا، بە ڕێگای ژنخوازییەوە بوونەتە خزمی یەکتری. قسەیەکی خۆش لەم بارەیەوە بووەتە ئەفسانە.

لە شەڕ و شۆڕەکانی نێوان پاشای کۆرە و دزەییان - کە بە ڕەچەڵەک خزمی یەکتریش بووینە - چەند ئاغایەکی دزەیی بە دیل دەگیرێن و ئەیانبەن بۆ خزمەت پاشا لە ڕواندز.

پاشا لێیان دەپرسێ: پێم بڵێن ئێوە بۆ کچی خۆتان نادەن بە غەیرە دزەیی؟ یەکێکیان دەڵێ گەورەم ئەگەر کچەکە جوان بێ بۆ بیدەین بە بێگانە! ئەگەر ناشیرینیش بێ بۆچی خۆمان شەرمەزار بکەین! پاشا زۆر پێی دەکەنێت و یەکسەر ئازادیان دەکا.

ئەمڕۆ ئەم نەریتەی ژن نەدان بە بیانی غەیرە دزەیی چەند ساڵێکە وا خەریکە وردە وردە کاڵ دەبێتەوە و ئەوەش دیارە دەرئەنجامی گۆڕانی سروشتیی کۆمەڵگایە کە جاران چینە کۆمەڵایەتییەکان هێڵی سووریان بۆ داندرابوو و چینە "کرمانجەکان" بۆیان نەبووە تێپەڕی بن. بێگومان ئەمڕۆ باری ئابووری و پەروەردە و ڕۆشنبیری، ڕۆڵی سەرەکی یاری دەکات لە پچڕاندنی ئەم هێڵە و تێکەڵبوونی هەموو چینەکان لەناو یەکتریدا. ئەمە لە ئەورووپاش هەر وای لێهاتووە.

بەڵام سەرنجکێشتر ئەوەیە کە ئەم تیرمی ئاغا و کرمانجە، هەر

لەناو دزەییان نەبووە، لەناو گەردی و مەنتک و لە کۆیەش هەر وابووە تا دەگاتە ناوچەی موکریانی ڕۆژهەلاتی کوردستان، لەوێش ئاغاکانی خێلە کوردییەکان وەک دێبوکری، مەنگوڕ، مامەش، ئەوانیش بە ڕەعیەتەکەی خۆیان دەلێن کرمانج. من لەمەم نەکۆلیوەتەوە، نازانم ئەمە بۆ وایە.

## مەحموداغا (مەحمودی قەرەنی)

دەبا بزانین مەلا خالید ئەمجارەیان دەربارەی ئەم مەحموداغایە، کوڕە بچووکەکەی قەرەنی ئاغا دەڵێ چی: "... مەحموداغا هەر لە گچکەییەوە ئاساری پیاوەتیی تێدا دیار بوو. حەقیقەتەن وای لێهات پیاوەکی زۆر ڕەشید و سوارچاک و سیلاحشۆر و ئازا و بەدەست وەکر بوو. گەورەیی لە براکانی زەوت کرد، بە تەبیعەتی حاڵ پێش کەوت. شەڕ و سەربردە گەلەک زۆرە لەگەڵ عارەبان، بەلام ئێمە مەقسەدمان هەر کورتییە"

یەکێک لە نەوەکانی مەحموداغا (کاوێسی مەلای) شایەستەی ئەوەیە هەڵوەستەیەکی لەسەردا بکەم. بۆ ئەم مەبەستەش دیسان هەر هانا وەبەر مێژوونووسی وردبین جەنابی مامۆستا مەلا خالید دەبەمەوە. لە سەردەمانی کۆندا نەک هەر لە کوردستان، بەڵکو لە تەواوی دونیادا هەر کەسێکی کە شەڕکەرێکی چاک، شۆڕەسوارێکی لێهاتوو و تفەنگچی یان شمشێر وەشێنێکی نموونەیی بوا، ئەوە ناوی دەردەکرد هەم لەناو عەشرەتی خۆی و هەم ناوبانگی دەگەیشتە دەرەوەی سنووری ولاتەکەی خۆی و لە هەموو لایەکەوە، لە لایەن یار و نەیاریشەوە، ڕێز و ئافەرین و دەسخۆشانەی بۆ دەهات و بەندبێژ و لاوکبێژەکان بەند و بەیتیان پێدا هەڵدەگوتن. بەپێی مێژوونووسی دزەییان جەنابی مەلا خالید دەبێ کاوێسی مەلای، یەکێک بووبێ لەو شۆڕەسوارە دزەییانە لە بەراییەکانی سەدەی نۆزدەهەم. ئەمەیان کورتە سەربردەیەکی ئەو شۆڕەسوارەیە.

## کاوێسی مەلای

مـەلا خالیـد دەربـارەی کاوێسـی مـەلای دەڵـێ: "عەگیدەکـی بـە ناوبانـگ و شـۆخ و شـەنگەکی لاوچـاک بـوو. لـە دەوری خـۆی مانەنـدی نەبـوو. لەنـاو عێلـی دزەیـی بـە چاپـوک سـوار و ڕم وەشـێن نـاو و دەنگـی کردبـوو. هەتـا لـە شـەڕی دزەییـان لەگـەڵ بابانییـەکان ئەگێڕنـەوە ئەڵێـن داودپاشـای والیـی بەغـدا لـە سـاڵی (1242هیجـری) وێرگـو و خەراجـی دزەییانـی بـۆ گوزەرانـی مەحمـود پاشـای بەبـە دانـا. ئینجـا مەحمـود پاشـا لـە دەمـی ئاخیـری بەهـارێ بـۆ خەرمـان هەڵگرتـن و خەرجـە کۆکردنـەوە بـە هێزەکـی تـەواو هاتـە سـەر وڵاتـی دزەییـان. وەکـی دزەیـی ئـەم پەیامەیـان زانـی زۆر لەلایـان ناخـۆش هـات. چونکـە خەرجیـی وڵاتەکەیـان هەمـوو بەخۆیـان ئەخـوارد، لە سـەدا بیسـتیان نـەدەدا حکوومەت. وە ئەگـەر مەحمود پاشـا بهاتبایـە، ئەبوایـە گشـتی بدەنـێ. لەبـەر ئەمـە هێشـتا مەحمـود پاشـا لـە ڕێگـە بـوو پەیامەکیـان نـاردە لای زۆر تکایـان لـێ کـرد کـە نەهێتـە سـەر وڵاتەکەیـان و بـە قسـەی داود پاشـا تەفـرە نەخواتـن. بـەڵام هەرچەنـد دزەیی لەبـەری ناورانـەوە چ فایـدەی نـەدا. جـا دزەیـی زۆر چـاک بەخـۆ کەوتـن. گەنجەکانـی وەکـو ڕەحمانـی کاکەخانـی و حەوێـزی حەسـەن ئاغـا و سـلێمانی حەسـەن ئاغـا و کاوێسـی مـەلای ئـەو جەنگـەی لەوەپێـش باسـمان کـرد لەگـەڵ بابانییەکانـی کـرد. حەقیقەتـەن ئـەو ڕۆژە کاوێسـی مـەلا و ڕەحمانـی کاکەخانـی بدادەکیـان کـرد هەتاهەتایـێ ئەبـێ هـەر بیگێڕنـەوە، چونکـە ئـەوەی ئـەوان کردیـان لـە هێـزی بەشـەردا نەبـوو." هەر لەبـارەی ئەم کاوێسـی مەلایـە، مـەلا خالیـد لـە شـوێنێکی دیکـەی دەسنووسـەکەیدا دەڵێ "....کاوێسـی مـەلای مەحموداغـای و ڕەحمانـی کاکەخانـی مەحموداغـای گەنـج بـوون تـازە پـێ ئەگەیشـتن، عەگیـد و سـوارچاک و ڕم وەشـێن و سیلاحشـورەکی زۆر بەناوبانـگ بـوون. هـەر تیپەکـی بریـان تـێ بکردبایـە ئەگـەر زۆر و ئەگـەر کـەم قەتعییـەن خۆیـان لەبـەر ڕاناگرتـن".

مەلا خالید هەروەها لە زاری ئێختیارەکانی زۆر پیر دەگێڕێتەوە، گۆیا لە ناو دزەییان مام عەولا ناوێکی هەردوو چاو کوێر هەبووە، لە شەڕی بەبان و دزەییان خەنجەرەکەی هەڵکێشابوو گوتبووی پێم بڵێن ئەگەر کاوێسی مەلای کوژرا هەتا منیش بەم خەنجەرە خۆم بکوژم و تا کاوێس لە کۆڕی شەڕدا بێ، دزەیی ئەو شەڕە نادۆڕێتن. مەلا خالید لە شوێنێکی دیکەی نووسینەکەیدا هەر لەبارەی ئەم شەڕەی دزەیی و بابانەوە دەڵێ "... هەر سوارەکی کاوێس فڕێی دابایە، لغاوی ماینی لەپاش زینی خۆی قایم ئەکرد هەتا لە زێی پردێی تێپەڕ کردن. هەشتا لغاوی لێ گێڕانەوە. خولاسە، مەحمود پاشا زۆر بە شپرزەیی گەڕاوە..." وەک کە لەو زەمانە زۆر ئاسایی بووە خێڵ و میرنشینەکان بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان ئەم لاو ئەو لایان زوو زوو دەگۆڕی و ڕۆژێک ڕەگەڵ عوسمانییەکان و ڕۆژێک ڕەگەڵ شایەکانی ئێران دەکەوتن. خێڵە گەورەکانیش ڕۆژێک لەگەڵ میرنشینی سۆران تەبا بوون، دواتر بەینیان تێک دەچوو و ڕوویان دەکردە بابانەکان. کاوێس چەندین شەڕی دژواری لەگەڵ لەشکری پاشای کۆرە کرد کە ئەویش چاوی بڕیبووە خەرمانی گەنم و جۆی ناوچەی دزەیاتی و لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەو ناوچەیە بەتەواوی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. کۆسپی گەورەی پاشای کۆرە بۆ وەدیهێنانی ئەو خەونەی، کاوێسی مەلای بووە. بۆیە هەنگاوی یەکەمی ئەوە بوو کاوێس لەوێ دەرپەڕێنێت ئینجا ڕێگاکەی بۆ خۆش دەکرێت بگات بە ئامانجی. هەر واشی لێهات. کاوێس لەگەڵ هەندێ خزمانی خۆی لەلایەن پاشای کۆرەوە دوور خرانەوە بۆ ناوچەی موسڵ و شنگال، بەڵام ئەو ناوە ناوە بە نهێنی هەر دەگەڕایەوە ناوچەی خۆیان و بەشێوەی چەتەگەری بەسەر هێزەکانی لیرەو لەوێی پاشای کۆرەیدا دەدا. جارێکیان تووشی دەستەیەکی سەربازی پاشا دەبێت کە بە سەرۆکایتی شێخێکی عەرەبی عەشیرەتی البوحمدان بوو. شەڕێکی قورس دەکات، بەڵام ماینەکەی دەکەوێتە ناو قوڕەلیتەیەکی زۆر

خراپ کە لێی دەرناچێت و کاوێس دەگیرێ. کابرای عەرەب سێ و دووی لێ ناکات، یەکسەر سەری دەبڕێت و سەرەکەی بە دیاری بۆ پاشای دەبا بۆ ڕواندزێ. بەڵام پاشا کە چاوی بە سەری کاوێس دەکەوێ دەست دەکا بە گریان دەڵێ " ئەمن سەری کاوێسم بە زیندوەتی ئەویست، هەتا تیانی پێ بشکێنم و قۆنگرە و قەڵاتانی پێ بگرم، داخەکەم ئێوە چۆن دڵتان هات ئەو سەرە نازدارە ببڕن، هەردوو چاوتان کوێر بێت. " ئینجا هەڵدەستێ یەکسەر سەرۆکی دەستە سەربازییەکەی خۆی کە شێخی عەشرەتی البوحمدان بوو لە زیندانێ دەنێت و لە شێخاتیشی دەیێخێ. مەلا خالید لە گێڕانەوەکەی بەردەوام دەبێت دەڵێ کە کاوێس نەما، ڕۆژێک کاکەخانی مامی دەچێتە شاری موسڵ و لە ناوشار تووشی بکوژەکەی کاوێس دەبێت هەڵدەکوتێتە سەری و بە شیران لەتوپەتی دەکات. پاش ماوەیەک، دیسان هەر بەپێی مەلا خالید "... لە ناوەندی بەهارێ خەبەر دەگاتە دزەییان کە عێلی البوحمدان وا لە دەوروپشتی مەخمور هەڵیان داوە. دزەییەکان سێ سەد سواری عەگید هەڵدەبژێرن و لەناکاو بەسەریاندا دەدەن. بیستوپێنج شێخی قاوەکوت لە البوحمدان ئەکوژن و کوشتن و بڕینی میللەتیش بێ ژمارە ئەبێت. حەقیقەتەن لەو ڕۆژە حەوێزی حەسەن ئاغای بڵاوی بە عارەبان کرد و ئەی وتە لەشکرەکەی، لە خوێنی کاوێسی، عارەبان بکوژن هەتا لەناو قەبری بانگ ئەکات سەر بۆ من ماڵ بۆ ئێوە. لەو ڕۆژیەوە عێلی البوحمدان کز بوون هەتا ئێستا." هەر بۆ زانیاری: ئەم حەوێزی حەسەن ئاغایە باپیرە گەورەی منە، واتا باپیری بابمە. یەکەم دۆکومێنتی - ئەوەی من پێی بزانم - کە گەڕیدەی بێگانە لەسەر دزەییان نووسیبێتی کتێبەکەی (کلۆدیوس جەیمز ڕیچ)ی بریتانییە (رحلة ريج في العراق عام 1820) کە لە ساڵی 1820دا نووسیویەتی و (بەهائەدین نووری) کردوویە بە عەرەبی. ڕیچ ئەو ساڵە گەشتێکی بە سلەیمانی و کەرکووک و هەولێردا کردووە و کە دەگاتە ولاتی دزەیی باسی فارس ئاغای دزەیی

دەکات دەڵێ "... کاتژمێر دەی بەیانیش گەیشتینە هەواری فارس ئاغا سەرۆکی خێڵی (دزەیی) لە گوندی (قوش تەپە) کە بەناوی گردێکی چکۆلە کراوە، کە پێشتر باسمان کردووە. خێڵی (دزەیی) کوردە و پێشان سەر بە ( کۆیە) بووە، بەڵام پاشای بەغدا لە (کۆیە) و لە (هەولێر)یشی دابڕی و خستیە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خۆی. جا ئەمە وای لەم خێڵە کردووە کە کەس بە پیاو نەزانێ. فارس ئاغا ڕاسپێردراوەکەی ئێمەی دەرکرد و پێی گوتبوو ئەو نە سەر بە وەزیری بەغدایە، نە بە پاشای کوردستان، نە بە شای ئێرانیش، بەڵکو خۆی ئاغای خۆیەتی و لە وڵاتی خۆیدا دەژی و چ میوانیش قەبوڵ ناکات. بۆیە باشترە بۆ ئێمە بچین بۆ (هەولێر)". بەدڵ سوپاسی کاک تاریق جامباز دەکەم کە یارمەتیی دام بۆ وەرگرتنی ئەم چەند دێڕەی سەرەوە لە کتێبەکەی کلۆدیوس جەیمز ڕیج. هەر لەبارەی ئەم فارساغایە کە وا دیارە لە سەرایی سەدەی نۆزدەهەم سەرۆکی گشت دزەییەکان بووە، مەلا خالید ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە: "... من خۆم لە پیاوە ڕیش سپییەکانی دزەییم بیستووە، وا ئەگێڕنەوە ئەڵێن حوسێنی فارساغای پیاوەکی زۆر ڕەشید و سەخی و گوزەران باش ئەبێ. میللەت هەموو ئەیانویست ئەو ببێتە سەرۆکی عێلی و فارساغای باوکی دەخلی هیچ شتێک نەکات. فارساغاش ئەمەی زۆر لا ناخۆش دێت و دەچی بۆ لای پاشای ڕواندزێ وە بۆ وڵاتی هەولێرێ دەیهێنی. بە لەشکرەکی قورس لەگەڵ ڕەسوڵ پاشای برای محەمەدپاشا وە سەید حەسەنی ڕەشوانی دەهێن بەسەر دزەییدا دەدەن. دوو شەڕی زۆر گەورە ئەکەن لە جەنگی یەکەم لەشکری ڕەسوڵ پاشا ئەشکێنن و زۆر پیاویشی ئەکوژن. بەڵام لە شەڕی دواییدا، دزەیی ئەشکێن. حوسێن و مەعروفی فارساغای ئەگیرێن. ئینجا ئەڵێن فارس دوو کوڕی خۆی بە کوشتن دا وە عێلەکەشی دەربەدەر کرد بۆ ڕەئیسایەتیی خۆی. لەبەر ئەمە هیچیان لەگەڵ پاشا نەکرد، چونکە بە ئەنگوستی خۆیان کوژران. ئەڵێن عەباساغای گەردیش وای کرد،

بەڵام ئێمە مەبەسمان لێی نییە، هەر لەسەر باسی دزەییان ئەڕۆین." بە پێی مەلا خالید، پاشای کۆرە حوسێنی فارس ئاغای بە دەستی خۆی کوشتووە، هەرچی مارفی برای بوو ئەمیان ویستوویەتی لە زیندان رابکات، لەسەربان خۆی فڕێ داوە، هەردوو لینگی شکاوە و هەر بەوە مردووە. ئەم رووداوە شتێکی نامۆ و سەیر نەبووە بۆ زەمانی خۆی، بەڵکو کتومت لەگەڵ جۆرەها چیرۆکی لەم بابەتە یەکدیگر دەبنەوە کە مۆرکێکی زۆر باوی مێژووی تورکە عوسمانییەکان، عەرەبەکان، فارسەکان و ئەوروپاییەکانیش بووە.

لەپاش ئەو سەرکردە دزەییانەی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە لە مێژووی ئەم خێڵە رۆڵیان گێڕاوە، مەلا خالید لە لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی دزەییان، کە جارێ هێشتا دەسنووسە، پێدا دێ یەک بە یەک بەکورتی باسی هەموو ئاغاکانی دزەیی دەکات تا ساڵی 1945 ئەو ساڵەی کە ئەم مێژووەی نووسیوە. ئەمن نامەوێ لێرەدا ئەو هەموو ناوانە بە شێوەیەکی کرۆنیکلی دووبارە بکەمەوە. ئەم هەموو ناوە مەبەستی من نییە. من تەنیا ناوی چەند کەسایەتییەکی ناوداریان دێنم کە لە دوادواییەکەی ئەو سەدەیە و تا پاش یەکەم جەنگی جیهانیش (1914-1918) و نەمانی عوسمانییەکان و هاتنی بەریتانیا بۆ کوردستان، واتا لەو چەند ساڵانەی پڕ لە قەیران و ئاڵۆزی و ئاژاوە و بەرەڵڵایی سیاسی و لێڵیی پاشەرۆژ، رۆڵیان گێڕاوە.

لە ئاخروئۆخری سەدەی نۆزدەهەمدا، چوار بەرەبابی دزەییان لەناو بەرەبابە زۆرەکانی وجاغی قەرەنی ئاغا، زۆر دەوڵەمەندتر بوون لەوانی تر و زیاتر ناویان دەرکرد، حەسەناغەیی، فارساغەیی، کاکەخان، مام خولە. بۆیە هەم دەوڵەتی عوسمانی کە لە سەرەمەرگدا بوو و هەم بەریتانییەکانی پاش ئەوان کە بۆ یەکەم جەنگی جیهان (1918-1914) گەیشتبوونە ویلایەتی مووسڵ (باشووری کوردستان) تەبای خۆ نزیککردنەوەیان لە هەموو سەرەک خێڵە کوردە گەورەکانی کوردستان، لە هەولێریش روویان دەکردە سەرۆکەکانی ئەو چوار

بەرەبابە. لەو کاتەشدا ئەو چوار بەرەبابە ناکۆکی و ناحەزییان تێ کەوتبوو لەسەر سەرۆکایەتی و لەسەر زەوی و زار و هەڵبەت حەسوودیش بە یەکتری. هەر یەکە سەرۆکی بەرەبابی خۆی بە پیاوترین سەرۆکی دزەییان دادەنا، خۆی پتر بە بەرەبابەکەی خۆی دەناساند و بەرەبابی زۆر لا گرنگتر بوو تا خێڵە دزەییە گشتییەکە. فوئاد حەمەخورشید لە کتێبی (العشائر الکردیە) چەند دەقێکی کاربەدەستانی بریتانی بڵاو کردووەتەوە، کە ئەمانە ساڵی 1919 لە بەغدا وەک چەند تێ بینییەک لەسەر خێڵەکانی باشووری کوردستان بۆ حکوومەتی خۆیان نووسیبوو و ئەو تەرجومەی عەرەبی کردووە و وەک کتێب لە ساڵی 1979 هەر لە بەغدا بە چاپی گەیاندووە. کە دێتە سەر باسی دزەیی دەڵێ "لەم خێڵە کەسیان سەرۆکی گشتیی هەموویان نییە."

بریتانییەکان ڕاستیان کردووە. لەناو بەرەبابی حەسەناغەییەکان کار گەیشتە ڕادەی لێک ترازان و دواتریش خوێن ڕشتن. ئەوساکە دوو پیاوی گەورەی ئەو بەرەبابە، نەک هەر لەناو بەرەبابی خۆیان بەڵکو لەناو تەواوی خێڵەکەیان و لەناو شاری هەولێریش و لە دەرەوەش ناویان دەرکردبوو، بایز کە باپیری من بوو و برایماغای کوڕی لەپاش خۆی کەسایەتییەکی لە باوکی کاریگەرتریشی لێ دەر کەوت و ئەحمەدی حوسێن ئاغای کە دواتر تایتلی پاشای لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پێ دراو بوو بە ئەحمەد پاشا.

جەنگی ڕووس -عوسمانی لە ساڵی (1878-1877) شکستێکی گەورە بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی. هەم لە باڵکان زۆرترایەتیی ئەو هەرێمانەی کە بەشێکی ئیمپراتۆرییەتەکە بوون، وەک مۆنتێ نێگرۆ، بولگاریا، بۆسنیا، ڕۆمانیا، مۆڵداڤیا، ڤالاخیا و هەر وەها یۆنان و کپرس لە دژی عوسمانییەکان هەڵسابوونەوە و هەندێکیان نیمچە سەربەخۆیی و هەندێکیان سەربەخۆیی تەواویان بەدەست هێنابوو. هەم لە کاوکاسیاش عوسمانییەکان هەندێ ناوچەیان دۆڕاندە ڕووسیا. هەر پێش شەڕەکەش لە ساڵانی 1875، 1874، 1873 باری ئابووریی دەوڵەتی عوسمانی

زۆر بەخراپی تێک چووبوو و گەیشتبووە ڕادەی لاتی (ئیفلاس).

بەرامبەر بەم تەنگانە داراییەی کە تێی کەوت، دەوڵەتی عوسمانی ئیتر کەوتە گیانی ئەو هەرێمە موسڵمانانەی کە هێشتا لەبن دەستیدا مابوون، لەوانە کوردستانیش. ئیستانبوڵ قانوونی تازەی باج و خەراج و خاوەنداریی زەوی و زاری دەرکرد، کە تەواوی ئەو زەوی زارە کشتوکاڵیانە ئیتر بە دیوانی (بە ڕەسمی) موڵکی دەوڵەتن. ئەمە نارەزاییەکی زۆری لەناو ئاغاکانی دزەیی خاوەن موڵک لێ کەوتەوە. فوئاد حەمەخورشید لە کتێبەکەیدا لەم بارەیەوە دەڵێ "جا لە ئەنجامی ئەم دەست بەسەرداگرتنە برایماغا زۆر بە توندی نارەزایی دەربڕی و هەموو ئەو بەڕێوەبەرانەی دەرکرد کە بۆ چاوەدێریکردنی موڵکە سەنیەکان لەو ناوچەیەدا نێردرابوون" حەمەخورشید بەردەوام دەبێت دەڵێ: حکوومەت هێزێکی نارده سەری و لەپاش چەند شەڕێک برایماغا لەگەڵ هەندێ لە خزمەکانی شکان و ڕایان کرد بۆ بادیە، بەڵام لە دواییدا گەڕانەوە و داوای لێبوردنیان لە سوڵتان عەبدولحەمید کرد. دەڵێ ئەویش ڕازی بوو بە مەرجێک هەموو زەوییەکانیان بە زەویی سەنیە دابندرێن و ببن بە موڵکی دەوڵەت. پاش ئەم ڕووداوە، حکوومەتی عوسمانی چیتر پۆستی بەڕێوەبەری ناحیەی نەدا بە هیچ ئاغایەکی دزەیی، بەڵکو دەدرا بە فەرمانبەرە تورکەکان.

مەلا خالید باسی شەڕێکی دیکەی برایماغا لەگەڵ تورکەکان دەکات و دەڵێ زەبتییەی عوسمانلی بە فێڵێکی نامەردانە هەموو سەرۆکە ناودارەکانی دزەییانی گرت (برایماغا، خورشیداغای برای، ئەحمەد پاشا، حاجی پیرداوداغا، حاجی نادراغا، قەرەنی ئاغا، حاجی فارسی ئالی کوتکی) و لینگی هەموانیان لەژێر زگی ولاخان گرێ دا و ڕەوانەی کەرکووکیان کردن. دەڵێ لەوێ سێ ساڵ لە بەندیخانە مانەوە بەڵام لەو ماوەیە ئەحمەد پاشا ڕای کرد، خۆی گەیاندە لای شێخ سەعیدی حەفید و ئەویش عەفووی بۆ وەرگرت (بڕوانە دەسنووسەکەی مەلا خالید ل. 56-57.)

لێرەدا مەلا خالید ئەحمەد پاشا هەر بە تایتلەکەی دواتری (ئەحمەد پاشا) ناو دەبات، بەڵام ئەمن گومان دەکەم ئەحمەد پاشا لە کاتی ئەم ڕووداوە ئەو تایتلەی لە لایەن سوڵتانەوە پێ بەخشرابووبێت و پاشایەک بەم شێوە ناشیرینە سووکایەتیی پێ بکرێت. من وای بۆ دەچم کە ئەوساکە (نازانم چ ساڵێک بووە) ئەحمەد پاشا هێشتا هەر ئەحمەدی حوسێناغای یان ئەحمەداغای دزەیی بووە و تایتلی پاشای نەبووە (بڕوانە: د. مەهدی محەمەد قادر، هەولێر، لەساڵانی 1926 - 1931 لاپەڕە 28) تایتلەکەشی دەڵێن بەم جۆرە پێ دراوە: نازانم بەتەواوی چ ساڵێک بەڵام جارێکیان حکوومەتی عوسمانی ئەوەندە لات دەبێ کە مووچەی فەرمانبەرەکانی لە هەولێر پێ نادرێ. ئەحمەدی حوسێن ئاغاش کە لەو ماوەیە بووبوو بە یەکەم دەوڵەمەندی کوردستان و دەرەوەی کوردستانیش، دەڵێن هەڵدەستێ مووچەی هەموو فەرمانبەرەکان لەجیاتی دەوڵەتی عوسمانی دەدات. لە پاداشتی ئەمەدا، سوڵتان یەکسەر تایتلی پاشای پێ دەبەخشێت و لەو ڕۆژەوە ئیتر بەرەبابی حەسەن ئاغای دزەیی دەبن بە دوو لک یەکێکیان بە ناوی بەرەبابی پاشا، ئەوی تریان بەرەبابی بایز. بەم جۆرە چوار بەرەبابە دەسرۆیشتووەکەی دزەییان دەبن بە پێنج. بە پێچەوانەی ئەحمەد پاشا کە لە تورکە عوسمانییەکانەوە نزیک بووە، برایماغا ( مامی من) هەمیشە کێشەی خاوەندارێتی زەوی و زاری لەگەڵیاندا هەبووە. بۆیە کە یەکەم جەنگی جیهان (1914-1918) ڕووی دا یەکەمیان پاڵپشتیی عوسمانیانی کرد و ئەوەی دواییش بەگەڵ بەریتانیا کەوت.

لەو شەڕە بەریتانییەکان پێویستیان بە هێزی عەشایر هەبوو و لە هەولێر ڕوویان کردە سەرۆکە گرینگەکانی دزەیی. برایماغا هەر زوو باوەشی بۆ ئەم تازەهاتووانە کردەوە، بەڵام هەر چەندی بەریتانییەکان هەوڵیان لەگەڵ ئەحمەد پاشا دا، سەری نەگرت و ئەو هەر وەفاداری تورکەکان مایەوە. تورکەکانیش دەستیان بە پڕۆپاگەندە تەقلیدیەکەی خۆیان کردبۆوە کە پێشانیش لەناو کوردی تورکیا بۆ لەناوبردنی

ئەرمەنییە "غەیرە دینەکان" دەیانکرد، ئەمجارەش لە باشووری کوردستان بۆ بەرهەڵستی کردنی ئینگلیزی (کافر) دەیانکرد.

ئەمن لێرەدا، هەر وەک پێشتریش باسم کرد، دەمەوێ ڕووناکی بخەمە سەر تەنیا ئەو کەسایەتیە دزەییانەی کە لە سالانی دوایی عوسمانی و سالانی بەرایی بریتانیا لە باشووری کوردستان ڕۆڵیان گێراوە. بۆ ئەم مەبەستەش هەمیشە دەگەڕێمەوە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگە و دۆکومێنتی بیانی و کوردی.

لێرەشدا خۆم هەستی پێ دەکەم، ڕەنگە خوێنەرم وەڕس کردبێت و لەوە دەچێت بەداخەوە دەبێ وەڕستریشی بکەم، بەلام چارم نییە، چونکە خوێنەری بەڕێز پێویستە بزانێ کە هەبوونی ئەم هەموو دۆکەمێنتە بیانییە ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە وا مامەڵەت لەگەڵ مێژووی کوردا دەکەین. کەریم شارەزا (یادی بەخێر) زۆر زوو هەستی بەمە کردبوو کە دەڵێ "... ئەنجامی پوختەکردنی ئەو میرنشینیانەی کورد، مێژووی سەردەمێکی دیاریکراوی نەتەوەکەمان پێکەوە دەنێن."

## بایزاغا (باپیری هۆمەر دزەیی)

مەلا خالید دەربارەی بایزاغا ئەمەی نووسیوە: "پیاوەکی زۆر بەناوبانگ بوو. وە براگەورەی هەموو خزمی خۆی بوو. سوخەتی چاکەی هەند زۆرە، نووسراوەکی سەربەخۆی پێ ئەوێ. "
بریتانیەکانیش کە فوئاد حەمەخورشید ڕاپۆرتەکانیانی گۆڕیوەتە سەر زمانی عەرەبی ئەوها باسی بایزاغا دەکەن " لە ماوەی بیست سالی ڕابردوودا، پۆستی بەڕێوەبەری قوشتەپە هەمیشە دەدرا بە ئاغایەکی دزەیی... هەر چۆنێکی بێت بایزاغا 25 سال لەمەوپێش هەولی دا ئەو لەوەڕگا سروشتیانە بکات بە زەویی چاندن، بەلام هەولەکەی بۆ نەگەیاندرایە سەر، چونکە یەک سال دوای مال گواستنەوەی بۆ مەخمور، کۆچی دوایی کرد... ئەم زەویە تازانە کە بۆ چاندن بێ

ویتە بوون، ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە جوتیارەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا و تەنیا چەند ساڵێکی کەمی برد کە برایماغا {کوڕی بایزاغا} بینی نزیکەی سەت گوند لە مەخمور وا لە دەوروپشتی قوت بوونەتەوە و نزیکەی نیوەی ئەو ژمارەیەش لە کەندیناوە. خۆی برایماغا، یان با بڵێین باوکی، لە ڕاستیدا مەملەکەتێکی نوێی لەو ناوانەدا بۆ خۆی دامەزراند"

ئەم بە هەڵپە و هەڵەداوان خۆ گەیاندنە کەندیناوە و قەراج سەردەمی دۆزینەوەی زێڕم لە کالیفۆرنیای ئەمەریکا دێنێتەوە بیر کە بە (گۆڵد ڕەش Gold Rush) بەناوبانگە و ڕەنگە بە کوردیەکی ڕەمەکیی خۆمان شتێکی ئا لەم بابەتەی ناو بنێین ("راکە بۆ زێڕ" یان "پەلەپەل بۆ زێڕ" یان "بگەیێ زێڕ ڕژاوە") . ئەم گۆڵدڕەشە لە ساڵانی 1848-1855 بوو کە دیار بوو زێڕێکی زۆر لە کالیفۆرنیا دۆزرابۆوە و خەڵکێکی زۆری کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکا بە پەلەپروزێ باریان دەکرد بۆ کالیفۆرنیا بە هومێدی زێڕ و بەم جۆرە کالیفۆرنیا پڕوچڕ بوو لە کۆچبەران. کەندیناوە و قەراجەکەی خۆشمان دیارە بووبوو بە کالیفۆرنیا، بەڵام بۆ گەنم و جۆ نەک بۆ زێڕ.

ئەفسەری سیاسیی بریتانی لە هەولێر (1918-1920) دەبلیو. ئار. هێی (کە لەناو کوردا بە کاپتن هێی ناسراوە) کتێبێکی لەسەر بیرەوەری و ئەزموونەکانی خۆی نووسیوە کە پڕن لە وردەکاریی بەڕاستی زۆر سەیر لە هەموو بوارێکی ژیانی کورددا بەناوی (دوو ساڵ لە کوردستانا) W.R.Hay Two Years in Kurdistan. بێجگەلە کاپتن هێی فوئاد حەمەخورشیدیش تێ بینییەکانی دیوانی حاکمی بریتانی هی ساڵی 1919ی لە بەغدا کردووە بە عەرەبی، ئەویش باسی سەرۆکە ناودارکانی دزەیی دەکات. ئەم دوو کتێبە کارەکەی منیان زۆر ئاسان کردووە کە من بتوانم بە بەڵگە پرۆفایلی ئەو کەسایەتیە دزەییانەی کە ئەوان لە کتێبەکانیاندا باسیان کردوون

بەکورتی بکەمە کوردی. لەپاش ئەمانە ئینجا دێم بۆ لای کوردەکانی ئاگادار، بزانین ئەوان دەربارەی هەر هەمان بابەت چییان لەباردایە. جەنابی مەلا خالیدی مورتکە و دکتۆر مەهدی محەمەد قادر، دوو سەرچاوەی کوردیی گرینگی منن بۆ ئەم زانیارییانە.

## برایماغا (برایمی بایزی) مامی هۆمەر دزەیی

کاپتن هێی لە لاپەڕە 164ی کتێبی لەسەرەوە باس کراودا دەربارەی ڕێبەرە ناودارەکانی دزەیی دەنووسێ:

" لە پێش هەموان برایماغا دێ. ئەمەیان پیاوێکی حەفتاساڵییە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە سەرو ڕیشی ڕەش دەکاتەوە لە تەمەنی خۆی گەنجتر دیارە. بەژنی مامناوەنجی بوو و نیوچەوانێکی بەرز، دووچاوی ڕەشی پرشنگئاوێژ و لووتێک کەوا یەکسەر سەرنجی ڕادەکێشایت. لە ئەدگارەکانی ڕووی ڕا دیار بوو کە ئەم پیاوە لە ژیانی پڕ لە ڕووداویدا گەلێک کێشە و گرفت و خەفەتی تووش بووینە. لەپاش تەمەنێکی پڕ لە شەڕوشۆر و بەگژیەکداچوونی توندوتیژ، برایماغا ئێستا وا گەیشتووەتە تەمەنی پیری، بەڵام بە خوو و ڕەوشت، ئەخلاقێکی وەک زێڕی تیزاب. خزمەکانی و ڕەعیەتەکانی برایماغا دەیانپەرست چونکە ئەو پیاوە کەسایەتییەکی وەهای هەبوو کە یەکسەر سەرنجی بۆ خۆی ڕادەکێشا. لە پاداشت، ئەویش زۆر بەگەرمی چاکەی دەدانەوە و دەبووە خەمخۆریان کە ئەم ڕەوشتەش زۆر کەمە لای کورد. برایماغا پیرێکی زیرەک بوو، بە زگماک دیپلۆمات بوو، لە هونەری قسەکردن و دواندنی خەڵک کەس نەیدەگەیشتێ و لە هەمان کاتدا قسەخۆش و نوکتەچیش بوو. برایماغا لە ناوچەکەی خۆیان شتی وای کرد کە بوون بە مێژوو. لە ماوەی 38 ساڵ پێشتر، لە سەردەمی بابی، هەڵستا کۆمەڵێک کوردی بەگەڵ خۆی دا، لە چیای

قەرەچوغ پەراندنیەوە و شارۆچکەی مەخموری دروست کرد و لەپاش چەندین ساڵ لە شەڕوشۆر لە پێشاندا لە دژی عەشیرەتی شەمەری عەرەب، دواتر لە دژی تورکەکان، توانی خۆی بەتەواوی سەقامگیر بکات و خۆی دابمەزرێنێ. پاش ئەوە خەڵکی دیکەش تەبای ئەو روویان لە مەخمور کرد. جا ئەم دەسپێشخەرییە لە برایماغاوە بوو کە دەشتی قەراج ئاوەدان کرا و چاندرا. دوابەدوای ئەوە، تووشی چەند شەڕێکی تر بوو لەگەڵ سەرۆکە دزەییەکانی دیکەی ناحەزی و، وەک پێشتریش باسم کرد، کوڕە گەورەکەی تێدا لەدەست دا. تەنیا کوڕی کە مایبوو، مشیر ئاغا، گەنجێکی بیست ساڵی بێباکی دەستبڵاو بوو، کە هێشتا نەگەیشتبووە ئەو تەمەنەی ژیان بەجددی وەرگرێ. دەگێڕنەوە کە گۆیا برایماغا خۆیشی لە تەمەنی لاوییدا ئەویش سەرەڕۆ و بێباک و گوێمەدێ و حەزی لە ژنانیش بووە. بۆیە ئومێد دەکرێ کە دوور نییە مشیری کوڕیشی بەم شێوەیە بڕسکێ. بەڕاستی برایماغا سەرۆکی هەرە گرینگی تەواوی عەشیرەتەکەی بوو و هەندێ خزمانی نزیکی خۆی لە بەرەبابەکانی دیکەی ناحەزی نەبێ، ئەوانی دی هەر هەموویان دەسەڵاتی ئەویان قەبووڵ بوو. بە خۆی و برایەکانی نزیکەی 30 گوندیان هەبوو، بەڵام زۆرێک لە ئاغای گوندەکانی تریش هەر ئەویان بە سەرۆکی خۆیان دادەنا. لەناو دزەییان برایماغا و خزمەکانی بە بەرەی بایز ناویان دەرکردبوو کە لە ناوی بابیەوە هاتووە. جا لێرەدا بەڕاستی مایەی سەرسوڕمان و سەرنجکێشانە کە خۆی و ئەم خزمانەی چەند قۆز بوون، ئەمن دەتوانم حەوت هەشتێکیان دابنێم کە هەم لە رووی شۆخ و شەنگییەوە هەم بە رەوشت و ئەخلاقیانەوە لە ئەندازە بەدەر بەرزوباڵاتر بوون لە هەر پیاوێکی دیکە کە بتوانی لەناو بەرەبابەکانی ناحەزیان لە عەشیرەتی دزەیی دەست کەوێ، مەگەر لەوانەیە تەنیا خدری کوڕە گەورەی ئەحمەدپاشای لێ دەربێنی. "

بریتانییەکانی هەولێریش کە فوئاد حەمەخورشید تێبینییەکانیانی لە دووتوێی کتێبێکدا تەرجومەی عەرەبی کردووە لە لاپەڕە 57 دا دەربارەی برایماغا دەڵێن:

**کەسایەتییەکانی ئەم خێڵە:**

1 - " ئیبراهیم بایز ئاغا پیاوێکی بەتەمەنە، قۆزە، ئەخلاق و ڕەوشتێکی پیاوانەی هەیە. ڕۆشنبیرییەکی باشی هەیە کە دەتوانێ پێی ببێ بە باشترین سەرەک خێڵ. زانیارییەکی چاکی لە کاروباری کشتوکاڵدا هەیە. خەڵکەکە بە ڕادەیەکی یەکجار زۆر خۆشیان دەوێ. خەڵکی دیش هەموو ڕێزی لێ دەگرن. دەیتوانی سەرۆکایەتیی ژمارەیەکی زۆر لە عەشیرەتەکەی خۆی بکات، بەڵام هەولی ئاغاکانی دیکە ڕێیان لێ گرت. کەسایەتییەکی کاریگەر و چالاکیشە لە شەڕی ناوخۆی عەشیرەتان"

برایماغا کە لە دەیە دواییەکانی سەدەی نۆزدە و تا کۆچی دوایی لە ساڵی 1920 میری هەرە ناودار و دەسەڵاتداری ناوچەی دزەییاتی بووە، قەڵایەکی سەختی بۆ خۆی لە دەرەوەی مەخمور دروست کردبوو و شاری مەخموریشی کردبوو بە پایتەختی خۆی. ئەو مەملەکەتەی کە قەرەنی ئاغای باپیرە هەرەگەورەی 300 ساڵ پێشتر بنیادی نابوو، ئەم گەیاندییە سەری. ڕەفتاری برایماغاش لەگەڵ عەشیرەتە عەرەبەکانی کە چاویان بڕیبووە دەشتی قەراج و کەندێناوە، هەمان ڕەفتاری قەرەنی ئاغا بووە کە هەم بە خۆشی و ژن لێ خواستن و هەم بە ترساندن ئەو عەرەبانەشی بۆ خۆی ڕاکێشاوە و ئەوانیش چ بەڕاستییان بووبێ، چ لە ترسان، ڕێزێکی زۆر زۆر و تایبەتییان لێ گرتووە. برایماغا لە کۆی 19 ژن کە هێنابوونی چواریان لە بنەماڵە دەسەڵاتبەدەستەکانی ئەو عەشیرەتە عەرەبانە بوون. جا بەپێی چەندین دۆکومێنت دەردەکەوێ کە ئەم پیاوە گەورەیە چەندین ناوچەی ئەم دەشتەی هەولێری لە چاوتێبڕینی عەشایری عەرەب و عەرەباندن پاراستووە.

کەسایەتیی کوردپەروەری ناسراوی کورد، عەونی یوسف (یادی بەخێر) بۆ خۆمی گێڕایەوە کە یوسف ئەفەندیی باوکی لە سەردەمی دەسەڵاتی برایماغا قازیی هەولێر بووە و دۆستێکی نزیکی ئەویش بووە. جا کاك عەونی لە زاری باوکی بۆی گێڕامەوە کە جارێکیان برایماغا ئاگادار دەکرێت هەندێ عەشایەری عەرەبی ئەو ناوە وا خەریکی گوند دروستکردن و جووتکردن و کشتوکاڵن و بەردەوام حوشتر و پەزیان لە دەشتی قەراج دەلەوەڕێنن و هەوڵ دەدەن بەخشکەیی خۆیان لە قەراج نیشتەجێ بکەن. برایماغا هەست بە خەتەری ئەم دیاردەیە دەکات و ڕۆژێکیان بەدوای سەرۆکی ئەو عەشیرەتانەدا دەنێرێ بێن بۆ قەلاکەی. بۆ بەیانی سەرلەزوو یەکسەر بەبێ گیربوون ئەو سەرۆکانە دەگەنە دیوەخانەکەی برایماغا لە قەڵای مەخمور. ئەویش لەماڵەوە نانی بەیانیی خۆی دەخوات و وردە وردە بەرەو دیوەخان هەڵدەکشێ. کە دەگاتە لای میوانەکان ئەوانە هەموویان یەکسەر لە بەری هەڵدەستن، بەڵام ئەو لەجیاتی ماندوونەبوون لێ کردنیان و بەخێرهاتن کردنیان، بە عەرەبی لێیان دەپرسێ: «منو بیکم الچلب الچبیر؟» بە کوردی واتا «کامەتان سەگە گەورەکەتانە؟» ئیتر کە ڕیشسپییەکەیان بەجواب دێت و دەڵێ: «تونمر مولانا» واتا «ئەمر دەکەیت گەورەم» برایماغا پێیان ڕادەگەیەنێ کە هەتا بەیانی یەك حوشتروانی عەرەب، یەك جوتیاری عەرەب، یەك شوان و مەڕ و ماڵاتی عەرەب لەو دەشتی قەراجە بەدی بکرێ، خاك و خۆڵیان دەخاتە ناو توورەکەوە. ئاغا قسەی خۆی کرد ئینجا لەگەڵیان دانیشت و نەشیهێشت بڕۆن، نانێکی باشی نیوەڕۆی لەگەڵا خواردن و بەوپەڕی ڕێزیشەوە بەڕێی کردن.

هەر واشی لێ هات کە خۆی ویستبووی. تا برایماغا مابوو یەك عەرەبی نیشتەجێ بۆ دەرمانیش لەو دەشتی قەراجە نەمابوو. لەپاش کۆچی دوایی ئەو میرە گەورەیە لە ساڵی 1920 و دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق، هەر یەك ساڵ دواتر، وردە وردە گوندی عەرەبان

لێرە و لەوێ لە دەشتەکەی قەراجی قوت دەبوونەوە. چەند جوانە قسەی پێشینانی کورد: «حەیفە جێی شێران، ڕێوی لێ بکەن گێران!». قەڵاکەی برایماغاش تا چەند ساڵێك لەمەوبەر تەنیا شوێنی چەند دیوارێکی بەسەر یەکدا تەپیوی مابوو. ئێستاش هەر گردەکەی کە قەڵاکەی لەسەر بنیاد نرابوو ماوە و سەنگەری پێشمەرگەی لێیە بۆ بەرهەڵستیکردنی عەرەب لەگەڵ شوورەیەکی نزم. سەیرە بەزمی زەمانە: لە سەردەمی برایماغا یەک عەرەب دەیتوانی بەو ناوانەدا ڕەت بێ!؟

لەم ساڵانەی دوایی جارێکیان بۆ کڕینی دوومەڵان چووم بۆ مەخمور و لەناو شار لە کوڕێژگەیەکم پرسی: ڕۆڵە کامە ڕێ دەمبا بۆ قەڵای برایماغا؟ ئەمە وەرامی بوو: «برایماغا کێ یە!».

پرسیارێک لە وەزارەتی پەروەردە: نەنگ نیە منداڵەکانمان ئاگایان لەو مێژووەی میللەتی خۆیان نەبێ؟

برایماغا ساڵی 1920 واتا یەك ساڵ پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق، کۆچی دوایی کرد.

مەلا خالیدیش لە دەسنووسەکەی لە لاپەڕە 55 بەم شێوەیە باسی برایماغا دەکا:

" برایمی بایزی سەرۆکی گشت خزمانی خۆی بوو. پیاوەکی گەلێک ماقوڵ و شۆخ و شەنگ بوو. ئەگەر بڵێم لە دنیا مانەندی نیە ڕاستە.. ڕۆیشتە دەشتی قەراجی لە کەونە مەخمور قەڵایەکی زۆر توند و دژواری کرد. لەگەڵ هەموو ئاغایان و کێخوا دێیان پەیمانیان کرد و سوێندیان بۆ یەکدی خوارد، چی برایماغا بڵێ لە قسەی دەرنەچن. ئەویش هەڵستا ڕۆیشتە پێش حکوومەتی عوسمانلی هێندە مرازی لێ داوا کرد بۆنی سەربەخۆیی ناوخۆیانی لێ دەهات. وە هەموو کەس ئەزانێ کە حکوومەتی عوسمانلیش چ چەشنە ڕەوشت و بەدکاری دەربارەی کوردانی هەبوو. زانی ئەمە حسسەکی تازەیە ئەگەر بێتو قەبوڵ بکات، گەلێ کەسی دیکە ئەم جۆرە داوایەیان لێ

ئـەکات. لەبـەر ئەمـە قبوڵـی نەکـرد. ئینجـا برایماغـا خـۆی و هاواڵەکانـی کەوتنـە شـۆڕش هەڵگیرسـاندن. گەلێـک هەراوهۆریایـان لەگـەڵ تورکـە بەدفـەڕەکان کـرد و شـەڕەکی خوێناویـان لـە گونـدی عـارەب کەنـدی کـرد، پیاوەکـی نـاو حمـد الکلبـاوی کـوژرا و چەنـد زەپتییـەش هاتنـە کوشـتن...."

لەسـەر مردنـی برایماغـا، کاپتـن هێـی لـە لاپـەڕە 278 کتێبـی ناوبراویدا ئەمەی نووسـیوە:

"... ڕۆژی چـواری مانگــی ئـاب مـرد. لەمێـژ بـوو نەخـۆش بـوو و زۆر جـار دەگەیشـتە سـەر ڕۆخـی قەبـری کـە بۆیـە ڕەنگـە نەمانەکـەی حەسـانەوەیەک بێ بۆی. لەگـەڵ چوونـی ئـەو، کەسـایەتییەکی مێژوویـی، دروسـتکەری مەخمـور و بـۆ مـاوەی سـی و حـەوت سـاڵ سـەرۆکی هەرەبـاڵای عەشـیرەتی گـەورەی دزەیـی ڕۆیشـت. پیاوێکـی دیپلۆماتـی زیـرەک بـوو، پیاوێـک بـوو کـە بەڕاسـتی میللەتـی خـۆی خۆشدەویسـت و خۆشەویسـتی میللەتـی خـۆی بـوو.

## ئەحمەد پاشا

لەو دۆکومێنتانەی کە دەسەڵاتدارە براوەکانی جەنگ (بریتانییەکان) لەسەر باشووری کوردستانیان نووسیوە، باسی ئەحمەد پاشا - بەپێچەوانەی باسی برایماغا - زۆر جار بەنەرێنی (نێگاتیڤ) کراوە.

(دەبلیو . ئار . هێی) لە کتێبەکەی (دووساڵ لە کوردستانا) کە لە هەڵسەنگاندنی برایمی بایزی دەبێتەوە ئینجا هەر یەکسەر لەپاش ئەو دێتە سەر باسی سەرۆکە گرینگەکەی تری خێڵی دزەیی ئەحمەد پاشا و لە لاپەڕە 166-165ی کتێبی ناوبراویدا ئەمەی نووسیوە:

" ئێستاش با بچین بۆ لای ئەحمەد پاشا. ئەمیان پیاوێکی چکۆلەی لەخۆ ڕازی و قسە لەڕوو بوو و زۆر حەزی لە قسەکردن بوو. تەمەنی لە شەست ساڵ زیاتر دەبوو، پەروەردەیەکی باشی نەبوو و ڕەفتار و هەڵسوکەوتیشی سووکایەتیی لێ دەتکایەوە. ئەحمەد پاشا بە سەرۆک خێڵ نەدەچوو، بەڵکو وەک بازرگانێکی سەرکەوتوو، هەمیشە هەڵی لە ڕۆژانی تەنگانە وەردەگرت تاکو قازانجی نامەعقول بکات. زۆر جار بە (کافرۆش) ناویان دەهێنا و تەنیا مرازی لە ژیانا کەڵەکەکردنی سەروەت و سامان بوو، بۆ گەیشتن بەو مەبەستەش گوێی لە هیچ ئیعتیباراتێکی ئەخلاقی نەبوو. ئەحمەد پاشا چونکە نەیدەتوانی زمانی خۆی بگرێت و خەڵکیشی زۆر دەشکاندەوە، بۆیە نە بە دۆستێکی خۆشەویست دادەندرا، نە بە دوژمنێکی خەتەر. خۆی ئەگەر بێتو بە ڕێچکە و پیشەی ژیانی ڕابردوویدا بچیتەوە هەنگی تێ دەگەیت ئەم کەسایەتییەی ئێستای لە چ سەرچاوەیەکەوە هەڵقولاوە.

ئەحمەد پاشا لە ساڵە سەرابیەکانی ژیانیدا، چونکە قروشێکی لە گیرفاندا نەبووە، ژیانی خۆی لەسەر مێزەکانی قوماری قاوەخانەکانی هەولێر مسۆگەر دەکرد. بەڵام کە لەو کار و پیشەیە بێزار و وەڕس دەبێت، ڕۆژێکیان هەڵدەستێ دوو هێستر دەدزێت و هەڵدێ دەچێتە

کەندێتاوە کە تازە خەریک بوو ئاوەدان دەکرایەوە. لەوێ بیری ئەوە دەکاتەوە ئەویش گوندێک بۆ خۆی دروست بکات. جا هەڵدەستێ هەندێ جوتیار لە دەوروپشتی خۆی کۆ دەکاتەوە و دەست بە جووتکردن دەکەن بەڵام بەروبوومی ساڵی یەکەمیان سفر دەبێ. ئەویش داواکارییەک بۆ حکوومەتی تورک دەنووسێت داوای قەرزێک دەکا کە بتوانێ تۆوی بۆ خۆی و بۆ جوتیارەکانی پێ بکڕێت بۆ وەرزی داهاتوو. حکوومەت پارەیەکی زۆری دەداتێ کە بەسەر جوتیارەکاندا دابەشی بکات، کەچی ئەو هەر هەمووی بۆ خۆی گل دەداتەوە و دەست دەکا بەوەی کە بەقەرز بیانداتێ و بە فائیدەیەکی زۆر نامەعقوولیش. لەوێوە ئیتر دەستی بۆ هەرشتێک ببردایە، بۆی دەبوو بە زێڕ. ئێستاکە بە خۆی و بە خزمەکانی خاوەنی نزیکەی 18 گوندن و دەڵێن بای 200,000 پاوەن لیرەی زێڕی لە ماڵی خۆیدا هەیە و پارەیەکی زۆریش وەک فائیدە لە دەرەوە.

بەم سەروەتەی، ئەحمەد پاشا لە پلانەکانی بۆ زیاتر قاچاندنەوەی زەوی و زار و لە کێشە و گرفتەکانیشی لەگەڵ برایماغا هەمیشە توانیویەتی پشتیوانیی حکوومەتی تورک بۆ خۆی دابین بکات. برایماغا کە شتێکی کەمی لە فەلاحەکانی دەستاند و پارەیەکی زۆری - بە دەستبڵاوی - لە میوانداری و پیاوەتی و باروبووکردنی خزمەکانی دەڕژاند، ئەگەر لەگەڵ ئەحمەد پاشا بەراوردی بکەیت، دەستکورت بوو.

لە ئەنجام، ئەحمەد پاشا کە بۆی دەرکەوت دادپەروەریی بریتانیا بۆ کڕین نییە، یەکسەر دەستی بە پروپاگەندەی دژ بە حکوومەتی نوێ کرد و لەوە دەچێ ئەم هەرایەی کە ئێستا وا بەرپا بووە هەمووی بە فیتی ئەو بێ.»

میر بەسری، کە مێژووناسێکی جووی عیراقی بوو و کتێبێکی بە زمانی عەرەبی نووسیوە و عبدالخالق عەلائەدین لەژێر ناوی (ناودارانی کورد) تەرجومەی کوردیی کردووە لە لاپەڕە 170دا ئەمەی لەسەر

ئەحمەدپاشا نووسیوە: "... ئەحمەد پاشا لە بنەماڵەی حوسێن ئاغای بەناوبانگە کە پایەی پاشایەتی لە دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی والیی بەغدا تقی الدین پاشا پێ دراوە. لە ئەیلوولی 1920 ئاژاوەی لە ڕووی کاربەدەستانی بریتانی لەگەڵ حاجی پیرداوداغای دزەیی لە هەندێک ناوچەی هەولێر بەرپا کرد"

فوئاد حەمە خورشید لە ل 57 ی کتێبەکەی کە بریتانییەکانی یەکەم جەنگی جیهان لەسەر باشووری کوردستانیان نووسیوە، دەربارەی ئەو کەسایەتییە گرینگەی دزەییان دەڵێ "ئەحمەد پاشا وەک سەرەک خێڵێک ڕەفتار ناکات، ئەو تەواوی خولیای کەوتووەتە سەر کاروباری بازرگانی. دەڵێن ملیۆنێرە و ئەو فرۆفێڵەی کە بۆ پەیداکردنی ئەو سەروەت و سامانە زۆرە بەکاری هێناوە، هەر ئەوەشە کە ناوودەنگی لەناو خێڵەکەی خۆی پێ پەیدا کردووە. هەرچۆنێکی بێ، پیاوێکی زیرەکە و بە شێوەیەکی دەگمەن چوست و چالاکە. بەڵام هیچ گرنگییەک بە کاروباری کشتوکاڵ نادات. بە پێچەوانەی برایماغاش، ئەحمەد پاشا دژی شەڕوشۆڕی ناو عەشایرییە، چونکە ئەمە ئەنجامی خراپی دەبێ بۆ ئەو قازانجەی کە لە پارەکەی دەستی دەکەوێ. دەکرێ بڵێین کە ئەحمەد پاشا موونافیسی برایماغایە بۆ ناوودەنگی باش و ئەگەر هەر عەیبێکیشی لە ڕەوشتە عەشایرییەکەیدا هەبێ، بە زیرەکەی بەردەستی پینەی دەکات. بەڵام سەرەڕای ئەوەش پیاوێکی قرچۆکە"

مەلا خالیدیش بەم شێوەیە باسی ئەحمەد پاشا دەکات: « ئەحمەد پاشای حوسێن ئاغای، پیاوەکی زۆر ئاقڵ بوو. زۆر بە هەڕەشە بوو. دەوڵەمەندەکی چاک بوو. هەتا ساڵێک حکوومەتی عوسمانلی خەزێنەی چۆڵ بوو ئەحمەد پاشا چەند هەزار قروشی باروبوو کرد، ئەوانیش لە سزای ئەو چاکەیە ڕوتبەی پاشایەتییان دایێ. لە پێش مردنی چەند دێهاتی چاکی پەیدا کرد کە ئێستاش ماون».

لەتەک ئەحمەد پاشا چوار ڕێبەری بەرەبابی دیکەی دزەییان

پێشەبڕکێیان بووە، برایماغا، کە پێشتر باسمان کرد (بەرەی بایزی)، حاجی پیرداوداغا (بەرەی فارساغا)، مەحمودی کاکەخانی (بەرەی کاکەخان) و ڕەسول ئاغا (بەرەی مام خولە). بەڵام پێشبڕکێی ڕاستەقینە زیاتر لەنێوان دوو سەرۆکە گرینگترەکەدا بوو، ئەحمەد پاشا و برایماغا، کە چەند ساڵێک پێشتر خوێنیش کەوتبووە بەینیان. پاشا چون زیاتر مەیلی کار و کارداری و بازرگانیی دەکرد تا خۆ خەریککردن بە کاروباری عەشایری و ئەقڵێکی کارداری (بزنز business) ی زۆر سەیری هەبووە، بۆیە لە ڕادەبەدەر دەوڵەمەند بووبوو و ئەفسانە دەڵێ کە گۆیا بە خەرمان لیرەی زێڕی هەڵدەدایەوە. هەرچی برایماغایە ئەمیان سەرەڕای ئەوەی کە خۆی و براکانی بەروبوومی دێهاتێکی زۆریان لە هەرسێ ناوچەی دزەییاتی (مولکیە، کەندیناوە، قەراج) دەڕنی، بەڵام وا دیارە لای ئەو بەها و نەریتی عەشایری لە سەرووی پارە کۆکردنەوە بووە. ئەو سەردەمەش و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دەوڵەمەندبوون پتر بە ڕێگای کارداریەوە (بزنز business) ئاسانتر و خێراتر بووە تا بە ڕێگای کشتوکاڵ و چاندنەوە. هەرچەندە کە ساردیش لەنێوان ئەم دوو بەرەبابە هەر هەبوو و کوڕ و برازای یەکتریشیان کوشتبوو، کەچی کە دەگەیشتنە یەک، ڕێزکی زۆریان بۆ یەکدی دەنواند بەتایبەتی ئەحمەد پاشا بەرامبەر بە برایماغا وا بووە، کە لە خۆی بەتەمەنتر بووە و بن ئامۆزای حوسێناغای بابی بووە. تەنانەت دەگێڕنەوە جارێکیان ئەحمەد پاشا نیازی ئەوەی دەبێ بەتەواوی پشت لە عەشیرەتگەری بکات و بڕوا خانووێک لە شاری هەولێر دروست بکات بۆ یەکجاری لەوێ دابنیشێ وەک خاڵەکانی ببێ بە شارنشین (دایکی ئەحمەد پاشا و یەکێک لە هاوسەرەکانیشی هەولێری بوون) و خۆی تەنیا بە کارداری و بازرگانییەکەی خەریک بکات. بەڵام کە برایماغا بەوە دەزانێ، زۆر نیگەران دەبێت و بە ئەحمەد پاشا دەڵێ: "ئەحمەد، ئەوە بەتەمای چی؟ ئەوە ڕاستە دەڵێن بە تەمای بچی لە هەولێر دابنیشی؟!، بڕام، ئێمە و شاریان گوتووە!

ئەدی ئەگەر سبەینێ سەت سوار میوانت بوون، لە کوێیان دادەنێیت! ئەسپەکانیان لە کوێ دادەکەیت! ئەو هەموو تەویلە و ئاخورە لە ناوشار چۆن جێی دەبێتەوە؟! " بەم قسانە پاشا ئیقناع دەکات واز لەو نیازەی بێنێت و هەر لە گوندەکەی خۆی قشاغلو بمێنێتەوە.

هەر لە سەر باسی ئەحمەدپاشا بەردەوامم و پێم وایە لێرەدا کژی هاتووە چیرۆکێکی تری بەڕاستی قەوماو بگێڕمەوە کە ئەحمەدپاشا خۆی یەکێک بووە لە دوو ئەکتەرە سەرەکییەکان. ئەکتەری دووەمی رووداوەکە، خاتوون هەمینەی مەولود هەولێری، خۆی بە وردەکارییەوە بۆ خزمی گێڕاوەتەوە.

## ئەحمەدپاشا و هەمینەی مەولود هەولێری

گوندی قشاغلو لە ناوچەی ملکیە لە بناری زنجیرەتەلانی زوورگەزراو پایتەختی بەرەی پاشای دزەیی بوو. ئەحمەدپاشا خۆی لەوێ دادەنیشت و دیوەخانە جوانەکەشی لەسەر گردی ناو گوند بوو. گوندی دووگردکانیش ئاقاری لەگەڵ قشاغلو یەکە و هەردوو گوند، ڕەنگە هەر چوار پێنج کیلۆمەتر لێک دوور بن. دووگردکان هی حەمەدەمینی بایزی (بابی هۆمەر دزەیی) و هی ڕەحماناغای برای بوو کە هەردووکیان برابچووکی برایماغا بوون لە بەرەی بایزی.

شەڕ گەرمە لەنێوان ئەو دوو بەرەبابە ئامۆزایەی یەکتری و چەند خزمی نزیکی یەکتریشیان کوشتووە لەناویاندا عەولا بەگی کوڕی ئەحمەدپاشا و عەزیزی خورشیدی برازای برایماغا. عەولا بەگ لە شەڕێکدا بریندار بووبوو، دواتر هەر بەو برینە سەری نابۆوە.

شەڕ گەرمە لە ساکەگۆڕی ئاقاری هەردوو گوندان بە سواری ئەسپ و بە تفەنگی جانبێزار و ماوزەڕ و ئینگلیزی و تفەنگە ڕەشکە و قەرەبینای ئەو زەمانی (نازانم چ ساڵێک بووە، لەوانەیە سەرایی سەدەی بیست یان چەند ساڵێک زووتر بووبێ.) مەولود ئاغای هیدایەت

ئاغـای عوزێـری کـە بـە مەولـود هەولێـری ناسـراو بـوو (دزەیـی نەبـوو، هەولێـری بـوو) دەستەڕاسـت و پرسـپێکەری حەمەدەمیناغـای بابـم بـوو و پیاوێکـی دنیـا دیتـەی زۆر ئاقڵ بـوو و لەنـاو هەمـوو بەرەبابەکانـی دزەیـی ڕێـزی لـێ دەگیـرا. هەچەنـدە کـە ڕەحمـان ئاغـا لـە حەمەدەمیـن ئاغـای براشـی گەورەتـر بـوو، بـەڵام چونکـە لەلایەکـەوە دایکیشـی و یەکێـک لـە ژنەکانیشـی لـە بـەرەی پاشـا بـوون (ئەحمـەد پاشـا خاڵـی بـوو) و لەلایەکـی تریشـەوە دینـدار بـوو و حـەزی لـەو شەڕوشـۆڕەی نـاو خزمـان نەدەکـرد، بۆیـە شـەڕە بەڕاستییەکە بـە ملـی حەمەدەمیناغـای بـرا بچووکیـدا هاتبـوو، هـەروەک کـە مـەلا خالیـد دەنووسـێ دەڵـێ "حەمەدەمینـی بایـزی مرۆیەکـی زۆر شـۆخ بـوو، سـوارەکی گەلێـک عەگیـد بـوو، زۆر شەڕوشـۆڕی لەگـەڵ ماڵـی فـارس ئاغـا و ئەحمـەد پاشـای کـرد...."

یەکێـک لـەو سـوارانەی ماڵـی بایـزی مەولـود هەولێـری بـوو، لەگـەڵ لەشـکرێکی پیـاو و خزمەتـکاران لـە گەرمـەی شـەڕدا دەبـن. مەولـود هەولێـری نـۆ گوللـەی پـێ دەکەوێـت لـە ئەسپەکەی دەکەوێتـە خـوارەوە و لەنـاو ئاقـاری لەنـاو خوێنـی خۆیـدا دەگـەوزێ. شـەڕکەرانی ماڵـی پاشـا زووتـر دەگەنـە سـەری و بـە برینـداری پەلکێشـی دەکـەن بـۆ لای بـەرەی خۆیـان بـەڵام هـەر نـۆ گوللـە بـە ڕان و لینگـی کەوتبـوون، کـە ئەگـەر خوێـن چۆڕانـەوە نەبوایـە مەترسـیی مردنـی لەسـەر نەبـوو. کـە شـەڕی ئـەو ڕۆژە دەبڕێتـەوە، مەولـود هەولێـری بـە برینـداری و خوێـن لێچۆڕانەوەیەکـی زۆر سـەخت دەبەنـە قشـاغلو، ئەحمەدپاشـا دەڵـێ ئـەو سـەگبابەی فـڕێ دەنـە نـاو تەویلـەی ولاخـان، وای لـێ دەکـەن. لـە شـوێنی ڕووداوەکـەش ئەسـپی مەولوداغـا کـە دەبینـێ وا سـوارە بەدبەختەکـەی پەڕیـوە و نەیاریـش هاتـوون پەلکێشـی دەکـەن، هەوڵێکـی زۆری دابـوو بـە چەپـۆکان بەرهەڵسـتیان بـکات و خـۆی ئـاگای لـە ئاغەکـەی خـۆی بـێ، بـەڵام هەوڵەکانـی بـێ سـوود دەبـن و ئەویـش یەکسـەر پرتـاو ڕوو لـە دووگـردکان دەکاتـەوە و هەتـا بەردەرکـی ماڵـی خۆیـان لێـی ناگەڕێتـەوە. کـە هەمینـە خانـی هاوسـەری مەولـود هەولێـری هەسـت دەکات تەقـە

بڕاوە، کەواتا دیارە شەڕ وەستاوە، لەبەر دالآنی ماڵەکەیان دەوەستێت، ڕووی دەداتە ڕێی قشاغلو و چاوی دەکاتە دووربین بەڵام لەبەر تۆزی لەشکری گەڕاوە، هیچی لێ دیار نابێ. لەپڕ ئەسپی مەولوداغای لێ بەدەردەکەوێ کە بەپێش هەموو سوارەکان کەوتبوو و گەیشتە بەردەم هەمینە خان وەستا سەری خۆی بۆ لای قشاغلو با دەدا و دەیحیلانند. هەمینە کە دەبینێ ئەسپ بێ سوارە و زین و تەنگەی ئەسپیش بە خوێن سوور هەڵگەڕاوە، سێ و دووی لێ ناکات، پڕ دەداتە لغاوی، پێی لە ڕکێفی گیر دەکات و خۆی هەڵدەداتە سەر زینی، پڕتاو، قشاغلو خۆت بگرە. یەکسەر بۆ سەر گرد و بەردەرگای دیوەخانی پاشا. نۆکەر و نۆبەدار بەسەرسووڕمانەوە جڵەوی ولاخەکەی لێ وەردەگرن، ئەویش هەڵدەکوتێتە ژوورێ و بەبێ سەلامون عەلێکوم دەچێتە سەری مەجلیسێ و لە تەنیشت ئەحمەدپاشا دادەنیشێ، هەر یەکسەر دەست لە بناگوێی دەنێت حەیران بەدوای حەیران، حەیران بەدوای حەیران، ئەوەی دەیلێت نایلێتەوە و هەمووشی بە ئیرتیجالی بەسەر مەولودی مێردیدا هەڵدەڵێ (هەڵبەت وای دەزانی کە دەبێ مردبێ.) هەمینەی مەولود هەولێری ژنێکی ناسراو بوو لەناو ئاغاژنە دزەییەکان و یار و یاوەری هەمیشەی کافیەخانی هاوسەری حەمەدەمیناغا بوو (دایکی هۆمەر دزەیی) و حەیرانبێژێکی بێ وێنەش بووە. پاشا و ئەو هەموو ڕیشسپیانەی کە دەورەیان دابوو، چاویان پڕ دەبێ لە گریان و ئەحمەدپاشا قۆڵی هەمینە دەگرێت و سەری ماچ دەکا دەڵێ: "هەمینە بەسە ئاگرت تێ بەردام" دەڵێ کورە زەلام بڕۆن مەولودی لە تەویلە دەربێنن، ئەسپێکی دیکەش حازرکەن مەولودی لێ سوارکەن با دوو کەس ئەملاو ئەولای بگرێ لەگەڵ هەمینە بیانگەیێننەوە دووگردکان. کە هەمینە دەزانێ مەولود ماوە و بەبریندداری لە تەویلە فڕێ دراوە، ڕوو لە ئەحمەدپاشا دەکات دەڵێ: "ئەتو بە خۆشت دەڵێی پاشا، کورە قەت عەیبت نەکرد مەولودت بەبریندداری فڕێ دایتە ناو تەویلەی! مەولود ئاغا هی ناو تەویلەیە!؟".

بەڵام کوڕە گەورەکەی ئەحمەدپاشا، خدر، کە لەپاش بابی بووە یەکێک لە پیاوە هەرە گەورەکانی هەموو دزەیی، ئەو دیار بوو هەر هەینێکە سوخەتی مەردایەتی و پیاوەتی و مرۆڤایەتیی لێ دەتکایەوە. پاشای کوڕی خدری پاشای بۆ خۆمی گێڕاوەتەوە کە خدری باوکی ئەو ڕەفتارەی ئەحمەد پاشای بابی لەگەڵ مەولود هەولێری زۆر پێ نابەجێ و شوورەیی بووە کە بەهیچ بیانوویەک لەگەڵ دابونەریتی سوارچاکی و مەردایەتیی ئەو سەردەمەدا نەدەگونجا، بۆیە بە دزی بابیەوە دەچووە تەویلەکە پشتێنی خۆی دەدڕاند و چەند تیلمە و پارچەی لێ دەکردەوە، برینەکانی مەولودی پێ دەپێچایەوە. محەمەدی کوڕی مەولود هەولێریش لە زاری باوکییەوە بۆ خۆمی دەگێڕایەوە، کە باوکی لە تەویلە گوێی لێ دەبوو ئەحمەدپاشا بە خدری کوڕی گوتووە: "ئەوە لە کوێ بوویت گۆڕ بەگۆڕ باب، ئەوە چووبووی مەولودی تیمار بکەی هەتا چاکی بکەیتەوە، هەی......!" دەڵێن ئەحمەدپاشا لە قسەکردندا زۆر زمانپیس و بێشەرم بووە.

هەمینەی مەولود هەولێری کە بە سۆز و خرۆشی حەیرانەکانی توانی مێردەکەی لە مردنێکی مسۆگەر ڕزگار بکات، لەگەڵ مەولوداغای هاوسەری تا نیوەی دووەمی شەستەکانی سەدەی بیست مابوون. مەولوداغا تەمەنی لە سەت ساڵ تێپەڕی کردبوو و بە شەلەشەل بە گۆپاڵ دەڕۆیشت و لە دانیشتنیشیا دەبوایە لاقێکی هەر درێژ بکات. هەمینەی مەولود هەولێریش کە من و خوشک و براکانم بە (دایە هەمە) بانگمان دەکرد زۆر قسەخۆش و نوکتەچی بوو. هەرجارێکی ئەم جۆرە مێژووانەی بۆ بگێڕابایناوە هەمووی بە پێکەنین و نوکتە دەگێڕایەوە، بەڵام ناوەناوە چەند بەندە حەیرانێکی بەنزمی دەخستە ناو قسەکانیەوە، گەرووی پڕ دەبوو لە گریان و حەیرانەکەی بۆ تەواو نەدەکرا.

هەر چۆنێکی بێ، هەرچییەکی بە چاکە و بە خراپە دەرهەق بە ئەحمەدپاشا نووسرابێت و گوترابێتیش بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێت ئەو پیاوە توانی بە دەستوبازووی خۆی، بە ئەقڵێکی نەسرەوت و سووربوون بگات بەو مەبەستەی کە دیارە ڕەچاوی کردبوو و بە گیرفانی بەتاڵی و لاتیی سالانی نەوجوانی و هەرزەکارییەوەی لەم قاوەخانە بۆ ئەو قاوەخانەی هەولێر، توانی خۆی بگەیەنێتە ترۆپکی پایە و پلەی ڕەهبەرێکی کاریگەر هەم لەناو خێڵی دزەیی و هەم لە مەیدانی سیاسەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سالانی سەرایی سەدەی بیستەم و هی بریتانییەکانی دوای ئەوانیش کە حیسابیان بۆ دەکرد.

حەز دەکەم ئەوەش بزاندرێت کە بۆ پاساو هێنانەوەشم نییە بەڵکو حەقیقەتێکی مێژووییە کە W.R.Hay لە لاپەڕە 166ی کتێبەکەی (Two Years in Kurdistan)دا دەڵێ " ئەحمەدپاشا لە هەرەتی لاویدا دوو هێستری دزی و هەڵات بۆ کەندیناوە و لەوێ چەند جوتیارێکی بەگەڵ خۆی دا و گوندێکی بۆ خۆی ئاوەدان کردەوە. "جا ئەوەی کە من لێرەدا مەبەستمە پیشاندانی ڕوخسارێکی گۆمەڵگای خێڵەکیی ئەو سەردەمە دێرینانەیە کە لەو زەمانە دزیکردن کەمی و سووکی نەبووە بەڵکو نیشانەی ئازایەتی و بێمنەتی و (تەحەداکردن) بووە، بەتایبەتی ئەگەر لە نەیار و ناحەزان بکرایە (پێت دەوەستم، ڕاناوەستم). لە ئەوروپاش و لەناو کاوبۆیەکانی ئەمەریکاش هەر وابووە. هەر بۆ نموونە، لە سالانی نیوەی دووەمی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، ئەمن - تەبای کوردێکی زۆری دیکە، لەناومانا سیاسەتکاری دێرین و شاعیری ناسراو ئیبراهیم ئەحمەدیش - لە لەندەن پەنابەر بووم. ڕۆژێکیان کاک برایم بۆی گێڕامەوە کە ئەو لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم لە هەولێر حاکم بووە. گوتی جارێکیان دزییەک کرابوو و کابرایەکی شوێنهەڵگریان برد ماڵە دزیارییەکە بدۆزێتەوە. {ئەو کابرایە عەلی عەبدولای شوونهەڵگری مەشهور بوو کە خۆم چاکم دەناسی و کوڕەکانی، حەمەدکۆ و شەریف، لەگەڵ خۆم و کاک موحسین

و کاک سەعدی برام، لە قوتابخانە بوون - هۆمەر دزەیی}. کاک برایم گوتی کابرای پسپۆڕ لە شوێنهەڵگرتنا ڕێڕەوی دزەکانی گەیاندە گوندی (باقرتە)ی مستەفای مەلای برای حوسێنی مەلای دزەیی. گوتی منیش بەڕاستی کەوتمە هەڵوێستێکی زۆر ناخۆشەوە، چونکە حوسێنی مەلای کەسایەتییەکی زۆر گەورە و ناسراوی ئەو سەردەمە و ئەندامی پێشووی یەکەم پەرلەمانی عیراقیش بوو. گوتی بیرم کردەوە چارەیەکی سازان بدۆزمەوە، هەڵستام پەیوەندیم بە حوسێن ئاغاوە کرد گوتم حەز ناکەم و بۆ ئێوە جوان نییە ئەم ڕووداوە بگاتە ڕەسمیاتی دادگا، لەبەرئەوە با ماڵە دزیارییەکە هەمووی بدەنەوە خاوەنەکەی و منیش کەیسەکە دادەخەم، وەک هیچ نەبووبێ وای لێ ئەکەین. گوتی حوسێن ئاغاش گوتی وەڵلاهی برایم، ئێمە عەشیرەتین و عەشیرەتیش بێ دز چۆن عەشیرەتێکە، ئینجا کەیفی خۆتە!

جارێکی دیکەش هاوار ئاغای برایماغای دزەیی (1919 - 2014) کە کوڕی برایماغای گەورە و ئامۆزا و زاوای خۆیشم بوو، بۆی گێڕامەوە کە گەنج بووە گەورەکانی داوایان لێ کردووە بچێ کلکی ولاخەکانی ماڵی پاشا ببڕێت بۆ هەتککردن. گوتی دوای نیوەشەو لەگەڵ چەند خزمەتکاران چووین و کلکی چەند هێسترێکمان بڕی. جا ئەمە پەیام بووە بۆ دوژمن و ناحەزان کە ئێمە هاتین و وا هەتکتان دەکەین، ئێوەش ئاگاتان لە خۆتان نییە! قسەیەکی کۆنی (کورد و گۆران) هەیە کە کوردی عەشایر بۆ سووککردنی کوردی شارستان ئەمەیان پێ دەگوتن "مانگەشەوە، تەققە و تەوە، گۆرانە حیزە چاو لە خەوە"

دنیای ئەو سەردەمە وا بووە و ڕاستییەکەی هەر لەبەرئەوەش بووە کە ئینگلیزەکان ( قانون دعاوی العشائر)یان بۆ عیراقی نوێ دانا، چونکە نەدەکرا و نەشیاندەویست هەموو بەند و بڕگەکانی قانوونی مەدەنیی مۆدێرن، بەسەر کۆمەڵگایەکی خێڵەکیدا پیادە بکەن و مل لەبەر ملی کولتوورێکی سەدان ساڵ کۆن بنێن و بە یەک بڕیار

هەڵیوەشێننەوە. خۆ بریتانیا خۆیشی لەپڕ نەبووبوو بە کوڕ، سیستەمە دیموکراسیەکەی ئەمڕۆیان زادەی سەدان ساڵ بەرەوپێشچوونی هەنگاو بە هەنگاو، نەک لەناکاو بووە.

ئەحمەدپاشا براگەورەی براکانی خۆی نەبووە، پێم وایە حاجی نادری برای لەم و لە حەمەداغای براشیان گەورەتر بووە، بەڵام ئەحمەدپاشا لەبەر دەوڵەمەندیەکەی زیاتر دیار و ناسراو و دەستڕۆیشتووتر بووە و دیارە کەسایەتیەکی خۆسەپێنەری هەبووە، بۆیە بەرەبابەکەش هەر سەبارەت بەو کەسایەتییەی ئەوەوە ناوی بوو بە بەرەبابی پاشا. ئەحمەدپاشا دەبێ زۆر دووربین بووبێ. سەت ساڵ لەمەوپێش تێگەیشتبوو کە وەک بە ئینگلیزی دەڵێن money is power واتا (پارە هێزە) یان money talks واتا (پارە قسە دەکا). بەڵام لەوە ناچێ لە سیاسەتیش بە هەمان ڕادە دووربین بووبێ. ئەو هەر وای دەزانی ئەو گەندەڵی و بەرەڵاییەی لە حکوومەتی عوسمانلی تورکدا هەبوو لە حکوومەتە نوێکەی بریتانیش هەروا دەبێ. جا کە بۆی دەردەکەوێت ئەمانە ناکرێن هەڵدەستێ دەست بە بزووتنەوە دەکات لە دژیان بەو هیوایەی کە دەسەڵاتی عوسمانییەکان بگەڕێتەوە. مقۆمقۆش بڵاو بوبۆوە کە ئینگلیز بەتەما نییە لە کوردستان بمێنێتەوە و وا خەریکی دان و سەندنە لەگەڵ تورک و لەوانەیە کوردستان بداتەوە ئەوان.

هەر چۆنێکی بێ، سروشت و خوو و ڕەوشتی ئینسان زادەی دوو سەرچاوەیە: جینات (بە زگماک) و ژینگە. دیارە ئەم دووانە هەردووکیان کاریگەر بووینە لە ( لەقاڵبدانی) کەسایەتیی ئەحمەدپاشا. بەڵام هەندێک لە دزەییەکان، هەرچەندە کە دانی پیادەنێن ئەحمەدپاشا زیاتر حەزی لە کارداری و بازرگانی بووە تا خۆخەریککردن بە کاروبار و دابونەریتی عەشایری، وەک پاکانە و پاساو بۆ ئەحمەد پاشا دەڵێن بریتانییەکان ڕکیان لە ئەحمەد پاشا و لە حاجی پیرداوداغا و لە ڕەسول ئاغا دەبۆوە، چونکە ئەم سێ سەرۆکە دەسەڵاتدارەی دزەییان، بە پێچەوانەی دوو براکە (برایماغا و خورشیداغا) نەهاتوونەتە ژێر

باری ئینگلیز و هەر وەفاداری حکوومەتی پێشووی تورک بووین، بۆیە دەسەڵاتدارە بریتانیەکانی هەولێر هەوڵیان داوە ناوی ئەم سیانە بزڕێنن، سووکیان بکەن و ئەم سیفەتە خراپانەی کەسایەتییانیان بۆ هەڵبەستاون.

دوور لە پاکانەکردن بۆ لایەنە نەرێنییەکانی (نێگاتیڤەکان)ی ئەحمەدپاشا، بەلای منەوە ئەگەر ڕەخنەی توند و گلەیی و گازاندەی زۆر لە ڕابردووەکەی هەشبووبێ، دەبێ ئەو میراتە جوانەی بۆ حسێب بکرێ کە لەپاش خۆی بەجێی هێشت: ئەولاد و نەوەی.

خدربەگی کوڕە گەورەی ئەحمەد پاشا، شایەستەی ئەوە بوو سەرۆکایەتیی هەموو دزەییان - نەک هەر هی بەرەبابەکەی خۆی - بکات، ئەگەر ڕکابەری و ناکۆکییەکانی ناوخۆی ڕابردوو ڕێیان لێ نەگرتبا، وەک کە پێشتر ڕێیان لە برایماغا دەگرت.

کوڕ و کوڕەزاکانی ئەحمەد پاشاش چون لەناو نازونیعمەتی سەروەت و سامانی بابیان و باپیریان گەورە بووبوون، زۆرترایەتیی هەرە زۆریان بوون بە خاوەنی باوەڕنامەی زانکۆیان و لە بواری پەروەردە و ڕۆشەنبیری و نیشتمانپەروەری و بزنسیشدا، ناویان دیار بووە و پۆستی گەورە گەورەی حکوومەتیشیان وەرگرتووە. نەک هەر ئەولاد و نەوەی ڕاستەوخۆی خۆی، بگرە تەواوی بەرەبابەکەی بە برا و برازاکانی و ئامۆزا و خزم و کەسی باب و باپیرانیشیەوە، هەر هەموویان بەری درەختە بەردارەکەی کەسایەتیی ئەحمەد پاشا دەڕنن.

بەکورتی، بەرەی پاشا لەناو دزەییان، کە پاشماوەی ئەم ئەحمەد پاشایەیە، لەپاش خۆی بە ژن و پیاوەوە بوو بە پۆشتەترین و پرشنگدارترین و بەزەوقترین و بەردەوامیش خۆشگوزەرانترین بەرەبابی هەموو دزەییان.

لەبیریشمان نەچێ کە لە مێژووی هەر میللەتێکی ئەم جیهانە پان و پۆڕەدا کەسایەتیی وا هەڵکەوتوون کە ناو و دەنگی جیهانییان هەبووە و ڕێزی دنیایان بۆ خۆیان وەدەست هێناوە، کەچی تۆ ئەگەر بێت و

- بە مەفهومی ئەمڕۆ - بە وردی ڕەوشت و ڕەفتاریان هەڵسەنگێنیت، ڕەنگە لایەنە شاراوەکانیان بتحەپەسێنێ. دنیاش هەر وا بووە و هەر واش دەبێ، کەس مەلائیکەت نییە.

## پیرداود ئاغا

لەپاش برایماغا و ئەحمە دپاشا، ئینجا کاپتن هێی لە کتێبەکەی (دوو ساڵ لە کوردستانا) Two Years in Kurdistan دێتە سەر باسی کەسایەتیی سێیەمی دزەیی، حاجی پیرداوداغا و دەڵێ:

"حاجی پیرداود پیاوێکی چکۆلەی بەڵام تارادەیەک قۆزی پەنجاوپێنج ساڵی دەبوو. دوو چاوی ڕەشی پڕ لە وریایی و زیرەکی و سمێڵێکی درێژی ئاوریشمینی هەبوو. بەڵام ئەو لەوانی تر زۆر جیا بوو. دەنگێکی نەرمی زۆر جوانی هەبوو، بەڵام دڵێکی ئیبلیسی. ئەمن کەسم نەدیبوو شیعری فارسی وەک ئەو وا جوان بڵێتەوە. لە هەولێرێ بە خۆی و بە تەواوی بەرەبابەکەی ئەویان دەگوت (مەلعون) کە ئەگەر تەرجومەی حەرفی بکەیت (لەعنەت لێکراو) دەردەچێ، بەڵام ڕەنگە تەرجومەیەکی باشتری (بەدبەخت) بێ. ژمارەیەکی زۆری ئەم بەرەبابە، سەرسوور و مەیلەو پووخەڵە و گەلێکیان دەردەداریشن. حاجی پیرداود پەروەردەیەکی باشی هەبوو و پیلان و تەگبیرەکانی زۆر ڕێویانی بوون. حاجی پیرداود لە بزووتنەوەی دژ بە حکوومەت، بەگەڵ ئەحمەد پاشا کەوت، ئەقڵ لە خۆی و پارەش لەو. هەرچەندە کە پیاوێکی مێیازی فێڵبازی بێ مەبدەئی دڵڕەقیش بوو، کەچی خۆی وەک دیندار پیشان دەدا و حەجیشی کردبوو، بەڵام دەڵێن حەجەکەی هەر لەبەرئەوە بووە کە ئەو وەختە بارودۆخی ولاتەکەی خۆی بە دڵ نەبووە. لەگەڵ خزمەکانی نزیکەی هەژدە گوندیان هەیە"

فوئاد حەمەخورشیدیش لە کتێبی (العشائر الکردیە) کە لە ئینگلیزییەوە تەرجومەی عەرەبیی کردووە، ئەمەی لەسەر پیرداود ئاغا نووسیوە:

**حاجی پیرداود**

ئەم پیاوە وەکو دوانەکەی پێشتر دەستی ناڕوا، بەڵام ناکرێ پلە و پایە و کاریگەریی پشتگوێ بخرێ. پیاوێکە لە قسەکردندا ڕاشکاوە و کەسایەتییەکی بەهێزی هەیە، بەڵام شارەزاییەکی ئەوتۆی نییە. دەڵێن موڵکێکی باشی هەیە و فەلاحەکانیشی خۆشیان دەوێ. هێزەکەشی لەوەدایە کە ژمارەیەکی زۆر لە گوندی هەیە کە یان ڕاستەوخۆ یان بە ڕێگای جەماعەتی خۆی و سەرکارەکانی بەڕێوەیان دەبا."

مەلا خالیدی مورتکە لە لاپەڕە 30 ی دەسنووسەکەیدا، تەنیا بە دوو دێڕ ناوی پیرداوداغای هێناوە دەڵێ "حاجی پیرداودی ئۆمەراغای لە ساڵی (1340)ی هیجری، وەفاتی کرد، شەش کوڕی لەپاش بەجێ ما، ئاغا، حوسێن، مەعروف، حەسەن، مستەفا، مەحمود"

## ڕەسول ئاغا

با بگەڕێینەوە بۆ لای کاپتن هێی، کە لە لاپەڕە 167ی کتێبی ناوبراویدا دەڵێ " چوارەم سەرۆک، ڕەسول ئاغایە، کە پێشتر دیبوومان، ئەگەر لەگەڵ ئەوانی تر بەراوردی بکەیت، ئەمیان ئەو گرنگییەی نییە" بەڵێ، کاپتن هێی ڕەسول ئاغای پێشتر لە شارۆچکەی دیبەگە دیبوو و لە لاپەڕە 121 ئەوها باسی کردووە "... نانم لەگەڵ ڕەسول ئاغا خواردبوو کە گرینگیی لە هەرچوار سەرۆکە حوکم بەدەستەکەی تری دزەیی کەمترە، بەڵام میوانداریيەکی زۆر پیاوانەی کردم. ڕەسول ئاغا دەنگی زۆر بەرزە و کە قسە دەکات دەیکا بە هەرا و بەبێ ئوسولیش سووکایەتی بە خەڵک دەکات بەڵام، بە بەراورد، پەروەردەیەکی باشی هەیە."

مەلا خالیدی مورتکەش لە لاپەڕە 39ی دەسنووسەکەی دوو

دێری لەسەر ڕەسول ئاغا نووسیوە، دەڵێ: "ڕەسولی حەمەد سادقی، پیاوەکی زۆر زانا بوو، تەگبیرچییەکی عەجایب بوو، زوبانی تورکیی چاک ئەزانی لە ساڵی 1933 وەفاتی کرد، دوو کوڕی لەپاش بەجێ ما، سلێمان و خسرۆ."

## مەحمودی کاکەخانی

ئینگلیزەکانی تازە هاتوو بۆ کوردستان، هیچ باسی ئەم مەحموداغایەیان نەکردووە، لەوە دەچێ چونکە ئەو پیاوە گەورەیەی خێڵی دزەیی ساڵی 1918 کۆچی دوایی کردبوو کە بریتانییەکان هێشتا نەگەیشتبوون، یان تازە گەیشتبوونە، ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان). بەڵام ئەو یەکێک بووە لە گەورەپیاوانی دزەیی و سەرۆکی ئەو سەردەمەی بەرەبابی کاکەخان بووە. مەلا خالید لە لاپەڕە 36ی دەسنووسەکەیدا، بەم شێوەیە باسی کردووە " مەحمودی کاکەخانی، پیاوەکی زۆر ئازا و بەناو بوو. لەگەڵ حکوومەتی عوسمانلی دائیم لە شۆڕشدا بوو هەتا کەرەتێک کەریم بەگی میرئالا لە گردمەلا خانووەکەی هەموو سووتاند و ماڵەکەشی لووس تالان کرد. خولاسە لە دەوری خۆی لەگەڵ برایماغای بایزی بە یەک تەرازوو ئەکێشران. لە ساڵی 1918 وەفاتی کرد. چوار کوڕی لەپاش بەجێ ما، عەلی، سابیر، تاهیر، شێمحەمەد"

ساڵانی جەنگی گەورە (1914-1918) و چەند ساڵێکیش دوای برانەوەی جەنگ هێشتا بە تەواوی یەکلا نەبووبووەوە، چۆن چۆنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی دابەش بکرێت. بەڕێوەبەرایەتیی بریتانی کە خەریک بوو لە ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) جێگیر بێ، هەوڵی دەدا ئەم وڵاتە نوێیەی کە بەنیاز بوو بە ناوی عیراق دایبمەزرێنێ لە گەردی سەدان ساڵ دواکەوتوویی تورکە عوسمانییەکان

دابوەشێنێت و بیکات بە وڵاتێکی مۆدێرن. بۆ وەئەنجامدانی ئەم نەخشەیەش تەنیا یارمەتیی هێزی چەکداری خێڵە گەورەکان بەس نەبوو چون زۆرترایەتیی ئەمانە نەخوێندەوار بوون، بۆیە پێویستیی بە توێژێکی نوێی گەنجی خوێندەوار دەبوو کە ئەمەش لەناو چینی بورژوازی ڕۆشەنبیریی شارەکاندا دەست دەکەوت. ئەوەبوو کە لەناو شاری هەولێر ئەحمەد ئەفەندی (ئەحمەد عوسمان، شارەوانی هەولێر) و لەناو دزەییانیش خورشیداغای ( مامی هۆمەر دزەیی) برای برایماغایان کرد بە پشت و پەنای سەرەکیی خۆیان. بەڵام ئەم دووانە، وەک کە لە خوارەوە دەیبینیت، بەم عێراقەی کە بریتانیەکان نەخشەیان بۆ کێشابوو ڕازی نەبوون.

ڕاستە، عوسمانیەکان دەستیان لە هەردوو ویلایەتی بەسرە و بەغدا شووشتبوو کە بریتانیا هەر لە یەکەم ساڵی جەنگی گەورەدا (1914) گرتنی بەڵام کێشمەکێشیان لەگەڵ بریتانییەکان لەسەر ویلایەتی موسڵ (باشووری کورستان) هەر مابۆوە. ویلایەتی موسڵ هێشتا سەرەنجامی بە تەواوی دیاری نەکرابوو، ئایا لەگەڵ تورکیادا دەمێنێتەوە یان دەخرێتە سەر دەوڵەتە تازەکەی بەناو عیراق کە بریتانیا پلانی دانابوو دایبمەزرێنێ، یانیش دەکرێ بە دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ. واقیعەن کوردی ئەم ویلایەتە هەوڵیان بۆ سەربەخۆیی دەدا و دواتریش پەیمانی سێڤر Sevre لە ساڵی 1920 هەندێ ویلایەتی عوسمانی بۆ دوو دەوڵەتی کوردی و ئەرمەنی دەسنیشان کرد.

خۆی لە بنەڕەتدا نیازی بریتانیاش هەر وابوو دەوڵەتێکی تازە بەناوی عیراق تەنیا لە دوو ویلایەتی بەسرە و بەغداوە دابمەزرێنێ کە بەئاسانی و بەبێ بەرهەڵستیەکی ئەوتۆ هەر لە یەکەم ساڵی جەنگدا داگیریان کردبوو و هەنگی چ بەتەمای ویلایەتی موسڵ نەبوون کە ویلایەتێکی عەرەب نەبوو و تا ساڵی دوایی جەنگیش (1918) هێشتا نەگیرابوو. بەڵام لەو ماوەیە نەفت لە کەرکووک دۆزرایەوە، ئیتر ئەمە بوو بە یەکێک لەو فاکتەرانەی کە تای تەرازووەکەی گۆڕی.

لەوێــوە ئیتــر دوو ســیناریۆ زیاتــر لەبەرچــاو دەگیــران، یــان ئــەم ویلایەتــەش بەگــەڵ دوو ویلایەتەکــەی تــر (بەســرە و بەغــدا) بــدەن و دەوڵەتێکــی نــوێ بــە نــاوی عیــراق لــەو ســێ ویلایەتــە (بەســرە و بەغــدا و موســڵ) دابمەزرێنــن کــە بەپێــی ڕێکەوتنــی ســایکس - پیکــۆ وەک (ماندێــت mandate) بــۆ چەنــد ســاڵێک بــەر بریتانیــا دەکــەوت، یانیــش بیکــەن بــە دەوڵەتێکــی کوردســتانی ســەربەخۆ کــە ئەوەیــش هــەر بــەر بریتانیــا دەکــەوت. بــەڵام بــە پێــی دکتــۆر مەهــدی محەمــەد قــادر" ... بریتانیــا نەخشەکێشــی ڕاســتەقینەی لکاندنــی ئــەم ناوچانــە بــوو بــۆ ســەر عیــراق بــۆ پاراســتنی بەرژەوەندییەکانــی لــە هەمووشــیان گرنگتــر ســامانی نــەوت.." (بڕوانــە د. مەهــدی محەمــەد قــادر، هەولێــر لــە ســاڵانی 1926 -1939، ل51).

دەوڵەتــی عوســمانیی لــە جەنــگا شــکاو کــە بــە ئاســانی دەســتبەرداری ویلایەتــی بەغــدا و بەســرە بــوو بــۆ هێــزە بــراوەکان پێــی ڕاگەیاندبــوون کــە بــە هیــچ جــۆرێ دەســت هەڵناگــرێ لــە ویلایەتــی موســڵ. ئــەوە بــوو کــە هێزێکــی گەورەیــان لــە ناوچــەی چیــای کــۆرەک لــە ڕوانــدز بــە ســەرکردایەتیی کۆلۆنێــل (عەقیــد - ســەرهەنگ) ئۆزدەمیــر ئامــادە کردبــوو و بەتەمــا بــوون بەســەر هەولێــردا بــدەن و نامەشــیان بــۆ ســەرەک خێڵــە بەهێزەکانــی هەولێــر دەنــارد کــە "نەکــەن پشــت لــە ســوڵتانی عوســمانیی موســڵمان بکــەن و بەگــەڵ ئینگلیــزی کافــر کــەون"، هەمــان قەوانــە کۆنەکــەی ســەردەمی ژەنۆســایدکردنی ئەرمەنــەکان کــە هەنــدێ ســەرەک خێڵــی گــەورەی کوردیــان بــە بیانــووی ئیســلامەتی، پــێ تەفــرە دان و بەشــدارییان لــە کوشــتارەکەدا پــێ کــردن.

لەو نامانەی کە ئۆزدەمیر بۆ سەرەک خێڵە کوردەکانی ناردووە، ئەمە یەکێکیانە کە بۆ ڕەسووڵ ئاغای دزەیی ناردووە و لە لاپەڕە 176-177ی ئەم کتێبەدا بڵاو کراوەتەوە

Robert Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion,1880- 1925

ئەمە تەرجومەی خۆمە هی ئەو نامەیەی کە بە ئینگلیزی لەو کتێبەدا بڵاو کراوەتەوە:

"بۆ: ڕەسووڵ ئاغا، سەرۆکی خێڵی دزەیی.

عەزیزم سەرخێڵ

یەک تاکە کەس لە ئومەتی محەمەدا نییە کە تا ئێستا بۆی دەرنەکەوتبێ، چ کارەساتێکی گەورە و گرنگ لە ئەنجامی جەنگی گەورەوە و هەروەها لەو ماوەیەی کە بۆ ئاگربەسیش داندرابوو بەسەر وڵاتەکاماندا هاتووە. یەک تاکە کەس لە ئومەتی محەمەدا نییە لە مەبەستی سەرەکی و بەڕاستی بەریتانییەکان نەگات کە بووە هۆی داگیرکردنی ئیستانبوڵی پیرۆز، پایەگای خیلافەت لە لایەن خەڵکانی دژی ئیسلام و سووککردنی "فەخری عالەم" خەلیفە (حەمد و سەنا بۆ ئەو) تا ڕادەی کۆیلایەتی. ئەوانە بە ڕێگای زۆر هیچ و پووچانەوە خەلیفەیان ناچار کرد ملکەچی فەرمانەکانیان بێت و لە دواییشدا دوژمنداری و لێکترازان لەناو موسڵماناندا ئەنجام بدەن و بەم جۆرە بەتەواوی بیانشکێنن. جا ئەمە بارێکی وای لە باشووری کوردستانا ئافراندووە کە بە هیچ شێوەیەک قبووڵ ناکرێت.

یەک تاکە کەس نییە لە ڕۆحی حکوومەتەکەی فەیسەل نەگات کە ئامێرێکی زۆر سووک و چرووکی دەستی بەریتانییەکانە. بەڵام ئەم بارە زۆر نالەبارە بێ ڕێزی لە خوداش کردووە و ئەویش لە گەورەیی خۆی و بۆ ئەوەی موعجیزەکانی پێغەمبەر ئیسپات بکات کە لە قورئاندا هاتووە، ئیسلام تا ڕۆژی قیامەت هەر هەیە، هەڵستا مستەفا کەمالێکی بۆ خستینە ناو کۆڕی مەیدانی شەڕەوە، تاکو دوژمن لەو

خاکە عوسمانییانەی کە داگیریان کردوون لە بنو بۆتکەوە هەڵکەنێت و لە گلاوبوون ڕزگاریان بکات و بێگانەکان وەدەر نێت کە بەشێکی گرنگی وڵاتەکەمانیان داگیر کردبوو. ئێستاش، ئەلحەمیلە، وڵاتەکەمان وا سەربەخۆیی دەست کەوتووەتەوە.

ئیتر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە حکوومەت نەیتوانی بە شێوەیەکی پێویست دەستی یارمەتی بۆ باشووری کوردستان و ویلایەتی موسڵ درێژ بکات. ئێستاکێش ئەلحەمیلە وا هاتووینەتە ئەم هەرێمە بۆ ئەوەی لاقی ئەو هێزە بیانیانە بشکێنین کە لێرە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست و وڵاتە پیرۆزەکەمان ڕزگار بکەین. بە پشت و پەنای خوا، وا خەریکین بەم زووانە خەڵکەکە بۆ بزووتنەوەیەکی گشتی ڕێک بخەین.

جا ئێستا ئامۆژگاریی من بۆ تۆ ئەوەیە - ئەگەر تۆ وەک سەرۆکی خێڵەکەت بەردەوام بوویت - کە خێڵەکەی خۆت لە ناوەوە هێرش بکاتە سەر دوژمن هەر کاتێکی ئێمە لە باکورەوە دەستمان بە ئۆپەراسیۆنی خۆمان کرد. لێرەدا هیچ بیانوویەک بۆ دوودڵی یان خۆگنخاندن قبوول ناکرێت. ئێمە هەرچی لەدەسمانا بێت بۆ ڕزگارکردنی ویلایەتی موسڵ دەیکەین. من چاوەڕوانی هاوکاریی تۆم هاوکات لەگەڵ جوولەی ئێمە. ئەگەر کۆمەکیش لە کاتی زۆر پێویست نەمانگاتێ، ئیتر کەڵکی چی دەبێ، بۆیە من لەم بارەیەوە هیچ بەڵێن و مەڵێن لە تۆ قبوول ناکەم.

من پێشنیار دەکەم کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ڕاسپێردراوی ئێمەدا بکەیت کە پێمان ڕاگەیاندووە چاوی پێت بکەوێ، لە هەر شوێنێکی خۆت بتەوێ، تاکو ئامانج و پلانەکانی ئێمەت بە جوانی بۆ ڕوون بکاتەوە. ئەگەر حەزیشت کرد دەتوانی داوای چاوپێکەوتنێ لەگەڵ ئێمشەدا بکەیت لە شوێنێکی گونجاو.

سڵاو و ڕێزم هەیە بۆ خۆت و بۆ سەرۆکەکانی خێڵەکەت.

لە بەرواری 26 ی حوزەیرانی 1922

ئۆزدەمیر

کۆماندانی ڕێکخراو و بزووتنەوەی گشتیی الجزیرە و عیراق"

بەرامبەر بەم دۆخە تازەیە، بەریتانییەکان بۆ یارمەتی ڕوویان کردەوە هەم دزەییەکانی دەرەوەی هەولێر و هەم ئەمجارە کەسایەتییە ڕۆشەنبیرە ناودار و دەسترۆیشتووەکانی ناو شاری هەولێریش.

لەناو سەرۆکە دزەییەکاندا، تەنیا برایماغا لەگەڵ بەریتانییەکان بوو، بەڵام لە بەدبەختیی ئەمان، برایماغا لەو ساڵەدا 1920 کۆچی دوایی کردبوو. خورشیداغای برای لەجێی کرابوو بە سەرۆکی بەرەی بایز و بەڵێنی بە برایماغای کاکی دابوو کە لە ڕێچکەی ئەو لانەدات، واتا بەردەوام پشتگیریی بەریتانیا بکات لەپێناو بەرژەوەندیی گەلی کورد (بڕوانە لاپەڕە 262ی کتێبەکەی ئارنۆڵد تی. ویلسن: بلاد مابین النهرین بین ولائین، الجزو الثالث) کە فوئاد جەمیل کردوویە بە عەرەبی.

لە بارێکی وەها بێ سەروبەر و پڕ لە ئاڵۆزی و ئاژاوە و پاشەڕۆژێکی تەماوی و لێڵدا، نەک هەر لە باشووری کوردستان، بگرە لە هەموو ویلایەتەکانی ئیمپراتۆرایەتی عوسمانیی ڕووخاو، ڕفان ڕفان دەستی پێ کرد.

ناسیۆنالیزم، وەک ئایدیۆلۆژی، کە لە سەدەی نۆزدە لە ئەورووپا سەری هەڵدابوو و لە دوا دوایەکەی ئەو سەدەیە و سەرایەکەی سەدەی بیست بە کاریگەریی (ژۆن تورک Jeunes Turcs = لاوە تورکەکان)ی ئوڵترا ـناسیۆنالیستەوە خەریک بوو وەک ئاگر و پووش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئافریکاشی دادەگرت. دوای کودەتا دەستوورییەکەی ساڵی 1908ی لاوە تورکەکان لە دژی سوڵتان ئیتر سوڵتانیشیان تەنیا وەک بووکە شووشەیەک هێشتەوە. کە جەنگیش برایەوە و عوسمانی دۆڕاندی، ئیتر هەر میللەتە و هەوڵی دەدا لەتێکی لە کێکە گەورەکەی عوسمانی دەست کەوێ کەوا خەریک بوو دابەش دەکرا. لە ڕۆژاوای ئەناتۆلیا و لە بالکان، یۆنان، بولگاریا، سێربیا، ماکەدۆنیا، مۆنتێ نێگرۆ، بەشیان دەویست. لە ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا ئەرمەن و کورد، بە جیا جیا، بەشیان دەویست. ڕوسیای

تزاری کە ساڵی 1916 بە پێی پەیمانە نهێنییەکەی سایکس - پیکۆ ئەویش لەتێکی لەو کێکە بۆ داندرابوو، ساڵێک دواتر ساڵی 1917 شۆڕشی بۆلشیڤیکی لێ ڕوودا و هەڵستا نەک هەر خۆی لە جەنگەکە کێشایەوە، بەڵکو بەندە نهێنییەکانی (سایکس - پیکۆ)شی هەموو بۆ دونیا ئاشکرا کرد کە ئەو لەتوپەتکردنەی دەوڵەتی عوسمانیی تێدا بوو.

لە باشووری کوردستانیش، شێخ مەحمود لە سلێمانی، خورشیداغای دزەیی مامی هۆمەر دزەیی و ئەحمەد ئەفەندی مێردی پووری هۆمەر دزەیی لە هەولێر و سەید تەهای نەهری (نەوەی شێ عوبێدوللای نەهری) لە هەرێمی هەریر و باتاس و ڕواندز، تا دەگەیشتە ناوچەی شەمدینانی باب و باپیرانی، ئیسماعیل بەگی ڕواندزی، شەریف پاشای خەندان لە دەرەوەی کوردستان، ئەمانە هەر یەکە لای خۆیەوە، داوای دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆیان دەکرد (بڕوانە لاپەڕەی جیاجیا لە هەردوو کتێبی کاپتن هێی و ئەوەی ویلسن.) ویلسن لە لاپەڕە 17 - 18ی کتێبەکەیدا ئەمەشی گوتووە: "... ئەم بیرۆکەیە بەگشتی شتێکی نوێ نەبوو، چونکە کەسایەتییەکی گەورەی خێڵی موکری لە ناوچەی سابڵاخی فارسی، داوای پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆی کردبوو کە لەژێر سایەی بەریتانیادا بێت و پرۆژەکەشی ساڵی 1918 دابوو بە سەرهەنگ (عقید) کینیۆن..... بێجگە لەوەش کاتێ کە سێر پێرسی کۆکس لە لەندەن دەبێ، ئەویش گوێی بۆ پێشنیارێکی لەو بابەتە شل کردبوو. هەینێ خانەدانێکی تورکیایی بە نەژاد کورد ناوی شەریف پاشا بوو لە ولاتی فارس دەژیا، هەرچەندە کە هەر لە تەمەنی منداڵییەوەی لە نیشتمانی خۆی دوور کەوتبۆوە کەچی هێشتا هەر خەمخۆری پاشەڕۆژی باشووری کوردستان بوو... پوختەی پێشنیارەکەشی ئەمە بوو: سەربەخۆیی بۆ دانیشتوانی باشووری کوردستان مسۆگەر بکەین و با لەبەر سایەی خۆماندا بێت. هەرچەندە کە شەریف پاشا پەیوەندییەکی وەهاشی لەگەڵ کوردستانا نەبوو،

بەلام بیروڕاکانی بەڕاستی مایەی سەرنج و هاوسۆزی بوون ...."

دەربارەی شێخ ئەحمەدی بارزانییش لەو سالانە پڕ قەیرانە (میر بەسری) لە لاپەڕە 41 ی کتێبە تەرجوومەکراوەکەی (ناودارانی کورد) دەنووسێ "... لاپەڕەی ژیانی شێخ ئەحمەد پڕە لە شۆڕشنانەوە و ڕاپەڕین. لە سەرەتادا ساڵی 1919 دەستی بە ناردنی نووسراو کرد بۆ تورکەکان و هەڵمەتبردنە سەر کاربەدەستانی بەریتانی لە (وان). دیسان لە ساڵی 1927 کەوتەوە ڕاپەڕین و پچڕانی کۆتی ملکەچی..."

پێشتریش برایماغای دزەیی کە هێشتا مابوو، پەیوەندیی بە شێخ مەحمودەوە کردبوو بۆ ئەوەی دەڤەری ژێر دەسەلاتی ئەویش بخرێتە سەر هەرێمی (کۆنفێدراسیۆنی کوردی Kurdish Confederacy ) بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمود کە ئینگلیزەکان لەگەڵ شێخا لەسەری ڕێک کەوتبوون. (بڕوانە فوئاد حەمەخورشید ل - 55 - 65). عەرەبی ناوەڕاستی فورات (الفرات الاوسط) ئەوانیش ساڵی 1920دەستیان بە سەرهەڵدان کرد لە دژی ئینگلیز کە دواتر ناوی بوو بە (ثورة العشرين). ئەڵبەت دوو سوپەرهێزە براوەکان (بەریتانیا و فرانسا) ئەوانیش هەر خەریکی نەخشە و پلاندانان بوون کامەیان پتر لەویتر پشکی شێری لەم دەوڵەتە دابڕ بە دابڕکراوەدا بەرکەوێ.

سەرکردەکانی کۆمەڵەی (اتحاد و ترقي جمعيەتی) تورکی ئولترا -ناسیۆنالیستی فەرمانڕەوا، سێ پاشاکە (تەلعەت پاشا، ئەنوەر پاشا، جەمال پاشا) کە ئەوان دەوڵەتی عوسمانییان تووشی ئەم جەنگە گەورەیە کردبوو و دۆڕاندییان، ئیتر لە ترسی گیانی خۆیان و لە شەرمەتری هەلاتن و دواتر هەرسێکیان لە دەرەوەی تورکیا لە شوێنی جیا جیادا کوژران (تەڵعەت پاشا کە سەرەک وەزیر بوو، لەلایەن ئەرمەنییەکی تاشناک لە تۆڵەی ژەنۆسایدەکەی ئەرمەنەکانی ساڵی 1915 لە ساڵی 1921 لە بەرلین کوژرا. جەمال پاشا ساڵی 1922 هەر لەلایەن ئەرمەنەکانەوە لە تفلیس لە گورجستان کوژرا و ئەنوەر پاشاش لە هەمان ساڵ لە تورکستانی سۆڤیەت کە لە تەک

تورک نەژادەکانی ئەویّ شەڕی بۆلشیڤیکەکانی دەکرد ئەویش لەو شەڕەدا کوژرا).

لەو بەینەدا ئەفسەرێکی ناو مستەفا کەمال پەیدا بوو کە ئەویش ئەندامی (اتحاد و ترقی جمعیەتی) بوو، بەڵام پلەی سەربازیی وەک هی سێکوچکەکە (سێ پاشاکە) بەرز نەبوو و دەستیشی لە تێوەگلاندنی دەوڵەتی عوسمانی لەو جەنگی جیهانییەدا نەبوو. مستەفا کەمال، کە دواتر ناوی بوو بە ئەتاتورک، لە بەندە نهێنییەکانی پەیمانی سایکس - پیکۆ ورد ببۆوە و تێگەیشتبوو کە پیلانێکی زۆر گەورە بۆ وڵاتەکەی داڕێژراوە و تورکیا وا خەریکە نەمێنێ، یان ڕەنگە شتێکی کەمی پێوە بمێنێ. ئەو هەڵستا سیاسەتی (شەڕوخۆشی)ی پەیڕەو کرد، لەلایەکەوە دەستی بە شەڕی سەربەخۆیی (حرب استقلال) کرد لە دژی هێزە براوەکان (بەریتانیا و فەرەنسا) و لەلایەکی تریشەوە کەوتە گفتوگۆی سیاسی لەگەڵیاندا. ئامانجی مستەفا کەمال ئەوە بوو، چەندی بتوانێ خاکی تورکیا لە لەدەستچوون ڕزگار بکات.

من نامەوێ لەوە زیاتر بچمە ناو قووڵایی مێژووەوە و ئەوەی کە باسم کردووە، بە ڕێخۆشکردنێکی پێویستی دەزانم بۆ بابەتەکەی خۆم کە لێرەدا ڕۆڵی دزەییەکانە لەو بگرەوبەردەیەی ساڵانی یەکەم جەنگی جیهان.

لێرەشدا بە گونجاوی دەبینم تێ بینییە کوردپەروەرانەکەی کەریم شارەزای کۆچکردوو کە پێشتر هەر لەم نووسینانەمەدا خستوومەتە روو سەر لە نوێ بێنمەوە یاد کە خۆی لە سەردەمێکدا هەر شیوعیش بووە و تا مردیش هەر چەپڕەو بوو.

« ... لەوانەیە هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆمان بڵێن: بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە بابەتە مێژووییانە، گیانی عەشیرەتگەری لەناو کورددا دەژێنێتەوە و، مێژووی نەتەوەکەمان دەکات بە مێژووی خێڵ و هۆز و سەرەك عەشیرەتان! بەڵام لە بەرپەرچدانەوەی ئەم جۆرە ڕا و بۆچوونانەدا دەڵێم: مێژووی نەتەوە بریتییە لە هەموو ڕووداو و

جووڵانەوەیەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی هەموو هۆز و چین و دەستەیەکی ئەو نەتەوەیە، هەرچەندە ئێمە بە جودا ئەو ڕووداوانە وەرگرین و لێیان بکۆڵینەوە، دەبینین هۆ و ئەنجامیان هەر تێکەڵاو بە مێژووی گشتیی نەتەوە دەبنەوە و، لێدوان لە مێژووی ئەردەڵان یان بابان یاخود سۆران، کە دزەیی لقێکن لەوان، وەکو لێدوانە لە مێژووی بادینان یا بۆتان، یاخود هەکاری و ئەنجامی پوختەکردنی مێژووی ئەو میرنشینیانەی کورد، مێژووی سەردەمێکی دیاری کراوی نەتەوەکەمان پێکەوە دەنێن.»

**کەریم مستەفا شارەزا**
**(2015-1928)**

## جا گلەییەک لە نووسەر و مێژوونووسانی دەڤەری هەولێر، بەڵێ هەولێر

بەدەر لەو شوێنەی کە لێی لەدایک بوویمە، دەنا ئەمن ناوچەی خۆ و شاری خۆپەرست نیم، بۆیە هەر لە منداڵیمەوە ئەشقی سلەیمانی لە بنەبانی دڵمدا چەسپیوە، چونکە بێجگە لەوەی کە لە تەمەنێکی زۆر زووەوە مەستی شێوەزارە کوردییە پاک و پاراوەکەی ئەو شارە بوویمە، سلەیمانییەکان هەر کەسێکی لای خۆیان ئەگەر هێندەی یەک دەنکە زیخێکیش لە هەر بوارێکی ژیاندا خزمەتی گەل و وڵاتی خۆی کردبێ هەرگیز فەرامۆشی ناکەن و بە دەیان گوتار و کتێبی لەسەر دەنووسن، با ڕەخنەگرانەش بێت، کە خۆی هەر دەبێ واشبێ. خەڵکی سلەیمانی بەهای گەورەپیاوان و کەسایەتییە مێژووییەکانی خۆیان دەزانن، ڕێزیان لێ دەگرن و هەقی تەواوی خۆیانیان دەدەنێ. خۆی ئەگەر ڕاستیت دەوێ، دەبێ ئەمە بەبێ جیاوازی بۆ هەر گەورەپیاوێکی کورد، خەڵکی هەر کوێیەک بێت وابێ، نەک هەر ئەوانەی ناوچەکەی خۆت. هەرچۆنێکی بێ، ئەمە لە سروشتی مرۆڤدایە کە جۆرێک لە "ناوچەدۆستی" هەر هەبووە،

بەتایبەتی لە سەردەمانی کۆندا و بە تایبەتیتریش لە بواری سپۆرت و هونەردا. بەڵام تۆ وەرە لە هەولێرییەک بپرسە برایماغای دزەیی یان خورشیداغای دزەیی (کە برا بوون) یان ئەحمەدەفەندی هەولێری (ئەحمەد عوسمان) کێن؟ باوەڕ بکە لە "خوێندەوارەکان" ئەگەر بەدوایانا بگەڕێیت، ڕەنگە یەک دوانێکت دەستکەوێ بزانن بەڵام دوور نییە لادێییە پیرە نەخوێندەوارەکان ، ئەگەر کەسیان مابێ، ئەوان زیاتر ئاگاداری ئەم مێژووە بن.

باشە دەبێ ئەمە بۆ وابێ؟ لەوانەیە بەشێکی وەرامی ئەم پرسیارە - نەک هەمووی - لەم کورتەچیرۆکە ڕووداوەدا بەدی بکرێ، کەوا بۆتانی دەگێڕمەوە. بەم دواییانە لەگەڵ برادەرێکی "زۆر شارەزای مێژوو و هەڵگری بڕوانامەیەکی زۆر بەرزی زانکۆ" بەتەما بووین، یەکتری ببینین، بە تەلەفۆن پێم گوت با لە فلانە دیوەخان یەکدی ببینین لەپاشان بۆ خۆمان دەڕۆین لە شوێنێک دادەنیشین. دەزانی وەرامی چی بوو؟! " ئەمن ناچمە دیوەخانی ئاغایان" ئەم قسەیە بەڕاستی بۆ من شۆک بوو بەتایبەتی کە لەلایەن کەسێکی وا ڕۆشەنبیرەوە بکرێ، چونکە ئەمە زۆر شت هەڵدەگرێت (ئاخر هەقمە کە دەڵێم سەقافەتی سلەیمانییان زۆر فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوەی هەولێرییان). هیچ سلەیمانییەک، شیوعیش بێ، قسەی وای بەسەر زاردا نایە. ئەمرۆ هیچ ئەوروپاییەکیش شتی وای بە خەیاڵا نایەت کە جاران لە سەردەمی فیئودالیزم جیاوازیی چینایەتی لەوێ زۆر باوتر بووە تا لەناو کوردا. سلەیمانییەکان ئەگەر بزانن یەکێک خزمەتی بووە لە هەر بوارێکی ژیاندا بوویێت پرسیار ناکەن ئاغا بووە یان گەدا. لە بادینانیش هەروا بووە: کەس نییە لەوێ پەسنی حازم شەمدین ئاغا نەدات کە لە باب و باپیرانیەوە هەر ئاغای دەستڕۆیشتووی زاخۆ بووینە. کەس نییە ئەمرۆ لە کۆیە شانازی بە حەماغای کۆیە و کاکە زیادی کوڕیشی نەکات و بە شانازیشەوە نەچێتە دیوەخانەکانیان. بەڵام دیارە ئەم برادەرەم لەو مێژووە بێ ئاگایە کە جوانترین و

ناسكترین هونەری دەنگ و ئاوازی بەسۆزی کوردی لەناو دیوەخانی ئەو ئاغایانەدا پەرەی سەندووە و گەشەی کردووە: لاوک و بەیت. دیارە ئەو لەوە بێ ئاگایە کە لاوک و بەیت مێژووی نەنووسراوەی کوردن، چ مێژووی شەڕوشۆری کوردان چ مێژووی حەزلێککردنی دوو گراوی نامراد. دیارە ئەو لەوە بێ ئاگایە کە نەخشە و پلاندانان بۆ سیاسەتەکانی کوردان بەرامبەر بە ئاخروئۆخری حوكمی دەوڵەتی عوسمانی و سەرەتایەکانی هاتنی بەریتانی و پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقیش، زۆر جار لەو دیوەخانانەی ئاغاکاندا کۆبوونەوەیان بۆ کراوە و حەفتوهەشتیان لەسەردا کراوە. دیارە ئەو لەوە بێئاگایە کە هەم لە زەمانی عوسمانی و هەم لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقیش کە جەندرمەی عوسمانی یان پۆلیسی عیراقی دەهاتن بۆ گوندێک کە گەنجێکی کوڕە جوتیاری ئاوایی ناوی دەهات بیبەن بۆ سەربازی یان هەر بۆ عەسکەری ئیجباری، ئاغای گوند لە دیوەخانەکەی خۆی یان هەر لە ماڵی خۆی لەناو ژنان دەیشاردەوە و بە بەرتیل و بە ژەمێکی چەور جەندرمە یان پۆلیسەکانی بەڕێ دەکرد. هیچ دوور نییە یەکێک لە باپیرانی ئەم برادەرەم لە زەمانی خۆی لە دیوەخانی یەکێک لەو ئاغایانە حەشار درابێت کە ئەو ئێستا (ئیستینکاف) دەکا بچێتە دیوەخانی ئاغا! دیارە ئەو لەوە بێ ئاگایە کە لەدەشتی دزەیی ئەوە ئاغاکان بوون کە داوایان لە حکوومەت دەکرد قوتابخانەیان لە گوندەکانیان بۆ بکەنەوە و بە داری زۆرێ منداڵە جوتیارەکانیان دەناردە بەر خوێندن و گوێیان نەدەدا بە پاڕانەوەی دایک و باوکە نەزانەکانیان، کە کەس نییە شوانی و گاوانییان بۆ بکات، ئەگەر ڕۆڵەکانیان بچن بۆ مەکتەب. ئەمن خودی خۆم و کاک سەعدی براشم ماڵ بە ماڵ لە گوندەکەی خۆمان دوگردکان دەگەڕاین و بە تۆبزی منداڵە جوتیارمان لە ماڵیان دەردەهێنا و دەمانبردن بۆ قوتابخانە. ئێستاش زۆریان مامۆستان و ئەم بیرەوەریانە بە پێکەنینەوە دەگێڕنەوە. وا خۆشبەختانەش زۆرێک لەو منداڵانەی هەینێکیە ئەمڕۆ

بڕوانامەی بەرز بەرزیان وەرگرتووە و دام و دەزگاکانی حکوومەت - کە جاران تەنیا تاپۆی کوڕە دەوڵەمەند و هی دانیشتووی شارەکان بوو چونکە هەر ئەوان خوێندەوار بوون - دەبینی ئێستاکێ وا پڕە لە منداڵە جوتیاری گوندەکان و خزمەتی ئەم گەل و وڵاتە دەکەن و هەندێکیشیان بوونەتە "مەسئولی" حیزبی پایە بەرز لە هەموو بوارێکا و سەت بەردیشیان بە ئاغاکانی پێشان دادایە. مێژوو دەبێ بە ئینسافەوە بگێڕدرێتەوە و بنووسرێتەوە. هەموو مێژوویەکیش چاکی و خراپی تێدا هەیە. هەموو ئاغا و بەگ و میرێکی جارانی کورد و ناکوردیش و هەموو ڕەعیەتەکانیش مەلائیکەت نەبووینە و هەمووشیان شەیتان نەبووین. بەڵام ڕاستە و زۆر ئاسایی بووە کە لە مێژووی هەموو میللەتانی دونیادا بەشی شێری لە چاکە و لە خراپە هەر بەر چینە دەسەڵاتدارەکە دەکەوت نەک چینە بێ دەسەڵاتەکە، چونکە هەر قسەی دەسەڵاتدارەکان دەیخوارد.

بۆ ئەوەی خوێنەرە بەڕێزەکانم بە هەڵە لەم قسانەی من نەگەن، دەمەوێ پێداگری لەسەر ئەوە بکەم کە مەبەستی من لێرەدا - هەر ئەوها لە خوتوخۆڕایی - ورووژاندنی مەسەلەی چینایەتییە بەسەرچووەکەی پێشینان نییە، مەبەستی من تەنیا مێژووە و بەس. بێجگە لە هەندێ، هیوادارم ئەم قسانەم یارمەتیدەر بن بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە هەڵوێستە نەرێتییانە چونکە تۆوی دووبەرەکی لەناو کۆمەڵگاکەمان دەچێنن لەکاتێکدا کە هەموو کۆمەڵگایەک لە هەموو دونیادا وا بە شێوەیەکی سروشتانە و بە هێمنی لە گۆڕاندایە ئیتر هەر هەڵوێستێکی لەم بابەتە بۆی هەیە ببێت بە کۆسپ و تاسە لە پرۆسەی ئەم گۆڕانکارییە.

ئەمن لە پرۆسەی خوێندنی (علومی سیاسی)م لە ئینگلەرە تاریخی سیاسیم بە وردی خوێندووە و لە هەموو دونیای تەمەنە ناوەندییەکان هەمیشە دوو چین لەناو کۆمەڵا هەبووە: دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات. سیستەمی بەڕێوەبردنی حکوومەت لە دنیادا ئەوها بووە. ئیمڕۆ لە وڵاتە

پێشکەوتووەکاندا ئەو سیستەمە چەند سەتساڵە بەسەرچووەی پێشان وای لە کەس نەکردووە، بە چاوی نەیاری و بوغزەوە بڕوانێتە نەوەکانی ئەمڕۆی چینە دەسەڵاتدارەکەی دووسەت سێسەت ساڵ لەمەوپێشیان، تای هوهو!! ڕۆژئاواییەکانی ئەمڕۆ ئەگەر بۆیان بلوێ زۆر بە خۆشی و سوپاسیشەوە حەز دەکەن سەردانی کۆشک و دیوانی نەوەکانی میر و مارکیز و کۆنت و هێرتزۆگەکانی سەردەمە دێرینەکانی خۆیان بکەن، چونکە ئەمانە لای ئەوان بەشێکی گرنگی مێژووی میللەتەکەیانن و بۆنی تاریخی کۆنیان لێ دێ، بە لایەنە چاکەکانی و خراپەکانیشیەوە نەک وەکو ئەو برادەرەی من (استنکاف) بکات بچێتە دیوەخانی ئاغایەکی کورد. نموونەی وەها لە مێژۆی هاوچەرخدا زۆرە: نیلسن ماندێلا و سپی پێستەکانی وڵاتەکەی، ئەمەریکاییە بە ڕەسەن ئافریکاییەکان، سیاسەتکارانی ئەمڕۆی هیندستان بەرامبەر بە کۆلۆنیالیستە بەریتانییەکان،عەرەبەکانی ئافریکای باکوور بەرامبەر بە کۆلۆنیالیستە فرانسییەکان، کورە تەواوی ئافریکای فرانکۆفۆن و ئەنگلۆفۆن بەرامبەر فرانسە و بەلژیک و بەریتانیا. ئەرێ ئایا ئەمانە گشتیان بە چاوی ڕک و کینەوە ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەنەوە؟ لەوانەیە ئێستا کوردی ناسیۆنالیستی بەعاتیفە ناسیۆنالیست ئەوها بیر بکەنەوە کە ئەگەر هاتوو ڕۆژێک لە ڕۆژان کوردستانەکانمان یان یەکێک لەو کوردستانانەمان سەربەخۆ بوو ئێمە دەبێ یەکسەر دوژمنداری لەگەڵ کۆنە ئاغاکانی یان ئاغاکەی خۆمان بکەین و سنگمان دەرپەڕێنین و لە تۆڵەسەندنەوە بگەڕێین! نا، ناو سەت جار نا! ئەمە ئەقڵی سیاسی نییە، بەم ئەقڵیەتە کۆمەڵگاکەت ئەبەد پێشناکەوێت و ناگات بە دواقۆناغ. سیاسەتی حەکیمانە ئەوەیە کە تا پێت بکرێ دۆستایەتی و دراوسێیاتی باش لەگەڵ بەغدا و ئانکارا و تاران و شام دا بتەو بکەیت بەتایبەتی ئەگەر کۆنە کۆلۆنیالیستەکەت زلهێز بوو و خۆ هەرسێکیشیان (تورک و فارس و عەرەب) لەچاو کورد زلهێزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن. خۆ نموونەی ڕوسیا و ئۆکراینا و ڕوسیا و گورجستان وا لەبەر چاواندایە.

لە سیاسەتدا ناکرێ ئەسیری ڕابردوو بیت، دەبێ بڕوانیتە پێشەوە و

ئایندەیەکی نوێ لەسەر بناغەی نوێی بەرژەوەندیی دوولایەنە، تەنانەت لەگەڵ کۆنە کۆلۆنیالیست و نەیارەکانیشت بنیاد بنێیت. باشترین نموونە ڤیەتنام و ئەمەریکایە: ئەمەریکا چی ما بە ڤیەتنامی بەدبەختی نەکات! کەچی ئەمڕۆ باشترین پەیوەندیی ئابووریان هەیە بۆ بەرژەوەندیی هەردوولایان. جا تۆ ئەگەر ئەوها سیاسەت نەکەیت و نەتوانیت خۆت لە سلبیاتی ڕابردوو ڕزگار بکەیت کاروانی پێشکەوتن لەسەرت ڕاناوەستێت و وڵاتەکەت بەجێ دەمێنێ. بەسەرکردنەوەی مێژوو پێویستە و دەبێ بە لایەنە ئەرێنییەکانی و نەرێنییەکانی بگێڕدرێتەوە و بنووسرێتەوە. نووسەری ئەمڕۆی مێژوو - ئەگەر خۆی نەوەی چینێکی بێ دەسەڵات و بەشخوراوی جاران بێ - دەبێ زۆر هوشیار بێ نەبادا بکەوێتە ناو داوی سلبیاتی کۆنەوە و لە بابەتییانەی (مەوزوعییەت)ی نووسینەکەی ئەمڕۆی دوور کەوێتەوە. بە هەمان پێوەر ئەگەر ئەو نووسەرە نەوەی چینێکی دەسەڵاتداری دەستڕۆیشتووی جارانە، دەبێ وریا بێ نەکەوێتە ناو داوی خۆبەزلتر زانینەکەی جارانی مێژووەوە.

بە درێژایی مێژووی کورد و هی میللەتانی تری جیهانیش، نیشتمانپەروەری و جاشایەتیش لەناو هەموو توێژەکانی کۆمەڵگادا هەر هەبووە. ڕاست نییە ئەمڕۆ ئەمە نەوەکانی ئەو دوو هەڵوێستەی جاران لێک بترازێنێ. هەر بڕوانە ئاڵمانەکانی زەمانی هیتلەر و ئاڵمانەکانی ئەمڕۆ. خۆ زۆرترایەتی هەرە زۆری ئەمانەی ئەمڕۆ نەوەی هیتلەریستەکانی جارانن.

برایماغای دزەیی ( ناسراو بە برایمی بایزی) ئەو میرە کوردپەروەرە بووە کە کورد خۆی لە بیری کردووە کەچی عباس العزاوی مێژوونووسی عەرەب و ئینگلیزەکانیش پێی لێ دەنێن کە دوو ناوچەی بە نەفت و گەنم و جۆ (واتا پیشەسازی و کشتوکاڵ) زۆر دەوڵەمەندی کوردستانی (دەشتی قەراج و کەندیناوە)ی لە عەرەبانـدن پاراست. برایماغا ساڵی 1920 مرد. خورشیداغای برای جێی گرتەوە و با بزانین ئەمیان چۆن بووە.

## خورشیداغا (خورشیدی بایزی) مامی هۆمەر دزەیی

لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی Sir Arnold T.Wilson, Mesopotamia Between Two Loyalties (بلاد مابین النهرین بین ولائین)، کە فوئاد جەمیل لە ئینگلیزییەوەی کردوویە بە عەرەبی، سێر ئارنۆلد تی. ویلسن ئەمەی لەسەر خورشیداغا نووسیوە (لاپەڕە 262 ی عەرەبییەکە) "هەرچی خورشیداغایە، ئەمەیان رێک بۆ رەهبەری خولقاوە و سوورە لەسەر قسەی خۆی. ئەو بەڵێنەی کە بە برایماغای {کاکی} دابوو کە لە سەرەمەرگدا دەبێ، زۆر بەجوانی بەجێی گەیاند. بەڵێنەکەشی ئەوە بوو کە پشتگیریی حکوومەتی نوێ بکات هەمیشە بۆ بەرژەوەندیی گەلی کورد. کاپتن های نووسیویەتی: ئەو بڕیارە نەگۆڕەی کە لە خورشیداغام دی، لە هیچ کوردێکی دیکەم نەدیوە. ئەو مەبەستێکی رەچاو کردبوو کە دوور بوو لە هەموو جۆرە خۆخۆییەک {انانیە}. ئەوە بوو کە لە خورشیداغا دەبینرا لەوان رۆژانی رەشدا"

خوێنەری بەڕێز، با خورشیداغا مامیشم بێ، خۆ منیش وەک وڵاتییەک، وەک هەر تاکێکی دیکەی ئەم کوردستانە، مافم هەیە هەر کەسێکی بزانم لە هەر بوارێکا رۆڵی هەبووە، هەڵی بسەنگێنم و بینرخێنم. ئەمن لێرەدا مێژوو، نەک خزم خزمێنە، مەبەستمە. دەسا وەرن با بە ویژدانەوە لەم چەند وشەی ئینگلیزەکان خۆیان ورد ببینەوە کە خورشیداغا چ بەڵێنێکی بە برایماغای براگەورەکەی داوە، کە ئەمیان لە سەرەمەرگدا دەبێت داوای بەڵێنی لێ دەکات: "... بەڵێنەکەشی ئەوە بوو کە پشتگیریی حکوومەتی نوێ بکات (حکومەتی بریتانی) هەمیشە بۆ بەرژەوەندیی گەلی کورد" ئینجا لەوەش بەهێزتر ئەوەیە کە دیارە ئەم ئیستیلاحی "هەمیشە بۆ بەرژەوەندیی گەلی کورد" ە خەون و ئاواتی ئەو دوو برایە بووە لەو هەرا و هۆریایەی ساڵانی

یەکەم جەنگی جیهانـدا (بڕوانـە لاپـەڕە 262 لـە تەرجومـە عەرەبییەکـەی کتێبـی سێر ئارنۆلـد تـی. ویلسـن.)

جـا توخـوا ئـەم هەسـتی کوردایەتییـەی ئـەم دوو سـەرەک عەشیرەتە دزەییـە 100 دانـە سـاڵ بـەر لـە ئێمـڕۆ هەیانبـووە، هـی ئەوەیـە کـە کـەس ناویشـیانی نەبیسـتبێ! کتێبەکانـی مێـژووی سیاسـی کـورد، هـەر ناویشـیان نەخەنـە نـاو پەڕەکانیانـەوە! شـارەوانییەکانی شـارەکانی هەرێـم (هـەر نەبـێ شـارۆچکەی مەخمـوور) شـەقامێک، مەیدانێـک، هۆڵێـک یـان پەیکەرێکیـان بەنـاو، یـان بـۆ نـەکا!

هەرچۆنێکـی بـێ هەولێـر دەکـولا و خەریـک بـوو هەڵبچـێ. پڕۆپاگەنـدەی تورکـەکان و کۆنـە فەرمانبـەرە تورکـەکان و ئـەو کوردانەی کـە سـەر بـەوان بـوون و هەرەشـەی جەنـراڵ ئۆزدەمیـری عوسـمانلیش کـە بەسـەر هەولێـردا دەدات، کەشـێکی پـڕ لـە نیگەرانـی و تـرس و لێڵیـی پاشـەڕۆژی ئافراندبـوو، هـەم لای خەڵـک و هـەم لای کاربەدەسـتە بریتانییـە نوێکانیـش. جـا ویلسـن لـە لاپـەڕە 258ی کتێبەکـەی بـەم شێوەیە باسـی ئـەو بـارە نالەبـارە دەکات کـە ئەمـە کوردییەکەیەتـی:

"ئـەوە بـوو کـە لـە سـەرای هەولێـر، یـەک بـەدوای یـەک، چـاوم بـە شـاندی کـوردەکان کـەوت کـە دیـار بـوو بـۆ ئـەو بـارە نالەبـارە بـاوەڕ و متمانـەی تەواویـان بـە خۆیـان هەبـوو، بـەڵام مـن بـۆ خـۆم لەنـاو دڵمـدا وام هەسـت نەدەکـرد. سوپاسـم کـردن کـە ئاسایشـیان لـە شـارەکەدا پاراسـتووە و ئاگاداریشـم کـردن کـە بـارودۆخ لـە تەقینـەوە دایـە. لێرەدا دوو دەمڕاسـتیان، خورشـیداغا و ئەحمـەد ئەفەنـدی بەکورتـی پێیـان ڕاگەیانـدم، بڕیاریـان داوە ئەمـن و ئاسـاییش دابیـن بکـەن و پشـتی بەڕێوەبەرایەتیـی سـیڤیل بگـرن. بـەڵام ئەمەشـیان خسـتە سـەر، گوتیـان ئێمـە دوو شـتمان لـە ئێـوە دەوێ: یەکـەم، نابـێ تـورک بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەم وڵاتـە و ڕێـگا بـە عەرەبیـش نـەدرێ حوکمـی کـورد بـکات، دووەمیـش ئەوەیـە کـە دەسـتوبرد هێـز بنێـرن بـۆ هەولێـر بـۆ ئـەوەی ئاژاوەچییـەکان تـێ بگـەن کـە زەبـری حکوومەتـی بریتانـی هێشـتا بەهێـزە و حیسـابی بـۆ دەکـرێ"

مـن هیـچ نالێـم، بـەڵام توخـوا و تـو کائینـات، کوردێـک، سـەرەک عەشـیرەتێکی کـورد، پێکـەوە لەگـەڵ خانەدانێکـی شـاری هەولێـر کـە خزمـی خـۆی بـووە (ئەحمـەد عوسـمان ولاشـزاوای حەمەدەمیناغـای باوکـی هۆمـەر دزەیـی بـوو واتـا مێـردی پـووری هۆمـەر) 100 دانـە سـاڵ لەمەوبـەر داخوازیـی کۆمـەک کردنـی بریتانییەکانیـان تەنیـا بـەو مەرجـە قەبـووڵ کـردووە ئەگـەر ئـەوان دەوڵەتێکـی کوردسـتانی سـەربەخۆ دابمەزرێنـن، کەچـی یـەک هەولێریـی ئەمـڕۆ ناویشـیانی نەبیسـتووە! باشـە وا ئـەم کتێبانـەی ئینگلیـزەکان خـۆ تەرجومـەی عەرەبیـش کـراون، بـەڵام جەنابـی مـەلا خالیـدی مورتکـەی، هـەزار ڕەحمـەت لـە گـۆڕی بـێ، لـێ دەربێنـی، ئایـا نووسـەرێکی کـورد، کتێبێکـی مێـژووی سیاسـیی کـورد، بەلایانـدا چـووە بـەدەر لـە ئاماژەدانیـان بـە ئارشـیڤەکانی بریتانییـەکان؟ مـەلا خالیـدی مورتکـە لـە لاپـەڕە 58 ی دەسنووسـەکەی ئەمـەی لەسـەر خورشـید ئاغـا نووسـیوە: "(قورشـیدی بایـزی) پیاوەکـی زۆر ڕەشـید و ڕاسـت بـوو. قسـەی کـەم دەکـرد بـەڵام قـەت لەسـەر قسـەی ناهاتـە خـوارێ، هیـچ درۆی ناکـرد. زۆر ماقـول و عزیـز النفـس بـوو. سـاڵی 1925 وەفاتـی کـرد. شـەش کـوڕی هەبـوو: علـی، مستەفا، عزیـز، سـلیم، محمـود، حمـد، عـولا." جەنابـی مـەلا خالیـد لێـرەدا لێـی تێـک چـووە. خورشـیداغای مامـم سـاڵی 1932 مـردووە - هۆمـەر دزەیـی.

ڕاسـتە خورشـیداغا بزووتنـەوەی چەکداریـی بـۆ دۆزەکـەی نەکـردووە، بـەڵام تـۆ ئەگـەر ناوچەکـەت دەشـتێکی کاکـی بـە کاکـی بـوو و بەرگـەی شـەڕی تانـک و تەیارەی نەگـرت و تەنیـا بـە ڕێگای ئاشـتی ناچار بوویت داوای مافـی نەتەوایەتیـی خـۆت بکەیـت، ئـەدی ئەمـەش کوردپـەروەری نییـە؟ ئەمـە دووربینیـی سیاسـی نیـە تا هەلێکـی گونجاوتـرت بۆ دەرەخسـێ؟ هەیـە لەبـەر هەڵکەوتـەی جۆگرافـی و تۆپۆگرافیـی ناوچەکـەی بۆی دەلوێ شـەڕی بـۆ بـکات، هەیـە بـۆی نالـوێ، گرینـگ هەسـتەکەیە. مـن بۆیـە قسـەکانی کەریـم شـارەزا (هـەزار سـلاو لـە گـۆڕی بـێ) دووبـارە و دەبارە دەکەمـەوە، چونکـە ئـەو بـاش لـە مێـژوو گەیشـتبوو. لەبیریشـمان نەچـێ، کەریـم شـارەزا هەولێـری نەبـوو، کۆیـی بـوو و سـەیر ئەوەیـە شـیوعییش

بـوو ئـەم قسـانەی کردبـوو. خـۆ ئێسـتا ئەگـەر ئـەم دوو کوردپـەروەرە دزەییانـە و ئەحمـەد عوسـمانی هەولێریـش خەڵکـی سـلەیمانی بـوان، لەمێـژ بـوو مێژوویـان دەکەوتـە نـاو بەرنامـەی خوێندنـی قوتابخانەکانـەوە. کەچـی "رۆشـەنبیرە" هەولێرییەکانمـان - تـا ئـەوەی ئەمـن پێـی بزانـم - جارێکیـان بەدواداچوونەوەیەکـی ئـەو کتێبـە تەرجومەکراوانەیـان نەکـرد و هەڵسـەنگاندنێک و نرخاندنێکـی ئەکادیمیانەیـان بـۆ نەکـردن. ئەمـن وای بـۆ دەچـم دەبـێ ئەوانـە هـەر بـە عەقلییەتـی مـۆدە بەسـەرچوو بیـر بکەنـەوە و بەچـاوی " ئاغـا و دەرەبەگـی زاڵمـی جـاران " بڕواننـە مێـژوو کـە شـیوعی خـۆی وا وازی لـەم جـۆرە بیرکردنەوەیـە هێنـاوە.

راسـتییەکەی نـەک هـەر برایماغـا یـان خورشـیداغای دزەیـی، بەڵکـو ژمارەیەکـی زۆر لـە رۆڵـەی کوردپـەروەری دیکـەی خـودی شـاری هەولێـر، لـە بنەماڵـە خانەدانەکانـی ئاغـاکان و چەلەبییـەکان و بنەماڵـەی مەلافەنـدی و ئەحمەدەفەنـدی و موفتـی و قـازی و شـێخ و سـاداتی تەکیـە و خانەقـاکان و ژمارەیەکـی زۆریـش لـە ئەنداماتـی چینـی وردە بـورژوازی و ئەهلـی نـاو بـازاڕ و ئەوانـەی ناوچـەی پارێـزگای هەولێریـش بەگشـتی (لـە هـەر بوارێکـی ژیانـدا بووبـێ) ناویـان نوقمـی دەریـای بـێ بنـی مێـژوو بـووە، لەبـەر پێنەزانـی، یـان کەمزانیـی زۆرێـک لـە نووسـەر و توێـژەرە هەولێرییـەکان خۆیـان.

راسـتییەکەی ئـەوەی کـە لـە کتێبەکـەی کاپتـن هێـی (دوو سـاڵ لـە کوردسـتانا) کارێکـی تایبەتیـی تـێ کـردم، چاپتـەرە هـەرە دواییەکەیەتـی کـە دەرەنجامـی کتێبەکەیەتـی (conclusion). لێـرەدا کاپتـن هێـی وێـڕای ماڵئاوایـی لـە کوردسـتان، ماڵئاواییەکـی تایبەتـی پـڕ لـە سـۆزداری و بەبـێ رتـووش لـە ئاغاکانـی دزەییـش دەکات. کاپتـن هێـی لە پاش گواسـتنەوەی پۆسـتەکەی بـۆ لەنـدەن، دوای دوو سـاڵ مانـەوەی لـە کوردسـتان، دیـارە بەبـێ دووڕوویـی، بـە دڵێکـی پـڕ لـە حەسـرەتەوە ئـەم وڵاتـە و ئـەم گەلـی کـوردە بەجـێ دێڵێـت، هەرچەنـدە کـە گەلێـگ ناخۆشـی و تەنانـەت مەترسـیی کوژرانیشـی تـووش دەبـوون و لـە لاپـەڕە 361 ی کتێبەکەیـدا دەڵـێ: ".... هەنـدێ جـار هەسـتێکی وام لـە دڵـدا دەڕوێ وەک بڵێـت

لاریم لەوه نابێ کە تەواوی پاشەڕۆژی خۆم بگۆڕمەوه بە یەک دانیشتنی ئێوارەیەکی مەخمووور لەگەڵ خورشیداغا، یان ئێوارەیەک بە سواری بەناو گەلیی رواندزیدا رەت ببم. ئەمن دۆستی زۆرم لە کوردستان پەیا کرد، بەلام نەیاری کەمیش نا. هەرچۆنێکی بێ لەوانەی دوایی من وا هەست دەکەم کە تەنیا یەکێک هەیە رەنگە نەتوانم هەتا هەتایە لێی خۆش بم، ئەویش سالح بەگی خۆشناو بوو { روونکردنەوەیەک: ئەمەیان سالح بەگی کوڕی میرانی رەشید بەگ نییە، بەڵکو میرانی سالح بەگی خۆرانە - هۆمەر دزەیی}. ئەمەش لەوانەیە لەبەرئەوه بێ کە ئەو تەنیا کەس بوو کە بەڕاستی فریوی دام (قۆڵی بڕیم). راستە ئەحمەدپاشا و حاجی پیرداود (دزەییەکان) دوژمنم بوون، بەلام دوژمنێکی مەرد و پیاوانە بوون. ئەمانە کە لەسەرەوه وەفاداریی خۆیان بۆم دەردەبڕی و ماستاویان بۆ دەکردم، ئەوه تەنیا شەکلیات بوو و خۆشیان دەیانزانی کە من باوەڕیان پێ ناکەم. پەیوەندیی شەخسیم لەگەڵ ئەم دووانە، هەمیشە دۆستانە بوو و فشەم بە پیلان و تەگبیرەکانیان دەهات و بە هەندم وەرنەدەگرت. ئای کە ئارەزووی بیستنی دەنگە باریک و نەرمە پڕ لە نیفاقەکەی (حاجی پیرداود) دەکەم و بریا جارێکی تریش گوێم لە خۆهەڵکێشان و کەیف بەخۆهاتن و قسە گەورەکانی پاشا {ئەحمە دپاشا} بووبووایە کە پڕ بوون لە فشەفش و موبالەغاتی بازرگانی و هەمیشە رۆژانی رەش و تەنگانەی بە دەرفەت دەزانی تاکو قازانجی لێ بکات..... "

بڕوانە لاپەڕە 361 لە کتێبی W.R.Hay, Two Years in Kurdistan

مامۆستا مەلا خالید عەزیزی مورتکەیی
1981-1910

کەریم شارەزا 1928-2015

کێخوا سمایلی کێخوا ئەحمەدی
پاڵانی ناسراو بە کاکە سمە

کێخوا ئەحمەد پاڵانی
یەکێک لە سەرۆکە ناودارەکانی
خێڵی پاڵانی

ڕزگاری ئەحمەدی حەمەدەمین
دزەیی

برایم ئاغای حاجی ئەمینی دزەیی
(1898 - 1984) یەکێکە لە نەوەی نەوەکانی
مەعرووفی فارس ئاغای گەورە

ئەحمەد پاشای دزەیی (1860؟ - 1925)

ئارامگەی برایم ئاغای دزەیی (برایمی بایزی) لە دامەنی چیای قەرەچووغ بەرامبەر مەخموور

ئارامگەی ئەحمەد پاشای دزەیی لە گوندی قشاغلوو

سلێمان ئاغای ڕەسوول ئاغای
دزەیی (1898 - 1981)

حاجی پیرداود ئاغای دزەیی
(1854 - 1918?)

کاوێس عەزیز حاجی ئەمینی
دزەیی (1933 - 2003) یەکێکە
لە نەوەی نەوەکانی قادری
برای کاوێسی مەلای ( کاوێس
مەلا هیچ کەسی لەپاش خۆی
بەجێنەماوە)

هاواری برایم ئاغای دزەیی بە گەنجی و بە پیری

موشیر ئاغای عەدۆی دزەیی
(1909 - 1991) یەکێکە لە نەوەی
نەوەکانی حوسێنی فارس
ئاغای گەورە

خورشید ئاغای دزەیی
(1850? - 1932)

عەلی مەحموود کاکەخانی
دزەیی (1896 - 1970)

خدری ئەحمەد پاشا کوڕە
گەورەی ئەحمەد پاشا دزەیی

هەمینە، هاوسەری
مەولوود هەولێری (دایە هەمە)

مەولوود ئاغای هیدایەت ئاغا
(ناسراو بە مەولوود هەولێری)

ئەحمەد عوسمان ناسراو بە
ئەحمەد ئەفەندی
(1946 - 1879)

عەلی ئاغای کوڕی خورشید ئاغای دزەیی (1890 - 1977)

هاواری برایم ئاغای دزەیی
(2014 - 1919)

میرانی
ساڵح بەگی خۆران

میرانی
قادر بەگ

میرانی
ڕەشید بەگ

تەڵعەت پاشا

مستەفا کەمال ئەتاتورک

ئەنوەر پاشا

جەمال پاشا

سەید تەهای نەهری

پاشماوەی قەڵاکەی برایم ئاغا هەرچەندە کە وێرانەیە بەڵام خۆ دوای سەد ساڵ ئاڵای کوردستان وا بەسەریا دەشەکێتەوە

ڕەسووڵ ئاغای دزەیی و خەسرەوی کوڕی
(1936 - ؟)

eign Governments.

God has said: "The real faith in God is Islam; God has grace and also his prophet and his faithful" and "Oh Prophet, ask the faithful to fight" and also "God's promises are good, he prefers the fighters (Mujahids) to those who sit down."

I have shown all my options in the way of how to raise the Millice (national) formations, and about the national movements, to Omar Agha Chief of the Jelian tribe; kindly meet him and he will let you understand whatever is necessary. God will help you in vanquishing.

(Sd.) EUZDAMIR,
Chief of the General National
Formations and Movements

Headquarters of the Syria and Palestine Committee of Organisation and National Liberty.

To: RASUL AGHA, Chief of the DIZAI tribe.

Dear Chieftain,

There is not a single Mohammedan who has not so far realised how great and serious was the calamity which befell our country in the Great War and also during the period which has elapsed since the Armistice. There is not a

نامەکەی ئۆزدەمیر بۆ ڕەسووڵ ئاغای دزەیی

درەختی بنەماڵەی دزەییەکان لە قەرەنی ئاغا بە خوارەوە

کاروان

٦٧

١٩٨٨

# کورتەیەکی مێژووی دزەییان لە دەستنووسێکی مێژوویی دا

ئامادەکردنی و هەڵسەنگاندنی

کەریم مستەفا شارەزا

پێشەکی

**نووسینەکەی کەریم شارەزا**

**قوتابخانەی دووگردکانی ئەمڕۆ**

**ئەم وردیلانە ئایندەی کوردستانن، کاربەدەستانی کورد ناچاریان مەکەن وڵات بەجێ بێڵن**

بەرگی کتێبەکەی عەباس ئەلعەزاوی

بەرگی کتێبەکەی حەننا بەتاتو

بەرگی کتێبەکەی ڕۆبێرت ئۆڵسن

بەرگی کتێبەکەی دکتۆر مەهدی

# بەشی 3

## هەڵوێستی کوردپەروەرانەی ئاغاکانی دزەیی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق 1921

دەهـۆڵ دڕا، تەقـەی تفەنـگ و لرمـەی تـۆپ بـڕا، عوسـمانلی دۆڕا، دنیـا گـۆڕا، وڵاتێـک بـە نـاوی عیـراق دامـەزرا، کوردیـش هیچـی پـێ نەبـڕا.

زۆرێـک لـەو گەورەپیـاوە مێژووییانـەی خێڵـی دزەیـی کـە لـە دەیـە دواییەکانـی دەوڵەتـی عوسـمانی و سـەردەمی بریتانییەکانـی پـاش ئـەوان و سـاڵانی سـەرایی دەوڵەتـی عیـراق واتـا لـە هەرسـێ حکوومەتـان (عوسـمانی، بریتانـی، عیراقـی) ڕۆڵـی سیاسـیان دەگێـڕا، ئەوانیـش نەمـان.

هـەم بریتانییـەکان و هـەم مێژوونووسـانی عەرەبـی عیراقـی و ناعیراقیـش چالاکیـی ئـەو خـزم و کەسـوکارانەی منیـان بـۆ مێـژوو تۆمـار کـردووە وەک کـە مـن وا خەریکـم لـەم نووسـینانەمدا هەنـدێ لـە پەڕەکانـی ئـەو مێـژووە بەسـەر دەکەمـەوە و لـە گـەردی بێنازییـان دادەوەشـێنم. بەداخـی گرانیشـەوە دەبـێ بڵێـم کـە مێژوونووسـانی کـورد خـۆی ئەگـەر بـە ڕێگای ئـەو بیانییانـەوە نەبووبـێ ئەگینـا فـری لـە بارەیانـەوە نەدەزانـی.

هـەر چۆنێکـی بـێ، لەپاش ئەوانـە ئیتـر جیلێکـی دیکـەی دزەیـی کـە تێکەڵەیـەک بـوو لـە چینـی ئاغـا خێڵەکییەکانـی جلـی کـوردی لەبـەر و چینێکـی نوێـی ڕۆشـەنبیری چاکـەت و پانتـۆڵ لەبـەر لـە بـواری جیاجیـای کوردایەتیـدا کەوتنـە جموجـۆڵ. ئەمانـە هەموویـان کـوڕ و کـچ و نـەوە و بـرازا و خوشـکەزا و ئامـۆزا و خزمـی ڕاسـتەوخۆی ئـەو پیـاوە گەورانـەی مێـژووی کوردسـتان بـوون کـە باسـمان لێـوە کـردن.

## مشیری برایماغای (مشیری برایمی بایزی)

دەزانم ئێستا هەندێ کەسی ئاگادار لە مێژووی بنەماڵەی دزەییان دەڵێن: "توخوا ئەم مشیری برایماغایە - کە ئارەقخۆرێکی هەمیشە سەرخۆشی ناسراو بووە - هی ئەوەیە ناوی بخرێتە ناو لاپەڕەکانی مێژووی کوردستانەوە!"، ئەمن پێکەنینم بە قسەی کەمزانانی وا دێ.
راستە ئارەقخۆری و سەرخۆشی بە مەفهوومی کۆمەڵگایەکی موسڵمان شتێکی خراپە. بەڵام کاکی برا، مێژووی بەشەرییەت نە موسڵمانە و نە رووباری مێژووش بە مەشرووب خواردنەوە شێلوو بووە. مێژوو بە مەفهوومێکی زۆر جیا لەوە حیساباتی خۆی دەکات. بۆچی هارونە رەشید و خەلیفەکانی عەباسی و ئەمەوی و سوڵتانەکانی عوسمانلی کە چەند ئیمپراتۆراتی موسڵمانی بەرفرەوانیان دامەزراند و ئەورۆش وڵاتە موسڵمانەکان شانازییان پێوە دەکەن و بە هەزاران کتێبیان لەسەر نووسراو، بۆچی تا چێشتەنگاوان مەشروبیان لەگەڵ جەوارییەکانیان نەدەخواردەوە؟ مستەفا کەمال ئەتاتورک بەپێی بەڵگەی بیانی و تورکیش شەوانە تا سەعات چواری بەیانی ئارەقی لەگەڵ ژنان دەخواردەوە و سەعات نزیکەی چواری دوای نیوەڕۆ لە خەو هەڵدەستا. هەر ئەو ئەتاتورکە سەرخۆشە بوو کە ئیمپراتۆرییەتێکی 700 ساڵ کۆنی لەناو برد، ئەم تورکیایەی بە سنووری ئێستای لە هەڵوەشان رزگار کرد و مێژوو و جۆگرافیای دنیای گۆڕی. ئەمانە تەنها چەند نموونەیەکن و زۆری تریش هەیە. ئینجا با بێمەوە بۆ لای مشیراغا سەرخۆشەکەی ئامۆزای خۆم، کە کوڕی میری دزەییان، برایمی بایزی مامم بوو.
لە پاش کوژرانی حەبیب ئاغای کوڕە گەورەی لە شەڕی ناوخۆی دزەییان، برایماغا دوو کوڕی مابوو (مشیر و هاوار) لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کچان. لە پاش کۆچی دوایی برایماغا خۆیشی لە ساڵی 1920،

خورشیداغای برای بە پێشنیاری جەنابی مەلا فەندیی هەولێری و ئینگلیزەکانیش کرا بە سەرۆکی بەرەی بایزی دزەییان بەڵام دواتر دیارە خزمەکانیان وایان بە پەسند زانیبوو کە مشیر ئاغا لە جێی باوکی بکرێ بە سەرۆک (بڕوانە: کۆڤاری کاروان ژمارە 52 کانوونی دووەمی ساڵی 1987).

مشیر هەرچەندە کە بۆ سیاسەت و بەڕێوەبردنی خێڵێکی وا گەورە، ئەو ئەزموونەی نەبوو و وەک کە( کاپتن هێی) ش لە لاپەڕە 165ی کتێبەکەی (Two Years in Kurdistan دوو ساڵ لە کوردستانا) باسی مشیر دەکات کە گەنجێکی سەرەڕۆی بێباکی دەستبڵاو بووە. بەڵام مشیر هەر لە سەرەتای سەرۆکایەتییەکەی یەکسەر رێچکەی برایماغای بابی و خورشیداغای مامی دەگرێتە بەر بۆ خزمەتکردنی گەل و وڵاتی. بەپێی گوتارێکی تەلعەت ئاغای کوڕی مشیر ئاغا (1929 - 2007) کە لە کۆڤاری (کاروان ژمارە 52 ی کانوونی دووەمی ساڵی 1987) وەک بیرەوەری بڵاو کراوەتەوە مشیر ئاغا لەو ماوە کورتەی 1921 کە حکوومەتی بریتانی لەپاش مردنی باوکی کردیان بە حاکمی بەڕێوەبەری ناوچەی شارۆچکەی مەخمور (پایتەختی برایماغا) هەر یەکسەر دەستی بەم خزمەتگوزارییانە کردووە:

1 - یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی مەخموری دامەزراندووە (1922).

2 - زوربەی ئەو باج و سەرانەیەی کە لە کاتی خۆیدا دەسەڵاتدارە عوسمانلییەکان بەسەر خەڵکی ناوچەکەدا سەپاندبوویان بەتایبەتی جوتیارەکان لە سەردەمی مشیر ئاغا کەم کراونەتەوە.

3 - پرۆژەی چاککردنی رێگای (گەلی بازارگە)ی ئەنجام داوە، ئەو رێگایەی لە مەخمورەوە بەرەو دێهاتەکانی دەوروبەری مەخمور دەکشێت و چیای قەرەچوغ دەبڕێ، ئەو رێگایەی کە پێشتر تاکە زەلام و کاروانچییەکان بەحاڵ پێیدا رەت دەبوون.

سەرباری ئەم خزمەتگوزارییە، مشیر ئاغا دڵی هێشتا تێرنەاو نەبووە و هەڵستاوە نامەیەکی زۆر جوانی ئاراستەی کۆمکاری نەتەوان (عصبة

الامـم) کـردووە کـە کۆڤـاری کـوردی ئەوسـاکە (زاری کرمانجـی) لـە لاپـەڕە 2ی ژمـارە 3ی 25ی مایسـی سـاڵی 1926 دەقەکـەی بـڵاو کردووەتـەوە. ئەمـەی خـوارەوە ئـەو نامەیەیـە بـەڵام بـە ڕێنووسـی نـوێ چونکـە ڕێنووسـی هەینـێ زۆر جیـاواز بـووە لـە هـی ئەمـڕۆ. ئەڵبـەت زمانـی کـوردی هەینێکـەش وەک ئـەوەی ئێسـتا پەتـی و پـاراو نەبـووە:

## رزگاری له نەزانین قسەی راست

مەعاریـف واسـیتە یـە بـۆ تەرەقـی، هـەم بـۆ سـەعادەت. ئێمـە کـە لـەم بەهرەیـە بـێ بەریـن، هاوارمـان بـە هیـچ لایـەکا نـاگات و، ئیتـر اضمحـلال و مەحوبوونەوەیشـمان ئینـکار ناکـرێ. وە هـەر لـەم رووەوە هەمـوو رۆژێ بـە تریشـقەی هەورێکـی بـەڵای ناگەهانـی و بـە بـای سـمومی نەگبەتـی، پـەرش و بـڵاو بووینەتـەوە. دەنـا ئەسـبابی ئـەم خەزانـی عومـرە و موبتەلاییمـان بـە ئـەم عیللـەت و ئافەتـە هـەر بـێ ئەفکارییـە. دووبـارە ئـەو قـرارە شـەفیقانەی کۆمـکاری نەتـەوان (عصبـة الامـم) کـە بۆمـان درابـوو بەبـێ ئیتیفاقـی کـە ئەسـبابی جەهالـەت و بـێ مەعاریفییـە، مەیدانـی هیـچ نەوعـە تەتبیـق و تەرویجاتێکـی نـەدا کـە ئەمیـش بـە ئاشـکرا مەعلومـە وەکـو (بـێ مەکتەبـی، لـە مەعاریـف بـەری، بـێ تەدریسـات بـە زمانـی خۆمـان، بـێ بـەری لـە حسسـییاتی میللـی). کـە ئـەم دوو جیهەتەیـش چ بـۆ تەرەقـی و چ بـۆ ئیمحایـی بـە تەتبیـق و عەکسـیش طبیعـی مەئمولـە، ئینجـا بـە نـاوی بەشـەرییەتەوە بـۆ ئـەوەی کـە لـە جەهـل و ئیسـتیبدادی تـا 1332 دەربچیـن و جەهالەتمـان بـە مەدەنییـەت و وێرانیـی وەتەنمـان بـە پـارەی وڵاتـی خۆمـان لـە ئـاوەوە و تەرەقـی تەبدیلکـردن بـۆ لەمـەولا مەگـەر بـە ئومێـد بیـن. ئینجـا لـەو جێگایانـەی کـەوا لایـەق و ئەلیەقـی گوشـادی مەکتەبـن بـۆ گوشـاد و بـۆ تەعیینـی موعەلیـم کـە حائیـزی ئـەم سیفەتە بـن و بـۆ نەهێشـتنی ئـەو نەوعـە موعەلیمـە قەڵـپ و قلاپانـەی کـە

مەعکوسەن تەعلیم و تەربیە بە ئەولادمان ئەکەن. وە بۆ رەغبەت بە زمانی دایک و باوکیمان لە قوتابخانەکانا بە یەک دڵ و یەک دەنگ هاوار بکەین کە ئیسترحاممان قەبوڵ بێ مەعلومە ئەو قەومی کە سەری لێ شێواوە پاشکەوتوو بێ ئەسبابی بێ مەعاریفییە و ونکردنی زمانی دایک و باوکیەتی.

بۆ ئەمەی ئێمەیش لەو عەدالەتەی کە حکوومەتی بریتانیا بە جیهانا بڵاوی کردۆتەوە بەشدار بین، زۆر بە ئومێد بووین بەڵام بەم حاڵە مەحرومییەتمان حەملی سەر ژێر چ لێفەیێکی سیاسەتی بکەم، نازانم! وا ئەپاڕێمەوە، کە لە عەدالەتەکەی ئێمەیش بەشدار ببین.

**کوڕی ئیبراهیم ئاغا**

**رەئیسی عەشیرەتی دزەیی**

**مشیر ئاغا**

(سەرچاوە: کۆڤاری کاروان، ژمارە 52 کانوونی دووەم 1987 ساڵی پێنجەم)

کە حکوومەتی بریتانی دەبینێ هەستی نەتەوایەتی لەناو مێشکی مشیری برایماغادا گەلاڵە بووە (ئەو ساڵە دەوڵەتی عیراقیش هەمووی چوار پێنج ساڵ بوو دامەزرابوو و ساڵی 1925 بووبوو بە ئەندامی کۆمکاری نەتەوان - عصبة الامم و کێشەی باشووری کوردستانیش بە - نەبوون بە دەوڵەت - یەکلا کرابۆوە) دیارە هەست دەکات کە ئەو پیاوە بۆ بەرنامەکەی ئەوان دەست نادات و لەوانەیە ڕێچکەی شێخ مەحموود بگرێتە بەر، هەڵدەستن یەکسەر لە پۆستەکەی وەک حاکمی مەخمور لای دەبەن.

دزەییە پیرەکان دەیانگێڕایەوە کە لە سەردانێکی لەگەڵ ئینگلیزەکان بۆ بەغدا لەوێ مشیریان فێری مەشروب خواردنەوە کرد و لە پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستانیش نەک هەر نەیتوانی مەشروب تەرک بکات بەڵکو بوو بە (ئەلکهۆلیک alcoholic - مدمن)ێکی لەدەست دەرچووی. مشیری برایماغا لە چەند ساڵی دوایی ژیانی کورتیدا (45

ساڵ) ئیتر شەو و ڕۆژ دەیخواردەوە و کەڵکی مەجلیسانیشی نەما و هەر بەو دەردەوەش ساڵی 1945 کۆچی دوایی کرد.

خزمان دەیانگوت ئەگەر دووچاری ئەم کارەساتە نەبوا مشیری برایمی بایزی تێی ڕا دەبینـدرا ببێ بە یەکێک لە ڕێبەرە هەرە کاریگەرەکانی خێڵی دزەیی چونکە سیفاتی سەرۆکایەتیی وەک برایماغای باوکی و خورشیداغای مامی لێ دەتکایەوە: هەتا بڵێی چاوتێر و ناندەر بووە و زۆر ئازا و مەرد و قسە لەڕوو و بێباک بووە. من خۆم منداڵ بووم بەڵام هەستم دەکرد کە خاوەنی زەوقێکی زۆر بەرزی هونەرییش بوو. بۆ ئەو زەمانە (سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم) لە گوندێکی دوور لە شارستانییەت گرامافۆنی هەبوو و ژمارەیەکی زۆریش قەوانی تورکی و عەرەبی و کوردیی هەبوو. چاکم لەبیرە من و کاک سەعدیی برام دڵمان خۆش دەبوو کە لەگەڵ کەسوکارمان سەردانی گوندەکەی ئەو (سیاو)مان دەکرد و زۆریشمان حەز دەکرد زوو زوو بچینە ئەوێ نەک لەبەرئەوەی کە ئامۆزامان بوو بەڵکو زیاتر چونکە ئەو گۆرانیانەی بۆ لێ دەدایـن و دیار بوو چێژێکی زۆری لێ وەردەگرت. هەمیشەش ئۆتۆمۆبیلێکی ئەمەریکیی زۆر جوانی ئاخیرین مۆدێلیشی هەبوو.

ئا لێرەدا پنتکێکی بایەخدار سەرنج رادەکێشێ. ئەم ڕەفتارەی بریتانییەکان لەگەڵ مشیری برایماغای دزەیی هەر کتومت هەمان ڕەفتاریان بووە لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید و لە گەڵ سەید تەهای نەهریدا، چۆن؟

دەربارەی شێخ مەحمود، بریتانییەکان دەیانگوت ئێمە لەگەڵیا ڕێک کەوتین کە ئەو لە ناوچەیەکی دیاریکراوی باشووری کوردستانا ببێ بە حوکمدار بەڵام ئەو چاوی بڕیبووە زۆر زیاتر لەوەی کە بۆمان دانابوو، دیار بوو تەماحی دەکردە تەواوی باشووری کوردستان. میر بەسری لە کتێبەکەی کە بە عەرەبی نووسیویەتی و عەبدولخالق عەلائەدین بە تایتلی (ناودارانی کورد) کردوویە بە کوردی لە لاپەڕە

32 - 33ی کوردیەکەدا دەڵێ: " کە ئینگلیزەکان کوردستانیان لە کۆتایی ساڵی 1918 داگیر کرد، شێخ مەحمود بەرزنجییان لێ کردە فەرمانڕەوا. بەڵام هەندەی نەبرد لە 1919 سەربەخۆیی خۆی راگەیاند، هێزی بریتانیایان بەگژەوە نا، شاری سلێمانییان دووبارە داگیر کردەوە. شێخ مەحمود دەگیرێت و بۆ هیندستان دوور دەخرێتەوە. لە ئەیلوولی 1922 دەگەڕێتەوە سلێمانی، دووبارە دەسەڵاتی کەوتەوە دەست. کەچی هەندەی پێ نەچوو شۆڕشی نایەوە و خۆی کردە مەلیکی کوردستان..". (هەر لەمبارەیەوە بڕوانە کتێبەکەی ویلسن). دەربارەی سەید تەهای نەهریش، کاپتن هێی لە لاپەڕە 353ی کتێبەکەیدا دەڵێ "... ئێمە داوامان کردبوو بێتە لامان تاکو باسی ناردنەوەی (ئاسووریەکان) بکەین بۆ سەر جێ و رێی خۆیان (لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سمکۆی شکاک لە ئێران)، کەچی کە لەگەڵیا دانیشتین دەرکەوت کە ئەو شتێکی تری لە مێشکا بوو: ئەو بۆ ئەوە هاتبوو کە پشتیوانیی بریتانیا مسۆگەر بکات (بە چەک و بە پارە) بۆ ئەو پلانەی کە لە خەیاڵیدا بوو بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ."

جا مەبەستی من لێرەدا ئەوەیە دیارە بریتانیا بە هیچ جۆرێ رازی نەبووە کەس بەرنامەکەی لێ تێک بدات کە دروستکردنی دەوڵەتێکی نوێی عیراق بووە بە پێوە لکاندنی باشووری کوردستانیشەوە بۆیە رەفتاری لەگەڵ شێخ مەحمود و مشیر ئاغای دزەیی و سەید تەهای نەهری - کە شتێکی جیاوازیان لە خەیالا بووە - بەو شێوەیە بووە.

بۆ پشتگیریی ئەم بۆچوونە بڕوانە (د. مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە ساڵانی 1926 - 1939 لاپەڕە 50 کە دەڵێ " هەر بۆیە دەتوانین بڵێین بەشێک لە کوردەکانی لیوای هەولێر دژی لکاندنی ئەم ویلایەتە بوون بە هەر یەک لە تورکیا و عیراق... بەڵام ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ ئامانجەکانی بریتانیا یەکی نەدەگرتەوە، هەر بۆیەش پێش چارەسەرکردنی کێشەکە، چەند پێشنیاری جیاجیای خستبووە روو تەنیا دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی نەبێت...".

سەرەڕای یەکلاییبوونەوەی کێشەی ویلایەتی موسل (باشووری کوردستان) و لکاندنی بەنابەدڵی دانیشتوانەکەی بە دەوڵەتێکی تازە بە ناوی عیراق، بزووتنەوە ڕزگاریخوازە چەکدارییەکانی شێخ مەحموود هێشتا بە تەواوی دانەمرکابوونەوە. هاوسۆزیش لەگەڵ شێخدا لەناو ئاغا دزەییە گەنجە خوێنگەرمەکاندا هەر بەردەوام بوو و لەپاش ئەویش لەگەڵ بزووتنەوە ڕزگاریخوازە چەکدارییەکانی مەلا مستەفای بارزانی.

ئەمەی خوارەوە دەقی ئەو داواکارییەیە کە سەرەک هۆزە ناودارەکانی هەولێر لە 1|7|1930 داویانە بە مەندوبی سامی بریتانی وەک کاردانەوەیان لە ڕووی پەیمانە نوێکەی نێوان بریتانیا و دەوڵەتی عیراق (پەیمانی 1930) کە هەستیان کردووە مافی کوردی تیا پشتگوێ خراوە.

(خوێنەری بەڕێز، سەرنجێکی ورد بدە لیستەی ناوەکان و بزانە چەندیان ئاغاکانی دزەیین. بێجگەلە بابی من ئەوانی دی هەر هەموویان مام و ئامۆزا و بنئامۆزای خۆمن یان ئامۆزا و ئامۆزازای بابمن - هۆمەر دزەیی):

" دائرة السجلات العامة

المرجع: وزاره الطيران 23 417

- 216 - التاريخ 1|7|1930

الى: -

فخامة المندوب السامي لدى العراق،

بغداد.

صاحب الفخامة.

ئەمە کوردییەکەیەتی کە خۆم (هۆمەر دزەیی) لە عەرەبیی ناو کتێبە کوردییەکەی دکتۆر مەهدی وەرمگێڕاوە (1):

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی سەرجەلەکان
سەرچاوە: وەزارەتی فرۆکەوانی 23 417
ڕۆژی: 1|7|1930
بۆ: -
جەنابی ڕاسپێردراوی باڵا لە عیراق
بەغدا.
قوربان،

ئێمەی کورد، کە گشتمان هەست بە دڵنیایی دەکەین، وا سەرئەنجامی خۆمان و پاسەوانیکردن لە مافە نەتەوەییەکانمان داوەتە دەستە ئەمینەکەی بریتانیای گەورە. ئێمە ئەوساو ئێستاش ئامادەین بە پێی ڕاوێژکاری و ڕاسپاردەکانی حکومەتی بریتانیای گەورە کار بکەین و "سەبارەت" بەو ڕاوێژکاریانەش بوو کە وا دەستی برایەتیمان بۆ عەرەبەکانی عیراق درێژ کردووە، کە لە گەڵیاندا بە هاوکاریکردنی یەکتری و بە شێوەیەکی باش و یەکگرتووانە پێکەوە بژین.
قوربان،

گەورەییتان زۆر چاک دەزانێ کە " کۆمەکاری میللەتان" {عصبة الامم} ویلایەتی موسلی بەو مەرجە بۆ عیراق هێشتەوە کە دان بە هەندێ ئیمتیازات بۆ کورد بنرێ. مەبەستیش لەو مەرجانە مسۆگەرکردنی مافی کورد و پێشخستنی کوردستانە و حکوومەتی بریتانیش بەڵێنی بە ئەنجومەنی کۆمەکار داوە کە چاوەدێریی جێبەجێکردنی ئەو مەرجانە بکات.

وە لەبەر ئەوەی کە پەیمانێکی نوێی ئینگلیزی - عیراقی بەستراوە کە پەیوەندیی نێوان بریتانیای گەورە و عیراق ڕێک دەخا، وە لەبەر ئەوەی کە کورد پێکهاتەیەکی "گرنگ"ن لەم هەبوونی عیراقەدا و ئێمەش ئارەزوومەندین نەتەوەکەمان بە پێشکەوتوویی ببینین، ناچارین داوا بکەین ئەم داخوازییانەمان بخرێتە ناو کاکڵی پەیمانەکەوە . چون جەنابیشتان نوێنەری کۆمەکاری میللەتانن و تاکە پارێزەری مافەکانی

کوردن تکامان ئەوەیە ئەم داخوازییانەمان بخەنە ڕوو و بە هاوسۆزی و بەهەند سەیر بکرێت و ئەوەی کە پێویستە بۆ جێبەجێکردنی بکرێت:

1 - دیاریکردنێکی ڕاست و دروستی سنووری کوردستانی عیراق.

2 - دامەزراندنی پارێزگایەکی کوردی لە هەرێمە باکورییەکانی ویلایەتی موسل.

3 - دان پیانان بە زمانی کوردی کە ئەوە زمانی دیوانییە لە ناوچە کوردییەکان و سەپاندنی بەکارهێنانیشی، بەبێ لێ دەرئاویشتن، لە هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکان و دووەمینەکان و هەموو نووسینەمەنییە دیوانییەکان لە دام و دەزگانی حکومەتدا.

4 - دانانی دەزگایەکی گشتیی سەرپەرشتی و بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتی لە وەزارەتەکانی ناوخۆ و پەروەردە کە بارەگاکانیان لە بەغدا بن و گرێدراوی ڕاستەوخۆی وەزیرانی ناوخۆ و پەروەردە بن. ئۆفیسی سەرپەرشتیاری گشتی "هەرچۆنێک بێ" لە یەکێک لە پارێزگا کوردییەکاندا دەبێت کە دواتر هەڵدەبژێردرێت.

5 - هەموو کارمەند و کاربەستەکانی پارێزگا کوردییەکان، بەبێ لێ دەرئاویشتن، "کورد نەژاد" دەبن و دامەزراندن و لابردنیان بە دەست سەرپەرشتکاری گشتییەوە دەبێت.

6 - دانانی یەکەی سەربازیی کوردی کە تەواوی سەرکردە و ئەفسەر و سەربازەکانیان تەنیا کورد دەبن.

7 - وە لەبەر ئەوەی کە ئاڵای عیراقی ئێستا هیچ هێمایەکی تێدا نییە کە ئاماژە بۆ کورد بکات، ئێمە داوا دەکەین کە کوردەکان لە پاشەڕۆژدا هێمایەک هەڵبژێرن کە بخرێتە ناو ئاڵاکەوە.

8 - دامەزراندنی دادگایەکی بەتەواوی کوردی لە بەغدا کە هەموو دادگا سیڤیلییەکانی ناوچەکانی کوردی بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە. هەروەها بە پێویستی دەزانین کە هەموو نووسین و گەیاندنەکان لەم دادگایەدا بە زمانی کوردی بن .

تێبینی:

وە بۆ ئەوەی کە هیچ خراپ لێکگەیشتنێک نەکەویتە ناوەوە، تکا دەکەین کە زۆر بە ڕاشکاوی ئاماژە بەوە بدرێ کە کورد هەرگیز نایەوێت لە عیراق جیابێتەوە. تاکە ئامانجی کورد ئەوەیە کە ببینێت هەبوونیان وەک نەژاد و کەرامەتیان لە عیراقا پارێزراوە. دەبێ ئەوەش ڕوون بکرێتەوە کە یەکیەتییەک لەسەر بناغەی ڕێکەوتنی هاوبەش و تێگەیشتن بنیاد نرابێ لێک ناترازێت و لە دواییدا دەردەکەوێت کە ئەمەیان زۆر تۆکمەترە لە یەکیەتییەکی بە زۆر و بە توندو تیژییەوە سەپێنراو. وە بۆ ئەوەی کە کورد بە شێوەیەکی دۆستانە و بە ڕێککەوتنی گشتی بە عیراقەوە بلکێندرێت پێویستە بەر لە هەموو شتێک بە قەناعەتەوە بەمە ڕازی بن. ئەم ڕەزامەندییەش تەنیا بە ڕێگای پیادەکردنی ئەو داخوازییانە دێتە دی کە لەسەرەوە باسمان کردووە.

تواقیع

| | |
|---|---|
| خورشید اغا بایز اغا | رئیس عشیره دیزەئی {مامی هۆمەر دزەیی} |
| احمد باشا خدر بک زاده | رئیس عشیره دیزەئی |
| حمه سادق اغا رسول اغا زاده | رئیس عشیره دیزەئی |
| معروف اغا حاجی بیرداود اغازاده | رئیس عشیره دیزەئی |
| مشیر اغای ابراهیم اغا | رئیس عشیره دیزەئی |
| حسین اغای ملا اغا | رئیس عشیره دیزەئی |
| اسماعیل اغای علو اغا | رئیس عشیره دیزەئی |
| عزیز اغای احمد باشا | رئیس عشیره دیزەئی |
| سلیمان اغای حاجی احمد اغا | رئیس عشیره دیزەئی |
| محمد اغای حاجی بایز اغا | رئیس عشیره دیزەئی |

{ئه‌مه‌یان باوکی هۆمه‌ر دزه‌یی یه به‌ڵام ناوه ڕاستیه‌که ناوێکی تێکهه‌ڵکێشراو "محمد ئه‌مین ئاغا" یه نه‌ک محمد ئاغا}

| | |
|---|---|
| جكول اغاى حويز اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| على اغاى خورشيد اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| اورحمان اغاى بايز اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| | {مامی هۆمه‌ر دزه‌یی} |
| احمد باشا زاده قادر اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| على اغاى حمد اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| مستفى اغاى ملا اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| عبدالله اغاى ابراهيم عمر افندى | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| حسن اغاى قرنى اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| سعيد اغاى حاجى قادر اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| عزيز اغاى حاجى ملا اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| حسن اغاى شيخ محمد اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| حاجى امين اغا زاده ابراهيم اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| كاك محمد اغازاده عبدالقادراغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| كوالى اغا زاده حاجى امان اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| حسن اغا زاده اسماعيل اغا | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| مولود حاجى حمه رشيد زاده | رئيس عشيرة ديزه‌ئى |
| كاكل اغا زاده جميل اغا | رئيس عشيرة گردى- لواء اربيل |
| مجيد اغا كاكل اغا زاده | |
| حسن اغا زاده | |
| بابكر اغا خورشيد اغا زادة | |
| اسعد اغا شيخ حسن اغا زاده | رئيس عشيرة زرارى |

| | |
|---|---|
| علاءالدین بک احمد بک زاده | رئیس عشیرة زراری |
| محمود بک کانبی اغا زاده | |
| سید رسول اغا زاده | |
| رشید اغا حاجی محمد اغا زاده | رئیس عشیرة شیخ بزینی |

**. (سەرچاوە: دکتۆر مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە ساڵانی 1926 -1939، بەڵگەنامەی ژمارە 12 بە عەرەبی لاپەڕە 457 -460.**

لێرەدا بە ئەرکی دەبینم سوپاسگوزاری و منەتبارییەکی یەکجار زۆرم بۆ نووسەری بە بڕشتی مێژوو کاک دکتۆر مەهدی دەربڕم بۆ ئەو کارئاسانییەی کە لەم بوارەدا بۆی کردووم و ئەم بیرەوەرییانەی بۆ دەوڵەمەندتر کردووم. کاک مەهدی بەڕاستی دەبێ ئەرکێکی گرانی کێشابێ کە بە دوای ئەو هەموو بەڵگەنامانەی عەرەبی و ئینگلیزییەدا گەڕاوە و کۆی کردوونەتەوە.)

## خدری ئەحمەد پاشای دزەیی (خدری پاشای)

خدری پاشای کە جیا لە هەموو ئاغاکانی دیکەی دزەیی بە تایتلی "بەگ" دەناسرا، سەرەڕای نەخوێندەواریی، شۆڕەسوارێکی کاریزماتیکی خاوەن کەسایەتییەکی زۆر بەهێزی خێڵی دزەیی بوو بە هەموو بەرەبابەکانییەوە. هەر وەک کە کاپتن هێی لە لاپەڕە 165ی کتێبەکەی (دووساڵ لە کوردستانا) هەر ئاوا لابەلا و سەرپێیی باسی خدربەگی کردووە کە " پیاوێکی ئاکار جوانی ڕەوشت پیاوانە بووە"، بەڕاستیش تۆ ئەگەر بتڕوانیایە ڕوخسار و ئاکاری بە سام و سەنگینی و دوو چاوی ڕەش و تیژی بازئاسای یەکسەر حەیرانی هەیبەت و گەورەیی ئەو پیاوە دەبوویت. خدر بەگ لە قسەکردندا متمانەی تەواوی بە خۆی هەبوو و بێ پێچ و پەنا هەرچی لە دڵی بوایە بە ئاشکرا دەری دەبڕی و نوکتەشی دەکرد با لەسەر خۆیشی بوا. ئەمن ئەوەندەی کە تێی ڕادەمێنێم دەبینم کە خدری پاشای لە ڕەفتار و ڕەوشتی پیاوانە و ئازاییدا زیاتر دەچۆوە سەر برایماغای بنئامۆزای باپیری نەک ئەحمەد پاشای بابی. ئەوەی کە لەبارەی بریماغامان خوێندۆتەوە و بیستوومانە دەردەکەوێ کە ئەخلاقی خدر بەک زۆر لە هی ئەو دەچێت. ئەمن کە لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەم هێشتا منداڵ و مێردمنداڵ بووم هەمیشە دەمدی خۆی ئۆتۆمۆبیلی خۆی داژۆت و ئەگەر بە گوندەکەی ئێمەدا، دووگردکان، ڕەت بوایە لە دوورەوە باسکی هەڵ ئەبڕی و سڵاوی لە دانیشتوانی گوند دەکرد. لە سەرەتاکانی هەشتاکانی هەر ئەو سەدەیەش ئەگەر لە هەولێر بوام چەندین جار لە دیوەخانەکەی لە شاری هەولێر لە خزمەتی دانیشتووم بەڵام ئەوساکە تەمەنی - وەک دەیانگوت - لە سەت و دە ساڵ تێپەڕیبوو و سروشتانە بۆ ئەو تەمەنە کەمدوو بوو.

خدر بەگ بە پێچەوانەی ئەحمەد پاشای بابی، لە هەموو ڕووێکەوە

پابەنــدی داب و نەریتــی خێڵەکــی بــوو و زۆر جــار لەســەر ڕەوشــتە بازرگانییەکەی بابی کە دوور بـووە لـە هەمـوو عـورف و عادەتـی بـاوی عەشیرەتان تووشـی ناکۆکـی دەبـوو لەگەڵیا. خـدر پیـاوی مـەردی خـۆش دەویسـت ئەگـەر نەیاریشـی بـوا.

پاشــای کــوڕی خــدر بــەگ تەنیــا کوڕیەتــی لــە ژیــان مــاوە ( لەدایکبـووی 1932) وە و منیـش ئەگـەر لـە هەولێـر بـم حـەز دەکـەم زوو زوو سـەردانی بکـەم کـە هەمیشـە حیکایەتـی خـۆش خۆشـی خـدری باوکـی و ئەحمـەد پاشـای باپیریـم بـۆ دەگێڕێتـەوە. پاشـا دەڵـێ: دەوڵەتـی عوسـمانی لـە دەسـپێکی جەنگـی گـەورە 1914 داوا لـە برایماغـای دزەیـی دەکات بـە هێزێکـی گـەورەی غەیـرە نیزامـی خزمـان و عەشـرەتەکەی خـۆی بچـن بـۆ ئێـران بـۆ غەزایـێ لـە دژی ڕووسـەکان. دەڵـێ خـدری باوکـی بـە ژمارەیەکـی زۆر لـە سـوارەکانی خـۆی یەکسـەر دەچێتـە لای برایماغـا و ئامادەیـی خـۆی پیشـان دەدەا لەگەڵـی بچـن بـۆ ئێـران. ئەحمـەد پاشـای باوکـی خـدر لێـی تـووڕە دەبێـت پێـی دەڵـێ کـوڕم ئـەوە بـە تەمـای چیـت، ئێمـە چ کارمـان بـەو هەرایـەوە هەیـە، بـا برایماغـا بۆخـۆی بـڕوا ئێمـە بـۆ بەگەڵـی کەویـن! بـەلام خـدر باوکـی ئیقنـاع دەکات دەڵـێ بابـە زۆر عەیبـە بـۆ ئێمـە بەشـداری لـەم هەڵمەتـە نەکەیـن، ئەمـە لەشـکری عەشـیرەتی دزەییـە بـە هەمـوو تیـرەو بەرەبابەکانییـەوە دەبـێ لـە ڕۆژێکـی وەک ئەمـڕۆ هەموومـان یـەک بیـن و پشـتی مامـم برایماغـا بـەر نەدەیـن. ئیتـر هێزێکـی گـەورەی دزەیـی بەسـەرکردایەتی برایماغـا دەگەنـە ئێـران. بـەلام دوای ماوەیەکـی کـورت دیـار بـوو ئەحمـەد پاشـا دڵـی هـەر لای بـازاڕ و بازرگانییەکـەی بەجـێ مابـوو و دەڵێتـە خـدری کـوڕم ئیشـوکارمان هەمـووی وەسـتاوە بـا بگەڕێینـەوە. ئەویـش دیسـان دەڵێتـە باوکـی کـە ئـەوە عەیبێکـی گەورەتـرە و پێمـان دەڵێـن دزەیـی ترسـنۆک بـوون و هەلاتـن بەمـەش تـەواوی عەشـیرەتەکەمان پـێ سـووک دەبـێ، دەڵـێ بابـە نەکـەی بڕۆیـت، بـەو خوایـە ئەگـەر بشـڕۆیت ئەمـن لەگەڵـت نایـەم. ئەحمـەد پاشـا ئەمجارەیـان گوێـی نادانـێ و چەنـد سـوارێک بەگـەڵ

خـۆی دەدات و ڕێـی هەولێـر دەگرێتـە بـەر. خـدر زۆری لا ناخـۆش دەبێـت و بـە دڵشـکاوی دەچێتـە لای برایماغـا ئەویـش هەسـت دەکات و لێـی دەپرسـێ خـدر کـوا بابـت؟ ئەویـش دەڵـێ وەڵـلا مامـە چیـت لـێ بشـارمەوە بابـم گەڕایـەوە. برایماغـا دەڵـێ بەخـوا کـوڕم دەمزانـی بابـت هـەر وای لـێ دەکات. لێرەدا قسـەیەکی زۆر مەشـهور لـە خـدر دەگێڕنـە کـە بـە برایماغـای گوتـووە" مامـە بریـا ئەمـن کـوڕی تـۆ بـوام" جـا ئەمـە ئـەوە دەردەخـات کـە خـدری پاشـای چونکـە خـۆی سـوارچاکێکی مـەرد و پیاوانـە بـووە هەمیشـە سـەرکردە و پیـاوی مـەرد و سـوارچاکی لا خۆشەویسـت بـووە. بـەڵام خزمـە نزیکەکانـی خـدر بـەگ دەڵێـن قسـەکە بـە پێچەوانـە بـووە. ئەمـان دەڵێـن کـە برایماغـا ئـەو بـە خـدری گوتـووە " خـدر، بریـا ئەتـو کـوڕی مـن بوایـت. " ئیتـر ڕووداوەکـە زیاتـر لـە سـەت سـاڵ کۆنـە و ڕاسـتیەکەی گرنـگ نیـە کـێ بـە کێـی گوتـووە، گرنگییەکـە لـەوە دایـە کـە پیاوەتـی و مەردایەتـی و خۆشەویسـتیی بـۆ یەکتریـی ئـەو دوو پیـاوە گەورەیـەی دزەییـان دەر دەخـات.

لـە دەسنووسـە بـە نرخەکـەی جەنابـی مـەلا خالیـدی مورتکـە ئەوهـا باسـی خـدری پاشـای کـردووە "خدربـەگ ئەحمـەد پاشـا پیاوەکـی بەناوبانگـە، زۆر چاپـوک و بـە دەسـت و بـردە، عەگیـد و تفەنگچییـە، زوبـان زانـە، بـێ شـەرمە، پێنـج دەورە نائیبـی کـردووە، سـوخەتی زۆرە بـەڵام مرازمـان لـەم نووسـینە کورتییـە"

بەڕاسـتیش دەڵێـن خـدر بـەگ لـە نیشـانە شـکاندندا وێنـەی نەبـووە. پاشـای کـوڕی ئەمەشـی بـۆ گێڕاوەمەتـەوە کـە لـە سـەفەرەکەی هێـزە غەیـرە نیزامییەکـەی دزەییـان بـۆ ئێرانـێ، کـە لەسـەرەوە باسـم کـرد، سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی مامـەش سـەریان سـووڕ دەمێنـێ لـە هونـەری نیشـان پێکانـی ئـەو سـوارچاکە دزەییـە کـە لـەوێ پێیـان گوتـووە خـدۆ. خـدر لـە نیشانەشـکاندن هـەر هەموویـان دەبەزێنـێ تـا قەرەنـی ئاغـای سـەرەک ئێلـی مامـەش بـە برایماغـا دەڵـێ" ئـەرێ برایماغـاماڵتـە، پێمـان ناڵێیـت ئـەم (خـدۆ) یـەت لـە کوێنـدەرێ بـۆ هێناویـن ؟ "

دکتۆر مەهدی محەمەد قادریش لە کتێبە پڕ لە گەوهەرەکەی (هەولێر لە سالآنی 1926 - 1939) لە لاپەڕە 33 - 34 دا هەمان چیرۆک لە زاری پاشای خدری پاشای دەگێڕێتەوە و دەڵێ لە یەکێک لەشەڕەکانی ئەوێندەرێ (لە ئێران) گردێک بە سەرکردایەتی خدری بابی دەگرن کە ئێستاش ئەو گردە ناوی بووەتە گردی خدۆی.

جەنابی مەلا خالیدی مورتکەش لە لاپەڕە 58 ی دەسنووسەکەی بەکورتی باسی ئەم هێزەی دزەییانی بۆ ئێرانێ کردووە بەڵام بێ ئاماژەدان بە ڕۆڵی خدر بەگ لەوێ.

دیسان هەر پاشای کوڕی خدر بەگ لە زاری شێخ سالاری حەفیدەوە بۆی گێڕاومەتەوە کە لە سالآنی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود (نازانم چ ساڵێک بووە) خدر بەگ چووەتە لای شێخ مەحمود کەوا بەناوی هەموو عەشیرەتی دزەیی هاتووە بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنێت کە دزەیی ئەو بە مەلیکی هەموو کوردستان دەزانن و تەواوی خێڵی دزەییش خۆیان بە ڕەعیەتی ئەو دەزانن. دکتۆر مەهدی محەمەد قادریش لە لاپەڕە 101 ی کتێبە بەهادارەکەی ( هەولێر لە سالآنی 1926 1939-) کە باس لە هاتنی مێجەر یۆنگ (Major Young) ی بریتانی دەکات ساڵی 1930 بۆ هەولێر و کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسایەتییە ناودارەکانی شار و عەشایردا دەڵێ " خدری ئەحمەد پاشا لە جیاتی ئامادەبووان داواکارییەکانی بە ناوی هەولێرەوە خستە ڕوو و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەموو هۆزەکانی هەولێر لەگەڵ داواکارییەکانی شاری سلێمانین، هەروەها داوای کرد کە نابێت هەرسێ لیوای کەرکوک و هەولێر و سلێمانی لە یەک جیا بکرێنەوە. دواتر ئەحمەد عوسمان سەبارەت بە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان وتی: ئێمە کوردین حقوقی خۆمان ئەوێ، بەندە چەند ساڵە لە خزمەتی حکومەتام و تێگەیشتووم کە کورد بە عومری لەسەر حقوقی خۆی ئیسرار ئەکات و ئەم حەقە بە قەراری عصبة الامم دامەزراوە پێویستە بماندرێتێ" مەحمود ئەحمەد عوسمانیش

خـۆی دەدات و ڕێـی هەولێـر دەگرێتـە بـەر. خـدر زۆری لا ناخـۆش دەبێـت و بـە دڵشـکاوی دەچێتـە لای برایماغا ئەویـش هەسـت دەکات و لێـی دەپرسـێ خـدر کـوا بابـت؟ ئەویـش دەڵـێ وەڵـڵا مامـە چیـت لـێ بشـارمەوە بابـم گەڕایـەوە. برایماغـا دەڵـێ بەخـوا کـوڕم دەمزانـی بابـت هـەر وای لـێ دەکات. لێرەدا قسـەیەکی زۆر مەشـهور لـە خـدر دەگێڕنـە کـە بـە برایماغـای گوتـووە" مامـە بریـا ئەمـن کـوڕی تـۆ بـوام" جـا ئەمـە ئـەوە دەردەخـات کـە خـدری پاشـای چونکـە خـۆی سـوارچاکێکی مـەرد و پیاوانـە بـووە هەمیشـە سـەرکردە و پیـاوی مـەرد و سـوارچاکی لا خۆشەویسـت بـووە. بـەڵام خزمـە نزیکەکانـی خـدر بـەگ دەڵێـن قسـەکە بـە پێچەوانـە بـووە. ئەمـان دەڵێـن کـە برایماغـا ئـەو بـە خـدری گوتـووە " خـدر، بریـا ئەتـو کـوڕی مـن بوایـت. " ئیتـر ڕووداوەکـە زیاتـر لـە سـەت سـاڵ کۆنـە و ڕاسـتییەکەی گرنـگ نیـە کـێ بـە کێـی گوتـووە، گرنگییەکـە لـەوە دایـە کـە پیاوەتـی و مەردایەتـی و خۆشەویسـتیی بـۆ یەکتریـی ئـەو دوو پیـاوە گەورەیـەی دزەییـان دەر دەخـات.

لـە دەسنووسـە بـە نرخەکـەی جەنابـی مـەلا خالیـدی مورتکـە ئەوهـا باسـی خـدری پاشـای کـردووە "خدربـەگ ئەحمـەد پاشـا پیاوەکـی بەناوبانگـە، زۆر چاپـوک و بـە دەسـت و بـردە، عەگیـد و تفەنگچییـە، زوبـان زانـە، بـێ شـەرمە، پێنـج دەورە نائیبـی کـردووە، سـوخەتی زۆرە بـەڵام مرازمـان لـەم نووسـینە کورتییـە"

بەڕاسـتیش دەڵێـن خـدر بـەگ لـە نیشـانە شـکاندندا وێنـەی نەبـووە. پاشـای کـوڕی ئەمەشـی بـۆ گێڕاومەتـەوە کـە لـە سـەفەرەکەی هێـزە غەیـرە نیزامییەکـەی دزەییـان بـۆ ئێرانـێ، کـە لەسـەرەوە باسـم کـرد، سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی مامـەش سـەریان سـووڕ دەمێنـێ لـە هونـەری نیشـان پێکانـی ئـەو سـوارچاکە دزەییـە کـە لـەوێ پێیـان گوتـووە خـدۆ. خـدر لـە نیشانەشـکاندن هـەر هەموویـان دەبەزێنـێ تـا قەرەنـی ئاغـای سـەرەک ئێلـی مامـەش بـە برایماغـا دەڵـێ" ئـەرێ برایماغـا ماڵتـە، پێمـان ناڵێیـت ئـەم (خـدۆ) یـەت لـە کوێنـدەرێ بـۆ هێناویـن ؟ "

دکتۆر مەهدی محەمەد قادریش لە کتێبە پڕ لە گەوهەرەکەی (هەولێر لە سالآنی 1926 - 1939) لە لاپەڕە 33 - 34 دا هەمان چیرۆک لە زاری پاشای خدری پاشای دەگێڕێتەوە و دەڵێ لە یەکێک لەشەڕەکانی ئەویندەریٚ (لە ئێران) گردێک بە سەرکردایەتی خدری بابی دەگرن کە ئێستاش ئەو گردە ناوی بووەتە گردی خدۆی.

جەنابی مەلا خالیدی مورتکەش لە لاپەڕە 58 ی دەسنووسەکەی بەکورتی باسی ئەم هێزەی دزەییانی بۆ ئێرانیٚ کردووە بەلآم بیٚ ئاماژەدان بە ڕۆڵی خدر بەگ لەویٚ.

دیسان هەر پاشای کوڕی خدر بەگ لە زاری شێخ سالاری حەفیدەوە بۆی گێڕاومەتەوە کە لە سالآنی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود (نازانم چ ساڵێک بووە) خدر بەگ چووەتە لای شێخ مەحمود کەوا بەناوی هەموو عەشیرەتی دزەیی هاتووە بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنێت کە دزەیی ئەو بە مەلیکی هەموو کوردستان دەزانن و تەواوی خێڵی دزەییش خۆیان بە ڕەعیەتی ئەو دەزانن. دکتۆر مەهدی محەمەد قادریش لە لاپەڕە 101 ی کتێبە بەهادارەکەی ( هەولێر لە سالآنی 1926 1939-) کە باس لە هاتنی مێجەر یۆنگ (Major Young) ی بریتانی دەکات ساڵی 1930 بۆ هەولێر و کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسایەتییە ناودارەکانی شار و عەشایردا دەڵیٚ " خدری ئەحمەد پاشا لە جیاتی ئامادەبووان داواکارییەکانی بە ناوی هەولێرەوە خستە ڕوو و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەموو هۆزەکانی هەولێر لەگەڵ داواکارییەکانی شاری سلێمانین، هەروەها داوای کرد کە نابێت هەرسیٚ لیوای کەرکوک و هەولێر و سلێمانی لە یەک جیا بکرێنەوە. دواتر ئەحمەد عوسمان سەبارەت بە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان وتی: ئێمە کوردین حقوقی خۆمان ئەویٚ، بەندە چەند ساڵە لە خزمەتی حکومەتام و تێگەیشتووم کە کورد بە عومری لەسەر حقوقی خۆی ئیسرار ئەکات و ئەم حەقە بە قەراری عصبة الامم دامەزراوە پێویستە بماندرێتیٚ" مەحمود ئەحمەد عوسمانیش

(کوڕی ئەحمەد عوسمان کە دەکاتە پورزای هۆمەر دزەیی) لە کتێبی (مصابیح وظلمات) کە بە عەرەبیی نووسیوە ئەویش هەر باسی هەڵوێستی کوردەکانی هەولێر دەکات (بە شارستانی و عەشایرەوە) بەرامبەر پەیمانی 1930 لە نێوان بریتانیاو عیراقدا. مەحمود ئەحمەد عوسمان لە لاپەڕە 21 22- ی کتێبەکەیدا دەڵێ " ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی 1930|8|9 جێگری سەرەک وەزیران جەعفەر پاشای عەسکەری و مەندوبی سامی بریتانی لە کەرکوکەوە چوون بۆ هەولێر و لەوێ لە کاتژمێر دەی پێش نیوەڕۆ لە سەرای حکومەت (باڵاخانەی پارێزگا) لەگەڵ خانەدان و سەرەک عەشیرەتەکان کۆبوونەوە. لەوێ جێگری سەرەک وەزیران ئەو بەیاننامانەی خوێندەوە کە پێشتر لە کەرکوکیش پێشکەشی کردبوون و لەپاش ئەو ئینجا مەندوبی سامی هەڵسایەوە و ئەویش بەیاننامەیەکی خوێندەوە کە تیایدا پشتگیریی لە ناوەڕۆکی بەیاننامەکانی جێگری سەرەک وەزیران کرد. لەپاشان ئەندامی ئەنجومەنی پیران ئەحمەد ئەفەندی عوسمان هەڵسایەوە گوتی: بەر لەوەی ئەمن دەست بە قسە بکەم بە پێویستی دەزانم جارێ با سەرەک عەشیرەتەکان بیروڕای خۆیان دەربڕن. لێرەدا سەرەک عەشیرەتەکان گوتیان ئەوان خدری ئەحمەد پاشا لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی دزەییان دەسنیشان کردووە بە ناوی هەموان قسە بکات. ئەویش هەڵستا و گوتی ئێمەی عەشایر پشتگیریی لە داخوازییەکانی خەڵکی سولەیمانی دەکەین و ئێمە یەکگرتووین و ناکرێ کەرکوک و سولەیمانی و هەولێر لێک جیا بکرێنەوە"

" ئینجا دوای ئەو جەنابی ئەعیان ئەحمەد بەگ هەڵستا گوتی: ئێمەی کورد داوای مافی خۆمان دەکەین و ئەو مافانەش لەلایەن کۆمکاری نەتەوەکانەوە (عصبة الامم) بڕیاری لەسەرا دراوە. لەپاشان ڕووی قسەکانی کردە جەعفەر پاشای عەسکەری و گوتی: گەورەم پاشا، ئەتۆ لە پێناو بەرگریکردنت لە عەرەب دوو پەنجەت پەڕیوە، ئێمە بۆ ئەمە ڕێزت لێ دەگرین. جا ئێمەش مافی خۆمانە گیانی

خۆمان لە پێناو مافە نیشتمانییەکانمان بەخت بکەین و هیچ کەسێکیش ئەو مافەی نییە گلەییمان لێ بکات. پێویستە لە ناوچە کوردییەکانی عیراقدا زمانی کوردی لە تەک زمانی عەرەبی ببێ بە زمانی دیولنی (رەسمی). "

ئەگەر خوێنەری بەڕێز سەرنجێکی ورد بداتە ئەو کۆبوونەوەیە (1930) کە ئەوسا دوو سەرۆکە ناودارەکانی دزەیی برایماغاو ئەحمەدپاشا نەمابوون بەڵام خورشیداغا مابووە و لەوێ بووە کەچی ئەو خدری ئەحمەد پاشای هەڵبژاردووە بەناوی هەموان قسە بکات چونکە خدر گەنجتر بووە و لەو وەختەوە سیمای گەورەیی و قابلییەتی قسەکردنی لێ بەدی کراوە و خورشیداغاش کە ئەوسا پیر بووبوو (ساڵی 1932 مرد) دیارە بۆ بەرژەوەندی میللەتەکەی ناحەزی و نەیاریی کۆنی ناوە بەلایەکەوە و خدری لە هەموان زیاتر لا پەسند بووە.

میر بەسری لە کتێبی (ناودارانی کورد) کە عبدالخالق عەلائەدین لە عەرەبییەوە کردوویەتە کوردی لە لاپەڕە 170 دا دەڵێ " خدر ئەحمەد پاشا: خدر بەگ کوڕی ئەحمەد پاشا سەرۆکی عەشیرەتەکانی کوردی دزەییە کە لە خوار ناحیەی قوشتەپە و هەموو ناوچەکانی قەزای مەخمور لە پارێزگای هەولێرن... "

" دیارە خدری پاشای نێوانی لەگەڵ جەنراڵ بەکر سدقیش زۆر کۆن و دۆستانە بووە. پەیوەندی نێوان بەکر سدقی و ئاغاکانی دزەیی دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای ساڵانی سییەکان بەتایبەتی لەگەڵ (خدری ئەحمەد پاشا دزەیی) کە پەیوەندییەکی بەهێزیان هەبووە. دوای کودەتاکەش ئەم پەیوەندییەیان هەر بە دۆستایەتییەوە دەمێنێتەوە و تەنانەت بەکر سدقی چەند جارێک سەردانی گوندی (سۆربەش) ی کردووە. " (بڕوانە: د. مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە ساڵانی 1926 - 1939 ل - 208).

دوور لە سیاسەت، خدر بەگ ئاشقی حەیران و لاوک و سپۆرت

و بەزمـی گەنجانیـش بـووە. محەمـەدی مەولـود هەولێـری (1917 - 1993) بـۆی گێڕامـەوە کـە حەیرانبێـژی هـەرە نـاوداری سـەردەمی خـۆی، زایـەر، کـە ئەویـش لـە بەرەبابـی مـام زێتدینـی دزەیـی بـوو کۆچـی دوایـی دەکات و لـە گۆڕسـتانی قوڵەپـەی یابە دەنێـژرێ دەڵێـن ڕۆژێکیـان خدری پاشـای بـە تاقـی تەنیـا بـە ئۆتۆمۆبیلـی خـۆی بـە ڕێـگای قوڵەپـەدا دەچێتـە هەولێـر. لـە گۆڕسـتانەکە ئەوەسـتێت و مێردمنداڵێکـی شـوان لـەوێ دەبـێ بانگـی دەکا دەڵـێ ڕۆڵـە قەبـری زایـەر کامەیانـە؟ شـوانەکە پیشـانی دەدات. خـدر بـەک دادەبەزێـت یـەک دانـە سـەعاتی تـەواو لەسـەر گـۆڕی زایـەر دەگـری.

جارێکـی تریـش بەسـەخانی ئامـۆزام و خەسـووم ئـەم قسـە خۆشـەی خـدر بەگـی خاڵـی (خاڵـی هەقـی بـوو) بـۆ گێڕامـەوە: خـدر بـەگ پێنـج کـوڕی هەبـوو بـەڵام ئەویـش وەک برایماغـا کـچ و کچـەزای زۆر بـوون و هەمووشـی نەدیبـوون و ئەگـەر بشـیدیبان نەیدەزانـی کـێ هـی کـێ یـە. دەڵـێ جارێکیـان شـایەکی گـەورەی دزەییـان لـە یەکێـک لـە گوندەکانیـان دەگـەڕا. خـدر بەگیـش بانگهێشـت کرابـوو و دەچێتـە نـاو شـاییەکە و دەسـت بـە هەڵپەڕکـێ دەکات. بەسـەخان دەڵـێ خاڵـە خـدرم زۆر کـەم دیبـوو حـەزم کـرد بچمـە دەسـتی لـە شـاییێدا. بەسـەخانیش بـە گەنجـی ژنێکـی زۆر جـوان و شـۆخ و شـەنگ بـووە کـە دەچێتـە دەسـتی خـدری خاڵـی ئەمیـان دڵـی زۆر خـۆش دەبـێ کـە کچێکـی وا جـوان هاتۆتـە دەسـتی و هەڵبـەت نازانـێ کـە خوشـکەزای خۆیەتـی. بـۆ مـاوەی یـەک سـەعات لـە دەسـتی بەسـەخان شـایی دەکات، خـۆی دەلەنگێنێـت و ئارەقـی ڕەش و شـینی بەلاچـاودا دێتـە خـوارێ. عەلـی ئاغـای خورشـیدی بایـزی کـە بـە عەلـۆی قورشـیدی بەناوبانـگ بـوو و مامـی بەسـەخان بـوو دەزانـێ خـدر خوارزاکـەی خـۆی ناناسـێت و زۆر مانـدووش دیـارە، لـە پەنـاوە بـە گوێچکەیـدا دەچرپێنـێ " کـورە بـەس خـۆت مانـدوو بکـە خـدر، ئـەوە بەسـەخانی خوارزاتـە !!" خـدر کـە ئەمـە دەبیسـێ دەحەپەسـێ و ڕووی دەکاتـە بەسـەخان دەڵـێ " تفـوو عەمـرت نەمێنـێ، ئـەوە بـۆ قسـە

ناکەیت؟! بڕۆ دەرێ لەدەستم بڕۆ! " ئیتر بەسەخان بە پێکەنینەوە دەستی خاڵی بەر دەدات و ئەویش بە دڵسادرییەوە شایەکە جێ دێڵێ.

لە نەریتی هەڵپەڕکێی کوردیدا پیاو هەرگیز بۆی نییە دەستی ژن بەربدات و لە بازنەی هەڵپەڕکێکە بچێتە دەوەوە، ئەم ئیمتیازە تەنیا بۆ ژنە کە دەستی پیاو بەربدات و بڕوا. لە چوونە ناو بازنەی هەڵپەڕکێش هەر هەمان ئوسوول، ژن دەبێ بچێتە دەستی ئەو پیاوەی کە دڵی دەیەوێ نەک پێچەوانەی. بۆیە کە دەهۆڵ و زوڕنا لێ دەدات وەک جاڕدان بۆ گۆڤەند و دیلانێ، هەڵپەڕکێکە بە بازنەیەکی تەنیا پیاوانەوە دەست پێ دەکات ئینجا کچەکان سەرنجی خۆیان دەدەنە هەڵپەڕکێکەرەکان و هەر یەکە پارتنەری خۆی ڕەچاو دەکات و دەچێتە دەستی ئەو. ئەم ڕەچاوکردنەش دوو فاکتەری لە پشتە، یان ئەوەتا کچە خۆی هەڵپەڕکێکەرێکی هونەرمەندی زۆر شارەزایەو حەز دەکا بچێتە دەستی ئەو پیاوەی کە هەڵپەڕکێ وەک خۆی جوان دەکات (نەک دڵی چوویێتێ) و بەم جۆرە دەبن بە کەپڵێک کە سەرنجی تەماشاکەران ڕادەکێشێت، یانیش ڕەنگە دڵی چوویێتە یەکێک لەو کوڕەلاوانەی ناو بازنەکەو دەچێتە دەستی ئەو. هەر بۆ پتر زانیاری، ئەمە لە دانسکردنی ڕۆژئاواییەکانیش هەر وایە کە ئەوان جووت جووت دەیکەن. کە کچێک داخوزی کوڕێک قەبوڵ دەکات بۆ دانس کردن یان لەبەر ئەوەیە کە کوڕەکە وەک دانسکەرێکی لێزانتر لە کوڕەکانی تر سەرنجی ڕاکێشاوە یانیش کوڕێکی قوزە و کچە دڵی چووەتێ ئیتر هەڵدەستێ دانس لە گەڵدا دەکات. بەڵام ئەوەی کە لێرەدا سەرنجکێشە ئەوەیە کە لە نەریتی هەڵپەڕکێی کوردیدا کچەکورد لە کچە ڕۆژئاواییەکان سەربەسترە، کچی کورد ئەو خۆی پارتنەری نێرینەی خۆی هەڵدەبژێرێت نەک پێچەوانەکەی کە نەریتێکی هەڵپەڕکێی ڕۆژئاواییەکانە.

ئەم ڕووداوانە بەڕاستی ئەوە دەردەخەن کە ئەم شۆڕەسوارەی دزەییان، خدری پاشای، هەم سیاسی و هەم کەسایەتی کۆمەڵایەتی و نوکتەچی، هەم سپۆرت پەروەر و هەم هونەردۆست بووە، بەکورتی پاکێجێکی تۆکمەی گەورەیی و ڕەهبەری بووە.

ئەمن چەند هەفتەیەک لەمەوپێش سەردانێکی کتێبخانەی وەفاییم دەکرد لە پارکی وەفایی لە هەولێر. کە بەناو پارکەکەدا لەسەرەخۆ بەرە و کتێبخانەکە دەڕۆیشتم پیاوێکی بەناوساڵدا چوویم دی کە دیاربوو باخەوان بوو و لەسەر یەکێک لە لاتەختەکانی پارکەکە لەبەر سێبەری درەختێک پشووی سانەوەی وەردەگرت. منیش سلاوم لێ کردو وەک نەریتی خۆم حەزم کرد تاوێک لای بوەستم و بیدوێنم. لێم پرسی " خارە گیان خەرکی کێندەری؟ " گوتی شێخانان. گوتم شێخانانی خدری ؟ گوتی بەرێ. گوتم خدربەگ چۆن پیاوێک بوو؟ گوتی هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بی، پیاوی وها هەرناکەویتەوە. گوتم لەگەر خەرکی گوندەکەی باش بوو، لێی ڕازی بوون ؟ گوتی " بە حەققی قورعان، مامۆستا، ئەوان ماری ویان دەخوارد، ئەو ماری بەشەری نەدەخوارد، کەس دری لێی عێجز نەدەبوو. "

خدری ئەحمەدپاشا کە لە 110ساڵ زیاتر ژیا تا مرد هەر مەرد و پیاو و سەرکردەیەکی هەم عەشایری و هەم کەسایەتییەکی کەم وێنەی کۆڕ و مەجلیسی سیاسییان و کۆمەڵایەتیی کورد و عەرەبیش بوو.

## عەلی مەحمودی کاکەخانی دزەیی

عەلیاغا تا شەنگ بوو و تین و تاوی لاوی و هەڵگرتنی تفەنگی هەبوو یەکسەر بەگەڵ هەر بزوتنەوەیەکی چەکداریی کوردی دەکەوت کە لەپێناو کوردایەتیدا بوا. پێشمەرگایەتیی سەرهەڵدانەکانی شێخ مەحمودی دەکرد و ئەوانەی مەلا مستەفای بارزانییش لە چلەکانی سەدەی بیستەم و ناوبانگی دەرکرد و کەوتە سەر زاران لە ماڵان و لە بازاڕان. بریتانیەکانی هەولێر بە "یاخیبوونی" عەلی مەحمودی کاکەخانی دزەیی نیگەران بووبوون کە بیستبوویان بەتەمایە لەگەڵ چەند چەکدارێکدا خۆی بگەیەنێتە بزووتنەوەکەی شێخ مەحمود و سەبارەت بەم مەترسییەیان ڕاپۆرتێکی نهێنییان بۆ لایەنی پەیوەندیداری خۆیان نووسیوە (بڕوانە د. مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە ساڵانی 1926 1939- لاپەڕە 483 بەڵگەنامەی ژمارە 30 بە زمانی ئینگلیزی). دکتۆر مەهدی هەروەها لە لاپەڕە 49 50- ی کتێبەکەیدا ئەمەی نووسیوە: "سەبارەت بە هەڵوێستی کورد لە مەسەلەی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی عیراقەوە، بیروڕای جیاواز هەبوو، کە چەند فاکتەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی تێدا دەبینی. هەندێک لە سەرۆک هۆزەکان و کەسانی ڕۆشەنبیر و بنەماڵە گەورەکان داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردییان دەکرد کە لەژێر چاوەدێریی بریتانیادا بێت. هەر لەم چوارچێوەیەشدا لەبارەی ئەم بابەتە چەند کۆبوونەوە لە هەولێر کراوە کە هەر یەک لە (عەلی مەحمود کاکەخان دزەیی) و (حوسێن حەتک زەیدبەگ) {نازانم ئەگەر ئەم ناوەی دواییان ڕاست بێ - هۆمەر دزەیی} بەشدارییان تێدا کردووە و ڕەخنەشیان لە شێوازی ئەنجامدانی ڕاپرسییەکە گرتووە و داوایان کردووە بژاردەی سێیەمیش کە بریتی بوو لە پرسیارکردن (ئایا سەربەخۆییتان دەوێت؟) لەپاڵ دوو پرسیارەکەی تردا زیاد بکرێت.".

لە چلەکانی سەدەی بیستەم ئەمن منداڵ بووم بەڵام لەبیرمە لە خزمەکانی خۆم دەبیست دەیانگوت عەلی مەحمود بووەتە ئەشقیا. هەینێکە وشەی پێشمەرگە هێشتا نەکەوتبووە سەر زارانەوە بەڵکو هەر کەسێ بە چەک لە دژی حکوومەت بوەستایە و ڕووی لە شاخ و هەردان بکردایە پێیان دەگوت ئەشقیا کە کۆی وشەی (شقی) عەرەبییە. ئەم وشەی ئەشقیایە بۆ ڕێگر و چەتەکانیش بەکار دەهات وەک خولەپیزە لە ناوچەی سلەیمانی و ساڵح ڕەحیم لە هەولێر (ئەمەی دواییان زیاتر بە دزێکی زیرەکی خۆشەویست وەکو ئارسین لۆپین ناوبانگی دەرکردبوو). وشەی چەتە زیاتر لە ناوچەی سلەیمانی بەکار دەهات. مەلا خالیدی مورتکە لە دەسنووسەکەی لەسەر مێژووی دزەییان ئەمەی لەسەر عەلی ئاغا نووسیوە: "عەلی مەحمود پیاوەکی زۆر بەناوبانگە. نیشتمانپەروەرە، سەخییەکی بێتامە. ماخۆی هونەرە، گیانی لەگەڵ میللەتەکەیدایە. حەز لە سەربەخۆیی ئەکات. هەموو دەم بۆ تەبایی و تفاقی مەیانی خزمان کۆشش ئەکا و لەبۆ دۆستایەتی زۆر ڕاستە. بەڵام نەختەک خوێنگەرمە وە لەسەر میللەت دوو جار شۆڕشی کرد. وە جارێکیش حکوومەت حەپسی کرد (1500) دیناری کەفیل لێ ئەستاند ئینجا بەربوو. ئێستا ماوە لە گوندی مورتکە دائەنیشێ کە تابیعی ناحیەی قوشتەپەیە. حەفت کوڕی هەیە: ڕەشۆ، ئەحمەد، خدر، سەردار، سەرهەنگ، حەمەڕەشید، عیسام." مایەی داخە کە نووسەر و توێژەرانی هەولێر ڕۆڵی ئەم پێشمەرگە دێرینەی خۆیان لە لاپەرەکانی مێژوودا فەرامۆش کردووە و بە دەردی برایماغا و خورشیداغایان بردوون. کەسێک کتێبێک یان نامیلکەیەکی لەسەر ژیانیان نەنووسیوە.

لەپاش سەرنەگرتنی بزووتنەوە ڕزگاریخوازە چەکدارییەکەی مەلا مستەفای بارزانی و تێکچوونی کۆماری مەهاباد و پەناهەندەبوونی بارزانی و پێشمەرگەکانی لە گەڵیدا لە یەکیەتیی سۆڤیەت، حکوومەتی بەغدا کەوتە گیانی دانیشتوانی بارزان و ژمارەیەکی زۆری لە خێزانە بارزانییەکان گواستەوە بۆ دێهاتەکانی ئاغاکانی دزەیی لەناویانا چەند

خێزانێکی بارزانی بۆ گوندی مورتکەی عەلی مەحمودی کاکەخانی دزەیی. عەلیاغا، تەبای هەموو ئاغاکانی دیکە، خزمەتێکی زۆری کردن و هەر چەندی لە وزەیدا بوا یارمەتیی دەدان.

## دوو بیروڕا لەسەر شێخ مەحمود:

هەر جارێکی لە کۆڕی چینی ڕۆشەنبیراندا ناوی شێخ مەحمود و بزووتنەوەکانی بێت حەفت و هەشتێکی زۆر و دوو بیر و بۆچوونی جیاجیای لێ دەکەوێتەوە.

بۆچوونێک دەڵێ شێخ مەحمود کەمزان و کورتبین بووە، ئەگینا دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهانەوە دادەمەزرا. بۆچوونی دووەم پێی وایە کە، نا، بریتانیا بەپێی ئەو ئەجێندایەی کە لەسەر بەرژەوەندیی خۆی داڕێژراوە، خۆی بڕیاری دابوو دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لە بەرژەوەندیی ئەودا نییە.

گرووپی یەکەم دەڵێن سەرەتا ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیی ڕۆشەنبیر و ئەفسەرانی پایە بەرزی کوردی سەردەمی عوسمانییەکان، وەک مستەفا پاشای یاموڵکی، ئەمین زەکی بەگ، ماجید مستەفا، تۆفیق وەهبی، پیرەمێردی شاعیر، مەعروف جیاووک، جەمال عیرفان، سدیق ئەلقادری، ئەمین ڕەواندزی و زۆری دیکەش کە من پێی نازانم هەر یەکسەر بزووتنەوەکەی شێخ مەحمودیان لە ئامێز گرت بەو هومێدەی کە کورد دەگەیەنێتە خەونەکەی بۆ سەربەخۆیی کوردستان.

بەڵام ئەمانە دواتر کە بینیان، یەک: نە شێخ خۆی ئەو زیرەکییە سیاسییەی هەیە کە بتوانێ مامەڵەت لەگەڵ ئینگلیزەکانی قاڵبووی سیاسەتدا بکات، دوو: نە پێکهاتەی حکومەتەکەی کە زۆرترایەتییان پیاوانی دینداری دوور لە سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەوڵەت بوون ئەو ئەزموونە سیاسییەیان هەبوو و، سێش: ڕەفتاری خودی شێخ مەحمود لەگەڵ ئەو دەسەڵاتدارە تازانە زۆر دواکەوتوانە بووە و دەگێڕنەوە

گوایـا کـە شـێخ تەوقـەی لەگـەڵ ئینگلیزەکانـا دەکـرد یـان فەقیانـە (کەڵانگوچک)ەکـەی لـە دەسـتی دەئاڵانـد کـە "پیـس" نەبـێ یـان لەپاشان دەچوو دەستی خۆی دەشووشت بە حیساب کە "گڵاو" بووە {نازانم ئەم قسانە چەندی ڕاستە چەندی پێوەنانە - هۆمەر دزەیی}.
جا کە ئەم چینی ڕۆشەنبیرە کەوتنە ڕەخنە و نارەزایی بەرامبەر بە هەڵسوکەوتە بەلای ئەوان چەوت و ناهاوچەرخییەکانی شێخ مەحمود، هەم لەگەڵ میللەتەکەی خۆی هەم لەگەڵ ئینگلیزەکانیش، ئەویش کەوتە دژایەتییان تەنانەت جەمال عیرفانی -وەک دەڵێن - بە بیانۆی کە دژی دینە لە ڕانییە دا بە کوشت. سێر ئارنۆلد تی. ویلسن لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی (بلاد مابين النهرين بين ولائين) تەرجومەی فوئاد جەمیل لە لاپەڕە 21-22 دا ئاوا لە شێخ مەحمود گەیشتبوو "لەپاش چەند هەفتەیەک کاپتن نۆئێل گەڕایەوە بۆ سلەیمانی و بینی کە شێخ مەحمود دەسەڵاتەکەی خۆی بەخراپی بەکار دێنێ و لەبەر ئەوەی کە هیچ بنکەیەکی سەربازیمان لەوێدا نەبوو، دیار بوو کە کۆنترۆلکردنی بۆمان ئاسان نەبوو. کە سەیری سەرجەلەکەشمان دەکرد دەرکەوت کە لە سەردەمی تورکەکانیش جێی باوەڕ نەبووە و هەمیشە بە ڕوویاندا هەڵدەستایەوە. بەڵام دەنگۆ و قسەڵۆک بڵاو بووبووەوە کە خەڵکی سلەیمانی ئەو بێدادی و ناهەقییەی لەدەست سەرۆکەکانی خۆیان و لە دەست ساداتەکان دەیاندی ئەوەندە لە دەست فەرمانبەرە تورکەکانیان نەدیبوو..." . لە لاپەڕە 23 ش ویلسن دەڵێ "خۆی خودی شێخ مەحمود سەختترین گرفتی ئێمە بوو. ئەو پیاوە جەهالەتی منداڵێکی هەبوو بەڵام دڵسافییەکەی منداڵان نا.."
ئەم گرووپەی کە پێیان وابوو و - پێیان وایە - ئەگەر شێخ مەحمود دووربینتر بوایە و واقیعیتر ڕەفتاری بکردایە دەیتوانی لەگەڵ بریتانییەکان هەڵبکات و شتێ بە شتێ بکات. بۆ نموونەش ئەوان دەڵێن لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهانەوە (1914-1918) کە عوسمانییەکان حیجاز و ئەو ویلایەتە عەرەبییانەیان لەدەست دا و بریتانیا کردی

بە شاهنشینی عەرەبستانی سەعودی، دەڵێن بۆچی لەوێ دەوڵەتێکی عەرەبی سەری گرت، بەڵام لە کوردستان دەوڵەتێکی کوردی سەری هەڵنەدا، دەڵێن خۆ عەبدولعەزیز ئال سعود شێخی قەبیلەیەکیش بوو و باوەڕیش ناکرێ ڕادەی پەروەردە و ڕۆشنبیریی لەوەی شێخ مەحمود زیاتر بووبێ. ئەمانە دەڵێن شەریف حوسێنی حیجاز خۆی و کوڕەکانی پشتیوانییەکی زۆر کاریگەری بریتانییەکان بوون بۆ ئازادکردنی ئەو ویلایەتانە لە دەست تورکەکان زۆر زیاتر لەو کۆمەکەی کە شێخێکی قەبیلەیەکی وەک عەبدولعەزیز ئال سعود بۆی دابین دەکردن کەچی لە دواییدا نەک هەر پشتیان لە شەریف حوسێن کرد بەڵکو لە حیجازیش شاربەدەریان کرد و دووریان خستەوە بۆ دوورگەی کیپرس و تا مرد لەوێ دەستبەسەر بوو. عەبدولعزیزیشیان هێنا و دەوڵەتێکی عەرەبییان بۆ دامەزراند کە حیجازەکەی شەریف حوسێنیشیان خستە سەر و عەبدولعزیزیان کردە (الملك عبدالعزيز ال سعود، مؤسس المملكه العربيه السعوديه) لە شێخی قەبیلەیەکەوە بوو بە مەلیک. بۆ؟ ئەمانە دەڵێن شەریف حوسێن داوای لە بریتانییەکان دەکرد کە دەوڵەتێکی عەرەبیی بەرفرەوانی یەکگرتووی بۆ دابمەزرێنن کە ئەمەش دیار بوو لەگەڵ پلانی بریتانیا و بەرژەوەندییەکانی نەدەگونجا. هەرچی عەبدولعەزیز بوو ئەمیان پێی گوتن کارتێکی سپی (بە فرانسی: کارت بلانش)ی بۆ بێنن تا واژۆی بکات ئیتر ئەوی تر با بریتانییەکان خۆیان پڕی بکەنەوە و چی تێدا دەنووسن با بینووسن ئەو پێی ڕازی دەبێ. جا ئەمانە دەڵێن دیارە هەر ئەم هەڵوێستەی عەبدولعەزیز پڕ بە پێستی ئەجێندای ئەو قۆناخەی بریتانییەکان بووە نەک خەونەکانی شەریف حوسێن کە بێ گومان ئەویش بۆ بەرژەوەندیی میللەتەکەی خۆی بووە بەڵام نەیزانیوە کە لە سیاسەتدا خەونی خۆش شتێکە و واقیعی سیاسی و ڕیئال پۆلیتیکیش Real Politik شتێکی ترە.

ئـەم گرووپـە نموونـەی تـری سـەرکردایەتیی واقیعبیـن و ناواقیعبیـن دێنـەوە وەک ئیسـرائیل.

ئـەوان دەڵێـن لەپـاش دووەم جەنگـی جیهـان نەتـەوە یەکگرتـووەکان UN دامـەزرا و لـە سـاڵی 1947بڕیـاری دابەشـکردنی فەلەسـتینی دا بۆ دوو وڵات: فەلەسـتین و ئیسـرائیل. جـووەکان هەرچەنـدە کـە خـەون و خەیـاڵ و پلانیـان بـۆ وڵاتێکـی زۆر لـەوە گەورەتـر بـوو کـە UN بـۆی دانابـوون، یەکسـەر ڕازی بـوون بـەوەی کـە بۆیـان دانـدراوە. هەرچـی فەلەسـتینییەکان و وڵاتـە عەرەبییەکانـە ئـەوان ئـەو بڕیـارەی UN یان یەکسـەر ڕەت کردەوە و داوایـان کـرد یـان هەمـوو خاکـی فەلەسـتین دەبـێ بـۆ دەوڵەتێکـی فەلەسـتینی بـێ، یـان هیچیـان ناوێـت و دەیکـەن بـە شـەڕ. کردیشـیان بـە شـەڕ و شەڕەکەشـیان دۆڕانـد. سـاڵی 1948 ئیسـرائیل بـەو سـنورەی کـە بـۆی داندرابـوو پێناسـینی دیوانیـی (ڕەسـمی) وەک دەوڵـەت و وەک ئەندامـی UN پـێ کـرا کەچـی عەرەبـەکان بـە بەشـەکەی خۆیـان ڕازی نەبـوون و دەوڵەتێکـی فەلەسـتینی کـە بریتـی دەبـوو لـە کەنـاری ڕۆژئـاوا (الضفـة الغربية)یـان نەویسـت. لێـرەدا زلهێزەکانیـش - لـە پیاوەتیـی خۆیـان - بەشـەکەی فەلەسـتینییەکانیان نـە خسـتە سـەر دەوڵەتـی ئیسـرائیلی بـراوەی شـەڕ بەڵکـو بـە وڵاتـی (شـرق الاردن)یانـەوە لکانـد و ئـەو وڵاتـە نـاوی گـۆڕا بـۆ (المملكـە الاردنيـە الهاشـميه). بـۆ فەلەسـتینییەکانیش دەهـۆڵ دڕا هیچیـان پـێ نەبـڕا و تـا ئەمـڕۆش دەبـێ هـەر لـە گوێـی خۆیـان بـدەن و وا دەپاڕێنـەوە ئـەو کەرتـە فەلەسـتینەی کـە سـاڵی 1947 بۆیـان داندرابـوو ئێسـتا بیاندەنـێ، بـەڵام ئیسـرائیل کـە لـە شـەڕی 1967 ئەوەشـی داگیـر کـرد تـازە نایـەوێ بیانداتـەوە یـان ئەگـەر بشـیانداتەوە بەتەمایـە بـە کلـک و گوێکـراوی بیانداتـەوە. جـا ئـەم گرووپـە دەڵێـن پلانـی (یـان هەمـوو یـان هیـچ) مەگـەر خـوا، ئەگینـا سـەر ناگـرێ. بـا ئەمـە وانەیـەک بـێ بـۆ کوردیـش.

ئـەم گرووپـە نموونەیەکی تـری خۆگونجاندن لەگـەڵ بەرژەوەندییەکانی زلهێـزەکان و لەگـەڵ سیاسـەتی بـاوی جیهانـی دێنـەوە ئەویـش مسـتەفا کەمـال ئاتاتورکـە.

لە یەکەم جەنگی جیهانیدا دەوڵەتی عوسمانی دۆڕاندی و هێزە براوەکان (بریتانیا و فرانسا بە تایبەتی) خەریکی ئەوە بوون میراتی عوسمانییەکان بەسەر چەند وڵاتێکی کۆن و هەندێ وڵاتی نوێشدا دابەش بکەن. لەپاش ڕاکردنی سێ جەنراڵە دەسەڵاتدارەکەی (اتحاد و ترقی) کە دەوڵەتی عوسمانییان تووشی جەنگەکە کردبوو (تەڵعەت پاشا و جەمال پاشا و ئەنوەر پاشا) بۆ دەرەوەی تورکیا ئەستێرەی ئەفسەرێکی کە زۆر پلە بەرزیش نەبوو بە ناوی مستەفا کەمال، کە خەریک بوو بزووتنەوەی بەرهەڵستیکردنی داگیرکەرەکانی ڕێک دەخست، هەر ڕوە و هەوراز هەڵدەکشا. ئەو بۆی دەرکەوتبوو کە نەک هەر ئیمپراتۆرییەتە عوسمانییەکە بەڵکو خودی خاکی تورکیای ئەناتۆلیش وا دەکەوێتە بەر مقەستی هێزە براوەکان. ئەو زیرەکاتیی نواند، لەلایەکەوە دەستی بە شەڕی سەربەخۆیی کرد لە دژیانا (حرب استقلال)، لە لایەکی تریشەوە گفتوگۆی نهێنیی لەگەڵدا دەکردن. لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە گەیشتنە ڕێککەوتن لەسەر چەندەها پنتێک کە زۆریان مەبەستی من نین لەم نووسینەدا. ئەوەی کە پەیوەندیی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە ئەو گەیشتنە ئەنجامەیە لە نێوانیان کە هێزە براوەکان لەوێوە بوەستن و لەوە زیاتر دەست لەو سنوورەی تورکیا نەدەن کە ئەمڕۆ هەیەتی. ئەو ێکهاتنە ئەم چەند بەندەی لە خۆ دەگرت: دەبێ پەیمانی (سێڤر)ی 1920 هەڵوەشێننەوە کە چەند بەندێکی تێدا بوو بۆ دامەزراندنی دوو دەوڵەتی نوێ بۆ کورد و بۆ ئەرمەن لەناو سنووری سیاسیی خودی تورکیای ئەناتۆلی. لە تراقیاش (ڕۆژاوای ئاناتۆلیا) شاری ئەدرنە و شوێنی تریش لەو پارچە ئەورووپییەی تورکیا هەر بۆ تورکیا بمێننەوە. لە بەرامبەر ئەوەدا مستەفا کەمالیش نەک هەر سیستەمی خیلافەتی ئیسلامی ڕابماڵێت بەڵکو هەر دیانەتی ئیسلامیش لە بن و بۆتکەوە هەڵتەکێنێت و کۆمارێکی گەردوونی (عەلمانی) ڕابگەیەنێت. هەروەها ڕێگای تورکیاش بکاتەوە بۆ جووەکانی دانیشتووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی (لە ئەورووپای

ڕۆژهـەڵات بـە تایبەتـی) بـار بکـەن بـۆ فەلەسـتین و لـەوێ ببـن بـە زۆرترایەتـی بـە ئومێـدی ڕاگەیاندنەکـەی بەلفـوور (Balfour 1917 Declaration) بـۆ دامەزراندنـی دەوڵەتێکـی ئیسـرائیلی لـە فەلەسـتین. لـە سـەردەمی عوسـمانییەکان هیـچ سـوڵتانێک نەیدەهێشـت جـووی ئەورووپای ژێـر دەسـتی عوسـمانی بچـن بـۆ هەمیشـە خۆیـان لـە فەلەسـتین دابمەزرێنـن. بـەم جـۆرە مسـتەفا کەمالـی واقیـع بیـن و هێـزە بـراوەکان گەیشـتنە ڕێککەوتـن.

لێرەشـدا حـەز دەکـەم دووپاتـی بکەمـەوە کـە نابـێ ڕێککەوتنـی مسـتەفا کەمـال و هێـزە براوەکانـی یەکـەم جەنگـی جیهـان هـەروا بـەم سـادەیە بخەینـە نـاو چوارچێـوەی تەنیـا ئـەم چەنـد پنتکـەی کـە لەسـەرەوە باسـم کـردن بـەڵام هـەر ئـەم بەشـە پەیوەندیـی بـە باسـەکەی ئێمـەوە هەیـە، لەسـەر هەرچییەکـی دیکـە ڕێـک کەوتبـن - کـە زۆریشـن - ئەوە باسێکی تـر هەڵدەگـرێ. دەمـەوێ خوێنـەری بەڕێـز لـەوەش ئـاگادار بکـەم کـە مـن هیـچ سـەرچاوەیەکی بەڵگـەدارم دەسـت نەکەوتـووە بـۆ ئـەم "پێکهاتنـە نهێنییـە"ی کـە باسـم کـردوون و ئـەوە تەنیـا تێگەشـتن و بۆچـوون و لێکدانـەوەی خۆمـن کـە لەوانەیـە وا بـێ و لەوانەشـە سـەرچیخ ڕۆیشـتبم.

ئینجـا گرووپـە نارەزاکـە لـە سیاسـەتی شـێخ مەحمـوود دەڵێـن ئەگـەر شـێخ کەمێـک دووربیـن و واقیعـی بـوا ئەوهامـان بەسـەر نەدەهـات. دەڵێـن عەبدولعەزیـز ئـال سـعود بەپێچەوانـەی شـەریف حوسـێنی حیجـاز و مسـتەفا کەمالیـش لـە ئەنجامـی جەنگـی یەکـەم و جووەکانـی ئیسـرائیلیش لـە سـاڵی 1947 ئەوانـە هەموویـان لـە بەردانانێکـی ( تەنـازولات) زۆریـان بـۆ هێـزە بـراوەکان کـردووە بـۆ ئـەوەی بگـەن بـە هەنـدێ، نـەک هەمـوو، ئامانجەکانیـان. کەچـی بـە قسـەی ئارنۆڵـد تـی ویلسـن بریتانییـەکان ناوچەیەکـی دیاریکراویـان بـۆ حوکمدارییەکـەی شـێخ مەحمـوود دەستنیشـان کردبـوو بـەڵام ئـەو بـەوە ڕازی نەدەبـوو و چـاوی بڕیبـووە ناوچەیەکی زۆر فرەوانتـر "هـەر چۆنێکـی بـێ، شـێخ مەحمـوود قەناعەتـی

نەدەهێنا و ڕازی نەبوو. ئەو لەخۆڕا دەیگوت کە ئەو لەلایەن تەواوی کوردەکانی ویلایەتی موسڵ و ئەوانەی وڵاتی فارسیش ڕاسپێردراوە کە بە ئێمە ڕابگەیەنێ ئەوانە ئارەزووی دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆ دەکەن بە پاسەوانیکردنی بریتانیا" (بڕوانە تەرجومە عەرەبییەکەی کتێبەکەی ویلسن ل 16 - 17).

مێژووناسی بە ڕەچەڵەک جووی عێراقی (میر بەسری) لە کتێبی (مشاهیر الكورد) کە بە عەرەبی نووسیویە و عەبدولخالق عەلائەدین کردوویە بە کوردی (ناودارانی کورد) لە لاپەڕە 36ی کوردییەکەدا دەڵێ: "ئینگلیزەکان ساڵی 1918 کەرکووکیان داگیر کرد و بەجێیان هێشت. پاشان دوای شەش مانگ هاتن دەستیان بەسەردا گرتەوە، لە تشرینی هەمان ساڵدا شێخ مەحموودیان کردە فەرمانڕەوای کوردستان بەڵام زۆری نەبرد کە دیتی لە وڵاتەکەیدا توانا و دەسەڵاتی پەیدا کردووە پشتی تێ کردن و لێیان هەڵگەڕایەوە"

هەر لەمبارەیەوە ڕۆبێرت ئۆلسن Robert Olson باسی ئەو پلانە دەکات کە بریتانییەکان لەپاش برانەوەی جەنگ بەتەما بوون کۆنفێدەراسیۆنێکی کوردی باکوریش بە ناوی ( North Kurdish Confederation) بۆ کوردەکانی تورکیا دابمەزرێنن لەسەر نموونەی ئەو کۆنفێدەراسیۆنەی کە بۆ کوردی باشوور (South Kurdish Confederation) بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دایانمەزراندبوو بەڵام دەڵێ: "... ئەو نەخشەیەی کە نۆئێل Noel بە تەمابۆ بۆ ناوچە کوردییەکان {مەبەستی ناوچە کوردییەکانی تورکیایە - هۆمەر دزەیی} پیادەی بکات سەری نەگرت وەک ئەوەی کە لە سەرایی ساڵی 1919 بۆ کوردەکانی باشوور بە ناوی (کۆنفێدەراسیۆنی کوردی باشوور) بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود دایمەزراندبوو و ناوچەکانی سلەیمانی و هەولێر و ڕواندزی دەگرتەوە" لەپاشان ئۆلسن بەردەوام دەبێ دەڵێ: "یەکێک لەو هۆیانەی کە وای لە بریتانییەکان کرد دەست لەو پلانە بەردەن بۆ دامەزراندنی فیدەراسیۆنی کوردی باکوور ئەوەبوو کە

سەرەنجامی فێدەراسیۆنەکەی کوردی باشوور شکستێکی گەورە بوو، چونکە دەرکەوت کە شێخ مەحموود بەڕاستی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی دەویست و بریتانیاش ناچار بوو لە مانگی حوزەیرانی ساڵی 1919بە هێزی سەربازی لەناوی بەرێت. جا لەوە دەچێ کە حکوومەتی بریتانی سەبارەت بەو ئەزموونە شکستخواردووەی لەگەڵ کوردەکانی باشوور چیتر پشتگیریی لە پلانەکەی نۆئێل (Noel) نەکات کە لە ئەنجامی گەڕانێکی سێ مانگی (حوزەیران، تەمووز، ئۆگوست) بەناو ناوچەکانی کوردی تورکیا لە مێشکیدا گەڵاڵەی کردبوو. سەرهەڵدانەکەی شێخ مەحموود هەروەها قەناعەتی بە کاربەدەستە بریتانییەکان هێنا کە کارێکی سەخت و خەتەریشە پشتگیری لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کورد Unified Kurdish State بکەن" (بڕوانە: Robert Olson , The Emergence of Kurdish Nationalism and the Sheikh Said Rebellion,1880 - 1925

ئەگەر واش بووبێ، هەڵبەت شێخ مەحموود ئەمەی لە دڵسۆزییەوە بووە، بەڵام لە سیاسەتی جیهانیدا هەر دڵسۆزی بە تەنێ دادت نادات.

دیسان عەبدولخالق عەلائەدین ئەمجارەیان لە پەراوێز ژمارە 9ی لاپەڕە 38ی کتێبی ناوبراویدا ئەم چیرۆکە دەربارەی شێخ مەحموود دەگێڕێتەوە (ئەمەیان قسەی خۆیەتی نەک هی میر بەسری) " لە کاتی خۆیدا کەسانێک بە شێخیان گوتووە کە هەندێک بەنەرمی لەگەڵ ئینگلیزەکان ڕەفتار بکات بەڵکو هەڵوێستیان دەگۆڕێ و بەرژەوەندیی کوردی تێدا دەبێ. شێخیش بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە دەڵێ:

نامەوێ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومڕەهی
نایکەمە سەرخۆم بە ئەمری موددەعی تاجی شەهی
قەت بە ئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرماندەهی.

خۆ کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە جەمال عەبدولناسری میسریش سەرکردەیەکی نەتەوەپەرستی دڵسۆزی عروبە و یەکبوونی هەموو وڵاتە عەرەبییەکان بوو. بەڵام بە ناواقیعی سیاسەتی و بێ ئەزموونیی لە سیاسەتی دەولیدا کارەساتێکی گەورەی نەک هەر بەسەر میسر بەڵکو بەسەر هەموو عەرەبدا هێنا و کێشەی فەلەستینیشی خستە ئەم بنبەستەی ئەمڕۆوە.

جا ئەم گرووپە دەڵێن توخوا ئەمە کەی ئەقڵە! کەی سیاسەت وایە بەم کەمزانییە مامڵەت لەگەڵ زلهێزەکانا بکەیت؟

بۆچوونی دووەم ئەم لێکدانەوانە هەر هەمووی ڕەت دەکاتەوە و پێی وایە شێخ مەحموود هەر چ لەبەردانانێکیشی بۆ بریتانیا بکردایە دادی نەدەدا چونکە نەخشە و پلانی بریتانیا، لەبەر هەچ هۆیەک بووبێ، دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆی تێدا نەبووە.

ئەمانە دەڵێن باشە ئەگەر بریتانییەکان ڕەفتاری شێخ مەحموودیان بە دڵ نەبووە خۆ دەیانتوانی وەک کە بۆ عێراق کردیان و ئەمیرێکیان لە حیجازەوە هێنا کە نە عێراقی بوو نە شیعەش و کردیان بە مەلیک لە عێراقێک کە زۆرترایەتیی شیعەن و بە نابەدڵیشەوە قەبووڵیان بوو. دەڵێن ئەگەر کوردستانێکی سەربەخۆ لە بەرنامەیاندا بوایە دەیانتوانی ئەمیرێکی بابان، بەدرخان، شەریف پاشای خەندان، مستەفا پاشای یامولکی، سەید ئەحمەدی خانەقا، محەممەد ئەمین زەکی بەگ، ئیسماعیل بەگی ڕواندزی، سەید تەهای نەهری یان یەکێک لەو هەموو کەسایەتییە کوردە ڕۆشەنبیرانەی سەردەمی عوسمانی کە سەر بە ئینگلیز بوون، یەکێک لەوانە بێنن، شێخ مەحموود بنێن بەلاوە و ئەویان بکەن بە مەلیکی کوردستان. ئارنۆڵد. تی. ویلسن لە لاپەڕە 16ی تەرجومە عەرەبییەکەی کتێبەکەیدا دەڵێ "خەڵکانێک هەبوون دەیانویست کوردستان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی لەندەن نەک بەغدا. هەندێکیشیان بۆیان درکاندم کە ئەوان ڕازی نابن شێخ مەحموود ڕابەریان بێ بەڵام کەسی دیکەشیان لەجیاتی ئەو پێشنیار نەدەکرد."

کەچی د. مەهدی محەمەد قادر لە کتێبی (هەولێر لە نێوان ساڵانی 1914 - 1930 ل - 89)دا دەنووسێ: "جێگای ئاماژەیە کە (سی . ای . ڕاندوڵ) جێگری حاکمی سیاسی بریتانی لە کۆیە لە نووسراوێکی 7ی مارسی 1920دا کە ئاراستەی ئەفسەری سیاسی ئینگلیز لە هەولێر دەکات، ئەوەی تێدا دەردەخات کە حاکمی شەرعیی کۆیە (مەلا محەمەدی گەورە) و جێگرەکەی (جەمیل ئاغا) پێشنیاری ئەوە دەکەن کە یەکێک لە بنەماڵەی بابانیەکان کە خاوەن ڕێزن لەناو خەڵکی کوردستاندا دابندرێت وەک حوکمداری کوردستان تەنانەت مەلای گەورە کەسایەتیی (حەمید بەگ بابانی) دەستنیشان دەکات. ئەشرافەکانی هەولێریش سەبارەت بە پێشنیاری مەلای گەورەی کۆیە هاوبیروڕا بوون و پێیان وابوو کە لە بەرژەوەندیی کوردا کار دەکات. هەروەها دەسەڵاتی ئەم حوکمدارەش بەسەر لیواکانی هەولێر و سلەیمانی و کەرکووکدا هەبێت ئەگەر دانیشتووانی ئەم لیوایانە ئارەزوویان هەبێت و دەبێت پێش دانانی (حەمید بەگ) ڕاوێژ بە ئەشرافەکانی ئەم لیوایانە بکرێت و ڕایان وەربگیرێت" ئەم گرووپە دەڵێن زۆرێک لە ڕاپۆرتەکانی کاربەدەستە بریتانییەکانی کوردستان بۆ وەزارەتی کۆلۆنییەکانی بریتانی لە لەندەن کە وینستن چێرچل وەزیری بووە زۆر دۆستانە بووە، بەرامبەر بە کورد و هەواداری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ بووینە. دەڵێن تەنانەت خودی چێرچل پێشنیاری بۆ حکوومەتەکەی خۆی کردبوو کە کوردستان بکرێ بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەڵام حکوومەتەکەی ڕازی نەبووە (بڕوانە شوێنی جیاجیا لە چاپتەر 3ی کتێبەکەی ڕۆبێرت ئۆڵسن) .

دکتۆر مەهدی محەمەد قادر لە لاپەڕە 51ی کتێبی (هەولێر لە ساڵانی 1926 - 1939) شدا دەڵێ: "... بریتانیا نەخشەکێشی ڕاستەقینەی لکاندنی ئەم ناوچانە بوو بۆ سەر عێراق بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە هەمووشیان گرنگتر سامانی نەوت .."

لەپاشان ئەم گرووپە دەڵێن ئەو قسانەی کە ناحەزەکانی شێخ

مەحمــوود بڵاویــان دەکــردەوە کــە گوایــا لەپــاش تەوقەکردنــی لەگــەڵ هــەر ئینگلیزێــک دەســتی خــۆی دەشوشــت دەڵیــن ئەمــە ئەســڵ و ئەساســی نییــە، بۆیــان هەڵبەســتاوە و هــەر خــۆی بەرپەرچــی خــۆی دەداتــەوە. دەڵیــن ئاخــر یەکێــک لــە وەزیرەکانــی حکوومەتــی شــێخ مەحمــوود کــە زۆر خۆشەویســت و نزیکــی خــۆی بــووە کەریمــی ئەلەکــە بــوو کــە کەسـایەتییەکی کریسـتیانی (مەسـیحی) ناسـراوی شـاری سـلەیمانی بـوو. { ئێســتاش نــەوە و خزمــی کەریمــی ئەلەکــە هــەر لــە ســلەیمانی مــاون و یەکێکیــان، ئەندازیــار عالیــە خــان، ڕەفیقێکــی نزیکــی خــۆم و ڕونــاک خانــی هاوســەرمە - هۆمــەر دزەیــی. }

جـا ئـەم دوو بۆچوونـە دژ بەیەکتریـە سـەبارەت بـە بزووتنەوەکانـی شـێخ مەحمـوود و نەبوونـی کـورد بـە دەوڵـەت لـە ئەنجامـی یەکـەم جەنگـی جیهـان تـا ئەمـڕۆش هـەر بـەردەوام لێدوانـی لەسـەردا دەکرێـت.

شێخ مەحمـود هێشـتا بەتـەواوی نائومێـد نەبووبـوو و دەسـتی لـە چەک هەڵنەگرتبـوو شۆڕەسـوارێکی دیکـەی ڕێـی بزووتنـەوەی ڕزگاریخـوازی کـورد بـەدەر کـەوت درێـژە بـە خەباتەکـە بـدات. مـەلا مسـتەفای بارزانـی

## مەلا مستەفای بارزانی

ئەمـن لێـرەدا بەتەمـا نیـم بچمـە نـاو درێژایـی چیرۆکـی ئـەم خەباتـەوە و خـۆم تووشـی ئـەم ڕێیـە سـەخت و دژوارەی مێـژوو بکـەم و تێیـدا ون بیـم کـە لەدواییـدا نەتوانـم چـۆن چۆنـی خۆمـی لـێ ڕزگار بکـەم. چونکـە ئـەم چیرۆکـە مێژوویەکـی تایبەتـی کـوردە و بـە سـەدان کتێـب و گوتـاری نـەک هـەر بـە کـوردی بگـرە بـە زمانانـی جیاجیای جیهانـی لەسـەر

نووســراوە. ئــەوەی مــن مەبەســتمە بــۆ ئــەم بیرەوەریانــەی خــۆم، کورتەیەکـی ڕۆڵـی دزەییەکانـە بـە ئەرێنی و نەرێنیشـیەوە لـەم بزووتنەوانەدا بـە تایبەتـی ڕۆڵـی ئەوانـەی کـە نەمـاون. ئەمـن لـە خەمـی ئـەوە دام کـە نـاو و ڕۆڵیـان ئـاوا بـە بێنـازی لەکیـس مێـژووی کـورد بچێـت.

بارزانییەکان هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سالانی پێش یەکەم جەنگی جیهان، لە دژی عوسمانییەکان، پاشان لە بیستەکان و سەرایی سییەکانی سەدەی بیستەمیش لە دژی حکوومەتی عێراق هەمیشە لە بزووتنەوەی چەکداریدا بوونە. ماوەیەک پەنایان بردووەتە بەر تورکیای زەمانی ئەتاتورک و دواتر گەڕاونەتەوە بۆ عێراق. کە گەڕانەوە حکوومەتی عێراق شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای برای دوور خستەوە بۆ باشووری عێراق و دوای چەندین سالیش مانەوەیان لەوێ لە سەرەتای چلەکان هێنانییەوە بۆ کوردستان، بەلام نەک بۆ ناوچەکانی خۆیان لە بارزان بەلکو بۆ سلەیمانی. مەلامستەفا تا سالی 1943 بە دەستبەسەری (اقامەی جەبری) لە سلەیمانی بوو. بڕوانە: میر بەسری، ناودارانی کورد (تەرجومەی عبدالخاق علائالدین بۆ کوردی ل 40 - 44).

چون ئەم بزووتنەوانە هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە دەستی پێ کردووە لێرەدا بە پێویستی دەزانم کەمێک بە باکگراوندی ئەم بزووتنەوە کوردییانە - هی کورد بەگشتی نەک هەر هی بارزانییەکان - دا بچمەوە و دەبێ وریا بم کە هەستی کوردایەتیم بەری چاوم نەگرێت و ڕاستییە مێژووییەکان بەلاڕێدا تی نەکەمەوە .

خۆی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە و بەتایبەتیش لە پاش شکستە گەورەکانی دەولەتی عوسمانی لە شەڕی 1877 - 1878ی لەگەل ڕوسیا و دۆڕاندنی زۆرێک لە هەرێمەکانی بالکانی، بەرەلاییەکی تەواو کەوتە ناو بەڕێوەبەرایەتیی عوسمانی و دەولەت گەیشتە سەر لێواری لاتی (ئیفلاس) و لە توانایدا نەمابوو مووچەی فەرمانبەرەکانی لەو ئیمپراتۆراتییە پان و بەرینەدا دابین بکات. بۆیە جەندرمە تورکەکان دەسەلاتیان پێ درابوو ئازاد بن لە چۆنییەتی مسۆگەرکردنی بژێویی خۆیان بە هەر ڕێگایەکی بۆیان بلوێت. ئەم دۆخە تا دەهات بەرەو خراپتر دەڕۆیشت تا ڕۆژئاواییەکان ناویان لە دەولەتی عوسمانی نا (پیاوە دەردەدارەکەی سەر بۆسفۆر) .

دواتریش کە بە وەزعێکی ئەوها شڕ و شپرێو و شپرزە و لاتیشەوە خۆی تووشی جەنگی گەورە (1918 - 1914) کرد باری ئابوورییان هەر بەتەواوی شڵەژا. ڕەشبگیر دەستی پێ کرد و (حوکمی قەرەقوش) ی ناوبەد بوو بە سیستەمی حوکمڕانی لە ویلایەتەکانی عوسمانی بەتایبەتیش لە وڵاتە موسڵمانەکان. دەبا چیرۆکێکی زۆر سەیری ئەم حوکمی قەرەقوشەتان بۆ بگێڕمەوە.

لەم ساڵانەی دوایی لەگەڵ دوو برادەری دێرینم، ئەرجومەندی مەلا سدیق (سەرۆکی پێشووی کۆلێژی ئەندازیاری لە زانکۆی کۆیە) و حەمەدەمین پێنجوێنی (شاعیر و پسپۆڕی سیاسیی ناودار) لە کۆیە بووین، بڕیارمان دا سەردانێکی جەنابی شێخ جەنگی تالەبانی (برا گەورەی مام جەلال) بکەین. کە دانیشتین کاکە شێخ جەنگی گوتی با چیرۆکێکی سەیری مەلا سدیقی باوکی ئەم کاک ئەرجومەندەتان بۆ بگێڕمەوە.

گوتی لە ساڵانی جەنگی گەورە (یان پێش جەنگەکە) مەلا سدیقی باوکی کاک ئەرجومەند گیرابوو و حوکمی ئیعدام درابوو. گوتی خزمەکانی هەوڵێکی زۆریان دا حوکمەکەی کەم کەنەوە بێ سوود بوو. کابرای دەرگەوانی زیندانەکە پەیوەندیی بە خزمەکانی مەلا سدیقەوە کرد ئەگەر بەرتیلێکی باشی بدەنێ بۆ خۆی و بۆ هاوکارەکانی ئەوا شەوی پێش بەیانیی لەسێدارەدانەکەی دەرگای زیندانی بۆ دەکاتەوە با ڕابکات و ئەوانیش بێن بیبەن. دەڵێ ڕێککەوتن. بەیانی سەر لە زوو دەرگای کردەوە و مەلا سدیق بۆی دەرچوو و خزمەکانیشی لە دەرەوە چاوەڕێی بوون بەگەڵ خۆیان دا و بە سواری وڵاخ لەبەر چاوان بزر بوون. دەرگەوانی زیندان دەیزانی هەموو بەیانییان دارفرۆش بەوێدا دێن دەچن بۆ مەیدانی داران. بەرلەوەی سەربازە تورکەکان بێن زیندانییەکە ببەن لەسەری بدەن، کابرایەکی لادێیی دارفرۆش بارەدارێکی لە گوێدرێژەکەی بار کردبوو بییا بۆ بازاڕی داران بیفرۆشێت و ڕێگاکەی بەبەردەمی بەندیخانەکەدا

دەڕۆیشت. دەرگەوانەکە چوو پشتی ملی گرت بە تورکی "ئێششەک ئۆغلی ئێششەک" لە کەرەکەی دابەزاند بە ساڵدرمان فڕێی دایە ناو ژووری زیندانەکەی مەلا سدیقەوە. لادێیی بەدبەخت کە یەک وشەی تورکیی نەدەزانی تێ نەدەگەیشت مەسەلەکە چییە و بۆ دەیگرن. کاتی ئیعدامکردن هات و سەرباز گەیشتن ناوی مەلا سدیقیان بانگ کرد. دەرگەوانەکە دەرگای بۆ کردنەوە و کابرای دارفرۆشی داماوی ڕادەست کردن گوتی "ئەمەش مەلا سدیق" ئەویش هێشتا نازانێ مەسەلە چییە و بۆ کوێی دەبەن. ئەوانیش ڕاپێچەکیان دا بردیان بۆ سەر سێدارە و زۆر پوختە ئیعدامیان کرد. نە مەلا سدیق و خزمەکانی دەیانزانی دارەوانێکی بێ گوناە لە شوێن ئەو ئیعدام دەکرێ، نە دارەوانی بێچارە دەیزانی بۆچی وا پەتکی لە مل دەکەن. ئاوا بوو حوکمی قەرەقووشی عوسمانییەکان.

من خۆیشم کە منداڵ بووم پیرەکانی گوندەکەی خۆم دووگردکان کە لە ساڵانی جەنگدا (سەفەربەرلک) گەنج بوون، دەیانگێڕایەوە کە ناوە ناوە جەندرمەی تورکی برسی و ماندووی شەڕ بە ئاواییان وەردەبوون ماڵ بە ماڵ دەگەڕان هەرچییەکی بەرچاویان بکەوتایە تاڵانیان دەکرد: مەڕوماڵات، مریشک، هێلکە، باراش، چاڵیان دەشکاند گەنم و جۆیان دەردێنا، گوارە و گەردانە و بازنی ژنانیان لە گوێ و مل و مەچەکیان دادەپچڕاند، گەنجی ئاوایی خۆیان دەشاردەوە، ئەگینا دەیانبردن بۆ عەسکەریی ئیجباری. ئەو عەشیرەتانەی چەکیان هەبوایە لە ڕووی ئەو ستەم و بێدادییەی تورکان ناچار بەرگرییان لە خۆیان دەکرد و دەبوو بە شەڕیان. لە یەکێک لەو شەڕانە سەربازێکی عوسمانیی ناو (حوسێن) بە برینداری لە گوندەکەی ئێمە دووگردکان بەجێ دەمێنێ لە پاشان ماڵەبابی من تیماری دەکەن چاکی دەکەنەوە ئەویش جەنگ بڕایەوە و نەیدەویست بگەڕێتەوە بۆ تورکیا و هەر لە دووگردکان مایەوە. دواتر مام حوسێن هەر لە دووگردکان ژنێکی مهاجیریشی دۆزیەوە مارەی کرد و بوو بە قاوەچیی حەمەدەمیناغای

باوکم و خەڵکەکە هەر بە حوسێن عەسکەر بانگیان دەکرد. حوسێن عەسکەر پیاوێکی زۆر خۆشەویست و باش بوو ئێمەی منداڵ ڕێزێکی زۆرمان بۆی هەبوو و بە مامە بانگمان دەکرد. تا ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەمیش مام حوسێن هەر مابوو و تا مردیش کوردی باش فێر نەبووبوو و پێکەنینمان بە کوردییەکەی دەهات. ژنەکەی ناوی (فاتمیلێ) بوو و کوڕ و کچێکی هەبوو (عەبدوڵا و عەیشێ)، عەیشێ ئێستاش ماوە بە ماڵ و منداڵە و لە مەخمور دادەنیشێ.

ئینجا با بگەڕێمەوە بۆ بابەتە سەرەکییەکە. ئەمە حاڵی نەک هەر کورد بەڵکو حاڵی هەموو دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بوو بەتایبەتی لە وڵات و ویلایەتە موسڵمانەکاندا بەدەست زۆرداریی و بێ بەختی حوکمی عوسمانییەوە. ئەو سەرهەڵدان و شەڕ و شۆڕانەش کە ئەو زەمانە لە دژی عوسمانییەکان بەرپا دەبوون زۆرتری - ناڵێم هەمووی - لە ئەنجامی ئەو سیستەمە مۆرانە لێدراوەی عوسمانلی بووە نەک لە ئەنجامی هەستی ناسیۆنالیزمی کوردی یان هەستکردن بە زوڵم و بێدادی چونکە تۆ تورک نیت، کوردیت. پیاو با قسەیە بۆ دزیش بکات: تورکە عوسمانییەکان ئەو هەستی تورکچیاتییەیان نەبوو وەک کە دواتر لای (اتحاد و ترقی) سەری هەڵدا و لەپاشانیش لە کۆماری تورکیا بوو بە دۆگما (dogma).

لەسەرەوە باسم کرد کە لە سەردەمی دەوڵەتی عێراقیش مەلا مستەفای بارزانییان بۆ چەند ساڵێک بە دەسبەسەری بۆ سلەیمانی دوور خستەوە.

دەکرێ ئەو چەند ساڵەی سلەیمانی تا ساڵی 1943 بە وەرچەرخانێک دابنێین لە ژیانی سیاسیی مەلا مستەفای بارزانی کە دوای ئەو قۆناخە سەرهەڵدانەکانی ئیتر ڕەنگێکی بە تەواوی جیا لەوانەی پێشوویان بەخۆوە دی و ناوی بارزانی لەناو کورد و لە تەواوی دونیاشدا وەک ڕێبەرێکی نیشتمانپەروەری ئەفسانەیی دەنگی دایەوە. میر بەسری لە لاپەڕە 43ی نوسخە کوردییەکەی کتێبەکەیدا دەربارەی مەلا مستەفا

دەڵێ: "... بزووتنەوە شۆڕشگێڕانەکەی لە 1943وە دەست پێ دەکات"

لەو چەند ساڵەی کە مەلا مستەفای لە سلەیمانی بوو، سەرەتای چلەکان تا ساڵی 1943، تەواوی دونیا لە گەرمەی دووەم جەنگی جیهاندا دەکولا. لە کوردستانیش بەتایبەتی لە شاری سلەیمانی چینێکی ڕۆشەنبیر و ئەفسەرانی پێشووی عوسمانلی کە هێشتا مەستی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود و دڵبرینداری ئاوات و خەونە بەدینەهاتووەکەی سەربەخۆیی کوردستان بوون، کەوتبوونە جموجۆڵ و چەندین ڕێکخراو و حزبیان دامەزراندبوو. پارتی هیوا بە سەرۆکایەتیی ڕەفیق حیلمی کە بۆ چەند ساڵێک بەهێزترین حزب بوو ; ژیانەوەی کورد (ژ. ک.) بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیم ئەحمەد کە لکی کوردستانی عیراقی ڕێکخراوی دایک بوو لە مەهاباد بە سەرۆکایەتیی قازی محەمەد. حزبی تریش وەک ڕزگاری کورد و شۆڕش و حزبی (تحرری وەتەنی) کە کۆمونیست بوو و لەپاشانیش (حزبی دیموکراتی یەکگرتووی کورد) کە مەلا مستەفا ساڵی 1946 لە ئێرانەوە جوابی ناردبووەوە دایمەزرێتن. ئەمانە هەمووی لە نیوەی یەکەم و ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بیستەم سەریان هەڵدەدا و هەندێکیان پاش ماوەیەک یان دەپووکانەوە یان لەگەڵ حزبێکی دیکەدا دەبوونە یەک.

حکوومەتی عێراق کە مەلا مستەفای بە دەستبەسەری لە شاری سلەیمانی دانا ئەو حسابەی نەکردبوو کە ئەو دوو جەمسەرە، حزبە کوردییە ناسیۆنالیستەکان لە لایەک و مەلا مستەفاش لایەکەی تر واتا ئایدیۆلۆژی و هێزی چەکدار، وەک جەزبەی موگناتیس بە گوڕ دەکەونە باوەشی یەکتری. حزبەکان بەتایبەتی حزبی ناسیۆنالیستی هیوا و تەواوی کەسایەتیە ڕۆشەنبیرە کوردپەروەرەکان و بەتایبەتیش شێخ لەتیفی شێخ مەحمود هەر لەگەڵ گەیشتنی مەلا مستەفا یەکسەر باوەشیان بۆ ئەم سوارچاکە (knight in shining arms) کردەوە و پەیوەندییەکی توکمەیان لەگەڵیا گرێ دا.

لە ئەنجامی ئەو تێکەڵییە لەگەڵ مەلا مستەفا هەردوولا پێکەوە

بـە داواکارییەکانـی بزووتنەوەکـەی بارزانیـدا چوونـەوە و چواچێوەیەکـی زیاتـر کوردایەتیی گشـتییان بـۆ دارشـت و لـە قاڵبـی خۆجێیـی (محلـی) یـان تێپەڕانـد بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە بزووتنەوەیەکـی گشـتیی کـوردی و هەمـوو کـورد پشـتیوانیی لـێ بـکات نـەک هـەر تەنیـا لـە ناوچەیەکـی سـنووردای وەک بارزانـدا بـە گیرخواردوویـی و بـێ سـەرەدەر بمێنێتـەوە. کـە گەیشـتنە ئـەم ئەنجامـە حزبـی هیـواش بڕیـاری دا چەندیـن ئەفسـەری کـوردی ئەندامـی هیـوا کـە لـە سـوپای عێراقـدا بـوون بەگـەڵ مەلا مسـتەفا بـدات، بزووتنەوەکـە هەڵگیرسـێننەوە و حزبیـش لای خـۆی ڕاگەیاندنـی بـۆ بـکات. هـەر واشـی لـێ هـات و لەوێـوە ئیتـر بزووتنەوەکـە بەرگێکـی زیاتـر سـیاس کرایـە بـەر وەک بەردەوامبوونـی خەباتـی ڕزگاریخـوازی کـورد.

جـا بـۆ پیادەکردنـی ئـەم پلانەیـان سـاڵی 1943 شـێخ لەتیفـی شـێخ مەحمـود و حزبـی هیـوای ناسیۆنایسـت مـەلا مسـتەفایان - هەڵبـەت زۆر بـە نهێنـی - لـە سـلەیمانی بـە ڕێـگای ئێـران گەیانـدەوە بـارزان و ئەویـش لـەوێ دەسـتی بـە بزووتنـەوە چەکدارییەکـە بـە دروشـمە نوێکەیـەوە کـردەوە.

لەپـاش چەندیـن سـەرکەوتن و شکسـت و هەنـدێ جـار شـەڕ هەنـدێ جـار ئاشـتی لەگـەڵ حکوومەتـی عێـراق کـە بریتانیـاش بـە هێـزی هەوایـی خـۆی (RAF) یارمەتیـی دەدا دانوسـەندن لـە بەهاری سـاڵی 1945 دەسـتی پـێ کـردەوە. ئەوسـا بزووتنەوەکـە کـە بـە ئاشـکرا بەرگێکـی ناسیۆنالیسـتی پۆشـیبوو پشـتیوانییەکی بەرچـاوی هـەم لەنـاو چینـی ڕۆشـەنبیری شـارەکان و هـەم لەنـاو ژمارەیەکـی زۆر لـە عەشـایردا بـۆ خـۆی دابیـن کردبـوو. هەڵبـەت دژایەتیـش لەنـاو هەنـدێ عەشـایردا کـەم نەبـوو.

کاک موحسـین دزەیـی بـرام کـە لـە مـن گەورەتـرە و بـە حوکمـی تەمـەن زیاتـر لـە مـن شـتی کۆنـی لەبیـر مـاوە، بـۆی گێڕاومەتـەوە شـەڕ و پێکـدادان هـەر لـە سـاڵی 1944ەوە سـارد بووبـۆوە و مـەلا مسـتەفاش ئـەو نیمچـە ئاگربەسـتە نارەسـمییە بـە هـەل دەزانێـت نامەیـەک بـۆ کەسایەتیی

ناوداری هەولێر عزەدینی مەلافەندی (کورە گەورەی مەلافەندیی بەناوبانگ) دەنێرێت کە حەز دەکات بچێ بۆ لای لە (کۆشکەکەی باداوە)ی (لە قەراخی شار) بۆ پرسەی مەلافەندیی باوکی کە ساڵێک پێشتر کۆچی دوایی کردبوو. مەلا مستەفا دەنووسێ کە بەو مەرجەش دەتوانێ بێتە هەولێر و سەردانی باداوە بکات، ئەگەر عزەدینەفەندی ئەمنییەتی بۆ دابین بکات. عزەدینەفەندی بۆی دەنووسێتەوە کە هەتا لەناو سنووری شاری هەولێردا بێت دڵنیا بێ کە سەلامەتیی مسۆگەرە.

جا لێرەدا خۆیشم {هۆمەر دزەیی} چاکم لەبیرە کە مەلا مستەفا بەپیادەیی لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە سەردانەکەی باداوەی دەگەڕایەوە بەبەردەم قوتابخانەکەی ئێمەدا (قوتابخانەی یەکەمی هەولێر) تێپەڕین. هەنگی ئەمن لە پۆلی سێی سەرەتایی بووم. کە بیستمان دەڵێن مەلا مستەفا وا بەبەردەم قوتابخانەکەمان رەت دەبێ، ئیتر نە مامۆستا نە قوتابی نە بەڕێوەبەر و نە فەڕاش کەس لە ژوور و دەری پۆلەکاندا نەما و هەموو رووومان کردە دیوارە شیشەبەندەکەی قوتابخانەکە بۆ دیدەنی مەلا مستەفا.

هەر بۆ زانیاری، ئەوسا خۆم و پێم وایە هەموو برا لەخۆم گەورەترەکانیشم ئەندامی حزبی هیوای ناسیۆنالیست بووین. ئەمن چوون تازە هاتبوومە بەر خوێندن و منداڵ بووم، ئەندامە گەورەکانی هیوا هەر یەکسەر لە رێکخراوی (بەچکە شێرانی کوردستان) ناونووسیان کردم. ئەو رێکخراوە بۆ لاوانی ئەندامانی حزبی هیوا داندرابوو و لەسەر تەرزی رێکخراوی لاوانی ئاڵمانی حزبی نازیی هیتلەر (هیتلەر یووگەند Hitler Jugend) پەروەردە دەکرا. بیرمان نەچێ چونکە ئینگلیز لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهاندا دڵی کوردی سارد کردبۆوە و لە سەربەخۆیی نەتەوەیی بێبەشی کردبوو، حزبی هیوا کە لە ساڵی 1939 (ساڵی دەستپێکردنی جەنگی دووەم) دامەزرابوو ئەمجارەیان هومێدی بە ئاڵمانیای نازی بوو کە شتێک بۆ کورد بکات بەتایبەتی کە ئاڵمانیا لە دوو سێ ساڵی یەکەمی

جەنگدا، سەرکەوتنی یەک بەدوای یەکی بەدەست دەهێنا و هیتلەر بووبوو بە خەونی میللەتانی ژێردەست بۆ رزگاریی نەتەوەیی.

ئەم ماوەی دان و سەندنەی بەهاری 1945 دەرفەتێکی باش بوو بۆ مەلا مستەفا گەڕانێک بەناو عەشایردا بکات بۆ وەدەستهێنانی پتر کۆمەک و پشتیوانی. میر بەسری لە کتێبەکەی (مشاهیر الکورد) کە عەبدولخالق علائەدین کردوویە بە کوردی (ناودارانی کورد) کە دێتە سەر باسی مەلا مستەفا لە لاپەڕە 43ی کوردیەکەدا دەڵێ: "... لە شوباتی 1945 دێتە بەغدا حکوومەت بە داواکارییەکەی قایل دەبێ، کە بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی و چەکەکان کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەو کەوتە سەردان و گەڕان لەناو گوندەکان و هاندانی خەڵک بۆ شۆڕش نانەوە." دیارە مەلا مستەفا لەپاش سالانی سلەیمانی و ڕێککەوتنی لەگەڵ حیزبی هیوا و شێخ لەتیفی شێخ مەحمودا، پشتی قایم کردبوو و ئیتر منەتی بە حکوومەت نەبوو، هەرچەندە کە حیزبی هیوا سالی 1945 ئەوەندە باویشی نەمابوو و ژمارەیەک حیزبی تر پەیدا بووبوون.

لەو گەڕانانەی بەناو عەشیرەتەکاندا سەردانێکی چەند ڕۆژیش بوو لە بەهاری هەر ئەو ساڵە بۆ لای ئاغاکانی دزەیی. لە گوندەکانی قازیخانە، سۆربەش، قوشتەپە و مورتکە لەگەڵ سەرۆکانی دزەیی وەک حوسێنی مەلا و خدری پاشا و مەعروفی حاجی پیراوداغا و عەلی مەحمودی کاکەخانی و خزمەکانیان چەند کۆبوونەوەیەکی کرد. وەکو من خۆم (هۆمەر دزەیی) لەمەلا و لەولام بیستووە کە حوسێنی مەلا و خدری پاشای بە مەلا مستەفا رادەگەیەنن ئەوان بە چەک و پارە و بە ئەرزاق هەر چەندی لە توانایاندا بێ یارمەتیی بزووتنەوەکەی دەدەن بەڵام گۆیا ئەمەشیان خستۆتە سەر کە لەبەر هەلکەوتەی جۆگرافیی ناوچە دەشتاوییەکەیان ناتوانن شەڕی تانک و تۆپ و فرۆکەی عێراق و ئینگلیزیش بکەن و چ

پەناشاخ و ئەشکەوتیش وەک ئەوانەی ناوچە شاخاوییەکانی بارزان شک نابەن ژن و منداڵەکانیان لێ بشارنەوە کە نەکەونە بەردەستی سەربازی عێراقی.

حاجی کاکەحمەدی دارەتووی دزەیی بۆی گێڕامەوە گوتی، عەلی مەحمودی کاکەخانی دزەیی خاوەنی گوندی مورتکە کە مەلا مستەفا لە سەردانەکەی بۆ ناو دزەییان شەوێکیش لەوێ بەسەر دەبات، ئەویان جیا لە ئاغاکانی دیکە بڕیار دەدات خۆی و پیاوە چەکدارەکانی بەگەڵ بزووتنەوەکەی بکەون. هەر واشی کرد. پاش ڕۆیشتنی مەلا مستەفا و دەست پێکردنەوەی بزووتنەوەکەی عەلی ئاغاش بیست چەکدارێکی بەگەڵ خۆی دا چووە گوندی سەرمەزرا و کە ئەوەش هەر گوندی خۆی بوو و ڕێگای ترومبێلی نەدەچوێ دەبوایە بە سواری وڵاخ یان بە پیادە بۆی بچێت. بنکەی خۆی لەوێ لێ داکوتا و دەستی بە یاخیبوونی چەکداری کرد لە حکوومەت بۆ ئەوەی بەغدا تێ بگات کە بزووتنەوەکەی بارزانی تەنیوەتەوە بۆ ناوچەکانی تری کوردستانیش نەک هەر لە ناوچەی بارزان قەتیس ماوە. عەلیاغا و چەکدارەکانی شەوێکیان بەسەر ناحیەی قوشتەپەیان دادا و شەوێکیش هێڵی تەلەفۆنی هەولێر - قوشتەپەیان پچڕی. حاجی کاک ئەحمەد دەڵێ ئەوسا سەعید قەزاز لە هەولێر موتەسرف (پارێزگار) بووە و بەم خەبەرە زۆر تێک دەچێت. دەڵێ ناردی بە دوای حوسێنی مەلا و خدری پاشا لە سەرۆکانی دزەیی و داوای لێ کردن بچن عەلی مەحمود بێننەوە دەیەوێ قسەی لە گەڵا بکات. ئەمانەش چەند کەسێکیان نارد بەڵام عەلیاغا نەهاتەوە لەپاشان خۆیان چوون ئیقناعیان کرد هێنایانەوە و بردیان بۆ لای سەعید قەزاز. سەعید بەگ پێی گوتن: "باوەڕ بکەن من لە ئێوە کورد پەروەرترم، بەڵام ئامۆژگاریتان دەکەم کە ئەم بزووتنەوەیە رووسەکان پشتگیریی دەکەن و بە هیچ شێوەیەک لە بەرژەوەندیی میللەتی کوردا نابێت، دەردی کورد بە روسیا چارە ناکرێت، بەڵکو بە رۆژئاوا. من ئەگەر بمزانییایە ئەمە

عیلاجە بۆ کێشەی کورد من خۆم پێش ئێوە بەگەڵ ئەم جۆرە بزووتنەوانە دەکەوتم. من دزەییەکانم خۆش دەوێ حەز ناکەم تووشی کێشە بن" بەم جۆرە عەلی مەحمود دەیسەلمێنێت و دەست لە چەک هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە.

با منیش بگەڕێمەوە بۆ لای کاک موحسین دزەیی برام و ئەویش بەردەوام بوو لە گێڕانەوەکەی و گوتی لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوانەی بارزانی لەگەڵ سەرۆکانی دزەیی بڕێک پارە کۆ کرایەوە و لەپاشان پارەکە و نامەیەکی پشتگیریش لەگەڵیا بە دەستی مەلا خالیدی مورتکە گەیاندرایە مەلا مستەفا کە رۆیشتبوو و دەستی بردبۆوە بۆ چەک. نوسخەیەکی دەسنووسی نامەکەش کە پشتیوانیی هەموو ئاغاکانی دزەیی بۆ بزووتنەوەکەی مەلا مستەفای تێدا نووسرابوو هەروەها ناو و واژۆی هەموو ئەو ئاغایانەش کە بە پارە باروبوویان کردبوو لای کاک ئەحمەدی برا گەورەکەم (ناسراو بە ئەحمەد حەمەدەمین) هەڵگیرابوو. کاک ئەحمەد لە سالۆنی سەرتاشی ناسراوی ئەو سەردەمەی هەولێر حوسێن حەلاق سەری دەتاشی. دیار بوو حکومەت پێی زانیبوو کە ئەو نامەیە لای ئەحمەد حەمەدەمینە و پۆلیس دەنێرێ بیگرن. کە پۆلیس دەچنە سالۆنی حوسێن حەلاق بۆ گرتنی کاک ئەحمەد ئەویش بەپەلە دەست بۆ گیرفانی درێژ دەکات نامەکە دەربێنێت بیدڕێنێت، کەچی پۆلیسەکان وایان زانیبوو دەست بۆ دەمانچە دەبات و یەکسەر کشابوونەوە. کاک ئەحمەدیش نامەکە دەردێنێت و پارچەپارچەی دەکات و فڕێی دەداتە ناو جۆگەلە ئاوێکی بارانی بەهار لەبەردەم سالۆنەکە. پۆلیسەکان پڕ دەدەنە پارچە کاغەزەکان هەمووی بە تەڕی کۆ دەکەنەوە دەیبەن بۆ پۆلیسخانەی خۆیان و لەوێ لێکیان گیر دەکەنەوە. هەموو ناوەکانیان بۆ دەردەکەوێت و دەچن هەر هەموویان دەگرن.

جا هەر بەو بۆنەی کاک ئەحمەدی برامەوە با تەنیا وەک نموونە چەند چیرۆکێکی پڕ لە دڵسۆزیی ئەو نیشتمانپەروەرەتان بۆ بگێڕمەوە.

## ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی (برا گەورەی هۆمەر دزەیی)

1925 - 1976

(برا گەورەی هۆمەر دزەیی، دکتۆر ئەنوەر دزەیی، موحسین دزەیی، سەعدی دزەیی، قەدریە خانی دزەیی و باوکی وریا دزەیی کوڕە گەورەکەی و خوشک و براکانی)

با جارێ بەم لاواندنەوەی بیرمەندی ناوداری کورد مەسعود محەمەدەوە دەست پێ بکەم کە هەم خزم و هەم برادەرێکی نزیکی گیانی بە گیانی کاک ئەحمەد بوو.

"... ئەحمەد سواچاکێکی کوردایەتی و مەردایەتی بوو. کەم کەس هەیە وەک ئەو بە درێژایی خۆناسینی بە گیان و لەش و ماڵ، بێ مزە و بێ وچان لە کوردایەتی سەرف کردبێ. حەیفە مرۆی وەها چاک و پاک و خۆلەبیرکردووی ڕێی نیشتمانپەروەری تۆزی فەرامۆشی لێ بنیشێت. ئەحمەد لە بەخشندەیی بەولاوە دەچوو تا ئەو سنوورەی لە بەخشیندا خۆی بە قەرزدار دەزانی. لێم نەبیست ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی هیچ ئەرکێکی خۆی بۆ برادەرانی و بۆ کوردەواری دەور بکاتەوە. ماڵ و دیوەخانەکەی قۆناغی حەسانەوەی هاوخەباتەکانی بوو، بۆ هەموو کەسێکیش لە عەشیرەت و لەوەی ڕێی شەکەتی و تێوەسان بۆلای ئەوی بردبایە نوای کاردروستی و بەهیوا گەیشتن بوو. کە بێینە سەر ئاکاری شەخسی دوور لە سیاسەت و خەبات ئەحمەد مرۆیەکی هەرە پاک و خاوێن و دڵفەراح و سینەکرایەوەی ڕۆژگاری خۆی بوو. لەمەوە بوو کە لە دڵی هەموو تیرە و بەرەبابی ( دزەیی) ئەحمەد خۆشەویست و نازگیراو بوو. بەڕادەی سەیر لێ هاتنەوە ئەم

مرۆیە تەبیات ئارام و قسەشیرین و ڕەفتار نەرم و نیان بوو. نەیدەزانی قسەی ڕەق و زەق بکات، فێریش نەبوو لە کەس قەڵس بێت وەیا ڕووی لێ گرژ بکات. دەشێ بڵێم ئەحمەد وێنەیەکی بەر شکڵی بەر ئاوێنە بوو لە باوکی. حەمەدەمیناغای باوکی کە لە تافی هەڵچوونیدا مەرگ پێچایەوە نیهاد پاکێک و نیک نەفسێکی ئەوتۆ بوو کە هەر خۆی بتوانێ ئەحمەدت لە بیر باتەوە. سەد ماشەڵلا لەو مرۆیەی وا مەرد و باڵ قووڵ و لێبوردوو و خاکی مەشرەب. جارەها دیتوومە لە جەمی قەڵەباڵغدا خۆی ترنجاندۆتە نێوان دەستەی نۆکەران و بێ ئەوەی پێوەی دیار بێت تەوازوع دەنوێنێ ڕاساوەتە خواردن و زۆریشی بەدڵ بووە. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی. لە بیرەوەری ساڵانەی مەرگی ئەحمەد لە 1977 و 1978 بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی چوونەسەر قەبری بەشدار بووم. تەنانەت لە 1978 تا ئەو فەرمانەم جێبەجێ نەکرد سەفەرە پێنج مانگییەکەی ئوردونم نەگرتەبەر.."

مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی دووەم، کوردستان 2005

ئەمن نامەوێ پێ بە پێ بە ڕێچکەی ژیانی شەخسی کاک ئەحمەدی برامدا بڕۆم. ئەم چیرۆکە کتێبێکی تایبەتیی دەوێ . ئەوەی کەمن لەم بیرەوەریانەمدا مەبەستمە بیانخەمەروو ئەو هەڵوێستە نیشتمانپەروەریانەن کە وا دەردەکەوێ درێژەپێدانی خەباتی دوور و درێژی کوردپەروەریی باب و باپیرانی و تەواوی بنەماڵەی دزەییان بێ (بۆ پتر زانیاری لەبارەی مێژووی ئەم خەباتە دەتوانن سەردانێکی بەشەکانی پێشتری ئەم بیرەوەریانە بکەن).

بە پێی مام جەلال تاڵەبانی (جا لەبیرم نەماوە مام جەلال خۆی بۆی گێڕاومەتەوە یان لە بەشێکی بیرەوەرییەکانی خوێندوومەتەوە کە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بۆ ماوەیەک چەند بەشێکی لێ بڵاو دەکردەوە). دەڵێم بە پێی مام جەلال تاڵەبانی ئەحمەد حەمەدەمین هەر لە تەمەنێکی زۆر لاوییەوە لە سەرەتای ساڵە چلەکانی سەدەی بیستەم کەتەمەنی هێشتا نەگەیشتبووە بیست ساڵ ئەندامی حیزبی ناسیۆنالیستی

هیوا بووە و ئەرکی پەیوەندی بە عەشایرەوە پێ سپێردراوە.

لەو ساڵەی کە کۆماری مەهابادی لێ لە دایک بوو (1946) کەسایەتی نیشتمانپەروەری باکوری کوردستان، ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی خۆیبوون و ئەندامی بنەماڵەی کوردپەروەری ناوداری جەمیل پاشای دیاربەکری ( قەدری جەمیل پاشا) بە پەناهەندەیی لە وڵاتی سوریا دەژییا. ئەوساکە لە ئەنجامی شکستهێنانی سەرهەڵدانەکانیان لە سەردەمی مستەفا کەمال ئاتاتورک ژمارەیەکی زۆر لە نیشتمانپەروەرانی باکوری کوردستان ڕوویان دەکردە سوریا کە هەنگێ لە ژێر حوکمی فرانسییەکاندا بوو. هەندێک لەو کوردپەروەرانە کە من خۆم ساڵی 1957 لە شام بە دیدەنییان شاد بووم ئەمانە بوون: قەدری جەمیل پاشا، خانەوادەی میر جەلادەت بەدرخان: ڕەوشەن خانی هاوسەری، سینەم خانی کچی و جەمشیدی کوڕی، نورەدین زازا، عوسمان سەبری، قەدری جان، مەمدوح بێگ، عیسمەت شەریف وانلی و ئی تریش کە بەداخەوە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە ( بڕوانە وێنە گشتییەکە لەم بەشەدا). قەدری جەمیل پاشا ئارەزووی سەردانی پێشەوا قازی محەمەد دەکات لە مەهاباد. هەڵبەت ئەو سەردانە دەبوایە بە ڕێگای کوردستانی عێراقەوە بەو پەڕی نهێنییەوە ئەنجام بدرێت کە سوریا و عێراق و ئێران پێی نەزانن. کاک ئەحمەدی برام کە ئەوسا تەمەنی بیست و یەک ساڵێک دەبوو ئامادەیی خۆی پیشاندا کە گواستنەوەی قەدری بەگ لە سنووری سوریاوە تا سنووری شاری کۆیە لە ئەستۆی خۆی و پیاوەکانی دەگرێت . کاکەزیادی حەماغای کۆیەش ئامادەیی خۆی دەربڕی کە لە کۆیەڕا تا ئێران ئەو و پیاوەکانی لە گەیاندنی قەدری بەگی جەمیل پاشا بەرپرسیار دەبێت. هەر واش بوو و قەدری بەگ لە چوون و لە گەڕانەوەشی بە ڕێگای ئەو دوو پیاوە کوردپەروەرەوە بە سەلامەتی سەردانە مێژووییەکەی خۆی بە ئەنجام گەیاند.

لەپاش دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کورد) ساڵی 1946 لە لایەن و بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی کە ساڵێک دواتر ئیبراهیم ئەحمەدیش بوو بە ئەندامی و هەر ئەویش ناوەکەی گۆڕی بە ( پارتی دیموکراتی کوردستان)، سێ ئەندامی دەوڵەمەندی حیزب (شێخ لەتیفی شێخ مەحمود لە سلەیمانی، کاکەزیادی حەماغا لە کۆیە و ئەحمەدی حەمەدەمیناغای دزەییش لە هەولێر) لە ڕووی داراییەوە بارە گرانەکەی مەسرەفی جموجۆڵ وچالاکییە نهێنییەکانی ئەو حیزبەیان لە ئەستۆ دەگرت ئەگینا کار بە پەنجا فلسەکەی ئابۆنەی ئەندامەکان ئەنجام نەدەدرا. لەم ڕووەوە ناکرێ ڕۆڵی دوو ئاغای گەنجی دیکەی دزەیی فەرامۆش بکرێت (برایمی عەلی حەمەد ئاغا و مشیری عەدۆ) کە بە پارەو بە چەک و بە کۆبوونەوەی نهێنی لەگوندەکانی خۆیان باروبووی پارتییان دەکرد. ئەمن دەزانم کە چالاکی ئەم دوو کوردپەروەرە زۆر لەوە زیاتر بووە کەمن لێرەدا بەم دوو دێڕە باسم کردووە بەڵام بەداخەوە لەوە زیاتر زانیاریم نەبووە. بێگومان زۆر دەوڵەمەندی کوردپەروەری دیکەش هەبوونە کە لە ژێرەوە بە پارە یارمەتی پارتیی ئەو قۆناخەیان دەدا و من پێی نازانم.

نەک هەر بۆ ئەندامانی پارتی، بەڵکو دەرگای دیوەخانەکەی ئەحمەد حەمەدەمین لە دووگردکان هەمیشە ئاوەڵا بووە بۆ ئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی شیوعیی عیراقیش ئەگەر ترسی گرتنیان ببوا و کاک ئەحمەد چ لەوێ چ لە ماڵی یەکێک لە دەستوپێوەندەکانی خۆی لە ئاوایی دەیشاردنەوە، لەپاشان پیاوی بەگەڵ دەدان بیانبات بۆ شوێنی مەبەستیان. بۆ پتر زانیاری لەم بارەیەوە خوێنەری بەڕێز دەتوانێ سەردانێکی تێکۆشەری لەمێژینی کورد و عیراق، سکرتێری پێشووی حزبی شیوعیی عیراقی کاک عەزیز محەمەد و هەروەها کاک مومتاز حەیدەری برای تێکۆشەرانی شەهید جەمال و موهێب حەیدەریی شیوعی بکات با ئەوان باسی ئەحمەد حەمەدەمینی بۆ بکەن.

کاک موحسین دزەیی برام بۆی گێڕامەوە، جارێکیان لە ساڵی 1948 ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعیی عیراقی شەهید نافیع یونس کە گەنجێکی هەولێری بوو فەرمانی گرتنی دەرچووبوو، حزبی شیوعی هانای وەبەر کاک ئەحمەدی برامان برد لای خۆی بیشارێتەوە تا چارەیەکی بۆ دەدۆزنەوە. ئەویش بەنهێنی بردی بۆ گوندەکەی خۆمان (دووگردکان) و یەک هەفتە لای خۆی شاردییەوە تا کاک نافیع لەلایەن حزبەوە ئاگادار کرا کە خۆی بگەیەنێتە موسل و ئیتر ئەوان لەوێ دەیگەیەننە بەغدا و لەوێ شاردنەوەی ئاسانە. ئینجا کاک ئەحمەد بۆ دڵنیایی و ئەمنیەتی نافیع یونس بە ڕێگای ئەو گوندانەی دوورن لە جادەی قیرکراو شەخسی خۆی و چەند پیاوێکی چەکداری خۆی لەگەڵی چوو بۆ موسل و ڕادەستی ئەو شوێنەی کرد کە حزبی شیوعی دەسنیشانی کردبوو.

چیرۆکێکی تری نیشتماپەروەریی کاک ئەحمەد کە دیسان کاک موحسینی برام بۆی گێڕاومەتەوە ئەمەیانە: لە مانگی یەکی ساڵی 1948 ئەو ساڵەی کە بە ساڵی (وثبة) واتا ڕاپەڕین چووەتە ناو مێژووی سیاسیی عیراقەوە، ڕۆژانە لە هەموو شارەکانی عیراق و کوردستانیشا خۆپیشاندانی زۆر گەورە گەورە لە دژی کابینەی سالح جەبر دەکران کە خەریک بوو پەیمانێک بە ناوی (پەیمانی پۆرتسماوث) لەگەڵ بریتانیا ببەستێت Anglo - Iraqi Treaty of Portsmouth لەجیاتی پەیمانێکی پێشتر بە ناوی Anglo - Iraqi Treaty of 1930.

لە هەولێریش (الحزب التحرر الوطني) کە لە ڕاستیدا دیوی دەرەوەی حزبی شیوعیی عیراقی بوو و من خۆیشم بەو منداڵییەی خۆم ئەندامی بووم ئەو خۆپیشاندانانەی ڕێک دەخست. جا من خۆیشم چاکم لەبیرە چونکە لەگەڵ براکانی ترم کە لە هەولێر دەمانخوێند بەشداریی خۆپیشاندانەکانمان دەکرد و کاک موحسینیش زیاتر زانیاریی دامێ، دەڵێ کاک ئەحمەدی برامان کە شیوعیش نەبوو بەڵکو ئەندامی پارتی بوو و لە گوند دادەنیشت هەڵستا بۆ خۆپیشاندانەکەی ڕۆژی

27ی مانگی یەکی ساڵی 1948 لۆرییەکی بەکرێ گرت پڕی کرد لە جوتیارەکانی گوندەکەی خۆمان (دووگردکان) بچن بەشداری لەو خۆپیشاندانە گەورەیەی هەولێردا بکەن. دەڵی و - لێرەدا من خۆیشم ئەوەم لە بیرە - هەر یەک لەو جوتیارانە دارێک یان تۆبزێکی لەناو شەرواڵی شاردبۆوە بۆ ئەوەی ئەگەر پۆلیس لە خۆپیشاندانەکە پەلاماری دان بیانگرێ یان پەرتەیان پێ بکات ئەوان بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن. هەر بەپێی کاک موحسین، کاک ئەحمەدی برامان شۆفێری تایبەتیی خۆی (مەگەردیجی ئەرمەنی) ڕاسپارد کە لۆرییە پڕ جوتیارەکان لە دووگردکانەوە بگوزێتەوە بۆ هەولێر بۆ خۆپیشاندانەکە. هەر واش بوو و هەندێ پێکدادان ڕووی دا و هەندێ کەس بە سووکی برینـدار بوون و هەندێک گیران. بەڕێوەبەری پۆلیس کە کاک موحسینی برام دەڵێ پیاوێکی زۆر باشی ناو جەمیل ڕەشید (؟) بوو و کەرکوکی بوو کە دیار بوو حەزی لە توندوتیژی نەدەکرد بە نەرمی - وەک باوکێک بۆ کوڕەکانی - قسەی لەگەڵ خۆپیشاندەرەکان دەکرد و ئامۆژگاریی دەکردن پەرتەی لێ بکەن بەڵام کەس گوێی نەدایە و ئەویش داوای لە پۆلیسەکان کرد توندوتیژی لەگەڵیانا بەکار نەیەنن.

جا بەزمی زەمانە لێرە لەوەدایە کە ڕێک دە ساڵ دواتر ساڵی 1958 دوای کودەتا سەربازییەکەی چواردەی تەمووز (کە دواتر ناوی کرا بە شۆڕشی چواردەی تەمووز) کاک ئەحمەد و کاک موحسینی برایانم پێکەوە دەچن بۆ بارەگای حزبی شیوعی لە هەولێر بۆ پیرۆزبایی لە کاک نافیع یونسی ناوبراو کە تازە بە بەرپرسی ئەوێ دامەزرابوو. کاک موحسین دەڵی ئێمەیان لە ژووری چاوەڕوانی دانا و خەبەریان بۆ کاک نافیع برد کە هاتووین بیبینین. دەڵی دوای نیو سەعاتێک چاوەڕوانی ئینجا یەکێک هات پێی ڕاگەیاندین کە پێویست ناکات چیتر دانیشن ئەگەر هەر کارێکتان هەیە بڕۆن بۆ بارەگای جوتیاران. دەڵێ چاومان بە کاک نافیع نەکەوت لە کاتێکدا ئێمە کە بەرەو

ئەوێ دەڕۆیشتین بە دڵنیاییەوە چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد کاک نافیع یەکسەر خۆی بێتە دەرەوە و باوەشمان بۆ بکاتەوە و بە توندی بە ئامێزی خۆیەوە بمانگوشێت. {ئەمە ڕۆمانەکەی بۆریس پاسترناکم دێنێتەوە بیر کە کرا بە فیلمی دکتۆر جیڤاگۆ - هۆمەر دزەیی} بە داخەوە کاک نافیع یونس لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری نیشتمانپەروەرانی دیکەی کورد و عەرەب لەلایەن بەعسیەکانی هەشتی شوباتی 1963ی بەدناو شەهید کرا.

لێرەدا حەز دەکەم خوێنەرە خۆشەویستەکانم ئاگادار بکەمەوە بە خراپە لە نیازی کاک موحسینی برام و لە هی منیش نەگەن کە وا ئەم چیرۆکەیان بۆ دەگێڕمەوە. ڕاستیەکەی کاک موحسین کە ئەم چیرۆکەی بۆ من دەگێڕایەوە هەستم پێ دەکرد کە تەنیا وەک گلەییەکی برایانەی پڕ لە حەسرەت و دڵشکاویەوە دەیگێڕایەوە بێ ئەوەی هیچ هێرشێکی شەخسی نە بەرامبەر بە کاک نافیع نە بەرامبەر بە حزبی شیوعی بە قسەکانییەوە هەستی پێ بکرێت، ئەو دڵی بەوە ڕەنجابوو و - هەقیشی بووە - کە کاک نافیع نەیویستووە هەر مەرحەبایەکیشیان لێ بکات. مەبەستی هەردووکمان لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە بە هیچ جۆرێک سووککردنی کەسایەتیی شەهید کاک نافیعی تێکۆشەر نییە و بە هیچ جۆرێکیش شکاندن و کەمکردنەوەی ڕۆڵی حزبی شیوعیی عیراقی نییە لە خەباتی دووردوورودرێژیدا لەپێناو خەڵکی هەژاری پەراوێزکراو و لەپێناو وەدەستهێنانی دادی کۆمەڵایەتی بۆ گەلانی عیراق. تا ئێستاش کارل مارکس لەلای من عەبقەریترین زانای ئابووری و فەیلەسوف و بیرمەندی ئینسانییە. لە بیریشمان نەچێت مێژوو بە چاکی و بە خراپییەوە با بگێڕدرێتەوە و بنووسرێتەوە چونکە بۆ نەوەکانی داهاتوومان دەبێتە سەرچاوەی وانە و عیبرەت. حەز دەکەم خوێنەرەکانم ئەوەش بزانن - ئەگەر نایزانن - کە لەوەتەی دەوڵەتی عیراق هەیە و دەستوور بە دامەزراندنی (احزاب) دراوە هەڵوێستی حزبی شیوعیی عیراقی بەرامبەر بە پرسی کورد لە هەموو

حزبە عیراقییەکانی دیکە ئەرێنیتر و لایەنگرتر بووە. ئەگەر کەسانێک، تاکێک لەناو حزبی شیوعیدا هەڵەیەکیشی کردبێت، باشە کێ هەیە لە پرۆسەی درێژخایەنی کاری سیاسیدا هەڵەی نەکردبێ؟ ئایا پارتی، یەکیەتی، گۆڕان و کەسایەتیی ناودار و قسەڕۆیشتووی ئەم حزبانەش لە ژیانی سیاسیاندا دەیان هەڵەیان نەکردووە و ئێستاکێ پەنجەی پەشیمانی ناکرۆژن؟ کورە نەک هەر لەناو کوردا، تۆ بڕۆ بیرەوەری و یادداشتەکانی کەسایەتییە ناودارەکانی جیهان بخوێنەوە (راست و چەپ)، چما ئەوانیش پەشیمانیی خۆیان بە ڕاشکاوی دەرنەبڕیوە کە لە ژیانی سیاسیاندا ئەو هەڵانەیان کردووە؟ بۆیە زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانم بە ناوی خۆم و بە ناوی کاک موحسینی برام و هەموو براکانی ترم و کەسوکاری نزیکم هەزار ڕەحمەت بۆ گۆڕی کاک نافیع یونسی شەهید و هەموو ئەو تێکۆشەرانەی حزبی شیوعیی عیراقی بنێرم لە هەر نەتەوە و ئایینێکدا بووبن کە گیانی خۆیان لەپێناو خزمەتی گەل و وڵاتیان بەخشیوە (تەنیا ئەو کەسەی کە خۆی بێگوناهە با بەردێکی تێ بگرێ). نافیع یونس لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو هەمیشە هاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد لە هەولێر چونکە ڕەفیقی حزبیی هەندێ برا لە خۆم گەورەترەکانم بوو و ڕەنگ و روخساریم چاک لەبیر ماوە چونکە خۆیشم هەرچەندە کە هەینێکە منداڵیش بووم ئەندامی حزبی شیوعی بووم. دواتر کە گەیشتمە گێڕانەوەی سەربردەی شەخسیی خۆم زیاتر دەچمە ناو وردەکاریی ئەو قۆناخەی ژیانمەوە.

کاک موحسینی برام هەروەها دەگێڕێتەوە دەڵێ محەمەد سدیقی برای مەلا مستەفا لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیست لە هەولێر دەستبەسەر بووە. دەڵێ زوو زوو دەهات سەردانی دەکردین لە (کۆمپانیای ئۆتۆمۆبیلی فۆرد)ی کاک موحسین و دەڵێ کاک ئەحمەدیش هەمیشە لەژێرەوە یارمەتیی دەدا. بێجگە لەوە خێزانێکی زۆری بارزانییان لە کۆتایی ساڵی 1948ەوە تا دەوروبەری 1953 بەسەر

گوندەکانی ئاغاکانی دزەییاندا دابەش کرابوون و لەپاشان کە سەعید قەزاز بوو بە وەزیری ناوخۆی عیراق بڕیاری دەرکرد هەموویان بنێرێتەوە بۆ وڵاتی خۆیان لە بارزان، واشی کرد. ئەم بارزانیانەی گوندەکەی ئێمە دووگردکان ڕێزی تایبەتییان لای کاک ئەحمەد هەبوو و ڕۆژانی جەژن کاک ئەحمەد گەورەکانیانی لە تەنیشت خۆی دادەنا بۆ چێشتی جەژن. ئەمن لەوانە فەرزی ئاغام لەبیر ماوە کە پیاوێکی زۆر گران و سەنگین و بەعیزەتی نەفس بوو. لەم بارەیەوە کاک موحسین ئەم چیرۆکەشی بۆ گێرامەوە: لە بارزانییەکانی کە لە گوندی ترپەسپیان نیشتەجێ کرابوون (عەولا مەلا شین) ناوێک سۆفیی شێخ عەبدولسەلام و لەپاش ئەویش هی شێخ ئەحمەدی برای بووە. ئەو پیاوە زوو زوو دەهاتە گوندەکەی ئێمە دووگردکان و دیارە کاک ئەحمەد ڕێزێکی تایبەتی بۆی هەبووە. کاک موحسین دەڵێ: " لە پاش دەسپێکردنی شۆڕشی ئەیلول عەولا مەلا شین جارەهای جاران بۆ مەلا مستەفا و ئیدریس و مەسعودی دەگێڕایەوە کە ئەحمەد حەمەدەمین هەر جارێکی بیدیبایە پێی دەگوت هەر شتێکی خۆت یا هەر بارزانییەک پێویستیتان پێ هەبوو یەکسەر بە ئەو بڵێ (بە کاک ئەحمەد) بە کەسی تر مەڵێ".

نامەیەکی مەلا مستەفای بارزانی بۆ ئەحمەد حەمەدەمین (نەزانراوە هی چ ساڵێک بووە بەڵام زەمانی حوکمی عەبدولکەریم قاسم بووە) تا ئەم چەند ساڵانەی دواییش لە ماڵی وریای برازام، کوڕە گەورەی کاک ئەحمەد، هەڵگیرابوو بەڵام نامەکە بەداخەوە ئێستا نەماوە. لە نامەکەیدا مەلا مستەفا داوا لە کاک ئەحمەد دەکات دەڵی لای ئێوە ئەسپی جوان دەست دەکەوێت تکای لێ دەکات ئەسپێکی بۆ بکڕێت بۆی بنێرێت. سۆراخ بە سۆراخ بە کاک ئەحمەد دەڵێن کە عەلی باپیر لە گوندی سیاو لە ناوچەی شەمامک ماینێکی زۆر جوانی ڕەنگ شینی قەزوانیی هەیە. کاک ئەحمەد خەڵک دەنێرێ ماینەکەی بە هەر نرخێک بێ لێ بکڕن. عەلی باپیر کە فەلاحێکی خواپێداو

بوو دەڵێ ماینێک بۆ جەنابی مەلا مستەفا بێت و کاک ئەحمەد حەمەدەمین داوای بکات عەیب نییە هاتوون باسی پارە دەکەن، ئەمە دیارییەکی بچووکی منە پێشکەش بە مەلا مستەفای دەکەم. کاک موحسین دەڵێ خەبەر بۆ کاک ئەحمەدی برامان هاتبوو کە حاجی مستەفای خەزنە ئامۆزای فاروقی جەمیلی حاجی سادقی (کەسایەتیی ناسراو کاک فاروق جەمیلی تێکۆشەر) و کاک دەهامی برای ئەویش ماینێکی بۆرەی زۆر جوانی هەیە. کاک موحسین دەڵێ خۆی و دوو ئامۆزای (حوسێنی عەلی ئاغای و بورهان ئاغای عەزیزی) چوون ماینەکە ببینن و حاجی مستەفاش بە هەمان شێوە پێیان دەڵێ باسی پارە و مارە نەکەن ئەمە پێشکەشی مەلا مستەفا بێ.

لەم ساڵانەی دوایی ڕۆژێکیان چوومە سەردانی دۆستێکی دێرینم حاجی عەباسی سنجاوی لە نووسینگەکەی خۆی لە هەولێر. دەروێش عەلی مەولود عەدێی خەڵکی گوندی عالّلای کەندیناوە لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەوێ دانیشتبوون. دوای چاک و چۆنی دەروێش عەلی ڕووی کردە جەماعەت گوتی با ئەم چیرۆکەی کاک ئەحمەدی حەمەدەمین ئاغای براگەورەی ئەم کاک عومەر دزەییەتان بۆ بگێڕمەوە گوتی: " لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم لۆرییەکی قەلابم هەبوو کرێم پێ دەکرد. هەنگی مەلا مستەفا لە یەکیەتیی سۆڤیت پەنابەر بوو، کاک ئەحمەد داوای لە من کرد بچم بۆ گوندی جانە لە کەندیناوە کە گوندی خۆی بوو. لە ڕۆژی دیاریکراو گەیشتمە جانە کاک ئەحمەد لەسەر جۆخینان (گۆڕەپانی خەرمانان) بوو. منی برد بەلایەکدا پێی گوتم کەس پێی نەزانێ دەمەوێ دوو قەلاب لەم گەنمەم بۆ ببەیت بۆ بارزانییەکان بەڵام مەڕۆ بۆ گوندی بارزان نەوەکو پۆلیس بپرسن ئەو گەنمە بۆ کێیە؟ تۆ تەنیا بیگەیەنە میرگەسۆر و تەسلیمی حەمەداغای مێرگەسۆری بکە ئەو خۆی دەزانێ بۆ کوێی ببا. دەروێش عەلی دەڵێ منیش ئەوەی کاک ئەحمەد پێی ڕاسپاردبووم بەجێم گەیاند. ئەمەشی خستە سەر کە دوو قەلاب پڕ

گەنم بۆ ئەو زەمانە پارەیەکی خەیاڵیی دەکرد. جا ئەم کومەکە هەر بەو دوو قەلابە پڕ گەنمەی ئەوساڵە نەبڕابوەوە، ئەحمەد حەمەدەمین ساڵانە ئەم کومەکە و هی تریشی بۆ بارزانییەکان دەنارد.

ئەمەیان مام جەلال بۆی گێڕاومەتەوە: جارێکیان لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم کەسایەتیی ناسراوی هەولێر زەید ئەحمەد عوسمان (پوورزای هۆمەر دزەیی) میوانێکی ئەمەریکی لەگەڵ خۆی دەبات بۆ دووگردکان. کە کابرای ئەمەریکی سەیر دەکات کاک ئەحمەد چ زەوی و زار و موڵک و سەروەت و سامان و مەڕ و ماڵاتی هەیە پێی سەیر دەبێت کە ئەفکاری سۆسیالیستی هەیە و لایەنگری یەکیەتیی سۆڤیەتە لە دژی بەرەی کاپیتالیست کە خۆی خاوەنی ئەو موڵکە زۆرەیە.

زیاتر لە بارەی کەسایتیی ئەحمەد حەمەدەمینی برا گەرەم لە بەشی (دووگردکان - دیوەخان) بخوێنەوە.

## دەفتەرەکەی مام رەشید عارف کۆیی

کەسایەتیی ناسراوی کورد مام رەشید عارفی کۆیی کۆمپانیایەکی گەورەی بەڵێندەراتیی بنیادنانی لە بەغدا هەبوو و هەر لە بەغداش دادەنیشت. پیاوێکی بورژوازی زۆر دەوڵەمەند و زیرەک و قسە حازر و قسە لە روو و قسەخۆش بوو. زۆر کوردپەروەر و لای نیشتمانپەروەرانی کورد و عارەبیش لە بەغدا خۆشەویست بوو و رێزی لێ دەگیرا هەرچەندە کە هەمیشە گاڵتەشی بە عارەب و مێژووی عارەبان دەکرد رووبەڕووی خۆیشیان و لە حزووری ژنەکەی خۆیشی کە عارەب بوو.

جارێکیان سیاسەتکاری ناوداری عیراقی کامل ئەلچادرچی کە برادەری مام رەشید بووە لێی دەپرسێ: " ئەرێ کاکە رەشید، تۆ هەڵدەستی و دادەنیشی باسی جیابوونەوەی کوردستان دەکەیت لە

عیراق، باشە ئەگەر جیا بوونەوە سنووری کوردستان چۆن دەستنیشان بکەین؟ " مام رەشید یەکسەر وەرامی دەداتەوە دەڵێ: " زۆر ئاسانە، با حەکەم لەخۆتان بێ، عارەب بێ، ئێمە پێی رازین. " ئەلچادرچی دەڵێ: " کاکە، ئەو عارەبە دەبێ کێ بێ ئێوە هێندە متمانەتان پێی هەیە سنووری کوردستانتان بۆ دەستنیشان بکات! " مام رەشید دەڵێ: "حوشتر، حوشتری بادیە بێنن با بەرەو کوردستان بکەوێتە رێ، لە کوێ وەستا لەوێ خەتێ ئەکێشین ئەولا کوردستان ئەملاشیان عەرەبستان! ". رۆژنامەوانانی فرانسی و بریتانی کە دەهاتنە کوردستان ئەم قسە خۆشەی مام رەشیدیان لە رۆژنامەکانی خۆیاندا بڵاو کردەوە.

جارێکی تریش کە چواردەی تەمووزی 1958 رووی دا مام رەشید دەچێتە لەندەن لەوێ چاوی بە دۆستێکی ئینگلیزی کۆنی خۆی دەکەوێ (یان ئێدمۆنز یان مەکێنزی بووە چاکم لەبیر نەماوە). کابرا لێی دەپرسێ: "ئەرێ میستەر عارف ئەوە عیراقی بۆ رۆژانە خۆپیشاندان لە دژی بریتانیا دەکەن و جنێومان پێ دەدەن، ئێمە چیمان لێ کردوون؟ " مام رەشید پێی دەڵێ: " ئێ دیارە هەقیانە، چۆن هیچتان لێ نەکردوون، ئێوە ئیستیعمارتان کردبوون" کابرا دەڵێ: "باشە کورد بۆ قسەمان پێ دەڵێن؟ " مام رەشید دەڵێ: "ئاخر ئەوانیش هەقیانە چونکە ئیستیعمارتان نەکردبوون !"

ئەمەشیان مام جەلال بۆی گێڕاومەتەوە: جارێکیان لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم سەرەک کۆماری یەکێتیی سۆڤییەت ئاناستاس میکۆیان کە بە نەژاد ئەرمەنی بوو سەردانی بەغدا دەکات. ئێوارەیەک باڵیۆزخانەی سۆڤییەت بۆ نان خواردن کەسایەتییە سیاسی و کاردارییەکانی عیراقی بانگهێش دەکات، مام جەلال و مام رەشیدیش لەناو میوانەکاندا دەبن. مام جەلال دەستی مام رەشید عارف دەگرێت دەیبا پێشکەشی میکۆیانی بکات دەڵێ: "کۆمراد میکۆیان، حەز دەکەم کاپیتالیستێکی کوردت پێشکەش بکەم". میکۆیان بە پێکەنینەوە دەڵێ: "نەمبیستووە کورد کاپیتالیستی هەبێ" مام رەشیدیش بە هەمان

پێکەنینەوە یەکسەر وەرامی دەداتەوە دەڵێ: "منیش نەمبیستووە ئەرمەنی شیوعی بێ"

مام رەشید بۆ تەمەن و سەردەمی خۆی پیاوێکی زۆر لیبراڵ و سێکولار و مۆدێرن بوو. لە هەموو کوردە دەوڵەمەندەکانی تری دانیشتووی بەغدا زیاتر بە پارە یارمەتیی رێکخراوە کوردییەکانی دەدا لە عیراق و لە ئەورووپا. لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ساڵی 1959 چاپخانەیەکی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان کڕی بە هەزار دینار کە بۆ ئەو زەمانە بڕێکی زۆر بوو. مام رەشید هەمیشە گلەیی لە کولتووری دواکەوتووی کۆمەڵگای کوردی هەبوو و بە چەند وشەیەکی زۆر کەم بەڵام بەراستی پڕ لە حیکمەت و فەلسەفە و زۆر جاریش بە گاڵتەپێکردنێکی شاراوە بە تەوسەوە پلاری خۆی دەگرتە سیاسەتکاران و پارێزیاران و دینداران. یەکێک لەو قسانەی کە هەمیشە دەیگوت و دەیگوتەوە ئەمە بوو:" کورد دەفتەری نییە".

مەبەستی مام رەشید عارف لەو دەفتەرە ئەوە بوو کە بە سەدان ژن و پیاوی کورد کە رۆڵی گرینگیان هەبووە لە بواری جیاجیا لە مێژووی کوردا ئیمڕۆ کەس ناویشیانی نەبیستووە و کورد دەفتەرێکی تەرخان نەکردووە بۆ تۆمارکردنی ناو و رۆڵی ئەو مرۆڤە مێژووییانە.

مام رەشید هەر لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە مانگەکانی هاوینی لە شاری ڤیەننا بەسەر دەبرد کە ئەوسا منیش لەوێ خوێندکار بووم و تا دەگەڕایەوە بۆ عیراق هەمیشە یار و یاوەری دەبووم. کە ئێواران پێکەوە دادەنیشتین زۆر جار باسی ئەو "دەفتەرەی کوردی" دەهێنایە ئارا دەیگوت ئەگەر کورد دەفتەری هەبوا دەبوایە بە دەیان کتێب و گوتار هەر بۆ نموونە لەسەر ئەحمەدی حەمەدەمینی دزەیی و کاکەزیادی کۆیە بنووسرایە چونکە دەیگوت کە هەر خۆی ئاگادار بووە ئەو دوو کەسایەتییە کۆمەڵایەتییە دەوڵەمەندەی کورد بەبێ خۆدەرخستن چ یارمەتییەکی بزووتنەوەکانی نهێنی و ئاشکرای کوردایەتییان داوە.

جا من لێرەدا بە یادی مام رەشید عارف کە دۆستێکی نزیکی خۆم و هەموو براکانیشم بوو وا ئەم دەفتەرەم کردووەتەوە بۆ ئەوەی هەر نەبێ ئەو کەسانەی کە لە بنەماڵەکەی خۆمدا خزمەتێکیان بە گەل و وڵات گەیاندبێ تۆزی فەرامۆشییان لێ نەنیشێت و ناویان بکەوێتە شوێنی شایەستەی خۆیان لە مێژووی کوردا و قوتابخەنەکانمان لە وانەی مێژوودا چیرۆکی ژیان و خزمەتەکانیان بە منداڵە وردیلەکانمان بلێنەوە. ئامۆژگاریشم - ئەگەر ئامۆژگاریم لێ قەبوول بکرێت - بۆ هەر تاکێک لەناو کوردا ئەوەیە ئەگەر چیرۆکی کەسانی وای لا هەبێ و پێی دەزانێ با سێ و دووی لێ نەکات و دەفتەرێکی بۆ بکاتەوە. ئەمە مەسەلەی خزم خزمێنە نییە، ئەمە مێژووە و مێژووش دەبێ بنووسرێتەوە. راستە ئەو سەربازە بزرانە کوردایەتیی خۆیان بێ خۆدەرخستن کردووە بەڵام کە خۆیان نەمان ئیتر ئەرکی مێژووە بەسەریان بکاتەوە و ناویان بەرز بنرخێنێ. ئەگەر خوێنەری بەڕێز بە قسەکانی مامۆستا کەریم شارەزای بیرتیژدا بچێتەوە کە من بۆ وەبیرخستنەوە لە سەرەوەی زۆرێک لە بەشەکانی ئەم بیرەوەریانەم دامناوە و دامناوەتەوە بۆی دەردەکەوێ کە کورد چەند پێویستی بە دەفتەرەکەی مام رەشید عارف هەیە.

وەک پێشتریش باسم کردووە مەبەستی من لەم دەفتەر کردنەوەیە زیاتر سەربازە لەبیرکراوەکانی بنەماڵەی دزەیی و زۆر بنەماڵەی کوردی عەشایری دیکەشە کە زۆرترایەتییان گوندنشینی نەخوێندەوار بووینە و بەو نەخوێندەوارییە، یان کەم خوێندەوارییەی خۆیان، ئەو رەنجەیان داوە وسەروەت و سامانی خۆیان لە پێناو کوردایەتی بێ خۆدەرخستن پێشکەش کردووە.

جاران بۆ کوردایەتی سەروەت و سامانی خۆیان لەسەر دادەنا، ئەمرۆ "بە کوردایەتی" سەروەت و سامانی گەل بۆ خۆیان کەڵەکە دەکەن. مخابن کە سەرکردە سیاسییەکانمان نەیانتوانی ببن بە نموونەیەکی ئەخلاقی بۆ گەلەکەمان. سەت حەیف و مخابن بۆ

ئەو دەرفەتە لەدەستچووەی کە لەپاش گەڕانەوە بۆیان راخرابوو بین بە ماندێلا، بین بە ژنانی رۆژئاڤا و ریز و سەردانواندنی دونیا بۆ گەلەکەمان بەدەست بێنن.

مام رەشید عارف هەقی نەبووە خەم بۆ ئەو سەربازە نەناسراوانەی کوردایەتیی جاران بخوا؟

مام رەشید عارف وجاخ کوێر بوو و مامی بەڕێز دکتۆر حەمەنوری عارفی زانکۆی سەلاحەدینی هەولێر بوو. سالی 1982 دیسان لە سەفەرێکی ڤیەنای دەبێت و لەناو فڕۆکە شەپرەی دەماخ لێی دەدات. بەداخی زۆرەوە تا دەگەنە ڤیەننا گیان دەسپێرێ. بە تەواوی نازانم چ سالێک لە دایک بووبوو بەلام پێم وایە کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی لە دەوروبەری هەفتا سالێک دەبوو.

بەرلەوەی ئەم لاپەڕەی باکگراوندەم لە باوکەوە ئاودیو بکەم حەز دەکەم تێبینییەکی دیکەم روون بکەمەوە کە لەمێژە بیر و هۆشمی سەرگەرم کردووە، وشەی شۆڕش.

## شۆڕش

جاران کە گوێمان لە دەنگوباسی بە عەرەبی رادیۆی بی بی سی BBC یان هەر رادیۆیەکی بە زمانی عەرەبی دەبوو لەسەر کورد زۆر تووڕە دەبووین. پێمان ناخۆش بوو کابرای بێژەر لەباتی ئەوەی "شۆڕشی کورد" بە (الثوره الكرديه) ناو بێنێ پێ دەگوت (التمرد الكردى). ئیمە وامان دەزانی و - ئێستاش هەر وای تێ دەگەین - کە (ثوره) شتێکی باشە و (تمرد) خراپە. نەمان دەزانی و - ئێستاش هەر تێی نەگەیشتووین - کە هەدووکیان خراپن. ئەگەر راستیت دەوێ هێشتا (تمرد) باشترە.

بە پێی پێناسەی بیرمەندانی رۆژئاوا بۆ وشەی (ریڤۆلیوشن revolution) کە کورد وشەی (شۆڕش)ی بۆ بەکار هێناوە، عەرەبەکان

(ثـورە)، فارسـەکان (انقـلاب) و تورکـەکان (دەڤریـم - devrim) ی پـێ دەڵێـن ئـەوە بریتییـە لـە بزووتنەوەیەکی (هەمـە لەخۆگر) واتـا وەرگەڕانێکی رادیکاڵـی لـە رەگوریشـەوەی سـەرتاپای کۆمەڵـگا لـە هەمـوو بوارێکـدا بـەم جـۆرە: 1 - سیسـتەمی سیاسـیی دەسـەڵات (رژێـم) وەردەگێـڕێ بـۆ سیسـتەمێکی دیکـەی بەتـەواوی پێچەوانـەی پێشـوو (بـۆ نموونە: پادشـایەتی بۆ کۆمار) 2 - سیسـتەمی ئابووریی پێشـوو هەڵدەگەڕێنێتەوە بۆ سیسـتەمێکی دیکـەی بـە تـەواوی ئـاوەژووی پێشـوو (بـۆ نموونـە: ئابووریـی ئـازاد بـۆ ئابووریـی بەپلانکـراو تەنهـا لەلایـەن حکوومەتـەوە کـە هـەر ئایدیۆلۆژیـای حکوومـەت مافـی دەبـێ پـلان بـۆ ئابووریـی وڵات دابنـێ) 3 - پلاندانـان بـۆ سیسـتەمی پەروەردەکـردن دەبێتـە مافـی تەنهـا تاقمـە شۆڕشـگێڕەکە (the revolutionary body) 4 - ترادیشـن و دابونەریتـی لەمێژینـەی کۆمەڵـگا بـە تۆبـزی دەبـێ بگـۆڕێ بـەو سیسـتەمەی کـە تاقمـی شۆڕشـگێڕ بڕیـاری لەسـەر دەدا (بـۆ نموونـە: شۆڕشـی خومەینـی لـە ئێـران بـە داری زۆرێ لەچـک و چـادری بەسـەر کـچ و ژنانـدا داسـەپاند و کراڤاتیشـی لـە پیـاوان قەدەغـە کـرد. نموونەیەکـی تـری پێچەوانـەی ئـەوەش: مسـتەفا کەمـال ئەتاتـورک و تاقمـە شۆڕشـگێڕەکەی لـە تورکیـا کردیـان بـە قانـوون کـە هیـچ مێینەیـەک نابـێ حیجـاب بپۆشـێ، هیـچ ئەفەندییـەک نابـێ فێـس بکاتـە سـەری، مزگـەوت داخـران، مـەلا مەندیلیـان پـێ فـڕێ دران، هـەر سیسـتەمی خیلافـەت گـۆڕا بـە کۆمـار و ئیسـلام قەدەغـە کـرا و ئەلفوبێـش لـە عەرەبییـەوە کـرا بـە لاتیـن. هەڵبـەت شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری بۆلشـێڤیکەکان سـاڵی 1917 لـە روسـیای کایسـەری ئەویـش نموونەیەکـی زۆر لەجێـی خۆیەتی بـۆ ئـەم بابەتـە. لێـرەدا ئەمـن کارم بـەوە نییـە کامـی باشـە کامـی خراپـە، چەنـدی ئەرێنییـە چەنـدی نەرێنییـە، ئـەوەی مەبەسـتی منـە ئەوەیـە کـە هەردووکیـان شۆڕشـن revolution و وا دەشـبینین کـە هەمـووی بـە بزووتنەوەیەکـی رادیکاڵیـی زۆر خێـرا و بـە داسـەپاندنێکی زۆرەملێـی سەرپێشـوێڕکردن ئەنجـام دراوە. جـا ئـا ئـەم گۆڕانـە رادیکاڵـە و داسـەپاندنە بـە داری زۆرێ یـە رامـان دەکێشـێت بـۆ تێرمینۆلۆژییەکـی تـر، ئیڤۆلیوشـن evolution.

زانست دەڵێ تۆ ئەگەر منداڵێک لە زگی دایکی بە پێنج شەش مانگی یان کەمتریش دەربێنیت ئەگەر نەشمرێ هەر بەناتەواوی دەژی، چونکە پرۆسەی مانەوەی لەناو زگی دایکا تەواو نەکردبوو. خۆی دەبێ لێی گەڕێت پرۆسە سروشتییەکەی خۆی کە نۆ مانگ و نۆ رۆژە تەواو بکات. گۆڕینی کۆمەڵگاش وەک ئەو کورپەڵە وایە، پرۆسەی بە سەلامەتی گۆڕینی کۆمەڵگا بە شەو و رۆژێک نایەتە دی، دەبێ لێی گەڕێت رێڕەوی سروشتیی خۆی بگرێت تاکو وەک کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم، بە بەها و دابونەریتی بەرەبەرە و سروشتی بەرەو پێش بڕوات و بگۆڕێ. لەسەر دەوڵەت ئەوەیە ڕێی بۆ خۆش بکات نەک بە پاڵ و پەستۆ و بە تۆقاندن و ترساندن بیباتە پێشەوە. دەڵێن جارێکیان زانایەکی بایۆلۆجی بۆ تاقیکردنەوە چەند هێلکە پەپوولە (یان هی زیندەوەرێکی تر بووە چاکم لەبیر نەماوە) لەپێش خۆی دادەنێت کە کاتی هەڵهێنانیان دەبێت و چاوەدێرییان دەکات. کۆرپەڵەکان لەناو هێلکەکان کەوتبوونە جووڵە جووڵ و ناوەناوە بەشێکی باڵیان دەردەهێنا و دوای هەوڵێکی زۆر و ماندوو و شەکەتبوون لە هێلکەکان دەهاتنە دەرەوە و لە شەقەی باڵیان دەدا. یەکێک لەو کۆرپەلانە دیار بوو زۆر ماندوو و شەکەت بوو بۆ هاتنە دەرەوە و هەر چەندی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی وەک خوشک و براکانی تری بە ئاسانی بێتە دەرەوە. زاناکە ویستی یارمەتیی بدات بە ئامێرێکی وردی تایبەتی توێکڵی هێلکەکەی کەمێک لێک ترازاند تا ڕێی بۆ خۆش بکات ئەویش بەئاسانی بێتە دەرەوە. هاتە دەرەوە بەڵام لە بەدبەختیی خۆی هەموو پەپوولەکانی تر فێرە فڕین بوون و لە شەقەی باڵیان دا کەچی ئەو هەرگیز و هەتا مرد نەیتوانی فێرە فڕین ببێ. ماسولکەکانی باڵی ئەو پەپوولەیە بەتەواوی و بە شێوەیەکی سروشتی هێشتا پێ نەگەیشتبوون توێکڵی هێلکەکەی بشکێنن تا بێتە دەرەوە، ئەو هێشتا کەمێک یان چەند خولەک و چرکەیەکی مابوو بێتە دەرەوە. جا چونکە فاکتەرێکی دەرەکی یارمەتیی دابوو و ڕۆڵی

ئەو ماسولکانە هێشتا پرۆسەی هێز و توانای فڕینیان تەواو نەکرابوو ئیتر توانای ئەوەیان نەبوو یارمەتیی فڕینی بدەن. بە ئینگلیزی بەم پرۆسە بەرەبەرە تەدریجییە سروشتییە دەگوترێ ئیڤۆلیوشن evolution کە پێچەوانەی ریڤۆلیوشنە revolution.

ئەمڕۆ لە دیموکراسییەکانی رۆژئاوا ئەوەندە کەیفیان بە وشەی ریڤۆلیوشن (شۆڕش) نایە چونکە ئەزموونی خراپیان لەگەڵ هەر هەموو ریڤۆلیوشنەکانی مێژووودا هەیە کە تەنها کارەساتیان ئەنجام داوە و هەر هەمووشیان فاشیل دەرچووین. ئەوانە دەڕواننە شۆڕشی فرانسی 1789 کە نەپۆلیۆنی لێ زا و خۆی کرد بە ئیمپراتۆرێکی دیکتاتۆر و ماڵوێرانی و نەهامەتیی بەسەر هەموو ئەورووپادا هێنا و دواییش شکستی هێنا ئینجا دانیشتن وەزعەکەیان گەڕاندەوە بۆ دۆخی پێش شۆڕشەکە. دەڕواننە شۆڕشی بۆلشیڤیک ئەویش بۆ ماوەی حەفتا ساڵێک میللەتانی سۆڤیەت و دواتریش ئەوانەی ئەورووپای رۆژهەڵاتیشی لەپشت پەردەیەکی ئاسنین زیندان کردبوو لە ئاخیریش فەشەلی هێنا و هەموو سیستەمەکە لەسەر تا بەخوار داتەپی. لە تورکیاش دوای پتر لە نەوەت ساڵ قەدەغەکردنی ئیسلام وا ئەمڕۆ پارتییەکی ئیسلامی AKP هاتووەتەوە کۆڕی مەیدان و دەنگ زیاتر دێنێ لە پارتییە سێکولارە خاوەن شۆڕشەکەی ئەتاتورک CHP. دەڕواننە شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران کە خەڵکەکە وا زیڕەیان دێت و هەزار رەحمەت بۆ گۆڕی حەمەرەزاشا دەنێرن. دەڕواننە جەمال عەبدولناسری میسری و چواردەی تەمووزی عەبدولکەریم قاسمی عیراق و شۆڕشی بەعسییەکانی عیراق و سووریا کە ئەمڕۆ میللەتەکانیان وا هەزار رەحمەت بۆ گۆڕی مەلیک فاروق و مەلیک فەیسەل و نوری سەعید دەنێرن. دەڕواننە شۆڕشی فیدێل کاسترۆی کوبا کە کردنەوەکەی ئەم دواییەی سەرۆکی ئەمەریکی باراک ئۆباما بە رووی هاڤانا و ئاشتبوونەوەی ئەمەریکا لەگەڵ کوبا هێندەی یەک دونیا دڵی میللەتی کوبای خۆش کردووە کە لەمێژە بە ئاواتی رۆژێکی ئەوها بوون و راستییەکەی

لـەوەش زیاتریـان دەویَ چونکـە بێـزار و وەڕز بووینـە لـە شۆڕشـێکی شکسـتخواردووی بـێ بـەر و بەرهـەم. بەکورتـی، وا دەردەکەوێـت کـە هیـچ شۆڕشـێک بـەو مەفهوومـەی لـە سـەرەوە باسـمان کـرد سـەر ناگرێت و سـەرەنجامەکەی رووخانێکـی مسـۆگەرە و کارەسـات و نەهامەتییەکـی گـەورەش لەپـاش خـۆی بەجـێ دێڵێـت .

لەپـاش دەسـتپێکردنی یەکـەم جەنگـی جیهـان 1914 و سـێ سـاڵ دواتریـش بەرپابوونـی شۆڕشـی بۆڵشـێڤیک 1917 لـە روسـیا فەیلەسـوفی مارکسـی کارل کاوتسـکی Karl Kautsky (بـە رەچەڵـەک نەمسـاوی - چێـک)، کـە هەتـا هەینـێ گـەورە بیرمەنـد و تیئۆریسـتی مارکسـیزم بـوو، کەوتـە رەخنـە و هێرشـی تونـد لـە دژی (شـۆڕش - ریڤۆلیوشـن) و شۆڕشـی بۆڵشێڤیکیشـی بـە هەڵەیەکـی زۆر گـەورە ناسـاند. کاوتسـکی تیئۆرییەکـی نوێـی دانـا کـە راسـتترە کۆمەڵـگا بـە رێـگای (بەرەبەرەیەکـی سروشـتی - ئیڤۆلیوشـن evolution) نـەک (ریڤۆلیوشـن)ەوە بگـۆڕێ. لێنین و ترۆتسـکی کەوتنـە دژایەتیکردنـی، بـە هەڵگـەڕاوە (مرتـد renegade) یـان دانـا و لێنیـن سـاڵی 1918ناملیکەیەکـی لـە دژی کاوتسـکی نووسـی بـە نـاوی:

The Proletarian Revolution and the Renegade Kautsky

واتـا (شۆڕشـی پرۆلیتـاری و کاوتسـکی هەڵگـەڕاو) و چـی خراپـە پێـی کرد.

لـەو رۆژەوە ئیتـر دیمۆکراسـیە رۆژئاواییـەکان ئـەم تیئۆرییە ئیڤۆلیوشـنەی کاوتسـکییان قوازتووەتـەوە و کردوویانـە بـە دروشـمی خۆیـان و هەمـوو پارتییـە سۆسـیال - دیمۆکراتـەکان و پارتییـە مەیلـە و چەپـڕەوەکان باوەڕیان بـە ریڤۆلیوشـن نەمـاوە بەڵکـو پەیـڕەوی ئیڤۆلیوشـن دەکـەن. ئەوانـە دەڵێـن مێـژوو دەریخسـت کـە (دیمۆکراسـی) و (شـۆڕش) زۆر لێـک دوورن.

جـا سـەیر ئەوەیـە کـە حزبەکانی کوردسـتان هـەم خۆیان بـە دیمۆکرات هـەم شۆڕشـگێڕ دادەنێـن کـە ئـەم دوانـە لـە راسـتیدا دووسـەلکە بەرانـی نـاو یـەک مەنجەڵـن. هەیکەلـی ناوخـۆی حزبە کوردسـتانییەکان هێشـتانیش

هەر لەسەر بناغەی هەیکەلی حزبی شیوعیی لینین دارێژراون کە ناوکاکڵێک لەخۆ دەگرێت بەناوی (مەکتەبی سیاسی politburo) کە ئەمرۆ هیچ پارتیەکی دیمۆکراسییە رۆژئاواییەکان شتی وای نییە. ئەم تێرمە تایبەتە بە ئەحزابی شیوعی.

ئینجا با بێمە سەر وشەی (تمرد)ی عەرەبی کە کورد پێی ناخۆشە (متمرد)ی پێ بڵێن و کەیفی بە وشەی (شۆڕشگێڕ) دێ. وشەی ئینگلیزی بۆ ئەم تێرمە rebellion ,revolt , insurgence ,mutiny (ئەمەی دواییان بۆ بزووتنەوەیەکی سەربازی لە دژی دەسەلات بەکار دەهێنرێت) و زۆر تێرمی تریش هەیە وەک upheaval واتا (رابوون) کە هەمووشیان واتاکانیان لێک نزیکن. تۆ کە بە بێدادی و ناهەقییەک رازی نیت ئەگەر توانیت نارەزاییەکەت بە شێوەیەکی ئاشتییانە بۆ چارەسەر بکرێت ئەوە باشە ئەگەر نا ناچار دەبی دەست بۆ چەک ببەیت تا ئەو ناهەقییە نەهێلیت. بەڵام مەرج نییە مەبەستت گۆڕینی سیستەمی سیاسی و سەربازی و ئابووری و پەروەردە و کۆمەڵگا بێت. تۆ (تمرد) بۆ بەدەستهێنانی چەند داواکاریی خۆت دەکەیت ئەگینا کێ حەزی لە شەڕە. مێژووی کورد پڕە لە بزووتنەوەی چەکداری و ئێمەش هەر هەموویمان بە شۆڕش لەقەڵەم داوە هەرچەندە کە داواکارییەکانمان زۆر سادە و سنووردداریش بووینە و چ داوای گۆڕانێکی رادیکاڵی لە رەگوڕیشەی دەسەلاتی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵگاشمان نەکردووە. بۆیە ئەگەر تێبینیت کردبێت دەبینی من هەمیشە تێرمی (بزووتنەوەی چەکداری) یان (بزووتنەوەی رزگاریخوازی)م لەجیاتی شۆڕش بەکار هێناوە. دەشزانم لەوانەیە خەڵک پرسیار بکەن بۆچی ناڵێم شۆڕش. بەڵام تۆ ئەگەر بتەوێ بە راشکاوی باسی جیابوونەوە و سەربەخۆیی نیشتمانی بکەیت ئەوە ناوی بنێ (شەڕی سەربەخۆیی) یان (خەباتی سەربەخۆیی) وەک کە ئەتاتورک خەباتەکەی خۆی ناونا (حرب استقلال) چونکە ولاتەکەی لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهانەوە داگیر کرابوو و ئەو خەباتی

دەکرد سەربەخۆیی وەدەست بێنێتەوە. کە سەر کەوت ئینجا کردی بە شۆڕشێکی هەمەگر و بەڕاستیش بوو بە شۆڕش بەو مەفهوومەی کە لەسەرەوە باسم کردووە.

ئەمن پێم وایە کورد لەم قۆناخەدا چاکترە دەستبەرداری وشەی شۆڕش ببێت کە لەجێی خۆی نییە و تەنها لە دیکتاتۆرییەتمان نزیک دەکاتەوە و ولاتانی رۆژئاواشمان لێ دەرەوێنێتەوە. دەسەلات شۆڕش وەک ئایدیۆلۆژی بەکار دەهێنێت و هەر کەسێ دەمی رەخنە بکاتەوە پێی دەلێن تۆ دژی شۆڕشیت، ئیتر ئەمە لای دەسەلات دەبێتە ئامێرێکی شەرعیی پشتئەستوور بە پاساوی ئایدیۆلۆژی بۆ سەرکوتکردنەوەی خەلک.

دکتۆر مەهدی محەمەد قادر
مامۆستای مێژوو - زانکۆی سەلاحەدین

تەلعەتی مشیری برایم ئاغای دزەیی
2007 - 1929

شێخ مەحموودی حەفید

سەید تەهای نەهری

مشیری برایم ئاغای دزەیی
1945 - 1900

مستەفا بارزانی

شەریف پاشای خەندان

پاشای کوڕی خدری ئەحمەد پاشا

بارزانی (سێیەم دانیشتوو لە چەپەوە) لە شەقڵاوە

مەلیک عەبدولعەزیز ئال سعود

شەریف حوسێنی حیجاز

عیزەدینی مەلا فەندی

ئیبراهیم ئەحمەد

مەلا صدیق

ڕەفیق حیلمی

شێخ لەتیف

حوسێن حەلاق

ئەحمەد حەمەدەمین ئاغای دزەیی (برای هۆمەر دزەیی)

مارفی حاجی پیرداود ئاغای دزەیی

حوسێنی مەلای دزەیی

حاجی کاکەحمەد ئاغای دارەتووی دزەیی

ئەحمەد حەمەد ئەمین دزەیی

موحسین دزەیی (برای هۆمەر دزەیی)

مام جەلال، لە نێوان هۆمەر دزەیی و دێدەوانی ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی

کاکە زیادی حەماغای کۆیە

شێخ لەتیفی شێخ
مەحموودی حەفید

برایمی عەلی حەمەداغای
دزەیی

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: قەدری جەمیل پاشا، هۆمەر دزەیی، عوسمان سەبری

لە چەپەوە: مەسعوود محەمەد، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی و موحسین دزەیی

قازی محەمەد

جەمال عەبدولناسر

كامل الچادرچی

ڕەشید عارف کۆیی

میکۆیان سەرۆکی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران

حەمەد ئاغای مێرگەسووری لەگەڵ دیبلۆماتی ئەمەریکی ولیام ئیگڵتن

دیپلۆماتی بەریتانی ئێدمۆنز نووسەری کتێبی "کورد و تورک و عەرەب"

ئەحمەد حەمەد ئەمین دزەیی و کاکەزیادی کۆیە

نەخشەی دوو دەوڵەتی ئیسرایلی و فەڵەستینی بە بڕیاری UN ـ 1947

گۆڤاری زاری کرمانجی

یەکێک لە نەخشەکانی سایکس - بیکۆ بۆ دابەشکردنی میراتی عوسمانی

# بەشی 4

## باوانم

لەپاش ئەو نمایشکردنە دوورودرێژەی لە پێشاندا هەواری دزەییەکان و لە پاشانیش مێژووی بنەماڵەی دزەیی باب و باپیرانم ئەوجا وا خەریکە نزیک دەبمەوە لە گێڕانەوەی سەربردەی ژیانی خۆم. بەڵام دەمەوێ ئەوەش بزانن کە من چون تەنیا لە باوکەوە دزەییم و لە دایکمەوە بەرزنجەییم بۆیە باکگراوندەکەم کامل نابێ ئەگەر سەرجەلەی ئەو بەرەبابەی بنەماڵەی بەرزنجیش نەخەمە روو کە باب و باپیرانی دایکمن و هەڵبەتا هی خۆیشم.

بێ گومان ئێستا خوێنەرە بەرێزەکانم رەنگە بڵێن: "بە هەزار فاتیحا و قولوەڵلا رزگاریمان لە دزەیی بوو ئێستا نۆرەی بەرزنجییە، هەر ئەوەمان پێ دەویست !". دووریش نییە زۆرێک لەم خوێنەرانەم ئیتر پشت لە بەردەوامبوونیان لە خوێندنەوەی ئەم بیرەوەرییانەم بکەن. بەڵام بۆ دڵدانەوەی ئەوانە دەڵێم: نانا نیگەران مەبن من هەرخۆیشم ناوێرم خۆم لە قەرەی بەرزنجییان بدەم هەر وەک کە نەوێرام خۆم باوێمە ناو مێژووی خەباتی دوور و درێژی بارزانیشەوە. بەڵام چون لە هەموو دونیادا وا باوە کە بەشیکی تەواوکەری بیرەوەری نووسینەوە بایۆگرافیی نووسەرەکە خۆیەتی کە باب و باپیرانیشی لەخۆ دەگرێت. ئەگەر نووسەر باکگراوند و بایۆگرافی خۆی لێک گرێ بدات ئەوسا وێنەیەکی باشتر دەخاتە بەر چاوی خوێنەر. بۆیە تکایە لێم نەگرن و ئارامتان ببێ کە ناچارم ماوەیەکی کەمی تریش هێسکی خۆم گران بکەم ئەگینا نووسینەکەم ناتەواو دەردەچێت. وەک کە پێشتر باسم کردووە خەباتی مەلا مستەفای بارزانی مێژوویەکی تایبەتە و بە

سەدان کتێب و گوتاری بە زمانی جیاجیای جیهانیی لەسەرا نووسراوە. مێژووی ساداتی بەرزنجەش رەنگە پەلوپۆی هاوێشتبێتە ناو هەر چوار پارچەی کوردستانەوە. لەبەر ئەوە لە توانای مندا نابێت خۆم تووشی ئەو گێژەنە قووڵەش بکەم و دەبێ لە کورتی بیبڕمەوە.

لە پێشاندا با بە باوانی خۆمەوە دەست پێ بکەم.

## حەمەدەميناغای حاجی بایز اغای دزەیی

**(1888 - 1936)**

(باوکی ئەحمەد و محەمەد و عوسمان و قەدریە و نەجیبە و ئەنوەر و موحسین و سەعدی و هۆمەر دزەیی، نۆ منداڵ)

ئەمن لەباوکمەوە ئەوها دەگەمەوە قەرەنی ئاغای باپیرە هەرە گەورەی هەموو دزەییەکانی هەولێر: عومەر حەمەدەمین بایز حەوێز حەسەن مەحمود قەرەنی. کەواتە بە پێنج پشت دەگەمەوە قەرەنی ئاغای دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە کە لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا هاتۆتە ئەم دەشتی هەولێرە (بڕوانە بەشەکانی پێشووی ئەم بیرەوەریانە.) حەمەدەميناغای بابم برا بچووکی پێنج کوڕ و دوو کچی بایزاغا بووە کە ئەمانە بوون: برایماغا، خورشیداغا، ئەحمەداغا، رەحماناغا، حەمەدەميناغا، زرێخ، عەیشێ. بەداخەوە خورشید اغای مامی لێ بترازێ ئەوانی دی نە بابم نە هیچ یەکێک لەو خوشک و برایانەی هیچ وێنەیەکیان لە پاش بەجێ نەماوە و چونکە من پاشبابیشم (کە بەچەند مانگێک لەپاش مردنی باوکم لە دایک بوویمە) بۆیە هەر نازانم شێوەشی چۆن بووە. تەنها دوو سەرچاوە بە نووسین لەسەر باوکم ماوە یەکەمیان ئەو چەند وشە کەمەی ئەفسەری ئینگلیز (کاپتن هێی)یە کە لە لاپەڕە 273 - 272 ی کتێبەکەی Two Years in Kurdistan دا دەڵێ " Muhammad

واتـا " Amin Agha , a handsome, finely built man of thirty " محەحـەد ئەمیـن ئاغـا پیاوێکـی شـۆخی بەژنوبـالا رێکـی سـی سـاڵیە". دووەمیشـیان بیرمەنـدی گـەورە جەنابـی کاک مەسـعود محەمـەدە لـە کتێبـی ( گەشـتی ژیانـم، چاپـی دووەم، کوردسـتان 2005 ) کـە دێتـە سـەر لاواندنـەوەی کاک ئەحمـەدی کاکـم بـەم شـێوەیە باسـی بابیشـمان دەکات " ... حەمەدەمیناغـا باوکـی کـە لـە تافـی هەڵچوونیـدا مـەرگ پێچایـەوە نیهـاد پاکێـک و نیـک نەفسـێکی ئەوتـۆ بـوو کـە هـەر خـۆی بتوانـیّ ئەحمـەدت لەبیـر باتـەوە... " هەڵبـەت لـە خوشـک و بـرا لـە خـۆم گەورەتـرەکان و خـزم و کەسـوکار و یـار و یاوەرانـی سـەردەمی بابیشـم بیسـتووە کـە بەڕاسـتیش وابـووە و پیاوێکـی ئـاکار و جەسـتە جـوان بـووە.

باوکـم بەداخـەوە زوو کۆچـی دوایـی کـردووە (1936 - 1890) واتـا تەمەنـی هـەر چـل و شـەش سـاڵ بـووە و دەڵێـن بـە هێرشـی دڵ مـردووە.

تاکـە یـادگاری کـە مـن بـە رۆحـی باوکمـەوە ببەسـتێتەوە یـەک ئەنگوسـتیلەی زۆر سـادەی زیوینـی قـاش پیـرۆزەی شـینە کـە باوکـم لـە پەنجـەی دەکـرد و دایکـم لای خـۆی هەڵـی گرتبـوو. شـینایی بەشـێکی بچووکـی پیرۆزەکـە کەمێـک تاریکتـرە. کـە مـن لـە سـاڵی 1955 کوردسـتانم بەجـیّ هێشـت دایکـم ماچـی کـردم و ئەنگوسـتیلەکەی لـە پەنجـەم کـرد پێـی گوتـم: "رۆڵـە، تـۆ باوکـت نەدیـوە، بـا ئـەم ئەنگوسـتیلەیە یادگاریـی ئـەو بـیّ بـۆ تـۆ، بیپارێـزە خـوا بتپارێـزیّ" منیـش لەوسـاوە وەک پارچەیەکـی رۆحـم، وەک تالیسـمان (talisman) هەڵمگرتـووە هەرچەنـدە کـە بـۆ ماوەیەکـی زۆر کورتیـش لـە پەنجـەم کـرد چونکـە بەڕاسـتی ئەمـن هەرگیـز حـەزم لـە ئەنگوسـتیلە نەبـووە بـۆ پیـاو. دایکـم پێشـتریش کـە هێشـتا لـە پۆلـی شەشـی سـەرەتایی بـووم ئەنگوسـتیلەیەکی زێـڕی بـۆ کردبـووم کـە (عمـر محمـد امیـن) بـە مینـای رەنگاوڕەنگـی لەسـەرا هەڵکەندرابـوو ئەویشـم دوای ماوەیـەک لـە پەنجـەم کـردەوە و ئێسـتا لەگـەڵ ئـەوەی باوکـم لـە شـوێنێکی بـاش هەڵمگرتـوون. تەنانـەت ئەڵقـەی مارەیـی خۆیشـم دوای ماوەیەکـی کـورت رۆژێکیـان

لەگەڵ هاوسەرەکەم لە مەلەگایەکی شاری ڤیەننا مەلەمان دەکرد لەناو مەلەگاکە لێم کەوتە نا ئاو و زۆر بە دوایدا گەڕاین بۆمان نەدۆزرایەوە، ئیتر هاوسەرەکەم تێ گەیاند کە بمبووریٚ ئەمن هەر خۆم حەزم لە ئەنگوستیلە نەبووە بۆ پیاو، دیارە وا خوا بۆ خۆی بردەوە. دوور نییە ئازادی هەر بە زگماک تیکەڵ بە خوێنم بووبێ بۆیە حەز ناکەم بە هیچ شێوەیەک کۆتوبەند بکرێم.

یادگارێکی زۆر نایابی دیکەش لە باوکمانەوە بۆ هەموومان مابۆوە و ئێستاش خەمی بۆ دەخۆین کە لە دەستمان دا. رەختێکی زیوینی زۆر نایابی سینگ و بەرەی ئەسپەکەی بابم مابوو کە بە وەستاکارییەکی زۆر سەیر بە زرەوپۆلیە و پلپلە و یاقووت و پیرۆزە و بەردی بەهادار و قاشی رەنگاورەنگی بریسکەدار رازابۆوە و سینگ و هەردوو لاپیلی ئەسپەکەی دادەپۆشت وەک ئەوانەی کە لە فیلمە تاریخییەکانی هۆلیوودا دەیانبینین. ئێختیارەکانی گوندەکەمان دەیانگێڕایەوە کە هاڕەی ئەو هەموو زرەوپۆلیەی بەربەنەکەی ئەسپی حەمەدەمیناغا لە دووریی ئاواییەوە دەبیسرا. داخی بە جەرگم ئێمەی کوڕەکانی بە منداڵی و لەپاشانیش کە مۆدەی ئەسپسواری بەسەر چووبوو ئۆتۆمۆبیل خەریک بوو شوێنی دەگرتەوە، هێشتا ئەو تێگەیشتنەمان پەیدا نەکردبوو نرخی مەعنەویی ئەو پارچە گەنجینە مێژووییە بزانین. هەڵستاین ناردمان بۆ بەغدا بۆمان بشکێننەوە بیکەن بە تاقمی کەوچک و چەقۆ و چەنگاڵی زیوین و ناوی ئێمەی لەسەرا هەڵکەنن. هەر واشی لێ هات و ئێستاش ئەمن چەند دانەیەک لەو کەوچکە چکۆلانەکانم هەڵگرتووە کە ناوی منیان (عمر دزدەی) لە پشتەوەکەی لەسەر هەڵکەندراوە و نەخشی پێشەوەشیان (کاروانی حوشتر) و (تاقی کیسرا) و (چەند بەلەمێکی ناو زێی دیجلە)ن. دەوجا وەرە خەم مەخۆ! خۆ ئێستا ئێمە چاک دەزانین کابرای زیوینگری بەغدا (سوببە مەندائیەکان) کە ئەو بەربەنە نایابەی بۆ چووە خەنی خۆشی بووە و ئێمە دڵنیاین کە ئەم پارچە ئانتیکەی نەشکاندووەتەوە بەڵکو بۆخۆی بە نرخێکی زۆر بەرز

فرۆشتوویەتیە توریستە بیانیەکانی بەغدا و هەر بە زیوی خۆی ئەو کەوچک و چەنگاڵانەشی بۆ ئێمە دروست کردووە کە لە راستیدا ناگاتە بەشێکی بچووکی ئەو هەموو زیو و یاقوت و قاشی بەقیمەتی رەختەکە. پەککو ئێمە هەنگی چەند کەمزان بووینە!

ئەوە حەمەدەمیناغای دزەیی بابم بوو.

## دایکم، کافیە خانی شێخ مارفی شێخ کەریمی بەرزنجی

**1900 - 1963**

لە دایکیشمەوە، کە لە ساداتی بەرزنجی بوو، ئەمن دەگەمەوە شێ حەسەنی گڵەزەردە کە باپیرە هەرە گەورەی دایکمە لە باوکییەوە، بەم سەرجەلەیە: عومەری کافیەخانی شێخ مارفی شێخ کەریمی شێخ ئەحمەدی شێخ عەبدولکەریمی شێ حەسەنی گڵەزەردە. کە دەکاتە پێنج پشت تا باپیرە گەورەم لەلای دایکمەوە. بەڵام با جارێ کورتەیەکی ژیانی کەسایەتیە ناودارەکانی باپیرە بەرزنجییەکانم بخەمە روو بەر لەوەی باسی کافیەخانی دایکم بکەم. کەمێک دواتر باسی دایکمە بە درێژیتر.

شێ حەسەنی گڵەزەردە (باپیرە گەورەی کافیەخانی دایکم لە باوکییەوە)

زانای گەوری کورد جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە کتێبی بە زمانی عەرەبی (علماؤنا فی خدمة العلم والدین) لە لاپەڕە 159 - 163دا ئەمەی لەسەر شێ حەسەنی گڵەزەردە نووسیوە و ئەمە کودییەکەیەتی "... شێ حەسەنی کوڕی شێخ محەمەدی بەرزنجی شێخێکی بەرز و زانایەکی گەورەی خانەدان بووە لە گوندی گڵەزەردە دادەنیشت و هەر لەوێش وەفاتی کردووە. کوڕی شێخ محەمەدی

نۆدێ کوڕی شێ عەلی وەندەرینی کوڕی شێخ بابەرەسوڵی بەرزنجی بووە، خوا لە هەموویان خۆشبێ. لە نزیکاتی ساڵی هەزار و هەشتا و هەشتی کۆچی لە گوندی (نۆدێ) ناحیەی شارباژێر لە دایک بووە. مناڵێکی بەختەوەر و بە ئەسل و فەسل و خانەدان و نەجیبزادە بووە بەڕەوشت و ڕەفتارێکی زۆر بەرز و هەڵسوکەوتی زۆر گران و سەنگین..."

شێخ حەسەن نەک هەر زانایەکی ئایینی بووە، بەڵکو شارەزایەکی زۆر وردبینی گۆڕانی کاتەکانی شەو و ڕۆژ بووە و نەخشەیەکی مەشهوری دروست کردبوو بۆ ئەم مەبەستە. جەنابی مەلا عەبدولکەریم دیسان دەڵێ "کولانکەی لە مزگەوتەکەی خۆی لە گڵەزەردە کردبۆوە کە بەو شێوەیە بۆی دەردەکەوت کەی وەرزەکان دەست پێ دەکەن و کەی کاتی نوێژەکردن دێ لە هەر وەرزێکدا .." هەڵبەت بۆ ئەو زەمانە کە کاتژمێر (سەعات) نەبووە، ئەمە بەڕاستی دۆزینەوەیەکی زانستیی زۆر گرینگ بووە.

یەکێک لە نەوەکانی شێ حەسەن (شێخ ئەحمەدی کوڕی شێ عەبدولکەریمی شێ حەسەن) ئەویان هاتووەتە کۆیە، لەوێ نیشتەجێ بووە و بنەماڵەی گڵەزەردەیەکانی کۆیەی دامەزراندووە.

شێ حەسەنی گڵەزەردە مامی بابی شێخ مارفی نۆدێ بووە کە ئەمەشیان باپیرە هەرە گەورەی شێخ مەحمودی حەفیدە.

شێخ مارفی باپیرم (بابی دایکم) کە کوڕی شێخ کەریمی شێخ ئەحمەدی شێخ عەبدولکەریمی شێ حەسەنی گڵەزەردە بووە لە سەردەمی عوسمانلی لە کۆیە رایکردووە چووەتە هەڵەت و هەردەکانی گوندی هەڵەجە و دەوروپشتی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی هەولێر. بۆچی باپیرم کۆیەی بەجێ هێشتووە؟ ئەمەیان لەم چیرۆکەدا بەدەردەکەوێ.

## شێخ مارفی شێخ کەریمی بەرزنجی، ناسراو بە (شێخ مارفی هەڵەجە، بابی دایکم)

**1862 - 1930**

شێخ مارف کوڕی شێخ کەریم کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەیە. شێخ ئەحمەدی باپیری بە داخوازیی شێخ مارفی نۆدێ کە خاڵی بووە، گلەزەردە جێ دێڵێت بۆ کۆیە بۆ یەکجاری لەوێ نیشتەجێ دەبێت و لەوێوە ئیتر ئەم لکەی درەختی ساداتە بەرزنجییە گلەزەردەییەکان دەبن بە کۆیی. بەڵام بۆچی شێخ مارف لە کۆییەوە بوو بە هەڵەجەیی؟ چیرۆکی ئەمەش دیسان لای شێخ جەنگی تاڵەبانییە، براگەورەی مام جەلال، یادیان بەخێر هەموویان.

گوندی هەڵەجە بە چوار پێنج کیلۆمەترێک کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ناحیەی قۆشتەپە. لە سەردانێکم بۆ لای کاکە شێخ جەنگی تاڵەبانی لە تەکیەکەی خۆیان لە کۆیە کە بە تەکیەی تاڵەبانییان ناسراوە، شێخ جەنگی ئەم چیرۆکەی شێخ مارفی باپیرمی بۆ گێڕامەوە. بێجگە لە شێخ جەنگی هەندێ لە خزمە خاڵوانەکانم ئەوانیش شتێکیان لەبارەی هەمان چیرۆک دەزانی و بۆیان تەواو کردم.

دەڵێ شێخێکی نووشتەکەری فێڵباز لە کۆیە پەیدا بووبوو کە کەس نەیدەزانی کێیە و لە کوێوە هاتووە (لەوە دەچێ ئەمە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بووبێ). دەڵێ ئەو شێخە سێ کەوای لەسەر یەک لەبەر دەکرد و مێزەرێکی گەورەی لەسەری دەپێچایەوە بۆیە لە کۆیە ناوی بە (شێخی سێ کەوا) دەرکردبوو. جەنابی شێخی سێ کەوا بە نووشتە و قسەی پڕوپووچ خەڵکێکی زۆری لە کۆیە و دەوروپشتی هەڵخەڵەتاندبوو و لە هەموو لایەکەوە دیاریی بۆ دەچوو. شێخ کەریمی باوکی شێخ مارفیش کە نەوەی

شێ حەسەنی گڵەزەردەی عالیم بوو دەیزانی ئەو کابرایە بە فڕوفێڵ ئەو خەڵکەی فریو داوە هەڵدەستێ ڕای دەگەیەنێ کە ئەوە شێخی بەڕاستی نییە و تەنیا زمانلووسێکی درۆزن و حوقەباز و ساختەچییە و هیچی تر. خەڵکی کۆیە کە ڕێزی تایبەتییان بۆ بنەماڵەی ساداتی بەرزنجەی گڵەزەردەیی هەبوو یەکسەر پشت لە شێخی سێ کەوا دەکەن. ماوەیەکی پێ دەچێ نە دیاری دەهات بۆ شێخی سێ کەوا نە کەس باوەڕی پێ مابوو و بەم جۆرە دەکەوێتە بارێکی گوزەرانی زۆر خراپەوە. بەبێ دەرامەت و لاتی دەچێتە تەکیەی تاڵەبانییان لە کۆیە لەوێ دەبێتە چایەگێڕ. جا شێخ جەنگی دەڵێ ڕۆژێکیان شێخ کەریم و شێخ مارفی کوڕی دەچن بۆ تەکیەکەیان. کە دادەنیشن شێخی سێ کەوا چایان بۆ دەبات بەڵام کە دەگاتە بەردەم شێخ کەریم چایەکە دادەنێت هەڵدەکێشێتە خەنجەر و وەری دەگەڕێنێ. شێخ کەریم پەلەواز دەبێتەوە دەڵێتە کوڕەکەی کە لە دوورەوە وەستابوو "کورە مارف بمگەیێ خۆ منی کوشت". شێخ مارف کە دەبینێ باوکی وا لەناو خوێنا دەگەوزێ ئەویش تاو دەداتە شێخی سێ کەوا بە خەنجەران دای دەڕسێنێ. خولاسە شێخ کەریم چا دەبێتەوە بەڵام سێ کەوا دەمرێت و شێخ مارفیش دەبێتە پیاوکوژ.

شێخ مارف ناچار لە ترسی گرتن و حوکمی قەرەقوشی عوسمانلی خۆی دەشارێتەوە هەڵدێ دەچێتە گوندی (میرەکان)ی شێخ عەلیی خزمی خۆی لە ناحیەی قوشتەپە. ئەو ناوچەیە کە لەلایەن سەوادی دانیشتوانەکەیەوە (پشت ڕێ)ی پێ دەگوترا هەم هەندێ گوندی ئاغاکانی دزەیی لێ بوو هەم عەشیرەتی مەنتک و کورد و گەردی، بەڵام شێخ عەلیی (میرەکان) شێخێکی زۆر ناسراو و زۆر دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتووش بووە لە ناوچەکە. شێخ مارف یەک ساڵ لای ئەو خزمەی وەک پەنابەر دەمێنێتەوە ئینجا شێخ عەلی کە سێ کچی هەبووە کوڕی نەبووە، کچەکانی یەکێکی دابووە سمایل ئاغای مەنتک ئەوی تریانی دابوو بە حاجی نادری برای ئەحمەد پاشای

دزەیی و دواتریش بە شێخ مارف دەڵێ کە لای خۆی داڵدەی دابوو دەڵێ ڕۆڵە من کورم نییە تۆ ببە بە کوڕی من و با کچی سێیەمیشم (کولسوم خان) بۆ تۆ بێت و لێی مارە دەکات. لەپاش شووکردنی کولسوم خان بە شێخ مارفی باپیرم، کە دایکی دایکی من نەبووە، ئیتر هەر بە (دایەگەورە) بانگ دەکرا چونکە یەکەم ژنی شێخ مارف بووە. دەڵێن هەر شێخ عەلی خەزووریشی گوندی هەڵەجەی بۆ دەکڕێت و شێخ مارف تەکیەی خۆی لەوێ دەکاتەوە. گوندەکانی ئەو ناوە کە ئێستا هی نەوە و خزم و کەسی شێخ مارفن پێشتر بە زۆری هی شەبەک و موسڵاویان بووینە بەڵام خۆیان لەوێ دانەدەنیشتن بەڵکو هەر لە زەمانی عوسمانلی وەک لەوەڕ و چێرگە بۆ مەڕوماڵاتەکانیان کڕیبوو. شێخ مارف کە پیاوێکی هەم دیندار هەم زۆر سیاسی و دیپلۆماسی بووە ئەویش وەک شێخ عەلیی میرەکان ناوبانگێکی باش لەو ناوچەیە پەیدا دەکات و کەسایەتیی ناوداری عەشایر و شارستانیش خۆیانی لێ نزیک دەکەنەوە. دەڵێن حاجی سادقی خەزنە (باپیری کەسایەتیی ناسراو کاک فاروق جەمیل) کە لە شێخ مارف زۆر نزیک بووە و چونکە گوندەکانی (گوندەکانی حاجی سادق) نزیکی گوندەکانی شەبەک و هەندێ گوندی موسڵاویان بوون، ئەو یارمەتیی شێخ مارفی داوە بۆ کڕینی چەندین گوندی دیکەی موسڵاوی و شەبەکان لە ناوچەی قوشتەپە. دەشڵێن سولەیمانی باوکی خاڵە ئەحمەد تەبیبی نانەکەلی کە دەکاتە باپیری فوئاد ئەحمەدی هونەرمەند و دانیشتووی گوندی بنەسڵاوە بووە دەڵێن ئەویش یارمەتییەکی زۆری شێخ مارفی داوە بۆ کڕینی - یان هەر بەدیاری وەرگرتنی - ئەو گوندانەی موسڵاوییان و شەبەکان بۆ شێخ مارف. بەم جۆرە شێخ مارف کە لە چەند لایەکەوە باروبوو دەکرێ ئەویش وەک ئاغاکانی ئەو ناوە دەبێتە موڵکدارێکی گەورە و دەستڕۆیشتوو. وەک کە جاران لە کوردستان جار نا جار کێشە لەسەر دەسەڵات و بەرژەوەندیی بەگژیەکداچوویی لەنێوان ئاغا و

شێخان ڕووی دەدا، شێخ مارفیش کێشەی لەگەڵ ئاغاکانی دزەیی پەیدا دەبێ بەتایبەتی لەگەڵ بەرەبابی کاکەخان کە گوندەکانیان بەتایبەتی گوندی بێستانە هاوئاقار بوون لەگەڵ ئەو زەوی و گوندانەی کە شێخ مارف کڕیبوونی یان بەدیاری پێشکەشی کرابوون یان هەر خۆی دەستی بەسەردا گرتبوون. شێخ مارف لێرەدا - شێخ عەلیی خەزووری ئاسا - دیپلۆماسیەتێکی زۆر سەرکەوتوو بەکار دێنێت. کچێکی خۆی دەدا بە ئەحمەد عوسمانی ئامۆزای مەلافەندیی هەولێری، دوو کچیشی دەدا بە دوو برای برایماغای بایزی دزەیی، ڕەحماناغا و حەمەدەمیناغای باوکی هۆمەر دزەیی. بەم جۆرە شێخ مارف پشتیوانیی هەم بنەماڵە دەستڕۆیشتووەکانی ناو شاری هەولێر و هەم عەشرەتی بەهێزی دزەیی بۆ خۆی مسۆگەر دەکات. پێشتریش پشتیوانیی عەشرەتی (مەنتک)ی بە ڕێگای سمایل ئاغای هەوەڵزاوایەوە مسۆگەر کردبوو و لەبەرئەوەی کە خزمایەتییەکی نزیکیشی لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیدا هەبوو ئیتر بوو بە کەسایەتییەکی کاریگەری دینی و دونیایی لەو ناوچەیەدا.

هاوسەری دووەمی شێخ مارف لەپاش کولسوم خانی کچی شێ عەلیی میرەکان بەهیەخانی خوشکی شێ محێدینی کانی کەوە بوو کە بە (دایەخان) بانگ دەکرا. شێخانی گوندی کانی کەوە و شێخ ڕەزای دێلێژە ئەوانەش پشت بە پشت دەگەڕێنەوە بۆ شێخ سمایلی ولیانی کە براگەورەی شێ حەسەنی گڵەزەردە بووە. جا ئەم بەهیە خانە دایکی کافیەخانی دایکی هۆمەر دزەیی بوو کە پێشتر باسم کرد واتا نەنکی هۆمەر دزەیی.

(ئەم زانیاریانەی سەرەوەم لە بەڕێزان کاکە شێخ جەنگی تاڵەبانی و خاڵۆزاکانم شێخ خالیسی شێخ جەوادی بەرزنجی و شێخ عەزیز و شێخ ڕەوف و شێخ موزەفەر کوڕانی سەید عەبدولقادری بەرزنجی و شێخ ئیسماعیلی شێخ ئەنوەری شێخ شەفیقی بەرزنجی میرەکان و قەدریە خانی خوشکم وەرگرتووە. سوپاس و پێزانینی یەکجار زۆرم بۆ هەر هەموویان هەیە.)

## دایکم 1963 - 1900

(دایکی ئەحمەد و محەمەد و عوسمان و قەدرییە و نەجیبە و ئەنوەر و موحسین و سەعدی و هۆمەر دزەیی، نۆ منداڵ)

کافیەخانی دایکم یەکێک بووە لە پێنج کچ و پێنج کوڕی شێخ مارفی شێخ کەریمی بەرزنجیی کۆیی گڵەزەردەیی، ناسراو بە شێخ مارفی هەڵەجە، کە ئەمانە بوون: حەنیفە خان، فاتمە خان، نایلە خان، نەعیمە خان، کافیە خان، شیخ عەزیز، شێخ ڕەشید، شێخ تاهیر، شێخ عەبدولکەریم، شێخ جەواد.

دایکم کە بچووکترینی خوشکەکانی بووە و لە براکانیشی تەنیا شێخ جەوادی برای لە خۆی بچووکتر بووە، ژنێکی تا بڵێی جوان بووە. ڕوخسارێکی زیاتر درێژوکانیی هێلکەیی (ستانداردی عالەمی بۆ جوانیی فۆرمی ڕۆخسار) و ڕەنگێکی کاڵی دڵگیر. چاوڕەش و لووتێکی باریکی ڕاست، لچ و لێوی تەنک بوون، پڕ نەبوون، کە پێشدەکەنی ڕیزێکی جوانی مرواری ئاسای ددانەکانی سەرەوەی بەدەر دەکەوتن. دوو بسکی (ئەگریجە) ڕەشی باریکی بە پێش گوێچکە تەنکەکانیدا شۆڕ دەکردەوە و خاڵێکی چکۆلانەی ڕەنگ سووری یاقووتیی سەرنجکێشیش گۆنای لای ڕاستی نەخشاندبوو و هێندەی تر جوانیی پێ بەخشیبوو. بەژنی دایکم نە کورت بوو نە کەڵەگەت، مامناوەنجی بوو. بە کەلەشیش باریکەلە بوو کە لەگەڵ فۆرمی باریکی ڕووی جوانیدا دەگونجا. گەردەنی درێژ بوو و دیارە پێش بیوەژنبوونی بە گەردەنبەندێکی زۆر نایاب دەیرازاندەوە. ئەو گەردەنبەندەی دایکم ئێستاش وا لای من پارێزراوە. لە جلوبەرگ پۆشینا (هەڵبەت بەس جلی کوردیی دەستووری دزەیی لەبەر دەکرد) دایکم چێژێکی تایبەتیی خۆی هەبوو. ئەمن نازانم ئەگەر پێش بێوەژنبوونی بە دەستووری جاران جلی ڕەنگاوڕەنگی زۆر زەقی بۆ ئەو زەمان باوی پۆشییێ یان

تا به‌ڵام له پاش مردنی باوكم ( 1936) كه تەمەنی دایكی داماوم تەنیا سی و شەش ساڵێك بووه، ستایلی جله‌كانی زۆر به‌زانایی په‌یڕه‌و ده‌كرد. هه‌رگیز جلی ڕه‌نگاوڕه‌نگی زه‌قی له‌به‌ر نه‌ده‌كرد به‌ڵام سه‌رتاپا ڕه‌شپۆشیش نه‌بوو ده‌یگوت سه‌رتابه‌پا ڕه‌شپۆشی گوناهه. ئه‌و زیاتر ڕه‌نگی تاریكی هه‌ڵده‌بژارد كه تێكه‌ڵه‌یه‌كی زۆر جوانی گوڵه‌باخی وردیله‌ی سوور به گه‌ڵا سه‌وزه‌كانیانه‌وه ئه‌رزه تاریكه‌كه‌ی كوتاڵی كراسه‌كانی ده‌نه‌خشاند. سه‌رتاپای مێرابه‌كانی كه‌وا و سه‌ركه‌وا و بنكه‌وای دایكم كه ده‌ستووری ژنه دزه‌ییانه له وه‌رزی زستان به سیمی بریسكه‌داری یان زێڕین یان زیوین نه‌خشێندرابوون و زریزه‌یه‌كی زێڕی وردی نه‌رمی زۆر جوانی سه‌عاته به قه‌پاغه‌كه‌ی به لایه‌كی بنكه‌واكه‌ی شۆڕ ده‌بۆوه تا ناو باخه‌ڵی بنكه‌واكه‌ی كه شوێنی سه‌عاته‌كه‌ی بوو. ته‌پڵه‌كی هیزاره‌كه‌ی سه‌ری ( هیزار = ده‌سرۆك، تیلاك) به سێ ریز لیره‌ی زێڕی جیهادی سه‌رده‌می فه‌رمانڕه‌وایی عوسمانی ده‌وره درابوو و له ناوه‌ڕاستیشا یاقووتێكی لاكێشه‌یی گه‌وره‌ی ڕه‌نگ هه‌ناری به چه‌ند ریزێك پیرۆزه‌ی جوان جوان رازابووه‌وه. هیزاره‌كه‌شی به هه‌وریه‌كی سركه‌یی گوڵنگدار داده‌پۆشی. ئینجا چارۆگه‌یه‌كی گوڵ گوڵی ته‌نكیش كه كوتاڵه‌كه‌ی له‌و زه‌مانه جورجییه‌ت یان چیناوی یان قه‌نه‌وز بوو به سه‌روملی و پشتی هه‌موو ئه‌و جلانه‌دا ده‌هاته خواره‌وه. دایكم چارۆگه‌یه‌كی زه‌مانی كۆنی مابوو كه كوتاڵه‌كه‌ی (واوێل)یان پێ ده‌گوت و زۆر ته‌نك بوو ئه‌رزه‌كه‌ی ڕه‌ش بوو و به ورده گوڵی سپی سپیی چنراو نه‌خشێندرابوو. ئه‌وه چێژی دایكم بوو له هه‌ڵبژاردنی كوتاڵی جله‌كانی. ئه‌و زه‌مانه ژن نه‌ده‌چوونه ناو بازاڕ بۆ شت كڕین به‌تایبه‌تی ژنه ئاغاكان و ماڵه خانه‌دانه‌كان به‌گشتی. ئێمه كه گوندنشین بووین كوتاڵفرۆشی تایبه‌تی ژنانمان هه‌بوو له هه‌ولێر كه له‌پاش په‌یدابوونی هه‌ر بابه‌تێك له كوتاڵی تازه ده‌هاته گونده‌كه‌مان دووگردكان و هه‌رچی تازه بوایه له‌گه‌ڵ خۆی ده‌هێنا و نمایشی ده‌كردن. به‌ڵام هه‌ر جارێكی دایكم و خوشك و براژنیش

سەفەری هەولێریان بکردایە - کە زۆر کەمیش دەچوون - لەوێش کوتاڵفرۆش خۆی و تۆپە کوتاڵەکانی دەچوو بۆ لایان. کوتاڵفرۆشی ماڵی ئێمە مام حاجی عەلی و لەپاش خۆیشی حاجی شەهابی کوڕی بوو لە هەولێر. ئەمانە هەرچەندە کە کوردیش بوون بەڵام لەناوخۆیاندا بەتورکمانی قسەیان دەکرد و لە کوردیا زمانیان ڕەوان نەبوو. هەینێ کولتووری تورکیی عوسمانی لەناو شاری هەولێردا هێشتا هەر زاڵ بوو. کوتاڵفرۆشێکی تریش لە هەولێر لە ماڵە گەورەکان دەگەڕا و کاڵاکانی خۆی بۆ ژنەکان نمایش دەکرد، شەرافەت خانی دایکی حەیدەر محەمەد ئەمین. کاک حەیدەری جوانەمەرگ کە (دار المعلمین العالیە)ی تەواو کردبوو گەنجێکی زۆر قۆز بوو و ئەندامێکی زۆر چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستانی سەردەمی خۆی بوو. دایە شەرافەت کە تەنیا ئەو منداڵەی هەبوو بە مەرگی ئاوا لەناکاوی ئەو کوڕە جوان و تاقانەیەی ئیتر تا مرد وەک مردوو بێ وای لێ هاتبوو. لە شاریش ژنە ئاغا و چەلەبییەکانی هەولێر نەدەچوونە ناو بازار، کوتاڵفرۆش دەبوایە خۆی بچێتە ماڵیان. دایکم پێڵاوی پانی بەرزی کوردەواریی خۆمانی لەپێ دەکرد ئەگەر پێڵاوەکەی بیانیش بوا پانی زۆر بەرزی هەڵنەدەبژارد. لە قسەکردنا دایکم دەنگی نەرم و لەسەرەخۆ بوو هەرگیزیش قاقای پێکەنینی نەبوو. ئەو دەیگوت قاقای پێکەنین بۆ ژنان نەک هەر جوان نییە بەڵکو لە ئیسلامیشا پەسند نییە. ئەو هەندێ نموونەی دەهێنایەوە کە بۆچی قاقا بۆ ژنان پەسند نییە بەڵام من لە بیرم نەماوە چی بوون. جاروبار تووڕە دەبوو بەڵام قەت جنێوی ناشیرینی بەسەر زارا نەدەهات و دوعای خراپیشی لە کەس نەدەکرد.

دایکم زوو لێی قەوما. دە دوانزدە ساڵ زیاتر لەگەڵ مێردی نەژیا کە هێشتا لە هەرەتی جوانی و جەحێڵیدا بووە (36 ساڵ) بێوەژن دەبێ. کە باوکم دەمرێ منداڵی هەرە گەورەی کاک ئەحمەدی برامان بوو و تەمەنی هەر یانزدە دوانزدە ساڵێک دەبوو. دایکم هەموو

سیفەتێکی سەرنجکێشی هەبوو (جوانی، جەحێڵی، ماڵ و دەوڵەت) کە خزمانی مێردی چاوی تێ ببڕن وەک کە بۆ ئەو زەمانە زۆر ئاسایی بووە. بەڵام دایکم سەرەڕای ئەرکی گرانی بەخێوکردنی شەش منداڵی وەک دەڵێن سەرکەو بنکە، پێنج کوڕ و کچێک (دوو کوڕ و کچێکیشی پێشتر بە منداڵی مردبوون محەمەد و عوسمان و نەجیبە) و ئەرکی بەڕێوەبردنی موڵک و ماڵێکی زۆر هەروەها سەرەڕای بوونی لە ژینگەیەکی نامۆ لە خۆی کە خۆی سەیدێکی بەرزنجی بوو و لە هەموو لایەکەوە بە ئاغەژن و ئاغاواتی دزەیی دەورە درابوو کە خزمی مێرد و منداڵەکانی بوون نەک هی خۆی کەچی خۆی ڕاگرت، بێ شووکردنەوە لەسەر منداڵەکانی دانیشت و زۆر بە نموونەیی و بە ڕەوشتێک کە لە هەردوو بنەماڵەی دزەیی و بەرزنجییان بوەشێتەوە بەخێوی کردن. سەروەت و سامانێکی زۆری لە مێردیەوە بۆ مابۆوە و چونکە هەر خۆیشی بە تەنیا پیاوی ماڵەکەی بوو بۆیە زۆر وریا و هوشیار بوو کە فێڵ و ساختەیی لە ماڵ و سەروەتی نەکرێت. لەوانەیە هەر ئەو وریاییەش بووبێ کە وای لێ کردبوو خەوی زۆر سووک بێت و لە نووستنی ڕۆژێشی ئێمەی منالەکانی دەماندی زۆر جار چاوی بە ئاستەم هەر کراوە بوو. بیرمە کە منداڵ بووم دەمدی دایکم نووستووە منیش بۆ ئەوەی بە ئاگای نەهێنم زۆر بێ هەستوخوست بەلایا ڕەت دەبووم کەچی یەکسەر برژانگی لێک دەترازاند بۆ دڵنیابوون کە کێیە. پشیلە بەلایدا تێ پەڕیبوا هەستی پێ دەکرد ئەوەندە گوێقوڵاغ بوو.

دایکم زۆر بەدین بوو. کە باوکم دەمرێ ئەو پشکەماڵی خۆی کە لە مێردیەوە بە شەرع بەری دەکەوت لە هی منداڵەکانی جیا کردەوە. دەغڵودانی تایبەت بە خۆی بۆ دەچاندرا، مێگەلە مەڕ و شوانکارەی تایبەتی خۆی هەبوو جیا لەوەی منداڵەکانی و ڕەشەوڵاخ و مانگا و مێنگینی خۆیشی هەبوو هەر بەناوی خۆی کە دەیانگوت ئەمە هی شێخزادەیە. ماینی تایبەتیشی بۆ تەرخان کرابوو بۆ سەردانی

گوندەکانی ماڵە بابی خۆی و گوندەکانی خزمە دزەییەکانی منداڵەکانی.
ئەوسا ئۆتۆمۆبیل هێشتا زۆر کەم بەکار دەهێنرا. هەر خێرێک یان یارمەتییەکی هەر کەسێکی بدابا تەنیا لە ماڵەکەی خۆی دەیدا دەیگوت حەرامە دەست لە ماڵی منداڵە هێتیمەکانم بدەم.

لە سەرەتا و بنەتای تەمەنیدا تراژیدیا بەرۆکی دایکمی توند گرتبوو. وەک پێشتر باسم کرد سێ منداڵی لە شەش ساڵ وردتری مردن و هێشتا خۆیشی زۆر جوان و جەحێڵ بووە کە مێردیشی دەمرێ. لە سەرەمەرگیشیدا لە چلەی زستانی مانگی دوانزدەی ساڵی 1963 لەو پێنج کوڕەی کە مابوون و پەروەردەی کردبوون یەکێکیانی لە سەرینگانیا نەبوو تەنیا تاکە کچەکەی نەبێ. تراژیدیای دواهەناسەی لەوەدا بوو کە شاڵاوی بەعسی63 نە ماڵی هێشتبوو نە دەوڵەت. ماڵ و دیوەخان و حەوشە و حەساری دووگردکانیان سەرتاپا سووتاندبوو یان رووخاندبوو، مەڕوماڵات و گاگەلیان هەمووی بەتاڵان بردبوو. بێ داهات و دەرامەت شوێن نەما خۆی و بووک و نەوەکانی لێ بگیرسێنێتەوە چونکە حەرەس قەومیی بەعسییەکان بەدوای ئەو خێزانانەدا دەگەڕان بیانگرن ئەوانەی کە پیاویان لە پێشمەرگایەتی بوو بە ئومێدی ئەوەی کە لە ترسی چارەنووسی ژن و منداڵەکانیان بێنەوە خۆیان رادەستی حکومەت بکەنەوە. جەنابی شێ محێدینی شێخ ساڵحی بەرزنجی خزمی خۆمان خانووێکی بچووکی لەتەنیشت تەکیەکەی خۆی لە هەولێر چۆڵ کرد دایکم و بووک و منداڵەکانیانی لەوێ دانان و یارمەتیشی بۆ دابین دەکردن. شێ محێدین بە حوکمی پلە و پایەی ئایینی لە دەستدرێژیکردنی حکوومەتیشی دەپاراستن. سێ لە کوڕەکانی (ئەحمەد و موحسین و هۆمەر) لە شاخا پێشمەرگە بوون و دوانەکەی تریش دکتۆر ئەنوەر لە کەرکووک پزیشک بوو گیرا بەڵام پاش ماوەیەک ئەشکەنجدان بە واسیتە و بەرتیل بەر بوو و یەکسەر رای کرد بۆ ئەڵمانیا و ئێستاش هەر لە وێیە. کاک سەعدیی براشم چالاکوانێکی کارای کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد

بوو له ئه‌ورووپا. ئه‌وها دایکم بێ ئه‌ولاد و بێ قرۆش له کونه خانوویه‌کی ته‌نگ و تاریکی کۆلانێکی ته‌نگه‌به‌ری بنبه‌ستی گه‌ڕه‌کی شێخی چۆلی به سه‌رما و سۆلی شه‌وی ده‌یجوونی مانگی کانوونی 1963 له هه‌ولێر به‌نامرادی سه‌ری نایه‌وه.

گۆڕی دایکم له‌سه‌ر گردی دووگردکانه و گومه‌تێکی له‌سه‌ر بنیاد نراوه که گۆڕی کاک ئه‌حمه‌دی برام و گۆڕی کچێکی زۆر جوانی جوانه‌مه‌رگی ناو ئارازی کاک ئه‌حمه‌دیشی لێیه.

داپیرم (نه‌نکم) له دایکه‌وه، ناوی به‌هیه‌خان بوو و نازناوی (دایه‌خان) بووه، خۆشکی شێ محێدینی کانی که‌وه بوو. کانی که‌وه سه‌ر به قه‌زای چه‌مچه‌ماڵه. شێخانی کانی که‌وه و ئه‌وانه‌ی نه‌وه‌ی شێخ ڕه‌زای دیلێژه‌ش ئه‌وانه ده‌چنه‌وه سه‌ر شێخ سمایلی ولیانی که ئه‌مه‌شیان برای شێ حه‌سه‌نی گڵه‌زه‌رده بووه. ده‌ڵێن به‌هیه‌خانی نه‌نکم ئه‌ویش ژنێکی تا خوا حه‌ز ده‌کات شۆخ و شه‌نگ بووه (له‌وه ده‌چێ شێخ مارفی باپیرم حه‌زی له ژنی جوان بووبێ، جا کێ هه‌یه حه‌زی له ژنی جوان نه‌بێ!). هه‌ڵبه‌ت ئه‌وه پێش زه‌مانی من بووه به‌ڵام قه‌دریه خانی تاکه خوشکم ( له‌دایکبووی 1927 که له خوا ده‌پاڕێمه‌وه بۆمانی بهێڵێ) بۆم ده‌گێڕێته‌وه که له‌پاش مردنی به‌هیه خانی داپیرمان پووره مه‌هرو خانی خوشکی (واتا پووری دایکم که پێم وایه دایکی شێخ ڕه‌ووفی هه‌نجیره بووه) جاروبار له هه‌نجیره‌وه ده‌هات بۆ هه‌ولێر و بۆ دووگردکانی گونده‌که‌ی ئیمه‌ش سه‌ر له خوشکه‌زاکانی بدات. جا قه‌دریه‌خانی خوشکم له‌بیری ماوه ده‌ڵێ که پووره مه‌هرو خانیش ژنێکی زۆر جوان بووه و چاوی شین بووه.

گوندی گڵەزەردە: لە چەپەوە حەمەدەمین پێنجوێنی، ئەرجومەند سدیق، هۆمەر دزەیی، کیسرا ئەمیب

ئارامگەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە لە گوندی گڵەزەردە

شێخ خاڵس شێخ جەوادی بەرزنجی
خاڵۆزای هۆمەر دزەیی

شێخ جەنگی تاڵەبانی و فاتمە خانی هاوسەری

شێخ جەنگی بە گەنجی

کەوچکەکان

گەردەنبەندی کافیەخانی دایکم

ئەنگوستیلەی باوکی هۆمەر دزەیی

گۆڕی محەمەد ئەمین ئاغا دزەیی باوکی هۆمەر لە گوندی هەڵەجە

گۆڕی کافیەخانی شێخ مارف

گۆڕی دایە خان لە گوندی هەڵەجە

گۆڕی شێخ مارف لە گوندی هەڵەجە

بەردەکەی ئەستێرەناسی شێخ حەسەنی گڵەزەردە

# بەشی 5

## گوندی دووگردکان، زاگەی خۆم

دووگردکان ئەو گوندەیە کە من و هەموو خوشک و براکانمی لێ لە دایک بووینە. دەبا جارێ بەم لاواندنەوەیە دەست پێ بکەم کە بە دووگردکانمدا هەڵگوتووە، پاش تەختکردنی لەلایەن بەعسییەکانەوە و پێکەوە لەگەڵ لارای کچم بە ئاواز گوتوومانە و تۆمار کراوە:

گوندەکەم دووگردکان
دووگردکان گوندە خۆشەکەم
هەوا و خاکە بۆنخۆشەکەم
زەوی و زارە گوڵپۆشەکەم
کوێراییم دایە دووگردکان

*

دووگردکان گوندە جوانەکەم
خەوی خۆشی سەربانەکەم
دەنگی دووری حەیرانەکەم
کوێراییم دایە دووگردکان

*

کەند و جۆم و کەندەرانت
رەوە تەیری ئێوارانت
مریشک و جووچکەی کۆرانت
کوێراییم دایە دووگردکان

*

کوا لە کوێن کیژ و کارانت
بەزمی شەوانی جارانت
قسەی خۆشی ئێختیارانت
کوێراییم دایە دووگردکان

*

دووگردکان کوێراییم دایە
بریا قەت وام نەدیبایە
کە تۆ چوویت منیش بچوومایە
کوێراییم دایە دووگردکان

*

داخوا ئەو ڕۆژە دێتەوە
وەک جارانت لێ بێتەوە
هەنگی هەقمە نەزر بگرم
لە باوشت بمرم دووگردکان

*

## ئێتیمۆلۆژی وشەی دووگردکان

لـە ڕووی زمانەوانییـەوە دووگـردکان واتـا دووگـردان. ئـەم تیپـی (کاف)ەی دوایـی وشـەکە ئـەوە یەکێکـە لـە کۆلێـک ئامرازی چکۆلانـدن لـە زمانـی کوردیـا کـە بـە ئینگلیـزی پێـی دەڵێـن diminutive ئەمـە لـە زمانـی فارسیشـا هـەر وایـە وەک کـە دەڵێـن شـهر واتـا شـار بـەڵام شـهرک واتـا شـارۆچکە یـان شـارۆکە. ئینجـا لەڕاستیشـدا دووگـردکان دوو گـردی لێیـە (گـردە خەجیلـە) و (گـردی ناومـاڵان) ئەمـەی دواییـان گـردی سـەید وەسمانیشـی پـێ دەڵێـن چونکـە گـۆڕی چاکێکـی لەسـەرە کـە سـەید وەسـمان ناوێـک بـووە و کـەس نازانـێ کـێ بـووە و لـە کەینێکـەوە لـەوێ نێـژراوە.

بە قسەی شێرکۆی محەمەدی مەولود هەولێری کە لەدایکبووی گوندی دووگردکانە، گوایا (گردە خەجیلە) لە ڕاستیدا دەبێ (گردە خنجیلە) بووبێ و کورت کراوەتەوە بۆ خەجیلە. لێکدانەوەکەی ڕێی تێ دەچێ چونکە ئەو گردە بەڕاستیش زۆر خنجیلە و خڕیلە و جوان بوو بەرلەوەی حکوومەتە کەمزانەکەی هەرێمی خۆمان لووتکە خنجیلە جوانەکەی بە شۆفڵ بتاشێت و خانووێکی بۆ چاوەدێریکردنی لوولەکانی نەفت لەسەر دروست بکات بێ گوێدان بە قانوونی پاراستنی شوێنەوارە مێژووییەکان وەک بڵێیت ئەقڵی ئەوەیان نەبووبێ تاوەرێکی بڵند لەوێ بۆ ئەم مەبەستە داکوتن. دەوجا وەرن سەیری ئەم بەزمە بکەن، حکوومەت خۆی فشەی بە قانوون بێ ئەدی خەڵکەکە دەبێ چی بکەن!

## هەڵکەوتەی جۆگرافی و جۆری تۆپۆگرافی دووگردکان

دووگردکان نزیکەی بە 24 کیلۆمەترێک کەوتۆتە باشووری شاری هەولێر لە دەشتی دزەیی و بە دووریی (5 کیلۆمەترێک) بۆ هەردوولا کەوتۆتە نێوان ناحیەی قوشتەپە لەسەر جادەی کەرکووک و ناحیەی شەمامک لەسەر جادەی مەخموور. دەوروپشتی دووگردکان دەشتاوییە، بەڵام کەند و کەندەڵان و گۆمی لێ بووە کە تەنیا زستانان و بەهاران ئاویان پێدا دەچوو و گۆمەکانیش لێوڕێژ دەبوون. کەندارە سۆر (کەنداڵە سوور) لەسەر ڕێی قوشتەپە و گوندی پرینگە (پلنگە) لە سالانی منداڵیی من زۆر بڵند و درێژ بوو، کەچی بەداخەوە ئەمڕۆ لە ئەنجامی سوانەوەی بە کەشوهەوا و بە کێلانیش لەگەڵ زەویدا تەخت بووە. کەندی ناومالان کە هەر لە کەنداڵە سوورەوە شۆڕ دەبۆوە بۆ ناو ئاوایی و بەنێوان گەڕەکی ناوەند و گەڕەکی خەلیلاوادا دەچوو، زستانان کە پڕ دەبوو ئیتر هاتوچۆی نێوان ئەو

دوو گەڕەکەی تا ڕادەیەک پەک دەخست. بۆ ئێمەی منداڵیش خەنی خۆشیمان بوو کە لە شوێنە تەنکاوەکانیدا مەلەمان دەکرد. کەندێ تاراوان (تالاوان) لەپشت گردە خەجیلە بوو بەرامبەر گوندی تڕپە سپیان. لەوێش ئاوەکە پەنگی دەخواردەوە و گۆمێکی پان و قووڵی لێ دروست دەبوو کە مەلەمان تیا دەکرد. گۆمێ باوە کە لەناو زەویی کێخوا ئەحمەدی پاڵانی بوو نزیک ڕێی دووکەرە (دووکەڵە) ئەوەش نەورایەکی سروشتی بوو کە پڕ دەبوو لە ئاوی باران و شوانکارەکانی کێخوا ئەحمەد و کێخوا وەسمانی برای بۆ ئاودانی مێگەلەکانیان بەکاریان دەهێنا.

من ئێستاش ئەم هەموو شوێنە سروشتیانەم وەک فیلمێکی سینەمایی زۆر بەجوانی وا لەبەر چاوە و هەر جارێک سەردانی دووگردکان بکەم یان هەر دوور بە دووریش بە خەیاڵمدا ڕەت بێ فرمێسکی نۆستالگیا لە قولینچکەکانی هەردوو چاوم دەبریسکێنەوە.

دووگردکان ئاقاری لەگەڵ ئەم گوندانەدا هەیە: لە باکووری گوندی قوشتەپە و پرینگە. لە لای ڕۆژهەڵاتی گوندی سێبیران و قولتەپە، لە باشووری گوندی دووکەرە و قشاغلو و لای خۆرئاوا و باشووری خۆرئاوای تڕپەسپیان و منارە و باقرتە.

کەشوهەوای دووگردکان زستانی سارد هاوینی بە ڕۆژ گەرم بە شەو فێنک. وەرزی باران لە مانگی دە تا مانگی پێنجە. ئەگەر ساڵ بەباران بێ بەروبوومی دانەوێڵە (گەنم و جۆ) خێرو بێرێکی باشی دەبێ. دوو جۆرە با لەو ناوە هەڵدەکەن: شەماڵ و هوڕە. شەماڵ لە ڕۆژئاواوە و هوڕەش لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکات. هاوینان و پایزان گەردەلوولەی بچووک و گەورە ناوە ناوە لە ئاوایی دەدەن و دەبێتە خۆشیی منداڵە ورتکە. دانیشتوانی گوند بژێویی خۆیان بە کشتوکاڵ (چاندنی گەنم و جۆ) و ئاژەڵداری (مەڕ و بزن و گاگەل) دابین دەکەن. لە سەردەمی منداڵیی مندا جووتکردن تەنیا بە هێستر و گوێدرێژ دەکرا. ماڵی ئاغا و ماڵە کوێخاکان و جوتیارە گوزەران

باشەکان هێستریان بۆ جووتکردن بەکار دەهێنا ئەوانی تریش گوێدرێژ. لەلای ئێمە و لە تەواوی ناوچە دەشتاوییەکانی کوردستان گاجووت بۆ جووت کردن بەکار نەدەهات، گا تەنیا لە ناوچە شاخاوییەکاندا جووتی پێ دەکرا. کۆمباین (کە ئەمڕۆ کراوە بە دەڕاسەی عەرەبی) هێشتا نەگەیشبووە کوردستان. کە پەیاش بوو سەرەتا جووتیارەکانیش هەر ناوە ئینگلیزییەکە (combine)یان بەکار دەهێنا هەرچەندە کە بە ئینگلیزی هارڤێستەر (harvester)یشی پێ دەگوترێ. لەپاشان سەرەنجامی زۆر وشەی سەردەمی ئینگلیزەکان و هی زۆر وشەی کوردی ڕەسەنیش کەوتنە بەر شاڵاوی زمانی عەرەبی و کوردییەکە پشتگوێ خرا. هەر بۆ نموونە لە سەردەمی منداڵی و نەوجوانیی من هەر باخچە بەکار دەهات کەس نەیدەزانی (حەدیقە) چییە، نانڈین کرا بە (متبەخ)، شۆفێر کە وشەیەکی فرانسییە کرا بە (سایەق)، ئۆتۆمۆبیل یان ترومبێل کرا بە (سەیارە)، ئەلەتریک کرا بە (کارەبا) بۆ تی ڤی و ڕادیۆ دەنگ دەکرێ بە (سەوت)، کووچە و کۆڵان کران بە (فەرع) و ئیتر بەم جۆرە.

دووگردکان لە سەردەمی منداڵیی من لە چلەکانی سەدەی بیستەم پێم وایە ڕەنگە سەت و بیست ماڵێک دەبوو کە بەسەر سێ گەڕەکدا دابەش کرابوو: گەڕەکی ڕەحمانی (ڕەحمان ئاغای مامم)، گەڕەکی ناوەندێ (گەڕەکی ئێمە) و گەڕەکی خەلیلاوا. ئەم خەلیلاوایە لە کاتی خۆی ئەویش هەر هی خزمێکی خۆمان (خەلیل ئاغا) بووە بەڵام فرۆشتوویەتی و باوکم لێی کڕیوەتەوە. جا دوو گەڕەک هی ماڵە بابی من بوون و یەکێکیش هی حاجی ڕەحمان ئاغای مامم بوو کە لە بابم گەورەتر بوو.

بەرگی کوردیی دەشتی هەولێر بە گشتی بە ناوچە دزەییاتی و دووگردکانەکەی ئێمەشەوە کورتەک و شەروار (شەرواڵ)ە. کورتەک بەشی سەرەوەی جلەکەیە کە جاران بە شێوەی چۆغەیی بێ قۆپچە ڕاست و چەپ بەسەر یەکدا بە پشتێنێکەوە گیر دەکران و هەردوو

لچکی ژێرەوەیان شۆڕ دەبوونەوە بۆ ناو شەرواڕەکەوە کە ئەمەشیان تا کەرخی پشتێنەکە دەهات و بە دۆخین (بەنەخوێن) دەبەسترایەوە. کورتەکی مرادخانی و ستارخانی کە لە ئێران پەیا بووبوو درەنگ گەیشتە ناوچەی ئێمە. پێم وایە ـ ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ـ ستارخان جەنراڵێکی ئازەری ئێرانی بووە و مرادخانیش یەکیک بووە لە بەگزادەکانی جافی جوانڕۆیی. لە ژێر شەرواریشدا دەرپێیەکی هەر کتومت لە شێوەی شەروار بەڵام لە کوتاڵی شەعادە یان چاپانی ڕەنگ سپی سادە لەپێ دەکرا. هەندێ جووتیاری کەم دەرامەت تەنیا کورتەک و دەرپێ سپیەکەیان لەبەر دەکرد بێ شەروار چونکە هەرزانتر دەوەستا لە سەریان. شەرواری دزەییاتی وەک دەستووری زۆرترایەتی ناوچە سۆرانییەکانە واتا دەلینگ تەسک نەک وەک شاڵ و شەپکی بادینان و هەندێ عەشایری دی دەلینگ فش. پۆشاکی سەریش بریتییە لە کلاوێکی دەستکردی بە ئاوریشم نەخشێندراو و هەوری (مشکی) یان جەمەدانییەک (جامانە) بە دەوریدا. ڕاستییەکەی لە ساڵانی منداڵی مندا جامانە هەر نەبوو، جامانە هی عەرەب بوو لە پاشان وردە وردە کەوتە ناو کوردیشەوە، هەنگی هەر مشکی سوور و مشکی بەڵەک هەبوو بۆ سەری پیاوان و هەوری سرکەیی یان چارۆگەیەکی ڕەنگاوڕەنگ دەسرۆک و هیزاری ژنانی دادەپۆشت. هیزار زیاتر ئاغاژنەکان بەکاریان دێنا و ژنە کرمانجەکانیش هەوری سووریان دەکردە دەسرۆک چونکە هەرزانتر بوو. هەندێ پیاویش هەر پارچە کوتاڵێکی تەنکی ڕەنگاڕەنگی لەسەر دەنا کە بە ڕیشۆڵە و وردە گوڵنگ دەرازاندرایەوە و بەمە دەگوترا چەفیە. پێڵاویش بە زۆری کلاش بوو یان کلاشی سپی لە دەزوو چنراو کە ژێرەکەی قاڵتاغ بوو و لە شار دەیانکڕی یانیش کلاشی جووتیارانەی دەسکرد کە یەکێک لە جووتیارانی ئاوایی دروستی دەکرد. ئەمەشیان سەرەکەی بەن بوو و ژێرەکەشی لاستیکە ئەستوورەکەی تایەی ئۆتۆمۆبیلان بوو. گۆرەوی دووکانەکانی شار کەم لەپێ دەکرا، فەلاحی ئەوسا ئەو

پارەیەی نەبوو بە گۆزەوی دووکانانی بدات، خۆی دروستی دەکرد. هەندی کەس هەبوون لە گوند کە گۆزەوی ڕەنگاوڕەنگ یان هەر سپیی سادەی زۆر جوانیان دروست دەکرد. لەوانە حوسێنی کەریم هەباسی لە دووگردکان گۆزەوی زۆر نایابی دەچنی.

هەندێک لەو گیاوگوڵی بەهاران کە لەو دەشتە و لە گوێ ئاوی کارێزەکانی گوندی هەڵەجە و گردمەلا و قوشتەپە و پرینگە و برایمەلەک بۆ ماوەیەکی کورت سەر هەڵدەدەن و زوو وشک دەبنەوە و من بە هەڵبەست ڕیزبەندم کردوون ئەمانەن. بەداخەوە ئەمڕۆ هیچ کارێزێک لە کوردستان نەماوە.

سوسنە و بەیبوون و هەلاڵە
حاجیلە و هێرۆ و لاولاوە
نێرگز و گاگرۆ و گولاڵە
تێکەڵ بە گیابەند و خاوە
تۆلکە، قوڕادە، خەرتەلە
بزنترێنەو قەلۆغان
سێوەرۆک، پیفۆک، قێزبەلە
کاردی و کەنگر و دوومەڵان
سۆتکە و سمڵ، پوونگ و ڕەیحان
زەرگەزەوی و گونەپاڵە
پەڵپینە و کووزەڵەی جوان جوان
شەکرۆکە و ترشۆکە و ژاڵە
سێ بسکۆرە، گیابرژانە
کەپرۆکە، ترپۆک، ڕازیانە
کەربەشە و گلێخە و گوژارک
رنک و ڕێواس و کوارگ

هەر وەها ژمارەیەکی زۆر لە مەلی جۆراوجۆری جوان جوان ئەوانەش هەمیشە لەناو پەرێز و دەغڵ و دان و کەندوجۆمی دەورو

پشتی گوندەکەم دووگردکان یان لە دەو ئاوەکانی کاریزەکان و گۆمە کاتییەکاندا هێلانەیان دادەبەستا یان بە ئاسمانەوه بەدی دەکران. هەندێک لەو مەلە جوانانە کە بە پێی نەریتی کۆمەڵایەتی خۆیان هەمیشە بە هەزاران پێکەوە دەفڕین و بەری ئاسمانیان دەگرت و سێبەریان دەخستە سەر زەوی. ئەمانە هەندێکیانن کە ئەوەشم بە هەڵبەست ڕیزبەند کردووە:

هەوێردە، قوڵت، تورلی، کێشکە
تیترواسک، کوند و حەبارە
ریشۆڵە، ڕەنگاڵە، سوێسکە
داڵاش و چێرگ و کۆلارە
سۆفەقیتە و جوڕەپووتە
کۆترە کێویلکەی بە جووتە
خەرتەل و سیسالکە کەچەڵ
پۆڕ و پەپو سلێمانە
باشووکە و بارانبڕە و قەل
گشت دەگەڕێن لەم شوێنانە
چەند جوانە جێ سمی ئاژەڵ
لەسەر زەوی کزری بەهار
هێشتا پڕ ئاوی بارانە
چەند جوانە جێ پێی بێچوە مەل
لەسەر تەنکە بەفری نسار
دەڵێی وردە نەخشی خەنەی
ناولەپ و پەنجەی یارانە

هەڵبەت بەفر لەم دەشتە گەرمە زۆر بەدەگمەن دەکەوت. من ئەم هەڵبەستانەم بەشێکن لە بەندێکی درێژی هەزار و دووسەت بەیتێک کە وەک ژێننامەیەکی خۆم بە شیعر دامناوەو لەژێر ناوی (چیرۆکی ئەویندارییم) دوو جار بە چاپم گەیاندووە، جارێکیان لە ستۆکهۆلم لە

سوید و جارێکیش لە سلەیمانی.

لە سالانی منداڵی و نەوجوانی، من کە هێشتا لە دووگردکان دەژیام (چلەکان و نیوەی پەنجاکانی سەدەی بیستەم) بەرلەوەی ساڵی 1955کوردستان بەجێ بێڵم بڕۆم بۆ ئەورووپا، ئێستاشی لەگەڵدا بێ ڕوخسار و بەژن و باڵای هەموو ئەو دانیشتووە خۆشەویستانەی دووگردکانەکەم بە ژن و پیاوەوە، بە پیر و جوانەوە وا لەبەرچاوە بەتایبەتی ئەو منداڵانەی کە هاوزای خۆم بوون و شەوانە و ڕۆژانە پێکەوە گەمانمان دەکرد.

ئەم چەند بەیتەی خوارەوە بەشێکە لە هەڵبەستێکم بە ناوی: "برادەران، دوێنێ کە جوان بووم" کە ئاوازیشم بۆ داناوە بەڵام هێشتا تۆمارم نەکردووە:

برادەران، دوێنێ کە جوان بووم نەمدەزانی غەم چییە
نەمدەزانی ماندو بوون و خەو و واتای دەم چییە
ساڵەهای منداڵی و مێردمنداڵیم لە گوندەکەمان
ڕائەبوارد بە پای پەتی و بە ڕووی بە گەرد و بە گەمان
گرد و بستی و کەند و جۆم و کەندەڵان و وەرد و شۆ
بەهاران لە مێرغوزاران، هاوینان پەرێزە جۆ

***

خانووە قوڕەکانی گوندی دووگردکان هەنگینێ تەبای هەموو دێهاتی ناوچە دەشتاوییەکانی کوردستان بە خشتی لە گڵ دروستکراو بنیاد دەنران و بە قوڕەسوور سواخ دەدران. گڵ و کا و ئاویان تێکەڵ دەکرد بۆ ئەوەی چڕ بێت و یەکتری بەرنەدات ئینجا بە خاکەناس دەیانخستە ناو قاڵبێکی لاکێشەی نزیکەی 30 40سم درێژ کە هەرچوار لای لە شەپکەدار دروست کرابوو و پێیان دەگوت خشتبڕ. ئیتر ژمارەیەکی زۆر لەو خشتانەیان لەبەر هەتاو دادەنا تا وشک دەبۆوە و ڕەق دەبوو. ئیتر چەندینی ئەم خشتانەیان لەسەر یەک دادەنا و دیواریان لێ دروست دەکرد. سەرەکەشیان بە ژمارەیەکی زۆر لە

شەقرە ( = قەدی باریكی درەخت) دارەڕێ دەكرد كە بەملاو ئەولای یەك دانە كاریتە ( = قەدی ئەستووری درەخت) شۆڕ دەبوونەوە، هەراشیان (هەراش = گەڵای دار بە لاچكەكەیەوە) بەسەردا دەدا ئینجا ئەوەشیان بە قوڕی گیراوە سواخ دەدا. زۆرترایەتیی بانی ماڵە گوندییەكان بە شێوەیەك دەگرت كە پێیان دەگوت (جزیری) كە وەك خانووەكانی ئەورووپا و توركیا دروست دەكران، چونكە بۆ ئەمە یەك دانە كاریتە بەكار دەهات لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لە شەقرە. ئەمەیان هەرزانتر دەوەستا لە سەریان (شەقرە زۆر هەرزانترە لە كاریتە) بەڵام لە كوردەواریی خۆمان ئەو قرمیدە سوورەی كە ئێستا بۆ داپۆشینی سەربان بەكاری دێنن ئەوسا شتی وایان نەگەیشتبوێ. هەرچی ماڵە ئاغا و كێخوا و هەندێ ماڵە جوتیاری دەوڵەمەندیش بوو، ئەوان بانی خانووەكانیان بە شێوەیەك دادەپۆشت كە پێیان دەگوت (شارستانی) واتا تەخت. بۆیە خەوتنی هاوینان لەسەربانە جزیرییەكان نەدەكرا و ئەو خێزانانە دەبوایە لە حەوشی ماڵەكانیان بنوون هەرچی بانی شارستانییە ئەمەیان كە تەخت و پان بوو نووستنی هاوینانی لەسەردا دەكرا و لە حەوشەكان زۆر فێنكتر بوو.

تا ساڵی 1946 دووگردكان قوتابخانەی لێ نەكرابۆوە، بەڵام مەدرەسەی مزگەوتی لێ بوو كە تەنیا ژمارەیەكی زۆر كەم لە منداڵانی ئاوایی دەچوون سیپارە بخوێنن تا كەمێك خوێندەواری و دەستوقەڵەمیان ببێ. ئەگینا پێش كردنەوەی قوتابخانە تەواوی منداڵەكانی گوند نەخوێندەوار بوون. دواتر دوای ساڵەهای ساڵان هەندێك هەر لەو منداڵانەی قوتابخانەكەی دووگردكان هەر لەوێ بوون بە مامۆستا. كە قوتابخانە كرایەوە نەك هەر منداڵانی دووگردكان بەڵكو زۆریش لە منداڵەكانی گوندە نزیكەكانی دووگردكانیش ڕۆژانە بە پیادەڕۆیی بۆ خوێندن هاتوچۆیان دەكرد.

## خێزانەکانی دووگردکان

کاک سەعدیی برام ئەم لیستەی ناوی خێزانە ڕەسەنەکانی دووگردکانی ئامادە کردووە ئەوانەی کە لە سەردەمی منداڵیی ئێمە لە ژیاندا بوون. مامۆستای قوتابخانەی دووگردکان کاک فەرهادی حەمەدی مام تەهای ئەویش بە لیستەکەدا چووەتەوە و تەواوی کردووە و منیش بۆ دواجار پێیدا چوومەوە و هەندێ تێبینیی خۆشمم خستە سەر.

لە سەردەمی ژیانی منداڵیمان لە دووگردکانماڵەکان هەر بە ناوی سەرۆکی خێزانەکان دەناسران جا لەپاش ئەوەی کە من کوردستانم بەجێ هێشت 1955 زۆرێک لەو سەرەک خێزانانە ئەم دنیایەیان جێهێشت و لەدوای ئەوان خێزانەکانیان ناوی کوڕە گەورەی ئەو خێزانەی وەردەگرت. زۆر خێزانیش هەبوو کە سەرەک خێزانەکە بە ناوی دایکی ناسراو بوو وەک ئەمانە لە دووگردکان: حەسەن مێرەم، حەسەن ڕابی، حەسەن زارا، سەلیم ڕابی، قادری ئامانێ، قادر بەسێ، قادر فاتە، قادر فامە، کەریم بەسێ، ئەمین و مستەفای مۆمنی، مستەفای شەمامێ، ڕەسوور مەیاس، عەلی جەواهێر، خارندی جەواهێری، ئەحمەدی خەجەبۆتێ، عوسمان پەرێ، حەمەد زێزە... ئیتریش کە ئێستا نایەتەوە بیرم.

دووگردکان کە 120 ماڵێک دەبوو سەرخێزانی نزیکەی 22 عەشیرەتی لێ بوو. لەمانە تەنیا سێ سەرخێزان دزەیی بوون (ماڵی ئێمەو ماڵی ڕەحمان ئاغای مامم و ماڵی پیرداوداغای حاجی خەلیلی خزممان) و عەشیرەتی پاڵانی لە هەموان زیاتر بوو کە لەو 120 ماڵە 32 یان پاڵانی بوون. ئەوانی تریش گەلاڵی و ئۆرمزیار و شوان و سنجاوی و سوورچی و بلباس و کاڕەش و چوار ماڵە سەیدی بەرزنجی و ماڵە تورکێکی خەڵکی تورکیا و یەک ماڵە جوو و یەک ماڵی

بە ڕەچەڵەک فەلە و یەک ماڵە دۆم و ئەوانی تریش ئەمانە بوون: پیرەبابی، کەڵهوڕ، هەمەوەند، شێخ بزێنی، زراری، گەردی، مەنتک، مامەسێنی، نانەکەلی، عوزێری.

ماڵەکان کە بە ناوی سەرۆکەکانیانن لە گەڕەکی خەلیلاوەوە بۆ گەڕەکی ناوەندێ تا گەڕەکی ڕەحمانی بەم شێوەیە کەوتبوون:

مەولود هەولێری، پیرداودی حاجی خەلیلی، پیرداودی مستەفای، ئەحمەدی حەمەد مەحمودی، سمایل حاجی، مامۆستا مەلا ئەبوبەکر، حەمەدەمین جۆوان، کەریم بەسێ، مام سوڵتان یەنی، عەولای مامیسای، حەسەنی حەمە شینی، ئەمین و مستەفای مۆمنێ، کاکۆسم، مام عەزیز گاوان، ڕەحمانی عەولا رەشی، قادر فامە، مام محێدین، ئەحمەدی برای محێدینی، خارندی جەواهێری، مەلا حوسێن (پێش مەلا ئەبوبەکر مەلای دووگردکان بوو)، عەلە عەدێ، عەلی جەواهێر، سەلیم ڕابی و مەحمودە کۆری برای، کەریم هەباس، شێخ فەرەج، عەولا حوسێن، حەسەن مێرەم، تەها زەبۆ، کاکەسمە، عەزەکۆر، حوسێن عەسکەر، حەمەدی ئەحمەد جبەی، مام تەها، قادری ئامانێ، حەسەن چارکلدان (حەسەن ڕابی)، فەقێ عەولا، حاجی کەریم (کەریمە رەش)، قادر قووچە برباسی (باری کرد و سەید تۆفیق هاتە خانووەکەی)، عەبدولڕەحیم مەرەگە، مستەفا عەلی، کاکەحمەد (ماڵی ئاغای)، حەسەنی حاجی مستەفای، حاجی مستەفای جانەی، ڕەسور مەیاس، مستەفای یابەی و عەلۆ کەچەری برای، حەسەن زارا، سەید وەهاب، مام یاقوب، کێخوا وەسمان، عەلی چاوەش (عەلیۆکە دۆم)، عەولا و مستەفا، خارە ئەحمەدە ڕەش، برایم هەمزە، مەولود خدر، ئەحمەدی خەجەبۆتی، عەلی قادر، ڕەشیدە و بلە حەسیری برای، ئیشکاک (قادر بەسێ)، مام ڕەجەب، مستەفا بابۆ، قادر فاتە، قادر مامە، حەمەد غەریب، ئەحمەد لاوە، عەلی سەلمان، کەریم باوە، سرێمانی حەمەشینی، سمایلە مووتە، کێخوا ئەحمەد، دەنۆک و براکانی حەسەن و خدە، ئەسعەد قاوەچی، حەمەد و ئەحمەد گجە، یاقوبە جوو، مەلا عەوکە، مام حەمدین و

وەلی برای، مام ڕەسوری مێردی عەیشانێ، جەباری حاجی عوسمانی، عوسمان پەرێ، محەمەدی عوسمان پەرێ، حوسێن غەفور، سۆرە، مام عەلی مامەو ڕەحمان مامەو عەبدوڵا مامە (عەبلێ)، مەحمودە گڕکە، عەزیزی شێخە برباسی، خدری شێخە برباسی، حەمەدەمین قرمە، حەمەد قاوەچی، عەولا قۆریات، حەسەنەکۆر، حوسێن مکایل، حەمەد عەلی، سمایلی حوسێنەسرانی، عەولای حوسێنەسرانی، سەید ئۆمەر، حەمەسووسکە، عەلی مام شێخی، حەمەد زێزە، عەولا فەلە، ڕەحمان ئاغا (ماڵی ئاغای)، قوتەڕەش، عەلی بەقار (لەپاش خۆی نەجمەدینی عەلی بەقاری)، مەلا ڕەسوور، حەمەدە سۆر و حەمەد عەلی برای، ئەحمەد عەدێ، ئەحمەد دێواری، عەلی دێواری، حەمەد دێواری، شێ محەمەدی زەردەحمەدی، عەزیز کاکل، برایم کاکل.

## ئۆرکێسترای داستانی دووگردکان

ئەمن - هەر بە خەیاڵ - تێکڕای ئەو سەرخێزانانەی دووگردکانی ڕۆژگارانی منداڵی و نەوجەوانی خۆم و خوشک و براکانم بە ئەندامانی ئۆرکێسترایەکی موزیکاڵی گەورە دەچوێنم کە هەموومان پێکەوە (سیمفۆنیای داستانی دووگردکان)مان نووسیوە و بە تەبایی و هارمۆنییەکی زۆر هەمئاهەنگەوە بە مایسترۆیاتی کاک ئەحمەدی برا گەورەمان و پێش ئەویش بە مایسترۆیی حەمەدەمیناغای باوکمان ژەنیومانە و تا ئێستاش دەنگ و سەدای ئەو تەبایی و هەمئاهەنگییە هەروا دەنگ دەداتەوە و دەزرینگێتەوە.

(سیمفۆنیای داستانی دووگردکان)، کە هەر بەخەیاڵ لەسەر هەیکەلی سیمفۆنیایەکی موزیکی کلاسیکم داڕشتووە، لە چوار بزووتنەوە (movement) پێک دەهات: چلەکان، پەنجاکان، شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم کە خۆشی و ناخۆشی ژیانی ڕۆژانەی ئاسایی دانیشتوانی ئاوایی لەخۆ دەگرت هەرچەندە کە ئەمن خۆم لە

زۆرترایەتیی ئەو ساڵانە بە فیزیکالی لەوێ نەبوویمە بەڵکو تەنیا دوور بە دووری بە دڵ و بە هۆش. وەک کە لە هونەری دارشتنی هەیکەلی سۆناتا فۆرمی موزیکی کلاسیکیش (sonata form) باوە ئەمنیش سەرایەکی کورت (introduction)م لە شێوەی حەیران خستۆتە پێش بزووتنەوەی یەکەم:( تێبینی: کە لەم حەیرانەدا دەڵێم سێ لکە لێرەدا مەبەستم هەرسێ گەڕەکەکەی دووگردکانە):

* حەیران، ئەمن ئەورۆ هێواریێ زەینێ خۆم دەداوە دووگردکانی ڕەنگین لەمن دارەکی سێ لکە.

* دەنگۆ گەلینە گەلی براو برادەرینە وەرن بە چاویێ من بڕۆننە ڕەفتوڕۆینی بەژنێ باریک وەکی دێتەوە لە ڕێی سراوێ جەڕەی لەسەر شانی چەندە ناسک و شلکە.

* ئەوجا ئەمنی خانەوێران دەمگۆتە ئەوێ نازدار حەیرانێ خۆزگەمان بە هەینێکە وەکی لە جێیێ ژوانێ دەگەیشتینە یێک ئەمن تازە دامنابوو خەتیێ سمێرێ ئەتوو تازە داتدەنا بنیێ مەمکە.

بەڵام فینالەکەی (finale) ئەم سیمفۆنیایە بە کۆدایەکی (coda) زۆر تراژیک کۆتایی دێت کە نەک هەر بەسەر دووگردکان بەڵکو بەسەر تەواوی دێهاتی کوردستاندا هات: ئەنفالی ڕەش.

ئەمن ئەم فینالە تراژیکەی دووگردکانم بەم هەڵبەستە نمایش کردووە:

گردی دووگردکان
داخەکەم گردی دووگردکان
چەندە بە دیدار عەزرەتم
ئا ئێستا جەستەی شەکەتم
دڵی زامداری لەتلەتم
تاوێ لەلات بسرەوێنم
خۆم لەم دنیایە دەربێنم
بچمە دنیایەکەی ئەودیو

بۆ لای یارانی خێر نەدیو
بۆ لای جوتیار و گاوانی
لای گیشەکەر و سەپانی
بابەلباب هەر دووگردکانی
بۆ لای مام عەوڵا و حەمەد و
عەیشۆک و پلکە سوڵتانی
بۆ لای نەختێ و خانەگور
خامەک و پلکە بسکانی
دەستێ لە ملی کاکم کەم
سەرێ بە سینگی داکم کەم
شەوێک لەگەڵیان دانیشم
لەسەر گردی سەید وەسمانی
سکاڵا بۆ یەکدی بکەین
بەیادی ڕۆژانی جوانی
سەربردە و دەردی دڵمیان
بۆ باس بکەم تا بەیانی
ئەوجا بێمەوە ناو ژینی
پڕ لە خەمی دنیای فانی
چەند وردە کەستەکی ماوە
لەو سێ گەڕەکە ڕووخاوە
هەمووی بە ماچ و چاو تەڕکەم
بە سەروکۆکرم وەرکەم
چاوێ بە هەوارگەی وێران
بە کەرتەخشتی جێماوی
کاولە دیوەخانی شێران
دا بگێڕم و ببینم
دووبارە وێنەی ڕۆژانی

هەوەڵ بیست ساڵەکەی ژینم
دە وەرنەوە، دە وەرنەوە
ڕۆژانی ڕابردووی ژینم
من لەگەڵ خۆتان بەرنەوە
با پتر پیری نەبینم

**(هۆمەر دزەیی، ئەمەریکا، 1989**
**دوای ئەنفالە ڕەشەکە.)**

لەپاش نەمانی دەسەڵاتی بەغدا لە کوردستان، مام جەلال کە چاوی بە کاولە دیوەخانە مێژووییەکەی دووگردکان دەکەوێت کە جارەهای جاران کۆبوونەوەی حزبی نهێنی و نەورۆزیان لێ دەکرد، گوتی ئێرە هەوارگەیەکی دێرینی خەباتی نهێنیی کوردایەتیمان بووە، بۆیە ئەمن ئەم خانووبەرەی کاک ئەحمەد و براکانی لەسەر حیسابی خۆم دروست دەکەمەوە و جوانتریش. هەر واشی کرد کە مایەی پێزانین و سوپاسگوزارییە بۆ ئەم وەفادارییە.

لە دووگردکان و لە زۆرترایەتیی گوندەکانی ئەو دەشتی هەولێرە وەک کە جاران لە زۆر وڵاتانی جیهانیشدا هەر وا بووە، چەندین چینی گوزەرانی - بەپێی باری دارارییان - لەناو گوندا هەبووە:

1 - ماڵی ئاغا کە خاوەنی هەموو زەوی و زاری گوندەکە بووە کە بەشێکی خۆی کێڵاویەتی و بەشێکیشی دەدا بە جووتیارەکان بە کرێی ساڵانە لە بەروبوومی داهات.

2 - ماڵی کێخواکان (ئەگەر گوندەکە کێخوای لێ بووا) کە لەپاش ئاغا گوزەرانیان لە هەموو خەڵکی تری گوند باشتر بوو.

3 - ماڵی جووتیارە مەڕدارە، مانگادارە، هێستردارەکان.

4 - ماڵی جووتیارە کەم دەرامەتە خاوەن جووتە کەر و ڕەنگە خاوەن یەک دوو سەر مەڕ و بزنیش.

5 - ماڵی چەند کەسانێکی ڕەبەنی بێ داهات و دەرامەتیش کە

شوانی و سەپانی و جووتیاریی ماڵە مەڕدارەکان و خاوەن جووتەکانیان دەکرد، یان گاوانیی گوندەکەیان پێ دەسپێردرا.

لەم توێژانەدا گاوانی لە ڕیزی هەرە ژێرەوەی ئەو قووچەکە (هەرەم)ە کۆمەڵایەتییە بوو. کرێی گاوان نانێک بوو، هەرماڵێک ڕەشەوڵاخێکی هەبوا و بەشداریی لە گاڕانی گوندا بکردایە، ڕۆژانە یەک نانی دەدا بە گاوانەکە. جا کاری گاوانی کردن لەناو کوردا - هەرچەندە کە کارێکی زۆر ئینسانی و شەریفانە بووە - ئەوەندە بەڕێز نەبووە چونکە گاوان لەو نانەی کە ڕۆژانە ماڵەکانی ئاوایی دەیاندایێ لەوە زیاتر هیچی تری شک نەدەبرد خۆی پێ بژێنێت و کەسیش حەزی نەدەکرد کچی خۆی بدا بە گاوانی لات.

دەڵێن (قسە قسە ڕادەکێشێت) و چونکە باسی گاوان دەکەم لێرەدا دەبینم کە جێی خۆیەتی لادانێکی کاتەکی لە کرۆنۆلۆژی سەربردەکەم بکەم و چیرۆکی ئەو کچە گاوانەتان بۆ بگێڕمەوە کە مێردی بە کوڕە ئاغا نەکرد. کوڕە ئاغاکەش خۆم بووم.

## کچە گاوانەکەی مێردی بە کوڕە ئاغا نەکرد

ئەمن تا ماوم لەبیرم دەرناچێ کە لە هاوین و سەرە پایزی ساڵی 1967 لە گوندی لێنگریز Lenggries لە ناوچە شاخاوییەکانی باڤاریای ئاڵمانیا Oberbayern وانەی زمانم لە قوتابخانەیەکی تایبەت دەگوتەوە کە لە دەرەوەی گوند بوو.

لەپڕ ئاشق و شەیدای کیژۆڵە گاوانێکی شانزدە ساڵی بووم کە هەموو ئێواران تووشی دەبووم دارێکی بە دەستەوە بوو و هێدی هێدی لەپشت گاگەلەکەی دەڕۆیشت کە لە لەوەڕگای بەرزاییەکانی نزیک گوند دەیهێنانەوە خوارێ بۆ ئاوایی.

ئەمن ئۆتۆمۆبیلێکی سپۆرتی ڕەنگ سووری دوو نەفەریی سەر تەنتەی ڕەشی convertible مارکەی ئینگلیزی Triumph - Spitfireم

هەبوو کە ژمارەی فرانسیی پێوە بوو، چونکە ساڵێک پێشتر کە لە پاریس دەمخوێند کڕیبووم.

زۆر جار بۆ ئێوارە کە لە قوتابخانەکەم دەگەڕامەوە بۆ ماڵ دەگەیشتمە کیژۆڵە گاوانە نەشمیلانەکە و بەبێ ویستی خۆم یەکسەر لەگەڵ گاوانەکانی دووگردکانم بەراورد دەکرد، ماشینەکەم لە قەراخ ڕێگا دەوەستاند و ڕەگەڵ خانمە جوانەکە و گایەلەکەی دەکەوتم تا نزیک ئاوایی قسەی خۆشمان دەکرد، ئینجا لێک جیادەبووینەوە و من بەدڵساردی دەگەڕامەوە بۆ لای ترومبێلەکەم. گاوانە ژیکەلە پانتۆڵێکی تەسکی بۆ هەینێکە باوی تا بەلەکی لە پێ دەکرد و کراسێکی تەنکی تا کەمەری کورت و قۆڵ کورتیش کە هەر بەخۆی هەردوو لچکی پێشەوەی لە هەوراز ناوکی گرێ دەدا. ئەوەندەی لەگەڵیدا دەمکرد و دەمکڕاند ببین بە هاوسەر بەڵام دڵی نەرم نەدەبوو و دیارە، یان ڕەنگە، ئەوی پانزە شانزە ساڵی بە منی سی ساڵی ڕازی نەبووبێ، یانیش لەوانەیە من تیپی ئەو نەبوویمە و بۆ ئەو ڕەزاگران بووبم، نازانم. ئاخر بۆ ئەو سەردەمە نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر جوانترین کچی نەوجوانی teenager ئەورووپا شلی دەکرد بۆ کوڕەلاوێکی خاوەن ئۆتۆمۆبیلێکی سپۆرتی دوو نەفەری و هێشتا سەرنجکێشتریش دەبوو ئەگەر ترومبێلەکەی ژمارەی فرانسیی پێوە بوا و یەکسەر ئاشقی دەبوو و بەبێ دوودڵی بە هەموو داخوازێکی ڕازی دەبوو بەس ئەو هەلە زێڕینەی (کوڕێکی جوان و جەحێڵ و دەوڵەمەند)ی لەدەست نەچێ. ئەم کچە گاوانە وا نەبوو. ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەژنە شلک و باریکەلە و قژە زەردە لووسەکە و چاوە شینە کاڵەکان و ڕەنگ و ڕوخسارە گوڵەباخییە جوانکیلەکەی ئەو کیژۆڵە گاوانە ئاڵمانەم لەبەر چاو لاناچێ.

ئەمنی کوڕە ئاغا دەستیشیم ماچ دەکرد ئەو کچە گاوانە گیانە مێردم پێ بکا، بەڵام کچە گاوان بە کوڕە ئاغا ڕازی نەبوو.

لادانەکەم لێرەدا تەواو بوو، ئینجا با بگەڕێمەوە بۆ سەر بابەتەکەی

خۆم.

سەپانی و جووتیاریش بە ڕێککەوتنی پیشەکی بوو لەگەڵ خاوەن زەوی. هەر گوندێکیش ماڵی مەلایەکی لێ بوو بۆ بانگدان و پێشنوێژکردن و کاروباری شەرعی. گوزەرانی ماڵی مەلاش بە زەکات و سەرفترەی ساڵانەی هەموو ماڵە جووتیارەکانی گوند و هەروەها لە ڕێگای چێشتانەی ژن مارەکردن و ژن تەڵاقدانیش دابین دەکرا. هەندێ ئاغاش هەبوو -وەک ماڵی ئێمە - کە ساڵانە شکارتەیەکیان بۆ مەلای گوند دەکرد بەڵام ئەمە هەر وا وەک خێر بوو نەک واجیب. خۆ ئەگەر گوندەکە جگە لە مزگەوت مەدرەسەشی لێ بوا کە ئەوەش هەر لەناو مزگەوتەکەدا دەبوو ئەوا ژمارەیەک فەقێ لە دێهاتەکانی دووری ئەو گوندەوە ڕوویان تێ دەکرد بۆ خوێندنی ئاینی ئیسلام و وەرگرتنی بڕوانامەی شەرعی ئیسلامی (ئیجازەی مەلایەتی) کە بتوانن ئیتر بە ڕەسمی مەلایەتی بکەن. لە زمانی کوردیدا کە دەڵێی مەدرەسە ئەوە مەبەست تەنیا قوتابخانەی خوێندنی شەرعی ئیسلامییە. فەقێکانیش هەموو ئێواران ماڵ بەماڵی ئاوایی دەگەڕان بۆ (رادبە) وەرگرتن. ڕادبە کە لە (راتب)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە بریتی بوو لە چەند کەوچکێک لە چێشتی ئەو ماڵانەی ئەگەر ئێواران شێویان لێ نابوا، ئەگینا هەر نانی ڕووتیان دەدانێ. بە نەریتیش وا باو بوو کە هەموو ئێواران دوو فەقێ لەبەر دەرگای حەوشەی هەر ماڵێک دەوەستان و بە دەنگێکی بەرز بۆ ئەوەی ماڵەکە لە ژوورێ ئاگایان لێ بێ بانگیان دەکرد: "رادبە ڕەحمەتو لێ بێ"، ئیتر یەکێکیش لە ماڵەکە دەهات خواردنەکەی بۆ دەهێنان. جاری واش دەبوو کە کچێکی تازەپێگەیشتووی ماڵەکە کە ڕادبەی دەدایە دەستی فەقێکان دەستی لەگەڵ یەکێک لەو فەقێیانە تێکەڵ دەکرد چونکە فەقێکان لە تەمەنی نەوجوانیدا بوون و زیاتریش لە کوڕەکانی دیکەی ئاوایی پۆشتە و پاک و جامانە قیت و جوان و بۆنخۆش بوون، ئەمانە لە خوێندن زیاتر هیچ کاری دیکەیان نەدەکرد بۆیە هەمیشە خاوێن و باوێن

بوون و بۆن ئارەقەی سەر پەرێز و بۆنی گنجی و پشقلی ناو مێگەلە مەڕەکانیان لێ نەدەهات. زۆر جاریش فەقێی بەدبەخت سەگی ئاواییان تێ بەردەبوو هەرچی لە ڕادبە کۆیان کردبۆوە هەموویان لێ دەڕژا. ئەگەر ئاغای گوندێکیش قاوەچیی هەبوا کە قاوەکە لە دیوەخانی ئاغا بۆ هەموو پیاوەکانی گوند بوو ئەوا هەر ماڵە خاوەن جووتێک دەبوایە ساڵانە یەک شەغرە گەنم بۆ قاوەچی لەسەر جۆخین ڕوو بکات (دواتر باسی شەغرە دەکەم چییە). زۆر گوندیش - هەموو نا - ماڵە جووێکی لێ بوو کە ئەویش کاری خومکاری و جۆڵای بۆ گوند دەکرد و هەندێکیان وردەواڵە و پێداویستیی ناوماڵیشیان بە هێلکە و خوری و دانەوێڵە ئاڵوگۆڕ دەکرد.

ئەم توێژانە هەمووی لە دووگردکان هەبوون. هەر یەک لە سەرۆکی ئەم خێزانانە بە گوێرەی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی خۆی و تەمەنی خۆی لەناو گوندا ڕێزی لێ دەگیرا هەم لەلایەن ئاغای گوند، هەم لای مەلا و هەم لای سەوادی میللەتەکەشەوە. ئەو پیاوماقووڵانەی دووگردکان کە ڕیشسپیی گوند بوون و پێشتر لەگەڵ حەمەدەمیناغای بابم گەورە بووبوون هەموویان لە کاک ئەحمەدی براگەورەکەمان بەتەمەنتر و دیارە بە ئەزموونتریش بوون. جا هەر ئەوانیش دەبوونە شتێکی وەک ئەنجومەنی ڕاوێژکاریی ئاغای گوند لە کاروباری کۆمەڵایەتیی گوندەکە وەک کێشەی نێوان خێزانان، قاتوقڕیی ساڵانی نەهاتی یان ئەگەر پۆلیسی حکوومەت بهاتایە گوند بۆ بردنی گەنجە ناوهاتووەکان بۆ سەربازی ئەوا ئەم کێشانە هەمووی بە کۆبوونەوەی ئاغا لەگەڵ ڕیشسپییەکان تاوتوێ دەکران و بڕیاریان لەسەرا دەدرا. لەسەر ئاغای گوند بوو داکۆکی لە جووتیارەکانی خۆی بکات لە هەموو بوارێکدا و لەگەڵ دامودەزگاکانی حکوومەتیش. لەسەر جووتیارەکانیش بوو بەرامبەر بەو بەڕێوەبردنەی گوندەکەیان لە لایەن ئاغاکەیانەوە هەندێ باج و سەرانە و سەرفیسی تایبەتیی پێشکەش بکەن و تەنانەت لە کاتی شەڕە عەشایردا یان لە کاتی یاخیبوونی ئاغاکەیان

لە حکوومەت چەکیشی لەگەڵا هەڵگرن. جا وەک کە هەنگی لە سەردەمی فیۆدالیزمی دونیاشدا باو بووە لەوێ پرینسی باش و بەبەزەیی و هی خراپ و زاڵمیش هەبووە و لای ئێمەش ئاغای باش و بەبەزەیی و ئاغای خراپ و زاڵمیش هەبووە کە زێدەڕۆییان لە وەرگرتنی باج و سەرانە دەکرد یان بەپێچەوانەوە وەک کاک ئەحمەدی براگەورەی ئێمە و زۆر ئاغای دیکەش کە ئەسڵەن زۆرێک لەو باج و سەرانانەیان هەر نەهێشتبوو. بەڵام چاک یان خراپ، سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی لەناو هەر گوندێکا هەبوو، هەر ڕووداوێکی ناخۆش ڕووی بدابا سکاڵا لای ئاغا یان ئاغاژن دەکرا و بە ڕاوێژکردنی هەموو لایەک مەسڵەتیان پێ دەکردن و ئاغا نەیدەهێشت کێشەکە بگاتە حکوومەت. بۆیە دەکرێ بڵێین کە کۆمەڵگای گوندی کوردەواری بەم هایرارکییە (hierarchy) واتا قووچەکە کۆمەڵایەتییە - سیاسییەی کە لە دێرزەمانەوە وەک داب و نەریتێکی داکوتراو لەسەری دەڕۆیشتن جۆرە (مینی ستەیت Mini state) واتا دەوڵەتۆکە، یان (سیتی ستەیت city state) واتا دەوڵەتی شار بووە کە لە ئەورووپای تەمەنە ناوەندییەکان هەر ئەوە سیستەمی حوکمڕانی بوو. ئەو دەوڵەتی شارەش، کە لەناو عەشایری کوردەواریدا زیاتر دەوڵەتی گوند بوو، موڵکی ئاغا بوو چونکە خۆی خاوەنی هەم زەوی هەم ڕەعیەتەکەش بووە. ئەمە لە سیستەمی فیۆدالیزمی feudalism ئەورووپای تەمەنە ناوەندییەکانیش هەر وابووە.

## رۆژگار و شەوگارێکی گوند لە سالانی مندالیی من

چۆنیەتیی ڕۆژ و شەو بەسەربردنی دانیشتوانی لادێی کوردستان لە ناوچە بۆ ناوچە دەگۆڕێ. لەوانەیە گوندیەکانی ناوچە شاخاوییەکان کە داهات و بەروبوومیان لەسەر ڕەزەوانی و توتنەوانی و مەرەزە و ئاژەلداری وەستاوە ئەوانە پیاوەکانیان بەردەوام خەریکی ئاودێری و شوانکارەیی بن و ژنەکانیشیان مەڕدۆشین و مەشکە هەژاندن و ماست و پەنیر و لۆر دروستکردن. ئەمن وای بۆ دەچم کە ئەوانە دەبێ شەو و ڕۆژ سەرقالی ئەم کارانە بووبن کە بەڕاستی کاتی زۆری پێ دەوێ.

هەرچی دانیشتوانی گوندی دەشتەکانە، وەک دووگردکانەکەی خۆم، ئەوانە ئەو سەرقالی و پڕکارییەی گوندەکانی ناو شاخەکانیان نەبوو. چاییەکان ژیانیان زۆر سەختتر بووە لە دەشتەکییەکان. ئەمانەی دوایی چون هەر بەتەمای وەرزی باران بووینە چەند مانگێکی کەمی سالی لێ دەربێنی تەواوی سالەکەیان بەبێ ئیشوکار، بە کەمالی ئیسراحەت لە پەنا دیواری مزگەوت یان لە هەیوان و سەرسەکۆی دیوەخانی ئاغا بە جگەرەکێشان و یاریی دامە بەسەر دەبرد.

لای ئێمە پایزان دەست بە جووتکردن و تۆوکردن دەکرا و زستان و سەری بەهاریش شۆ دەبڕا و وەرد دەدرایەوە بۆ ئەوەی زەویەکە بۆ تۆوکردنی پایزی داهاتوو ئامادە بکەن. ئەمەش زۆری نەدەبرد و دیسان لێیان پال دەدایەوە و چاوەڕێی ڕەحمەتی خوایان دەکرد بۆ باران. ئەمە جاران لە سەردەمی مندالیی من وابوو کە بەڕاستی سەرقالییەکی وا زۆری پێویست نەدەکرد. هیچی تریان نەدەکرد و ڕاستیەکەشی ئەو سەردەمە هیچی تر نەبوو بیکەن تا کاتی دروێنە دەهات لە مانگی پێنجەوە بەدوا. ئیتر ئەوەیشیان بە چەند مانگێک بە ئەنجام دەگەیاند و قرشەکەیان بە شەغرە دەگواستەوە بۆ سەر جۆخینان لە قەراخ ئاوایی، لەوێ گێرەیان دەکرد، بە جەنجەڕ دەیانکوتایەوە و شەنەبایان دەکرد

ئیتر گەنم و جۆیەکە بەتەواوی ئامادە دەکرا. دوایێ ئەوە دووبارە لێیان پاڵ دەدایەوە. بەڵام پایزان هەر ماڵە و خەریکی سواخدانی سەربانی خانووەکانیان دەبوون و بۆ زستانیان ئامادە دەکرد کە درۆپە نەکات.

ئەمن سوپاس و پێزانینی زۆرم ئاراستەی برادەری منداڵیم کاک شێرکۆی محەمەدی مەولود هەولێری دەکەم کە ئەویش وەک من خەڵکی دووگردکانە و سەرچاوەی زۆرێک لەم زانیارییانەیە لەسەر ژیانی ناو گوند.

جا وەک کە روونم کردەوە ژیان و سەرقاڵیی رۆژانەی دانیشتوانی ناوچە دەشتاوییەکانی کوردستان جیاوازە لەوەی دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان. زۆر سروشتییە مرۆڤ خۆی لەگەڵ تۆپۆگرافی و کەشوهەوای ئەو دەڤەرە بگونجێنێت کە لێی دەژیت و هەر ئەو کار و کاسبییانەش بکاتە پیشە کە بۆ ئەو شوێنە دەست دەدەن.

گوندەکەی من دووگردکان لە پێدەشتایە و بەم حیسابە منیش دەشتەکیم. بەڵام لە شاخا بێ یان لە دەشت کوردی لادێ بە گشتی بە دوو پیشەوە سەرقاڵن، یان سەرقاڵ بوون، چونکە ئەمرۆ شت زۆر گۆڕاوە: کشتوکاڵ و ئاژەڵداری. کشتوکاڵیش لە دووگردکان لە سەردەمی منداڵی و نەوجوانیی مندا چاندنی گەنم و جۆ بوو و ئاژەڵدارییەکەش بەخێوکردنی مەڕ و بزن و گاگەل. لەبیرمە هێشتا هەندێ کاریز لەو دەشتی هەولێرە و لە بەرزاییەکانی هەندێ گوندی لای قوشتەپە مابوون کە لەوێ مەرەزەشیان دەکرد و برنجێکی زۆر بەتامی لێ بەرهەم دەهات بەتایبەتی برنجی گردمەلا و قوشتەپە و داڵداغان و برایمەلەک و پیرداود و تەندوورە. بەداخەوە ئەمرۆکە نە کاریز ماون و نە ئەو برنجە بەتامەی جارانیش.

جا لەبۆ بەرهەمهێنانی گەنم و جۆ ئامێری کشتوکاڵی تایبەت بەو دوو جۆرە دانەوێڵەیە بەکار دەهاتن هەر لە یەکەم رۆژی تۆوکردنیان تا پێ دەگەیشت وەک خۆراک یان بۆ فرۆشتن. گەنمەکە بۆ نان و ساوار و بروێش و پیرخەنی و داندۆک و زۆر خواردەمەنیی تریش

بەکار دەهات بەڵام خێزانە کەمدەرامەتەکان جۆ یان مزاشیان بۆ نان بەکار دەهێنا چونکە جۆ لە گەنم هەرزانترە، مزاشیش تێکەڵەیەکی گەنم و جۆیە. جۆ لای ئێمە بۆ ئاژەڵ بەکار دێ کە لەگەڵ کا تێکەڵ دەکرێت. جاران نەماندەزانی نانی جۆ بۆ تەندروستی باشترە کە ئێستا وا ماڵە دەوڵەمەندەکانیش لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهانا زیاتر نانی جۆ یان نانی بە کەپەکەوە بۆ خواردن بەکار دێنن.

ئامێری کشتوکاڵ لەلایەن دارتاشەکانەوە لە شاری هەولێر دروست دەکران. ئەمانە دارتاشی تایبەت بەو ئامێرانە بوون و کووچەی تایبەتی خۆیان لەناو قەیسەریی هەولێردا هەبوو و ئێستاش هەر ماون هەرچەندە کە لەم سەردەمە، کە تێکنۆلۆژیای مۆدێرنی تایبەت بە کشتوکاڵ شوێنی ئەو ئامێرە دارە تەقلیدیانەی جارانی گرتووەتەوە، هەندێک لەو ئامێرە دارە کۆنانە هێشتا هەر پێویستن و دروست دەکرێن. ئەمن ئەگەر لە هەولێر بم زۆر جار مەلی نۆستالجیا لەسەر شاپەڕی باڵی خۆیم دادەنێت دەمبا بۆ ناو کووچەی نەجاران لە قەیسەریی هەولێر و لەوێ تینوویەتیی بیرەوەرییەکانم بە گەڕانێک بە بەردەم دوکانی ئەو دارتاشانە دەشکێنم، دوو قسە لەگەڵ دارتاشەکان دەکەم و زۆر جاریش هەر لەوێ بۆ نیوەڕۆ نان و کەبابێکی گەرم و ماستاوێکی سارد - بێ ئێوە ناخۆش - لە (کەبابخانەی نەجار) نۆش دەکەم. ئەم کەبابخانەیە لەوەتەی ساڵی 1938 لەوێیە.

**ئامێرە کشتوکاڵییەکانی جاری جاران**

ئەمن چ بەتەما نەبووم چەند چاپتەرێک لەم نووسینانەم بۆ باسکردن لە ئامێرە دارە کۆنەکانی کشتوکاڵ تەرخان بکەم ئەگەر ئەم لایەنەی کولتووری ئێتنۆگرافیکی کوردەواری - تەبای گەلێک لایەنی تریش - ئەوها بەبێ ناز، بەبێ خاوەن نوقمی بن دەریای فەرامۆشی نەکرابان. بۆیە سوپاس و پێزانینی هەموو لایەکمان دەبێ ئاراستەی چەند تاکە کەسێکی خۆبەخشی دڵسۆز و وەرامبار بکرێت لە ناویاندا: دامەزرێنەری مۆزەخانەی ڕستن و چنین کاک لۆلان لە قەڵای هەولێر،

دامەزرێنەری کەناڵی تی ڤی ڕەسەن لە هەولێر کاک هوشیار نوری لەک، دامەزرێنەری موزەخانەیەکی تایبەت لە قوشتەپە کاک داود شرۆڵ و هەندێ تاکی تریش کە قۆڵ و باسکی مەردایەتیان لێ هەڵکردووە و لەناو دووکانێک یان لە ماڵی خۆیان بە پارەی خۆیان هەندێک لەو کەلەپوورانەیان لە بزربوونی هەتاهەتایی ڕزگار کردووە.

ئامێری کشتوکاڵی جاران زۆر بوون و بۆ من نەک هەر ئیمڕۆ کە ئەگەر بەرێکەوت لە شوێنێکا بەرچاوم بکەون بەڵکو، بەبێ پێوەنان، دەتوانم بڵێم کە ئەم جۆرە کەلوپەلانە لە ڕۆژگارانی منداڵیشم لە دووگردکان هەمیشە دیمەنێکی هەست و هەناو فێنککەرەوە بووینە کە نەک هەر بە چاوی عەینی بەڵکو بە چاوی زەینی چێژم لێ وەردەگرت. ئیمڕۆ تەریب لەگەڵ بۆن گوڵاوی Chanel و Armani و Dior کە خۆمیان پێ بۆنخۆش دەکەم بۆنی کاو کادین و هەوێز و مۆڵگە و ورشەی قرشە و قەسەر و زۆر لەو بۆنە سرووشتییانەی لادێی جارانیش مووچڕکێکی غەریبی و نۆستالجیایەکی تا ڕادەی مێلانکۆلیکم لەناو دڵ و دەروونەدا دەئافرێنن و تێکەڵەیەکی غەمگینی و شادی بە ئارەزووی خۆم و بە حەزی خۆم دامدەگرێ، حەز دەکەم بمگرێنێ. ئیمڕۆش لە هەر شوێنێکی ئەوروپا یان ئەمەریکا یان هەر شوێنێکی دیکەی جیهانا بم بەدڵ حەز دەکەم سەردانی گوندەکانیان بکەم و تینووەتیی (عەین و زەین)م بە دیداری ژیانی سادە و ساکاری گوند و دیمەنی مێگەل و گاگەل بشکێنم.

ئەدی نزیکەی 30 ساڵ لەمەوپێش لە ئەمەریکا ئەم چەند بەندەم بۆ ژیانە سادەکەی کوردەوارییەکەی خۆمان هەڵنەبەستاوە کە ئەمە بەشێکیەتی!:

خۆشیی من لەسەر پەرێزە
لەژێر داربەڕوو و دارگوێزە
لەگەڵ جوتیار، لەگەڵ پاڵە
لەناو ئەو دۆڵ و ئەو یاڵە
خۆشیم لە هەوجاڕ و داس و
گشت ئامێری کشتوکاڵە
لەگەڵ ڕەنجبەر، لەگەڵ کارکەر
لەگەڵ گیشەکەر و دارکەر
لەناو زەوی و سەرخەرمانە
لەژێر ئەو ئاسمانە جوانە
خۆشیم لە تەلان و هەردە
خۆشە ئێستا لەپێم ڕاچێ
سەت قونجرکە و دڕکەزەردە
بۆنی لەودەی کام پێخۆشە
تۆزی شەنەبام پێخۆشە
چەند خۆش بوو سەردەمی پێشان
کە بانگ دەکراین بۆ کاکێشان
هەر لەدوای بانگی شێوانا
کچ و کوڕ لەسەر خەرمانا
کوڕ بە کا ڕەشکان پڕ دەکەن
کچ بە با مەمکان خڕ دەکەن
بە بازدان و زۆرانێ و پاڵ
کوڕ بە زۆڵی خۆی دەخست و
دەکەوتەسەر یاری مناڵ

لەناکاو دەبووە بێدەنگی
دوو مەمکۆڵەی خەپەتۆڵەت
وێکڕا دەکەوتنە دوڕ چەنگی
وەک تۆزی سەر میوەی سەر دار
کوڵمی کاڵیم دەسڕیەوە
بە لێوی بۆ ماچ شێت و هار
بە دەنگی پڕ لە شەرمەوە
هەناسەی خاو و گەرمەوە
کە دەیگوت "جارێ نا... دیارن"
وەها تێکەڵ دەبوو گیانمان
لەتوابێ ئاگر و دارن
ئێستاش ئەو چەند وشەی دوێنێ
تەزووم بە ناخا دادێنێ
گەوزە گەوز و ماچ ماچانێ
لەناو لەودە و سەرگێندانێ
لەلای من گەلێک خۆشتر بوو
لە چارپایەی شای ئێرانێ.

زیانی بۆ پەز نابێ ئەگەر هەر نەبێ هەروا سەرپێیی باسی هەندێ لە ئامێرە گرینگ و پێویستەکانی دەوری بەرێ بکەم کە بۆ کاروباری کشتوکاڵ بەکار دەهاتن. هەر نەبێ با منداڵە وردیلەکانی ئەمڕۆمان کە لە موزەخانەیەکی میللیی گەورەی ئێتنۆگرافیک بێ بەش کراون بیرۆکەیەک وەرگرن باب و باپیرانیان لەناو چ ژینگەیەکدا ژیاون. جاران لە دەشتی دزەیی و لە دەشتی هەولێر بە گشتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە سێ جۆر بوون: 1 - ئامێرەکانی جووتکردن 2 - ئامێرەکانی دروێنەکردن و گواستنەوە 3 - ئامێرەکانی کوتانەوە.

## ئامێره‌كانی جارانی جووتكردن، درووێنه‌كردن و كوتانه‌وه

### 1. ئامێره‌كانی جووتكردن

**هه‌وجاڕ**

ئه‌مه‌یان ئامێری هه‌ره گرینگ و پێویستی جووتكردنه به ئێستر یان گوێدرێژ یان گاجووت. له ناوچه ده‌شتاوییه‌كانی كوردستان و هه‌ڵبه‌ت له دووگردكانه‌كه‌ی خۆشم گا بۆ جووتكردن به‌كار نه‌ده‌هات. لای ئێمه ته‌نیا جووته هێستر و جووته كه‌ر هه‌بوو. گا زیاتر له ناوچه شاخاوییه‌كان بۆ جووت به‌كار ده‌هات. هه‌وجاڕ بریتی بوو له سێ پارچه‌ی سه‌ره‌كی: هه‌وجاڕه‌كه خۆی و مژانه و گاسن. هه‌وجاڕه‌كه لایه‌كی دارێكی ئه‌ستووری درێژ بوو كه (باسكه هه‌وجاڕ)یان پێ ده‌گوت لایه‌كه‌ی تریشی قوونكێكی زۆر ئه‌ستوورتر بوو كه پێی ده‌گوترا (قوونكه هه‌وجاڕ) و ئه‌مه‌یان لكێكی لێ ده‌بۆوه كه پێیان ده‌گوت (زمانه‌ی هه‌وجاڕ) و كۆتاییه‌كه‌ی ئه‌مه‌یان باریك ده‌بۆوه بۆ ئه‌وه‌ی گاسنی لێ گیر بكرێت. گاسن، ئاسن بوو و له‌و زمانه‌ی قوونكه هه‌وجاڕه‌كه گیر ده‌كرا و سه‌ره‌كه‌ی تیژ بوو و خاكی هه‌ڵده‌كۆڵی و هه‌میشه له‌ژێر خاكا ده‌بوو بوویه لووس و بریسكه‌دار بوو. له‌سه‌ر قوونكه هه‌وجاڕه‌كه‌ش دارده‌ستێك قوت ده‌كرایه‌وه كه (ده‌سته‌ندوو)یان پێ ده‌گوت له‌ویشه‌وه هێنده‌ی بستێك دارێكی تر ده‌رده‌چوو بۆ ئه‌وه‌ی جوتیاره‌كه ده‌ستی پێوه بگرێت و جووته‌كه‌ی به ڕێك و ڕاستی باژوا كه به‌مه‌ش ده‌گوترا (ده‌سته مسته). جوتیار به ده‌ستێك ده‌سته مسته‌ی ده‌گرت و دارێكی تریشی به ده‌سته‌كه‌ی تره‌وه بوو كه پارچه ئاسنێكی وه‌ك كه‌وچك به‌ڵام پانی پێوه بوو بۆ پاككردنه‌وه‌ی گاسن له‌و قوڕه‌ی كه پێیه‌وه ده‌نووسا و به‌مه‌یان ده‌گوت (لاپوته). ئه‌مه‌یان هه‌وجاڕ و گاسن. لایه درێژه‌كه‌ی هه‌وجاڕ

بە دارێکی تەرەوە دەبەسترایەوە کە پێی دەگوترا (مژانە). ئەوەی کە هەوجارِ و مژانەی بە یەکەوە دەبەستایەوە چەند تیلمە دارێکی چکۆلانە بوون بە ناوی (خەپە). ئینجا لایەکەی تری مژانە دەکەوتە سەر پیلی وڵاخەکان ئەوەش بە ڕێگای چەند ئامێرێکی دیکەی وەک (بنمل، نیر، کۆپەران، هیرتە) لەسەر پیلی وڵاخەکان گیر دەکراو بەم جۆرە وڵاخ و ئامێر ئامادە دەبوون بۆ جووتکردن.

سوپاس و پێزانینی بێ پایانم ئاراستەی کاک سەرتیپ دەکەم کە یەکێکە لە بەڕێوەبەران و خاوەنانی موزەخانەی ئێتنۆگرافیکی لۆلان لە قەڵای هەولێر کە ئاسانکارییەکی یەکجار زۆری بۆ کردم بۆ وێنەگرتنی هەندێ لە ئامێرە کشتوکاڵییەکان و ئی تریش. هەروەها سوپاس و منەتباری زۆریشم بۆ برادەری منداڵیم کاک شێرکۆی محەمەدی مەولود هەولێری دووبارە دەکەمەوە کە زانیارییەکی زۆری لەبارەی ئامێرە کشتوکاڵییەکان پێ داوم. بۆ باشتر تێگەیشتنی ئامێرەکان و پارچەکانیان تکایە سەرنجێ بدەنە وێنەکان.

## 2. ئامێرەکانی دروێنە و گواستنەوەی بەرهەم

کەرەستەی دروێنەکردن لە دەشتی هەولێر بریتی بوو لە داس، قەرانگ، قەیناغ، کەرەشاخ، کوندەی ئاو و دۆدان، سەرکڵاوی سەپانان کە مەرج نەبوو هەموو سەپانێک هەیبێ. کەرەستەی گواستنەوەی دروێنەکراوەکەش بۆ سەر جۆخینان (سەر خەرمانان) لە ئاوایی بریتی بوو لە شەغرە، گوریس، هێستر یان گوێدرێژێک.

لە دەشتی هەولێر بەو کەسەی کە دروێنەی دەکرد دەیانگوت (سەپان) و ئەو کەسەش کە ڕێبەرایەتیی هەموو سەپانەکانی دەکرد کە دیارە سەپانێکی شارەزای بەئەزموون بووە بەویان دەگوت (سەرپاڵە). ئەمانە وەک من بزانم هەموویان پیاو بووینە و نەمبیستووە

ژن کاری سەپانیی کردبێ مەگەر فەلاحێک کچی زۆر بوا و کوڕی نەبوا هەنگی لەباتی ئەوەی مەسرەفی سەپان و پاڵەی بەکرێگیراو بکات ڕەنگە کچەکانی چووبن دەغڵەکەی خۆیان دووریبێتەوە وەک کە شێرکۆی محەمەدی مەولوود هەولێری بۆی گێراومەتەوە کە جارێکیان سێ خۆشک لە گوندی گردعازەبان هەموو دەغڵەکەی ماڵەبابیان دووریەوە، ئەمە زۆر کەم ڕووی داوە.

ژمارەی سەپانەکانیش لە کاتی درووێنەکردندا بەپێی گەورەیی و بچووکی ئەو زەویە بووە کە دەیاندووریەوە. لە دوو سێ سەپانەوە بگرە تا دە دوانزدە سەپان پێکەوە درووێنەیان کردووە. لەتەک سەپانیش (گیشەکەر) و (تێلەکیش) هەبوون ئەمانە خرپیان ژن بوون و ژمارەیان لە سەپانەکان زۆر کەمتر بوو و کاری ئەوان کۆکردنەوەی ئەو (مەڵۆ)یانە بوو کە سەپانەکان دەیاندووریەوە و لە دوای خۆیانا بەجێیان دەهێشت. سەپانەکان (گیشەکەرەکان نا) بەیانییان سەرلەزوو دەچوونە سەر پەرێزێ و یەکسەر دەستیان دەکرد بە خۆشکردنی شوێنی (گیشە) و (گەلاوێژ) و کوندەی ئاو و دێمکە و دۆدانە و کەرەشاخی چەورکردنی داسەکان و سێبەرۆکەیەکیان بۆ دەکردن. لەپاش سەپانەکان بە ماوەیەک ئینجا کچە گیشەکەرەکان دەهاتن و نان و دۆیان لەگەڵ خۆ دەهێنا و ئەوانیش دەستیان بە کاری خۆیان دەکرد.

پرۆسەی درووێنەکە بەوە دەستی پێ دەکرد کە سەرپاڵە بەتەنێ لەمسەر تا ئەوسەری پەرێزەکە هێڵێکی ڕاستی دەدووریەوە کە ئەو هێڵە ئیتر دەبووە سنووری درووێنەکەی ئەو دەمەیان و پلانی ئەو ڕۆژەیان. بەو کارە تەنیاییەی سەرپاڵە دەگوترا (گاز) دەیانگوت سەرپاڵە چووەتە گازێ. کە دەگەڕایەوە هەموو سەپانەکان ئیتر دەیانزانی لە کوێوە دەست پێ بکەن و بۆ کوێ و تا کوێ بڕۆن، کورت و کرمانجی ئیتر پلانی خۆیان دەزانی. ئەمانە هەموویان بە ڕیز دەوەستان و سەرپاڵەکەش لە ناوەڕاستیاندا. یەکێک لە دەنگخۆشەکان کە بەندی

درویَنـەی زۆر لەبـەر بـوا دەسـتی بـە بەنـدان دەکـرد و سـەپانەکانی تریـش و کچـە گیشـەکەرەکانیش هەمـوو پێکـەوە بۆیـان دەگێڕایـەوە. بەم جۆرە بە دەنگ و ئاوازە نەرم و بەسۆزی بەندەکانی درویَنە کە هـەر هەمووشـی لەسـەر خۆشەویسـتیی کـوڕ و کـچ بـوو کارە قـورس و گرانەکـەی درویَنەکـردن بـەو قرچـەی گەرمـای چلـەی هاویـن سـووک و ئاسـان دەبـوو و سـەپان و گیشـەکەر لەلایەکـەوە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆماتیک کارەکـەی خۆیـان دەکـرد لەلایەکـی تریشـەوە دەکەوتنـە نـاو خـەون و خەیاڵـی ڕۆمانسـییەتی بەندەکانـەوە.

داس بـۆ درویَنـەی گەنـم و جـۆ لـە ناوچـە دەشـتاییەکانی کوردسـتان بـەکار دەهـات (سـەیرێکی ویَنـەکان بکـە) بـەڵام لـە ناوچـە شـاخاوییەکان و لـە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتانیش بێجگـە لـە داس ئامێـری (مەڵەغـان -کەرەنتوو)یشـیان بـەکار دەهێنـا کـە هـەر کتومـت وەک داس وابـوو بـەڵام زۆر گەورەتـر. مەڵەغـان لای ئێمـە نەبـوو. کـە داس کـول دەبـوو سـەپانەکان لـە کاتـی سانەوەیان لەبەر سێبەری کەپرۆکەیـەک چەوریـان دەکـرد بـۆ ئـەوەی تیـژ بێتـەوە. چەورییەکەشـیان لەنـاو قۆچێکـی شـکاوی بـزن یـان نێرییـەک هەڵدەگـرت بـۆ ئـەوەی لەبـەر تینـی هەتـاو نەتوێتـەوە و بەمـە دەگوتـرا کەرەشـاخ. سـەپان بـە داس دەغڵەکـەی دەدوورییـەوە و پـاش چەندیـن بڕینـەوە کـە ناولەپـی پـڕ دەبـوو و جێـگای زیاتـری لـێ نەدەبـۆوە ئـەوەی ناولەپـی لـە تەنیشـت خـۆی بـەردەداوە و گیشـەکەرەکانیش کـە لـە پشـت سـەپانەکان بـە ڕیـز دەڕۆیشـتن ئەوانیـش یەکسـەر بـە ئامێرێـک (قەرانـگ) هەڵیـان دەگرتـەوە و بـەم چنگـە دەغڵـە درواوەیـە دەگوتـرا (مەڵۆ) (سـەیرێکی ویَنـەکان بکـە). کچـەکان دەسـت و باسـک و مەچەکـی خۆیـان بـە کۆنـە گۆرەوییەکـی دووبـەدەر یـان بـە هـەر پەڕۆیـەک بـوا جـوان دەپێچایـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەو مەڵۆیـە زبـر و دڕکاوییانـە ئـازاری پێسـتیان نـەدەن. شـەکڵی قەرانـگ وەک داس وابـوو بـەڵام دەمەکـەی تیـژ و پـان نەبـوو بەڵکـو خڕۆکـی بـوو تەنیـا نووکەکـەی تیـژ بـوو. خـۆی سـەپانیش بـۆ ئـەوەی مەڵۆکان دەسـتیان نەبـڕن ئەوانیـش

شتێکی لە تەنەکە دروستکراوی وەک پەنجەوانەیان لە یەکە یەکەی پەنجەکانیان هەڵدەکێشا کە ناوی (قەیناغ) بوو.

گیشەکەرەکان ئەو مەڵۆیانەیان بە سینگی خۆیانەوە دەنا تا لێیان نەکەوێت و دەیانبردە شوێنێک کە پێشتر بۆیان دەستنیشان کرابوو و بەجوانی و بەڕێکوپێکی بە دوو ڕیزی درێژ لەتەک یەکیان دادەنان. بەو کۆمەڵە مەڵۆیانەیان دەگوت (گەلاوێژ) ئەگەر گەنم بوا و (گیشە) ش ئەگەر جۆ بووا.

لە زۆر بەندی دروێنەکردندا باسی ئەو گیشەکەر و مەڵۆیانە کراوە کە ئەمەیان تەنیا نموونەیەکە:

لە کێم دیت و لە کێم دیت
هێ برا لە وراتی کۆیێ
مەمکی یارێم گۆواینە
لەبەر هەرمی مەرۆیێ

دانانی مەڵۆکانیش هونەری تایبەتی خۆی هەبوو کە بیرێکی زانستیانەی لێ کرابۆوە. کە مەڵۆی گەنم لە پاڵ یەک دادەندران دەبوایە گوڵەکانیان لە لای دەرەوە بێت و لاچکەکانیش هی ڕیزی ئەمبەر و ئەوبەر بکەونە سەر یەکتری. هەرچی مەڵۆی جۆیە ئەمەیان بە پێچەوانەی گەنم گوڵەکانی هەردوو ڕیزان ڕوویان تێک دەکرد و ڕووی لاچکەکانیشیان بۆ دەرەوە یان بۆ سەرەوە دەبوو. ئەم شێوە دانانە لەبەر ئەوە بووە کە جۆ خزە و دەبوایە بە شێوەیەکی تایبەت لەسەر شەغرەی دابنێن هەتا لە ڕێگای گواستنەوەیان نەخزێت و نەکەوێت. هەرچی گوڵەگەنمە ئەمەیان بە لاچکەکەشییەوە دڕ و زبرە و بەئاسانی لەسەر شەغرە گیر دەبێت، یەکدی دەگرێت و ناکەوێت.

درەوی گەنم و جۆ لە کوردستان بەگشتی لە وەرزی هاویندایە. کارێکی زۆر سەخت و ناخۆشە چونکە دنیا گەرمە و سەپانیش تا ئێوارە دەبێ پشتی بچەمێنێتەوە. سەپانەکان کلاوێکی قووچی لە خوری دروستکراویان لەسەر دەنا کە پێیان دەگوت (سەرکلاو) و بەنێکیشیان

لە نیوچەوانیان دەبەستا کە گوڵنگ بەملا و ئەولایان شۆڕ دەبۆوە بۆ ئەوەی کە ئارەق بە نیوچەوانیاندا دەهاتە خوارێ، نەگەیشتبایە چاویان و بەنەکە دەیگێڕایەوە و ئارەقەکە ڕێڕەوی خۆی دەگۆڕی و درۆپ درۆپ بەملا و ئەولای گوڵنگەکاندا دەتکانەوە.

سەپانی باش و بە ئەزموون هەبوون و ئی وەهاش کە نوێ بوون بۆ ئەم کارە. بۆ ماوەیەک بەو تازە هاتووانەیان دەگوت (نیوەسەپان) تا چاک فێر دەبوون و ڕادەهاتن.

زۆر جاریش دەبوو بە پێشەبڕکێ لەنێوان سەپانە باشەکاندا بەتایبەتی ئەگەر گیشەکەری جوانیان لەگەڵ بوایە. دەگێڕنەوە دەڵێن سەپان هەبووە چەند مەڵۆیەکی داوەتە گیشەکەرێک و پێی گوتووە بگەڕێتەوە بۆ ئاوایی گەنمەکە بە دەستهار بکوتێ و بیکا بە ئارد و بیکا بە نان و بێتەوە لایان و ئەویش شەرت دەکات هەتا کچەکە نانەکە بە گەرمی نەیەنێتەوە ئەو پشتی خۆی ڕاست نەکاتەوە. ئەم قسەیە گوتراوە جا نازانم چەندی ڕاستە چەندی پێوەنانە. لە کاتی درووێنەکردنا نەریتێک هەبووە پێیان دەگوت (سوارە). ئەگەر ئەسپسوارێک ڕێگاکەی بەلای ئەو سەپانانەدا بوایە سەرپاڵەکە مەڵۆیەکی بۆ بلند دەکرد و دەیگوت: "سوارە... فلان ئاغا سوارە!" ئیتر تازە دەبوایە ئەسپسوارەکە بۆ ئێوارە نانێکی گەرمی باشی وەک ناسکەنان یان هەرمیشک بۆ سەپانەکان ساز بکات. یان ئەگەر سوارەکە خەڵکی گوندەکەی خۆیان نەبوایە لەوانەیە هەر لەوێ خەلاتێکی بچووکی پێشکەش بکردبان. هەشبوو هیچی نەدەدا.

### شەغرە

شەغرە ئامێرێکی دارینی کتومت وەکو پەیژەیەکی دوولایی وابوو ئەوەی کارکەرەکانی کارەبا بۆ بەستنی گلۆپ و تێل و ستوونی کارەبا بەکاری دێنن (سەیرێکی وێنەکان بکە). شەغرەکێشیش ئەو کەسە بوو کە بۆ ئەو کارە بەکرێ دەگیرا و کاری ئەو هەر ئەوە بوو لە بەیانی تا ئێوارە دەغڵە دووراوەکە لەسەر پەرێز بگوازێتەوە بۆ

سەر جۆخینان. شەغرەکە دەخرایە سەر پشتی هێستر یان گوێدرێژ و گیشەکەر و شەغرەکێش پێکەوە مەڵۆکانیان لەملاو ئەولای شەغرەکە بە گوریس توند دەبەستایەوە تا نەکەوێ. ئەگەر شەغرەکە بە چاکی و بە ڕێکوپێکی نەبەسترابایە لەوانەیە لە ڕێگا بەلادا بچووبا و بکەوتبا. کەوتنی شەغرە لە ڕێی گواستنەوە پێی دەگوترا (شەغرە زا) جا کە شەغرەیەک دەزا دەبوایە خەبەر بۆ سەپانەکان بنێرن یەکێکیان بچێ شەغرەکە سەرلەنوێ لێ بنێتەوە. شەغرەکێش کە شەغرەی بە پری پێبوو لە دوو ئاژەڵەکە دەڕۆیشت بەڵام کە شەغرەکەی لەسەر جۆخین بەتاڵ دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ سەر پەرێز ئیتر سوار دەبوو و لە خۆشییان دەستی بە گۆرانی دەکرد.

## 3. پرۆسە و ئامێرەکانی کوتانەوە

**جۆخین (خەرمان)، گێرە، جەنجەڕ، شەنەبا، ڕەوسە**

لە دەشتی هەولێر بە خەرمان دەڵێن جۆخین، هەموو گوندێکی دەشتی هەولێر یەک دوو سەرجۆخینی لێیە کە گۆڕەپانێکە لە پەڕگەی گوند و تەرخان کراوە بۆ جۆخینەکانی هەموو ئەو ماڵانەی ئاوایی کە جووتیان گەڕاوە و جۆخینەکانیان تا ڕادەیەک لە نزیک هی یەکتری دادەبەستن. شەغرەکێش ڕۆژانە بڕێکی زۆر لە گەنم یان جۆیە درواوەکە لە پەرێزەوە دەگوازێتەوە بۆ سەر جۆخینان و ئێواران کە سەپانەکان دەگەڕێنەوە ئیتر چەند هێسترێک دێنن گێرەیان لەسەر دەغڵە درواوەکە پێ دەکەن و هێسترەکانیش هەموویان بە قەوچ و ڕێشمە بە یەکتریەوە بەستراونەتەوە و ئەو هێسترەی کە دەکەوێتە لای ناوەوەی گێرەکە هێستری بنەی پێ دەڵێن و ئەمیان بە گوریسێک بە سنگێکی داری ناوەندی قرشەکەوە بەستراوەتەوە. دوای ئەوە هەر ئەو قرشە گێرەکراوە دەکەن بە جۆخین و ئیتر دەست بە (جەنجەڕ) گێڕانی دەکەن (بڕوانە وێنەکان). جەنجەڕ ئامێرێکی دارینە لەسەر ژمارەیەک

(باڵتـە)ی ئاسـنینی دەم تیـژ گیـر کـراوە وەک ئۆتۆمۆبیلێکـی چکۆلانـە لەلایـەن جووتـە وڵاخێکـەوە ڕادەکێشـرێت و منداڵێـک یـان هەرکەسـێک سـواری دەبێـت ئیتـر بـە درێژایـی ڕۆژگارەکـە بـەدەوری جۆخینەکـەدا دەخولێتـەوە تـا بـە جوانـی وردی دەکات و بەرهەمەکـە دەبێتـە تێکەڵەیەکی گەنـم و کا یـان جـۆ و کا. سـواربوونی جەنجـەر بـۆ ئێمـەی منـاڵ زۆر خـۆش بـوو چونکـە وەک سـواری ترومبێـل یـان عارەبانـە بوویێـت وابـوو. ئینجـا هەنـگاوی دوایـی لـە پرۆسـەی کوتانـەوە و بەرهەمهێنانـی گەنـم و جـۆ (شـەنەبا)کردن بـوو. (شـەنە) ئامێرێکی باسـکداری درێـژی دەم دار یان دەم ئاسـنی کتومـت وەک چەنگاڵـی نانخـواردن وابـوو بـەڵام زۆر درێـژ بـوو و نزیکـەی هێنـدەی بەژنـی پیاوێـک دەبـوو. دەغڵـە کوتراوەکـە کـە هێشـتا تێکەڵەیەکـی وردی دان و کا بـوو دەکـرا بـە کۆمـەڵ. ئیتـر سـەپان چاوەڕوانـی ڕۆژێکـی دەکـرد کـە بـای (شـەماڵ) هەڵـکات نـەک (هـوڕە) بـۆ ئـەوەی دەسـت بـە شـەنەبا بـکات. لـەو دەشـتە دوو بـای ئاسـایی هەیـە شـەماڵ و هـوڕە. شـەماڵ لـە ڕۆژئـاواوە دێـت و زۆر نـەرم و فێنکـە کـە شـەنەبای لـە بـەردا دەکـرا چونکـە هـەر ئەوەنـدە هێـزەی هەبـوو کایەکـە کـە لـە دانەکـە سـووکترە بنـێ بەلایەکـەوە و دانەکـەش کـە گرانتـرە لـە شـوێنی خـۆی دەمایـەوە. بـەم جـۆرە دان و کا بـە تـەواوی لێـک جیـا دەکرانـەوە و شـەنەباکەر دانەکـەی بـە ئامێرێکـی داریـن (بێـرۆک) کـۆ دەکـردەوە و بـەو کۆمەڵـە کۆکراوەیـە دەگوتـرا (ڕەوسـە). هەرچـی بـای هـوڕە بـوو ئەمیـان لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هەڵـی دەکـرد و بەگـوڕ بـوو و دان و کاکەشـی هەمـوو لەگـەڵ خـۆی دەبـرد. بۆیـە شـەنەبا بـە ڕۆژی هوڕەبـا نەدەکـرا. هـوڕە ڕەشـەبا نییـە، ڕەشـەبا هێشـتا لـە هـوڕەش بەتینتـرە و لەوانەیە زۆر شـتت لـێ تێـک بـدات. هـوڕەی کـوردی لـە ئەمەریـکاش هەیـە و پێـی دەڵێـن (هوریـکان hurricane) کـە لـە ئیسـپانییان وەرگرتـووە و بـە ئیسـپانی پێـی دەڵێـن (هـوڕەکان huracan) بـەڵام ئـەوەی ئـەوان یەکجـار زۆر لـە هـوڕەی ئێمـە بەتیـن و تاوتـرە.

بەم جۆرە جوتیاری کورد لە ناوچە دەشتاییەکاندا قۆناخی هەرە دوایی بەرهەمی ساڵانەی لە گەنم و جۆ بە ئەنجام دەگەیاند. ئەمن دیمەنی شەنەباکردنی دووگردکانم بەم چەند بەیتە شیعرە نمایش کردووە:

چەند خۆشە ئێستا ڕاکشان
لەژێر کەپری کاکی سەپان
کڵاشت بکەیتە سەرین
رووی خۆت بدەیتە سەرجۆخین
شنەی شەماڵ ببزوێنێ
شەنەباکەر شەنە و هووردەی
بەشێنەیی بوەشێنێ
باوکێک جارجار بانگی کوڕ کا
" کورە هۆ... هۆ عەسەن، عەسەن!
هەی توخمەسە، ئەو کەرانە
لۆ دەرناکەی لەسەر ڕەوسن"

بەندی درووێنە

جارێ بەر لەوەی دەست بەم بابەتە بکەم حەز دەکەم تێبینیەکی زمانەوانی دەربارەی وشەی ( بەند) بخەمە بەرچاو. ئەمەیان بیرو تێگەیشتنی خۆمە کە لە ئەنجامی وردبوونەوەو لێکدانەوەیەکی زۆرەوە لە مێشکمدا گەڵاڵە بووە و ئەمن وای بۆ دەچم بەڵام دووریش نییە بە هەڵەدا چووبم.

بۆچی لادێییەکی نەخوێندەواری کورد جاران هەر وشەی( بەند) ی بۆ چەند دێڕێکی میتەردار و دوادەنگدار (بە وەزن و قافیە meter and rhyme)بەکار دەهێناو وشەی (شیعر)ی عەرەبی هەر نەشبیستبوو؟

بەڵێ جاران تا نزیکەی رەنگە پەنجا شەست ساڵێک لەمەوپێش خوێندەوارو رۆشەنبیرانی کورد لە ئەدەبیاتی کوردیدا (ئەدەبیاتی

زارەکی نا) هەر وشەی (شیعر)ی عەرەبییان بۆ (هەڵبەست) و ( هۆنراوە)ی ئەمڕۆ بەکار دەهێنا.

هەڵبەست و هۆنراوە هەردووکیان تازەن و لەلایەن زمانەوانانی کوردەوە داتاشراون. ئەمن ناڵێم ئەم دوو وشەیە بۆ (شیعر) ناتەواون بەڵام ئەگەر زمانەوانەکان بە سەرنجێکی وردترەوە پیاسەیەکیان بەناو ئەدەبیاتی زارەکی سەدان ساڵ کۆنی کوردیدا بکردایە هەنگی بۆیان دەردەکەوت کە بابوباپیرە نەخوێندەوارەکانی لەوانەیە هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆمان بەڵێ وشەیەکی کوردی پەتییان بۆ وشەی ( شیعر) عەرەبی هەبووە، بەند.

جاری جاران نەک هەر لە کوردەواری بگرە لەناو تەواوی کۆمەڵانی نەژادی جیاجیای دونیادا خوێندەواری زۆر کەم بووە و ئەگەر هەشبووا ئەوە تەنها بۆ چینی ئایینی و دەسەڵاتدارەکان بووە. سەوادی کۆمەڵانی رەشورووت بەتەواوی بێ بەش بووینە لە بواری خوێندن و نووسیندا. بەڵام ــ دیسان نەک هەر لە کوردەواری ــ بەڵکو لە هەموو دونیادا ئەوە ئەو رەشورووتە نەخوێندەوارانە بوون کە بەندبێژو بەیتبێژو لاوکبێژ واتا هونەرمەندو شایەرانی ئەدەبیاتی زارەکییان لەناودا هەڵدەکەوت و لە کۆشک و دیوەخانی پاشاو خان و میر و مارکیز و کۆنت و هێرتسۆگ و بەگ و ئاغایاندا بەند و بەیت و لاوکی پێدا هەڵگوتن و شەڕوشۆر و چیرۆکی خۆشەویستی دوو گراوی وەک مەم و زین و لاس و خەزاڵ و لەیل و مەجنونیان دەچڕی و شاباش و پاداشتی چەوریان پێ وەردەگرت. بە کورتی شاعیرانی ئەو سەردەمانە هەر ئەمانە بوون و هەمووشیان ئەو شیعرە زارەکیانەیان بە دەنگو ئاوازی تایبەت بەهەر یەک لەو ژانرە ئەدەبیانەدا دەلۆراند.

بەڵگەیەکی زۆر سەلمێنەرم بۆ دەرکەوتووە کە کورد زۆر لەمێژە بە زمانی کوردی وشەی خۆی هەبووە بۆ وشەی (شیعر)ی عەرەبی کە وشەی (بەند)ە. دیارە (شیعر) پاش موسڵمانبوونی کورد کەوتۆتە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە. چونکە مەعقوول نییە عەرەبی بادیەی

پێش ئیسلام شیعری گوتبێت و وشەشی بۆی هەبووبێت کەچی دوو ئیمپراتۆراتی زرتوزەلامی وەک ماد و فارس و ئایینێکی خوداناسی بەربلاوی وەک ئایینی زەردەشتی وشەیەکیان بۆ شیعر نەبووبێت .

جا ئەو بەلگەیەی کە لە سەرەوە باسم کرد ژانری ( بەیت)ە لە ئەدەبیاتی زارەکی کوردیدا.

بەیتی کوردی کە بە عەرەبی (ملحمە) و بە زمانانی جیاجیای ئەوروپاش (epic , romance ) ی پێ دەڵێن یەکێکە لە ژانرە هەرە کۆنەکانی هونەرو ئەدەبیاتی رەمەکی کوردی. بەیتە کوردییە درێژەکان تایبەتمەندییەکی خۆیان هەیە کە بەشێکی بە (گێرانەوە)ی ئاسایی دەگوترێت و بەشێکی بە بەند و بە دەنگ و ئاواز دەچرِدرێ. ئەو کەسەی کە بابەتی بەیتەکە دەگێرِێتەوە (بەیتخوان) کە ئەو خۆی یەکێک نییە لە کارەکتەرەکانی ناو چیرۆکەکە بە قسەی ئاسایی دەست بە باسی سەربردەکە دەکات تا دەگاتە یەکێک لە ئاکتەرەکان. ئا لەوێدا ئیتر قسەی ئاسایی نامێنێت و هەر خۆی دەبێتە ئاکتەرەکە و بە دەنگوئاوازێکی مۆنۆتۆن بەلام زۆر بەسۆز دەست بە ( بەند)ان دەکات. جا ئەو چەند دێرە کە شیعرێکی زۆر رێکوپێکی بە ( میتەر و دوادەنگ - وەزن و قافیە)یە لەو زەمانە کۆنەوە هەر (بەند)ی پێ گوتراوە. ئەم وشەیە ئەمرِۆش لە لادێی کوردەواری هەر ماوە و زۆر جار ئەگەر داوا لە دەنگخۆشێک بکرێ شتێکی کۆن بلێ پێی دەلێن " کاکە دە بەندێکمان بۆ بلێ".

وەک پێشتر گوتم بەندە درێژەکان کە سەربردەی شەرِو شۆر یان حەزلێککردنی دوو گراو دەگێرِنەوە ئەوانە لە رووی دارِشتنی هەیکەلی چیرۆکەکە دوو بەشن ( بەشی گێرانەوەی ئاسایی و بەشی بەند) هەرچی چیرۆکی کورتە کە ئەوەندە کۆن نییە ئەمەیان هەر لە سەرەتا تا بنەتا هەر بە بەند و بەئاواز دەگوترێت و قسەی ئاسایی تێدا نییە. بەندی درووێتە دەکەوێتە ناو خانەی ئەم جۆرەی دواییان.

ئینجا مەبەستی من لەم پێشکەشکردنە ئەوە بوو کە کورد هەر لە کۆنەوە وشەیەکی رەسەنی کوردی (بەند)ی هەر هەبووە بۆ وشەی

(شیعر)ی عەرەبی و زمانەوانەکانمان دەبوایە وردتر بوان لە گەڕانیان بە دوای وشەی کوردی رەسەندا و چ پێویستی نەدەکرد دوو وشەی نوێ (هۆنراوە) و (هەڵبەست) دابتاشن.

بەندەکانی درووێنەکردن بە ئاوازەکانیشیانەوە دەبێ لەگەڵ دەستوداس وەشاندنی سەپانەکاندا بگونجێ، بڕگەکانی بەندەکە و ئاوازەکە دەبێ لەگەڵ بزووتنەوەی دەستوداسی سەپانەکان رێک بن. ئاوازی بەندی درووێنە زۆرن بەڵام وەک گوتم دەبێ ئەو مەرجانەی سەرەوەیان تێدا بێ. ئەمانە هەندێکن لەو بەندانە کە کوردی نەخوێندەواری لادێ دایان ناوەو دانەرەکانیشیان بەزۆری بزرن کەس نازانێ کێ دایناون. باجارێ بەم دوو بەندەی خوارەوە (ئەستێرە) و (پەڕەسێلکە) دەست پێ بکەم کە من خۆم بەم دواییانە دامناون بەڵام دوای ئەوە ئیتر بەندی بەناوبانگی دانەر نادیارن.

بەخۆت ناوت ئەستێرە
وەک ئەستێرەی عاسمانی
بەیانیان شۆڕ دەبییەوە
لۆ بناری سەید وەسمانی
جەرەی ئاوێت لەشانی
تەڕ دەکا ناو مەمکانی
دەوەرە مەمکۆرەت بمژم
کیژۆرەی دووگردکانی

***

بریا پەڕەسێلکە بام
لە گوندی دووگردکانی
هێلانەم بکردبایە
لە دوڕ مارێ کیژجوانی
بەشەو و رۆژ دەمرۆنیە
بەژن و بارای گوستانی

بەندی دروێنە ئەوەندە زۆرە لەبن نایەو ئاوازەکانیشیان جیاجیان بەڵام هەروەکو پێشتر روونم کردەوە ئاوازەکان دەبێ لەگەڵ بزووتنەوەی دەست و داسی سەپانەکاندا یەک ریتم و یەک تێمپۆ بن. ئەمانەی خوارەوەش چەند بەندێکی ترە کە دانەرەکانیان نەناسراون.

لەبەر ماران بەدیارکەت
چاورەشێ من بێرییە
توورەکی سۆر لە پشتێ
سوارۆپیای لە عەردییە
خۆتۆ ناچییە پەرێزێ
سەرپشتێ خۆت بەستییە
تاقمە کیژەک ڕاڕۆیی
لۆسەر بیرێ عەلییە
بەدەست عیشارەتی کرد
کەسمان لەمارێ نییە
بابم چوویتە هەولێرێ
کاکم وا لە جۆتییە
سەمان سەگڕەوێ نابا
داکیشم بێ قەیدییە
زەندێ سپی پڕ بازن
وەک بالیفێ کورکییە
هەتیم وەرە مارێ مە
دەتنێم لەبن سەرییە.

***

ئەستێرە برێ ئەستێرە
لۆت نەمایمە ئەستێرە
سینگت پەنیری کوردی
مەمکت کوارگە عەتێرە

هێ کچێ لەدووم هەناردی
دەمەکی وەرە ئێرە
(ئەگەر مەمکۆرەت نەمژم
بە ماچان نابم تێرە.)
من ئەم دوو دێڕەی دواییم بەم جۆرە بیستبوو
ئەگەر ماچم نەدەیێ
بە مەمکان نابم تێرە
بەڵام خۆم بۆ ئەو شێوەی سەرەوەم گۆڕی.

***

ئەستێرە برێ ئەستێرە
ئەستێرەی سەر سەفینی
لە برندان لێم بەدیارکەت
شەوقی دا لە رەشکینی
چاوێ تۆ گەلە رەشە
مریەمێ سەیدەمینی

***

لەکێم دیت و لەکێم دیت
لەبناری تۆغەرانێ
یارم کۆترە باریکە
هەرنیشتیە لە هێلانێ
دەستم لەبۆ درێژ کرد
دەفڕی دەچووە عاسمانێ

***

هایێ هایێ لەسەر کانیێ هاتەوە
هۆی ئەسمەر دوگمەم لەزیان کردەوە
هایێ هایێ جۆت شەمامەم دیتەوە
هۆی ئەسمەر هەردووکم گرت پێکەوە

هایێ هایێ هی خۆمەو ناسیمەوە

***

لە پردێ باسان کاریتەی مێوە
گەیمە حەیرانێ کوڕ بەبەرێوە
ماریژگەم وێران ماندی بووی پێوە
لە پردێ باسان کاریتەی گورە
بەژنێ حەیرانێم دار قەنەفرە
حەیران راڕۆیی زانیم دوو درە
لە پردێ باسان کاریتەی شکێ
مەمکێ حەیرانێم سێوێ سەر لکێ
هێشتا مندار بووم لێم دەگرت رکێ
لە پردێ باسان هەر وەرەو پێدا
سینگت سندووقە چەک و زێڕ تێدا
چەک بەمیرات بی کوڕ لە بەندێدا

***

مارەک لە سۆران یێک لە بادینان
شاییەک دەگەڕێ لەهەر سێ دینان
کێ ئەو شاییەی خۆش کرد شەمێی شەمدینان

***

خوێنـەری بەڕێـز، ئەمانـە تەنهـا چەنـد نموونەیـەک بـوون لـە بەنـدی دروێنەکـردن کـە جـاران لـە سـەردەمانی دروێنەکردنـی بـە داس بەتایبەتی لـە دەشـتی هەولێـر و کۆیـەدا زۆر بـاو بـوو.

بـۆ بەندەکانـی دروێنـە دوو کتێبـی فۆلکلۆرناسـی بەبڕشـت کاک سـەعدوڵا شـێخانی (فۆلکلـۆری کـوردی) و (سـێ سـەد هۆنـراوەی فۆلکلـۆری کـوردی) و هەروەهـا کتێبـی ئاوازخانی ئەحمـەدی حەمەدەمینی دزەیـی (فۆلکلۆری کـوردی لە ناوچـەی دزەییاندا) سـەرچاوەی سـەرەکیم بـوون. سـوپاس و پێزانینـی زۆرم بـۆ هەردووکیـان.

***

سمایلی مام حاجی کەریمی

محەمەدی مەولود هەولێری

حەمەدی مام تەهای

حاجی فەقێ عەولای

دوو وێنەی پلکە سوڵتانی حەمەد مەحموودی

شێرکۆی محەمەدی مەولوود
هەولێری برادەری منداڵی
هۆمەر دزەیی

جێ ژوانەکانی کوڕە ئاغا و کچە گاوان لە ناوچەی باڤاریای ئەڵمانیا

گوندی دووگردکانی ئەمڕۆ

گردە خەجیلە

گوندی دووگردکانی ئەنفالکراو (ئارامگەی کافیەخانی دایکی هۆمەر دزەیی)

نانەکەلی کورد

(سەرچاوە: ئاواز دزەیی، فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا)

سەپانی کورد و درووێنە بە داس

(سەرچاوە: ئاواز دزەیی، فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا)

هەوجار (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

جووتیاری کورد (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

جەنجەڕ (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

کەرستەی جووت (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

جۆخین و درمو (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

هەندێ ئامێری دروێنە (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

شەنە (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

شەغرە (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان لە قەڵای هەولێر)

# بەشی 6

## هۆمەر دزەیی

لەپاش نمایشکردنی تابلۆیەکی رەنگاورەنگی مێژوو، جۆگرافی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و زۆر بواری تری ژیانی ئەو سەردەم و رۆژگارانەی کە پەیوەندییەکی کەم و زۆریان بەو ژینگەیەوە هەبووە کە منی لێ هاتوومەتە ئەم دنیایە ئینجا وا کڕی هاتووە بێمە سەر سەربردەی خودی خۆم، عومەری کوڕی حەمەدەمیناغای حاجی بایزاغای دزەیی و کافیە خانی شێخ مارفی بەرزنجی، ناسراو بە (هۆمەر دزەیی).

ئەمن بەتەواوی نەمدەزانی چۆن باوکم کچە شێخێکی ساداتی بەرزنجە، کافیەخانی دایکمی، دۆزیوەتەوە و کردوویەتی بە هاوسەری خۆی. ئەم لە کوێ ئەو لە کوێ. بەڵام نا، ئەمن کە قووڵتر لێی ورد بوومەوە ئێستا رەملم هەر بۆ ئەوە دەچێت کە پێشتر رەحمان ئاغای مامم (زڕبرای لە بابم گەورەتر) نایلەخانی کچی شێخ مارفی بەرزنجیی هەڵەجەی هێنابوو. پێش ئەویش خاڵێکی مامە رەحمانم (حاجی نادر ئاغای دزەیی) ئەویش کچێکی شێ عەلی بەرزنجیی میرەکانی هێنابوو. کەواتە تێکەڵاوی بە ژن لەنێوان ئاغاکانی دزەیی و شێخەکانی بەرزنجی ناوچەی هەولێر پێش بابم و دایکم بە ماوەیەک هەر هەبووە و دیارە رێخۆشکەر بووە بۆ ئەوەی باوکیشم تەبای خزمەکانی خۆی ئەویش کچێکی شێخ مارفی هەڵەجە بخوازێت، کافیەخانی دایکم کە لە هەموو خوشکەکانی بچووکتر بووە.

دایکم نۆ منداڵی دەبێت کە من بچووکترینیانم، بەپێی تەمەنیان: ئەحمەد، محەمەد، عوسمان، قەدریە، ئەنوەر، نەجیبە، موحسین، سەعدی،

عومەر. بەڵام کە دایکم منی لە سکدا سێ مانگان دەبێ بابم لەپڕ و لە تەمەنی 46 - 47 سالیدا بە هێرشێکی دڵ کۆچی دوایی دەکات. لە کوردەواریی خۆمان بەو منداڵەی کە لە سکی دایکی دەبێت و بابی دەمرێت دەڵێن پاشباب. جا وەک کە دەگێڕنەوە بابم کە لە مانگی (ئۆگوست یان تەمووز)ی ساڵی 1936 مردبێت و منیش لە زگی دایکم سێ مانگان بووبم دەبێ ئەمن یان لە مانگی یەک یان دووی ساڵی 1937 لە گوندی دووگردکان لەدایک بوویم. بەڵام لە تۆماری لەدایکبووانی عیراقی (دەفتەر نفووسی جاران) منیان بە تەوەلودی 1936 تۆمار کردووە. ساڵێکم زەرەر کردووە.

## بە دایەن درام، ساڵانی گوندی ترپەسپیانم

کە لەدایک دەبم دایکم لەبەر تازە بێوەژنبوونی حەزی نەکردووە بەبیلەی بە بەرێوە بێت و مەمکی بداتێ بۆیە بەدوای دایەنێک گەڕاوە کە ئەویش تازە منداڵی بووبێت و شیری هەبێ. لە گەڕەکی مامم ڕەحمان هەر لە دووگردکان (زاریێ)ی ژنی خدری شێخە برباسی منداڵێکی شیرخۆرەی مردبوو گوتیان هەر ئەو ژنە هەیە شیری هەبێت و ئیتر منیان دا بەو دایەنە. بەڵام وەک قەدریەخانی خوشکم دواتر بۆی دەگێڕامەوە کە سەیریان دەکرد منی شیرخۆرە لای ئەو دایەنە هەتا دێ دەبنیسێم و ڕۆژ لە ڕۆژ لاوازتر دەبم و هەر ئەوڕۆ نا سبەی دەمرم. بۆیان دەردەکەوێ کە منداڵەکەی زاریێ ماوەیەک بوو مردبوو و ئەویش شیرەکەی وەک دەڵێن کۆن بووبوو و ئیتر کەڵکی ئەوەی نەمابووە دەرخواردی منداڵی ساوای بدەیت. ئەوە بوو کە منیان لە زاریێ وەرگرتەوە و لە گوندی ترپەسپیان کە گوندێکی هەر خزمی خۆمان بوو و تەنها 2 - 3 کیلۆمەتر لە دووگردکانەوە دوور بوو ئاغاژنی گوند (پلکم لارەک) جواب بۆ دایکم دەنێرێت کە عەیشە نیگار ناوێک تازە منداڵێکی بووە و شیری هەیە. ئەوەبوو کە منیان

نارد بۆ لای ئەو ژنە لە ترپەسپیان. خێزانی عەیشە نیگار و مێردەکەی عوسمان نیگار خێزانێکی دەستکورتی بێ دەرامەت بوو و بریتی بوو لە ژن و مێرد و دوو کچ و کوڕێک: عوسمان نیگار، عەیشە نیگار، گولان، نەخشین، محەمەد. ئەمڕۆ بەداخەوە کەسیان لەوانە نەماون بەلام محەمەدیان کچێکی جوانی ماوە (قەدری) و مێردی بە هونەرمەندی حەیرانبێژ فارسی برای حەیرانبێژی ناودار عوسمان حەیران کرد. لە سەردانێکی ئەم دواییانەم بۆ گوندی ترپەسپیان کوڕێکی گولانیشم دۆزیەوە (عەبدولڕەزاق). جا بۆم دەگێڕنەوە کە مالی عەیشە نیگار هەرچەندە کە پیس و پۆخل بووە، بەلام پاش ماوەیەکی کەم بە خواردنی شیری ئەو ژنە ئیتر وردە وردە ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر خڕ و پڕ و خەپانە دەبووم و دوای چەند مانگێک بووبووم بە منداڵێکی پەلەستوور و پێچکەستوور.

عەیشە نیگار و عوسمان نیگاری مێردیشی هەردووکیان بە خۆوە و تێکسمراو بوون، ملەستوور و سینگ و پشت پان، هەرچەندە کە دەستکورتیش بوون کەچی بە کەلەش مەیلە قەلەو بوون و تەندروست دیار بوون. عوسمان نیگار زۆر ئاقل نەبوو و قسەی هەلەق و مەلەقی دەکرد و لای گوندییەکان بە جیدی وەرنەدەگیرا و بە ناتەواو ناسراو بوو. بەلام عەیشە نیگار لەو ئاقلتر بوو هەرچەندە کە سالەهای سالان دواتر هەر جارێکی کافیەخانی دایکم لێم تووڕە بوایە پێی دەگوتم: "... ئاخر ڕۆلە ئەتو شیری عەیشە شێتت خواردییە بۆیە ئەتوش ئەوها شێت و شووری". دیارە عەیشێش بە ئاگری مێردەکەیەوە سووتابوو و خەلکەکە ئەویشیان بە مەیلەو بێ ئەقل دەزانی، کە لە ڕاستیدا واش نەبووە.

ئەمن پێم وایە دەبێ تا تەمەنی سێ سالییەک لای دایە عەیشێ مابمەوە و ڕاستە کە دەلێن بیری منداڵی تیژە چونکە بەڕاستی ئەمن هەندێ دیمەنی ئەو چەند سالەی گوندی ترپەسپیانم زۆر چاک لەبیرە. چاکم لەبیرە مالەکەمان، مالی عوسمان نیگار کەوتبووە

لای باکووری ماڵێ ئاغای گوند (ئەحمەد ئاغای سلەیمان ئاغای قوشتەپەی دزەیی کە لەگەڵ ماڵە بابی خۆم ئامۆزازای یەکتری بووین). هەڵبەت خانووەکانی گوندی ئەو سەردەمی دەشتی هەولێرێ هەمووی لە قوڕ دروست دەکران و لە بیرمە ماڵەکەی ئێمەش (ماڵی عوسمان نیگار) بریتێ بوو لە یەک تاکە چاوەی تا رادەیەک گەورە کە جێی هەموومانی لەسەر ئەرزا لێ دەبۆوە و حەوشێکی دیوار نزمی خنجیلانەشی هەبوو. هەروەها لە بیرمە کە هاوڕێیەکی کچی دراوسێشم هەبوو ناوی (حەمدۆکە) بوو و هەمیشە پێکەوە گەمەمان دەکرد. ئەوەشم چاک لەبیر ماوە کە جارێکیان لەبەر دەرگای ماڵەکەی خۆمان بە پێخاوسی وەستابووم هەردوو (قاچیلە)م بەدەستەوە گرتبوو هەر بانگی حەمدۆکەم دەکرد بێت بۆ گەمان و ئەویش نەدەهات منیش ناچار بە دڵساردی گەڕامەوە بۆ ماڵ. ئەو زەمانە بە پێڵاوی منداڵی ساوایان دەگوت قاچیلە. ئەم گرتەیەی هەبێکەی خۆمم هەرگیز لە یاد دەرناچێت. نازانم بۆ، لەوانەشە کچ ڕەفزی کردووم.

ماڵەکە وەک گوتم دەستکورت بوون و کافیەخانی دایکم لە دووگردکانەوە خواردن و جلوبەرگی بۆ دەناردم بەڵام ئەوان زۆر پیس و پۆخڵ بوون و منیان زۆر درەنگ درەنگ دەشووشت. ئەوەشم لەبیرە کە عەیشێی دایکم جاروبار منی دەبردە ماڵی ئاغا کە ماڵێکی گەورە بوو و ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم رووی دەرگا و هەیوانەکەی بەرەو باکووری ئاوایی بوو. ئەمن ئەو سەردانانەم بۆ ماڵی پلە لارەک چاک لەبیرە و ئەم چەند کەسانەشم لەبیرە، پلە لارەک و پلە پەرەک و موعتەبەر و سەعدە: پلە لارەک کە حاجی لارەکی کچی حاجی پیرداوداغای دزەیی بوو هاوسەری سلێمان ئاغای قوشتەپە و دایکی ئەحمەد و عەزیز و جەمیل و موعتەبەر بوو، پلە پەرەک خێزانی کاک ئەحمەد و دایکی سەعدە بوو. هەڵبەت هەنگی نەمدەزانی کێ کێیە و چی کێیە هەر ئەوەندەم لەبیرە کە ئەمانە هەبوون. لەوانەی

کە هاتوچۆی ناوماڵی ئاغایشیان دەکرد کەنعان و عووجان و شێ محەمەد بەگمم بە ڕەنگو ڕووشیانەوە چاک لەبیر ماوە. بێجگە لەمانە ناوی مامۆستا مەلا شێخ جەلالیشم لەبیرە و هەتا چەند ساڵێکیش دوای گەڕانەوەم بۆ دووگردکان سوێندی گەورەی من هەر ئەمە بووە: "بەو قورعانەی مامۆستا مەلا شێخ جەلال لەسەر کۆشی خۆی دانایە"، هەڵبەت دیارە کە لە ترپەسپیان بوویمە ئەم سوێندەم زۆر لە دەمی دانیشتوانی گوندەکە دەبیست. لەوە زیاتر وردەکاریم نایەتەوە یاد بەڵام دواتر قەدریەی خوشکم بۆی دەگێڕامەوە کە پلکم لارەک و پلکم پەرەک هەموو جارێک خۆیان لە عەیشە نیگاری دایەنم تووڕە کردووە کە منی ئەوها بە پیس و پۆخڵی و بە سەر و قژی پڕ ڕشک و ئەسپێ بەخێو دەکرد و سەرکۆنەیان دەکرد: "... کچێ عەیشۆک هەی عەمرۆکەت نەمێنێ ئەوە ئەو منداڵە جوانەی لێ خاوێن ناکەیەوە؟" جا قەدریەخانی خوشکم دەڵێ هەر ئەوان خۆیان منیان دەشووشت، کۆچک و جلکیان دەگۆڕیم و ڕێکوپێکیان دەکردمەوە تا جارێکی تر.

کافیەخانی دایکی خۆم لە دووگردکان دەیزانی کە حاڵی ئەو جگەرگۆشەیەی بە دەست دایەنەوە ئەوهایە بەڵام ئەو لەلایەکەوە چون تازە بێوەژن بووبوو و ئەرکی بەخێوکردنی پێنج منداڵی سەرکەو بنکەی دیکەی کەوتبووە ئەستۆ و خەم و خەفەتی بەبێ پیاو ماڵداری و بەڕێوەبردنی موڵک و ماڵاتێکی زۆریش لەلایەکی ترەوە، ئەو کاتەی نەبووە لە خەمی مندا بێت. هەقیشی بووە.

ئەمن ڕەنگە یەکەم دووساڵ تا سێ ساڵی تەمەنم هەر لای دایەن لە ترپەسپیان بووبم و دوای ئەوە دایکم بڕیار دەدا کە ئیتر بەسە با بمباتەوە بۆ لای خۆی. کە کاک ئەحمەدی برا گەورەکەم داوا لە عوسمان نیگار دەکات من بهێنێ بۆ دووگردکان و لەوێ بە عوسمان و عەیشێ ڕادەگەیەنێ کە ئیتر بەسە با بڕۆنەوە و کوڕەکە بەجێ بێڵن عوسمان نیگار دەیکا بە گریان و هاتوهاوار و بە کاکم دەڵێ: "ڕەبی

خوا زگت بسووتێنی کە ئەتو وا زگی من دەسووتێنی". بەڕاستیش ئەو ماڵە منیان وەک منداڵێکی خۆیان حسێب دەکرد و منیش سروشتانە لەو تەمەنە هەر وام دەزانی کە ئەوان باوانی راستەقینەمن. قەدریەخانی خوشکم بۆی گێڕاومەتەوە لە دووگردکان کە منیان گل دابۆوە و عوسمان و عەیشە نیگاریان بەگریانەوە بێ من ڕەوانەی ترپەسپیان کردبۆوە منیش دەستم بە گریان کردووە و هەر گوتوومە: "دەچمەوە کن حەمدۆکەی". دیارە ئەمن لە ژیانی ماڵی نیگاری ترپەسپیان راهاتبووم و هەر ئەوێم بە ماڵی بەڕاستیی خۆمم دەزانی و لای کەسوکاری راستەقینەم لە دووگردکان خۆم بە نامۆ دەدی.

زۆرێک لەم زانیارییانەی یەکەم دوو سێ ساڵی ژیانم لە گوندی ترپەسپیان لە خوشکی لە خۆم گەورەتر قەدریە خانم بیستووە کە (لە دایکبووی 1927)ـە و سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆی هەیە.

## سالانی دووگردکانم پێش 1943 (پێش چوونە بەر خوێندنم)

کە منیان لە ترپەسپیانەوە بردەوە بۆ دووگردکان تەمەنم دەبێ سێ سالێک بووبێ. ئیتر وردە وردە لەو ژیان و ژینگە تازەیەی دووگردکان و لە دایک و خوشک و برا "تازەکانم" ڕاهاتم. پاش ماوەیەک کە دستەبرام لەناو مندالانی ئاواییش پەیدا کرد و ئاشنای ڕوو و ڕوخساری پیر و جەوانی دووگردکان بە ژن و پیاویەوە و کووچە و کۆلانەکانی دووگردکان و دووڕیان و سێڕیانەکانی دەوروپشتی دووگردکان بووم ئیتر ڕەگی خۆشەویستیم بۆ دووگردکان و خەلکی دووگردکان و خانووە قوڕەکانی دووگردکان و گرد و کەند و کەندەلانەکانی دووگردکان پەلوپۆی خۆیان هاوێشتە قوولایی خولیا و کەلکەلەمەوە و ئێستاش کە تەمەنم وا خەریکە خۆی لە هەشتا بدات هەر وەکو کەعبەی یادگارەکانی مندالی و مێردمندالیمی دەڕوانمێ.

خانووی مالەبابی من لە دووگردکان بریتی بوو لە کۆمپاوندێکی گەورەی سێ بەشی: مال، دیوەخان، حەسار. ڕووبەری ئەمانە بە هەرسێکیان لە هەشت دۆنم زیاتر دەبوو. مال بۆ خێزانی خۆمان بوو، دیوەخان بۆ میوانی پیاو و دانیشتوانی ئاوایی و حەساریش بۆ ئەسپ و هێستر و گاگەل و مریشک و پەڕەوری دیکە و ئەنباری دانەوێلە و هەروەها بۆ هەلگرتنی هەموو ئامێرەکانی کشتوکال بوو.

## ماڵی خیزانیمان لە دووگردکان

بە تەنیا رووبەری بەشی ماڵەکەمان (بۆ ژیانی خێزان) لەوانەیە دوو دۆنم دەبوو و بیرێکی ئاوی لە لای باکووری رۆژئاوای حەوشەکەی لێ لێدرابوو و خانیچۆلەیەکی خنجیلانەش بۆ ئاودەستخانە لەولای بیرەکە لە سووچێکی دووری حەوشەکەدا کرابوو. کوندەڵانێکیش لە نزیک بیرەکە دروست کرابوو کە کوندە و دۆدانی لێ دادەندرا. دیوارێکی مەیلەو بازنەیی بڵند سێ لای حەوشەیەکی پانی دەپاراست کە بە رێگای داڵانێکەوە دەچوویتە ناویەوە و دەروازەیەکی دارینی دوودەریی گەورە و بڵندیش کە بە بزماری گەورە گەورەی سەر پان زۆر بەجوانی نەخشێندرابوو ئەو بن داڵانەی دەگرت. لە دەشتی دزەیی بە داڵان و بن داڵانیان دەگوت قەمتەرە و بن قەمتەرە. هەر لە تەنیشت قەمتەرەکە و بە دیواری لای رۆژئاوایەوەی نووسابوو، نانەدین بوو. نانەدین ژوورێکی گەورەی بڵند بوو و ئاگردانێکی لە ناوەڕاستا لێ بوو بۆ نان کردن و چێشت لێنان. ئاگردانەکە سێ کوچکەبەردی زلی لە سێ لاوەی لێ داندرابوو کە سێکوچکەیان پێ دەگوت و مەنجەڵ و سێلی نانیان لەسەر دادەنا. چەند کولانکەیەکی بچووکی بە دووکەڵ ڕەش هەڵگەڕاویش یەک دوو بست لە خوار گوێسوانەکەوە کرابوونەوە بۆ دەرچوونی دووکەڵ ئەگینا لە دەرگا بەولاوە هیچ پەنجەرەیەکی لێ نەکرابۆوە. لایەکی دیکەی قەمتەرەکە سەرگیندان بوو کە بریتی بوو لە خانوویکی چکۆلانەی تاریک بۆ داکردنی پشقل و سەرگین (تەپاڵە) کە وەک سووتەمەنی بەکار دەهات. سەکۆیەکی گەورەش کە بە سێ چوار پلیکانە سەری دەکەوتی لە ناوەڕاستی حەوشەکە کرابوو کە ئێوارانی هاوینان لەسەریا دادەنیشتین و نانمان دەخوارد. لای رۆژئاوای حەوشەکە لەوانەیە سەت مەترێکی کرابوو بە باخچەو و جۆرەها داری جوان و گوڵ و گوڵەباخی

بۆنخۆشـی لـێ دەڕوێنـدرا و دەچێنـدرا. لەبیرمـە پێشـان ئـەم باخچەیـە نەبـوو و شـوێنەکەی هـەر زەوییەکـی ڕووت بـوو دواتـر بـە بیرۆکـەی کاکـە ئەنوەری بـرام کـە لـە ئێمـە گەورەتـر بـوو و لـە ئێمـە زیاتـر دنیـای دیبـوو ئـەم باخچـە خنجیلانەیـە دروسـت کـرا. کـە دەڵێـم زیاتـر لـە ئێمـە دنیـای دیبـوو دنیاکـەش لـە ڕاسـتیدا لەوانەیـە هـەر شـاری هەولێـر بووبـێ کـە ئەوسـا لـە سـەرەتای چلەکانـی سـەدەی بیسـت سـەرژمێری دانیشـتوانی ڕەنگـە هـەر چـل هـەزار کەسـێک دەبـوو.

خانـووی ماڵەکەمـان کەوتبـووە لای باشـووری حەوشـەکە و بەمجـۆرە لەگـەڵ دیـوارە مەیلـەو بازنەییەکـە بازنـەی هەرچـواردەوری حەوشـەکەمانی تـەواو دەکـرد. خـودی خانووەکـەش بریتـی بـوو لە سـێ چاوەی فـرەوان و بـەرز: چـاوەی ڕۆژهەڵاتـێ، چـاوەی ناوەنـدێ و چـاوەی هێـزان. (چـاوە بـە شـێوەزاری دەشـتی هەولێـر واتـا ژوور کـە لـە وشـەی چێمبـەر chamber ی ئینگلیزیشـەوە نزیکـە). چـاوەی ڕۆژهەڵاتـێ ئاگردانێکـی گـەورەی لـێ بـوو کـە بـە دیـوارەوە نووسـابوو و دووکەڵەکـە بـە ڕێـگای کولانکەیەکەوە دەچـووە دەرەوە. زسـتانان هەمووـمـان بـە دەوری بەردەسـێرەیەکی سـەر ئاگردانەکـە کـۆ دەبووینـەوە کـە ئاسـنێکی سـێ سـووچ بـوو و شـتی بـۆ گەرمکردنـەوە لەسـەر دادەنـدرا. بـۆ ئاگرەکـەش زیاتـر کا و پشـقل بـەکار دەهـات و هەنـدێ جـار زۆپایەکـی ئاسـنینی کـون کونیـش کـە پشـقل یـان دار و پەرۆشـەی تـێ دەکـرا ئەویـش لەپـاڵ ئاگردانەکـە بـەکار دەهـات. بنەبانـی چـاوەی ڕۆژهـەڵات بـە سـندووقێکی دارینـی درێـژ لادیوارێکـی تـەواوی گرتبـوو و نوێنـی لەسـەر دەق دەکـراو هەڵدەگیـرا و بەمەیـان دەگـوت ئەسـتێرک.

چـاوەی ناوەنـدێ (living room) ئەمەیـان بـۆ دانیشـتنی ڕۆژانـە بـوو بـۆ خۆمـان و بـۆ میوانەکانیـش بـە تایبەتـی میوانـی ژن، چونکـە میوانـە پیـاوەکان لـە دیوەخانـی پیـاوان دادەنیشـتن. شـەوانیش هـەر لـەم چاوەیـە نوێـن ڕادەخـرا و لـەوێ دەنووسـتین. ئەمەیـان ژوورێکـی گـەورە و بـەرز بـوو. سـێ لادیـواری بـە تاخچـەی بـە گـەچ سـواخدراو لەژێـر بنمیچـدا

ڕازابۆوە کە هەندێ شووشەوات و لەنگەری نەخشینی ئەنتیکی لەسەر ڕیز کرابوو. ڕستەیەکی لە بەنی ڕەنگاوڕەنگ و گوڵنگی گەورە و بچووک دروستکراو لەمسەر بۆ ئەوسەری دوو لادیوارە درێژەکان هەڵواسرابوو هەم وەک دیکۆرێکی جوانی لادێیانە و هەم بۆ هەڵواسینی هەندێ شتی سووک و بچووک. تێر و تووری ڕەنگینی زۆر نایاب کە هەمووی دەستکردی ماڵە تەونکەرەکانی گوندی دووگردکان و گوندەکانی تری دەشتی دزەیی بوون، ئەوانەش دیوارەکانی ئەم ژوورەیان دەڕازاندەوە. لە یەکەم ساڵانی ژینی من نەریتی کورسی و مێز و قەنەفە بۆ دانیشتن و نان خواردن نەبوو. پەنا دیوارەکانی ئەم ژوورە بە مافوور و سەرەنداز و لبادی بەڕاستی زۆر جوان کە هەر هەمووی دەستکردی خۆماڵی بوون ڕادەخران و ئەگەر میوان هەبوایە دۆشەک و بالیفی بە گوفک و گوڵنگی ڕنگاڕەنگ دەخرانە سەر مافوورەکان. هەندێ لە مافوورکەری ناوداری دووگردکان بەسێ عالای هاوسەری پیرداودی خەجێ و زێزەی خێزانی حەمەدی پیاوی ڕەحمان ئاغای مامم بوون. بەپێی قەدرییەخانی خوشکم دوو کیژی مامە ڕەحمانم (پەری خان و ناجیە خان) پێش مێردکردنیان کە هێشتا لە ماڵە بابیان بوونە ئەوانیش مافووری جوانیان دەکرد. لبادە جوانەکانیش لەلایەن کارگەچیی ناوداری دووگردکانی (فەقێ ونس) ەوە دروست دەکران کە کارگەکەی لەناو ژوورێکی حەسارەکەی ئێمەدا دامەزراندبوو. دیواری بنەبانی ئەم ژوورە سندووقێکی درێژی بە پانایی ژوورەکە لێ داندرابوو و لەسەر سندووقەکەش نوێنی زۆر جوان و تایبەت بۆ میوانان هەڵدەگیرا و هەموویشی بە جاجم و چارشەوی لە بەن و سیم و ئاوریشمی هەمەڕەنگ و هەمەنەخش دروستکراو دادەپۆشران کە ئەو ژوورەیان بە چێژێکی هونەرمەندانە دەڕازاندەوە. ئەو سندووقە درێژە لەلایەن وەستایە خۆماڵییەکانەوە دروست دەکران و لە ڕووی جوانکارییەوە بۆ ئەو زەمانە بەڕاستی دەگمەن بوون. دوو دەرگای هەبوو و کلیلەکەشی تەنیا لای دایکم هەڵدەگیرا. بێجگە لەو

ســندووقە درێــژە دوو ســندووقی تریــش بــەڵام زۆر بچووکتــر لەمــلاو ئــەولای ســندووقە درێژەکــە داندرابــوون: ســندووقی عەوێنــە و ســندووقی خــڕ. ســندووقی عەوێنــەش بــە نەخشــی تابلۆکێشــی ڕەنگاورەنگــی نایــاب بەڵام زۆر ســادەی ڕوســتیکاڵی (لادێیانــە) ڕازابــۆوە و دیــارە وەســتاکەی لــە گونــدی عەوێنــە دادەنیشــت بۆیــە ئــەم ناوەیــان لــێ نابــوو. ســندووقی خــڕ ئەوەنــدە ســەرنجکێش نەبــوو.

## قاسەکەی دایکم

دایکــم قاســەیەکی پۆڵاینــی زۆر گرانبەهــای هەبــوو و ئەویــش لــەو چاوەیــە لــە ســووچێکا داندرابــوو و ئەوســا ئێمــە وشــەی قاســەمان نەبیســتبوو بۆیــە لای ئێمــە نــاوی هــەر (ســندووقی پــۆڵا) بــوو. ئــەو قاســەیە بــە بیســت کەســیش بڵنــد نەدەکــرا ئەوەنــدە گــران بــوو و دیــارە بابــم بــۆ دایکمــی کڕیبــوو. قاســەکە بــۆ ئێمــەی منــداڵ زۆر نامــۆ بــوو، دەرگایەکــی دەرەوەی هەبــوو بــە کلیلێــک دەکرایــەوە و کە دەکرایــەوە دەرگایەکــی بچووکتریش هەبــوو کــە بــە کلیلێکــی دیکــە دەکرایــەوە. ئــەم کلیلــەی نــاوەوە لــە کلیــل نەدەچــوو و شــتێکی پانۆکــی بــوو کــە ئێمــە کلیلی وامــان هەرگیــز نەدیبوو. کــە ئــەو دەرگا بچووکــەی نــاوەوە بــەو کلیلــە عەنتیکەیــە دەکرایــەوە ئیتــر "ژوور" ێکــی زۆر جــوان و بەســام و هەیبەتــت لــێ بــەدەر دەکــەوت کــە دیــوار و ئەرزەکــەی بــە مەخمەڵــی نایابــی ســەوز داپۆشــرابوو و بەڕاســتی مایــەی سەرســووڕمانی ئێمــە بــوو. مــن ئێســتا بــەم تەمەنــەی ئەمــڕۆم وا بیــری لــێ دەکەمــەوە کــە وەک فیلمــی ســینەماییم دێتــە بەرچــاو. بۆیــە هــەر جارێکــی دایکــم ئــەو قاســەیەی بکردبایــەوە - کــە هەرگیــز لەبــەر چــاوی بێگانــان نەیدەکــردەوە - ئەگــەر خــۆم و خوشــک و براکانــم لــەوێ بوایــن یەکســەر ڕامــان دەکــرد بــۆ ئــەوێ هــەر تەنیــا بــۆ بینینــی نــاوەوەی ئــەو قاســە جــوان و دەگمەنــە کــە بــۆ ئێمــە ســینەمای ئــەو زەمانــە بــوو کــە ئەوســا هیــچ یەکێکمــان لــە خوشــک و براکانــم ســینەمامان نەدیبــوو.

دایکم چەند خشڵی هەیبوو هی خۆی و هی قەدریەخانی خوشکم و هی ناجیە خانی براژن و زۆر جاریش هی هەندێ لە خزمەکانمان کە قاسەیان نەبووە و زێڕی خۆیان لای دایکم هەڵدەگرت ئەوانەی هەموو لەناو ئەو "ژوور"ە چکۆلانەی لای ناوەوەی قاسەکە هەڵدەگرت. جگە لە خشڵ، دایکم قۆچانی خاوەنداری موڵکەکانمان و ئەوراقی تاپۆ و هەندێ بەڵگەی گرینگی تریشی لەناو ئەو قاسەیە هەڵدەگرت و هەردوو کلیلیش دەبوایە هەر لای خۆی بێ.

چاوەی هیزان، ئەمەیان کەوتبووە لای ڕۆژئاوای خانووەکەمان و بۆ هەڵگرتنی ئازوقە بەکار دەهات. لادیوارێکی ئەم چاوەیە بەتەواوی بۆ هیزە تەرخان کرابوو. هیزە پێستی بەران یان نێریی زل زل بوو کە زۆر بەوەستایی بە جەفت دەیانخاران لە پاشان چەندین جار دۆشاویان تێ دەکرد بۆ ئەوەی تام و بۆی بگۆڕێ تا بەتەواوی ئامادە دەکرا بۆ هەڵگرتنی ڕۆن. لە سەردەمی منداڵیی من ئێمە چوار مێگەل مەڕمان هەبوو و ساڵانە ڕۆنێکی زۆرمان لە شوانکارەکانمانەوە بۆ دەهات. لە پەنا لادیوارەکەی بەرامبەر هیزەکانیش جەواڵی گەورە گەورە لەسەر خەلانەیەکی بستێک یان زیاتر بڵند ڕیز کرابوون و پڕ بوون لە برنج و ساوار و بروێش و گەنمەکوتاو و دانەدۆک و ئەرزاقی تر. بەمەش دەگوترا هەرزاڵە.

بە داوای لێبووردن لە خوێنەرە خۆشەویستەکانم لێم گەڕێن با دیسان لادانێکی کورتی زمانەوانیی بکەم کە بە لادانێکی پێویستی دەزانم و دیارە ئێستا وا کڕی هاتووە باسی بکەم.

هەر جارێکی باس لە کەلەپووری کۆن بکرێت وشەی زۆر سەرنجکێشمان دەکەونە بەرچاو کە لە ژیانی مۆدێرنی ئەمڕۆماندا پێویستیمان پێیان نەماوە و بەکاریان ناهێنین، چونکە ئەو شتانەی جاران کە ئەو ناوەیان هەڵدەگرت ئیمڕۆ لەم سەردەمەدا شتەکان خۆیان نەماون. بەڵام دەکرێ ئێمە ئەو وشە کۆنانە بۆ شتی تازەبابەتی دیکە بەکار بێنین کە لە زمانی کوریدا هێشتا ناویان بۆ دانەندراوە و لە

شتە کۆنە بەسەرچووەکانیشەوە نزیکن و چ پێویست بەوەش ناکات ناوی نوێیان بۆ داتاشین و ئەو وشە کوردییە ڕەسەنانەش بکەونە بن گۆمی فەرامۆشییەوە.

ئەگەر خوێنەری بەڕێز چاوێ بگێڕێتەوە بۆ چەند دێڕی سەرەوە دەبینی کە من وشەیەکم بەکار هێناوە کە ڕەنگە بۆ ئەمڕۆ وشەیەکی نامۆ بێت و کەم کەس بیستبێتی، وشەی (خەلانە) کە شایەستەی ڕوونکردنەوەیەکی زمانەوانییە چونکە تێکەڵەیەکی زۆر سەیری شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە خۆ دەگرێت. (خەلانە) لەرووی زمانەوانییەوە لە دوو وشەوە تێکهەڵکێشراوە (خا/ خایە) و (لانە). ئەوەی یەکەمیان بە بنشێوەزارەکانی کوردی باشوور، فەیلی و خانەقینی و کەڵهوڕ و زەنگنە واتا (هێلکە). وشەی دووەمیش (لانە) پێم وایە بە کەمێک جودایی بە هەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردی واتای شوێن، جێگا، بێشە، مەڵبەند، هەوار، وڵات ئەگەیەنێ. کەواتە ئەم دوو وشانە بە تێکهەڵکێشراوی ئەو شوێنە دەگەیەنێت کە هێلکەی لێ دەکرێت و لە ڕاستیشدا مریشک لەوێ لەسەر هێلکەکانیان کورک دەبوون چونکە شوێنێکی تاریک و لاچەپ و بێ دەنگ بوو و هاتوچۆی کەمی بەسەرەوە بوو. جا لەم دەشتی هەولێرە بەو یەک دوو بست شوێنە بەرزە تاریکە دەگوترا (خەلانە) کە کورتکراوەی وشەی (خالانە) یان (خایەلانە)یە و لەڕاستیدا کتومت هەمان واتای وشەی (هێلانە)ی سۆرانی و (هێلین)ی کرمانجیش دەدات. خودی (هێ -لانە) و (هێ -لین) ئەمانیش تێکهەڵکێشراوی دوو وشەن (هێ) و (لانە) کە یەکەمیان واتا هێلکە کە ئەمە خۆیشی کورتکراوەی وشەی (هێگ) ی کرمانجی باکوور و بادینان و وشەی (ئێگ) eggی ئینگلیزی و لەگەڵ وشەی (ئای) ei ئاڵمانی و وشەی (ئۆ) oeuی فرانسی زۆر نزیکن و دووەمیشیان وەک لەسەرەوە باسم کرد واتا شوێن، جێگا، بێشە، مەڵبەند، هەوار، وڵات. هێلکەی سۆرانی لە هەورامان (هێڵێ) ی پێ دەڵێن و هێلانەش (ئیلیانی). چەند سەیرە کە سەرنجی بدەیتێ

(ئـی ـلیانـی)ش لـە دوو وشـەوە پێـک هاتـووە (ئـی) کـە وەک (ئـای) ئاڵمانـی و (ئـۆ) فرانسـەییە و (لیانـی)ش هـەر (لانە)کـەی خۆمانـە، کەواتـە هـەردوو وشـەی هەورامـی بـە تێکهەڵکێشـراوی دەبێتـە (ئیلیانـی) واتـا شـوێنی هێلکـە. جا ئـەم تێکەڵەیـە سـەیرەی زمانەوانـی: هێلکـەی سـۆرانی و هێگـی کرمانجـی و هێڵیـی هەورامـی لەگـەڵ ئەوانـەی ئینگلیـزی و ئاڵمانـی و فرانسـەیی بـۆ هێلکـە و بگـرە تەنانـەت (لانـد land)ی ئینگلیـزی و ئاڵمانیـش و زمانـە گێرمانییەکانـی تـر بـۆ (لانـە)ی خۆمـان کـە ئەگـەر بـە پەیـڕەی ئێتیمۆلۆژیـدا هەڵگەڕێـت و بیانگەڕێنیتـەوە بـۆ دواوە بـۆ قۆناخـی Proto - Indo- European بـۆت دەردەکەوێـت کـە لەگـەڵ زۆرێـک لـە زمانـە هینـدۆ ئەوروپاییەکانـی تریـش دەستەخوشـکن. تـێ بینییـە زمانەوانییەکـەم لێـرەدا تـەواو بـوو و بـا بگەڕێمـەوە بـۆ بابەتـی خۆمـان.

لـە لادیوارێکـی دیکـەش ژمارەیـەک کەنـدوو ڕیـز کرابـوون. کەندووێـک بـۆ سـماق، یەکێـک بـۆ خوێـی خواردەمەنـی و کەندووێکـی تایبەتیـش بـۆ خوێـی مەڕوبـزن کـە ئەمەیـان خوێیەکـی درشـتی مەیلەوتـاڵ بـوو. ژمارەیەکیـش لـە هەمبانـەی ڕەنگاوڕەنگـی جوان جوان لـە بەرزاییەک ڕیـز کرابـوون، ئەمانـە بـۆ هەڵگرتنی برنج و سـاوار و نیسـک و ئەو شـتانەی کـە وەک بەردەسـت ڕۆژانـە بـەکار دەهاتـن. لەژێـر بنمیـچ بـە یـەک دوو بسـت لـە سـووچێکا تاخچەیەکـی سـێ گۆشـەیی دروسـت کرابـوو بـۆ هەڵگرتنـی پیـاز کـە پێـی دەگوتـرا تـەرواره. تاخچەیەکـی درێژیـش هەبـوو کـە کوولەکـەی زلـی زەردی نـۆ مانگـی (بابڵێیـن کوولەکـەی هاڵۆویـن Halloween) و هەناریـان لەسـەر هەڵدەگـرت. سەوەشـیر (سەوەتشـیر، سەبەتشـیر)ێکی گـەورەش لـە ناوەڕاسـتی ئـەم چـاوەی هێزانـە دادەنـدرا کـە شـیر و ماسـت و پەنیـر و پاشـماوەی خواردەمەنـی ئـەو ڕۆژە و گۆشـتی کاڵیشـی لەژێـر دادەنـدرا و گاشـەبەردێکی گـەورەش دەخرایـە سـەر سەوەشـیرەکە بـۆ ئـەوەی پشـیلە نەتوانـن هەڵـی دەنـەوە. ئەمـە لەبـری سـارداو (سـەلاجە)ی ئەمـڕۆ بـوو. خـۆ ئەگـەر کاوڕێـک، گیسـکێک بکوژرابایـەوە و لەژێـر سەوەشـیرەکە جێـی نەبوایـەوە ئـەوە

دەبوایە کەلەشەکەی بە پەتێک بە حەوای چاوەی هیزانەوە هەڵبواسن بۆ ئەوەی پشیلەی نەگاتێ و گۆشتەکەش تا چەند ڕۆژێک تێک نەچێت. بیرمە زۆر جار پشیلە بە حەسرەتەوە سەیری ئەو کەلەشەیان دەکرد و هەندێ جار موجازەفەیان دەکرد کە لە شوێنێکی بەرزی نزیک کەلەشی بەحەواوە خۆیان هەڵدەدایێ بەڵام لە بەدبەختیا نەیان دەپێکا، زرپەیان لێوە دەهات و لە شەرمەترپیان بۆی دەردەچوون. چاوەی هیزان چونکی ئەرزاقی لێ هەڵدەگیرا بۆیە هەمیشە بەهەشتی پشیلان بوو بەتایبەتی بە شەو کە دەیانزانی دنیا کشوماتە جا ئێمەی منداڵ ناومان لە چاوەی هیزان نابوو چاوەی پشیلان.

## بەهرەی هەست پێنەکراوی دانانی شیعرم لێرەوە سەری هەڵدا

چاکم لە بیرە ئێواران دوای ڕۆژئاوا ئەگەر هاوین بوا و لە حەوشە دانیشتبواین ئەمن لەبەر پشیلەکان دەترسام بەتەنیا بچمە ناو ژوورەوەی خانووەکەمان بۆ دەرهێنانی شتی منداڵیی خۆم چونکە تاریک بوو و منداڵیش ئەو مافەی نەبوو فانۆسێک لە شوێنێکی پێویست هەڵگرێت بیبات بۆ دۆزینەوەی شتی منداڵانەی خۆی بەکاری بێنێت و شوێنە پێویست بە ڕووناکییەکە بە تاریکی بهێڵێتەوە، ئەوسا بیر ئەوەندە بڕی نەدەکرد کە چەند فانۆسێکی زیاتر بکڕن. جا چارەیەکم بۆ ڕەواندنەوەی ترسەکەی خۆم دۆزیبۆوە کە دوو بەیتە شیعرم دانابوو هەر جارێکی بەتەنیا و تاریکی بچوومایە ژوورەوە تا کارەکەی خۆم بە ئەنجام دەگەیاند و دەچوومە دەرەوە بە دەنگێکی بڵند هاوارم دەکرد و هەر ئەمەم دەگوتەوە:

ئەوی لە من دێتە دەر
هەتا بیکوژم بە خەنجەر
ئەوا خەنجەرم دەسک سپییە
ئەوا لەبەر پشتێم ڕاکردییە

ڕاستییەکەی ترسەکەم هەر لە پشیلە نەبوو بەڵکو زیاتر لە جنۆکە. شەوان کە پیرێژنەکانمان چیرۆک و مەتەڵۆکەی دێو و درنج و ئەجندانیان بۆ دەگێڕاینەوە ترسی جنۆکە لەناو دڵما چەسپابوو. پێم وایە ئەو چەند دێڕە هەڵبەستەی سەرەوە لەگەڵ ئەمەی خوارەوەش دەبێ یەکەم شیعرم بووبێ کە لە سەرەتای تەمەنمدا بۆم هاتبێ. دایکم شیری لە ژێر سەوەشیرەکە بۆ هەڵدەگرتین تا بەیانییان بۆمان گەرم بکەنەوە بیانخۆینەوە. جارێکیان پشیلە سەوەشیرەکەیان هەڵدابۆوە و شیرەکەیان هەموو خواردبووەوە. بەم بۆنەیەوە منیش ئەم بەیتە شیعرەم بۆ هاتووە:

برسی برسیمە، برسی برسیمە
پشیلەی سەگباب شیری خواردیمە

کاکە سەعدیی برام کە ئەویش ئەم چەند دێڕە (شیعرانە)ی منی لەبیر ماوە ئێستاش هەمیشە پێم دەڵێ: "هۆمەر گیان، ئەتو هەر لە منداڵییەوە شیعرت بۆ دەهات".

لەسەردەمی ئەو ساڵانەی منداڵیی من لە دووگردکان ئێمە سێ کارەکەرمان لە ماڵەوە هەبوو: عەیشێ و زولە و فاتۆک.

## عەیشێ

عەیشێ بە ڕەچەڵەک خەڵکی دووگردکان نەبوو و لەناو ئاوایی دووگردکان بە (عەیشێی ماڵی ئاغای) دەناسرا. عەیشێ لە ماڵی ئێمە وەک کارەکەر سەیر نەدەکرا بەڵکو ئەو حیسابی تایبەتیی بۆ دەکرا و هەر لەگەڵ ئێمەشدا لە چاوەی ناوەندێ دەنووست. عەیشێ سەرپەرشتیاری دوو کارەکەرەکەی تر بوو و ڕێکخستنی ناوماڵ لە هەموو ڕوێکەوە هەمووی بەرپرسیارەتیی خۆی بوو، ڕۆڵێک کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن (هاوس کیپەر housekeeper). عەیشێ ژنێکی کەڵەگەتی بەژن قیتی زۆر جوان و تیلاک لار و هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو کە بەکوردی بەم جۆرە ژنانە دەڵێن شۆڕە ژن، جا عەیشێ بە هەموو سیفەتێکەوە بەڕاستی شۆڕە ژن بوو و فشەی بەم دنیایە دەهات ئەوەندە متمانەی بە خۆی و بە جوانییکەیەوە هەبوو. دەڵێن هەر شایی و گۆڤەندێک لە ئاوایی بگەڕابوا و عەیشێی تێدا بووا لە هەموو هەڵپەڕکێکەرەکان شارەزا و لێهاتووتر بووە و لە هەر هەمووشیان بە ژنە ئاغا و کرمانجیشەوە جوانتر بووە. من ئەم قسانەم هەرچەندە کە هی سەردەمی زۆر زووی منداڵیشمە، بەڵام جوانی و ناز و عیشوەی عەیشێ ئەوەندە سەرنجکێش بوو کە وەک نەخشی سەربەرد لەناو کەلکەلەمدا هەڵکەندراوە و ئێستاش کەوا ئەم چەند دێڕە دەنووسم

ڕووی جـوان و دەمولێـوی بـە پێکەنیـن و بـاڵای ڕێکوڕاسـتی عەیشـێم وەک دوێنـێ بووبـێ ئەوهـا لەبـەر چـاوە. ئێسـتاش لەبیرمـە کـە عەیشـێ قـۆڵ و باسـکی بـۆ کارکـردن هەڵدەماڵـی جووتـێ بازنـی شووشـەی شـینی لـە باسـکە ناسـکە جوانەکـەی بەخۆرەتـاو کەمێـک قاوەیـی هەڵگـەڕاوی بـەدەر دەکـەوت هێنـدەی تـر جوانیـی پـێ دەبەخشـی. لـە بەدبەختیـی خـۆی عەیشـێ لەنـاو کـوردا دەرکـەوت ئەگـەر لـە هۆلیـوود بـوا دەبـوو بـە ئەسـتێرەیەکی سـینەمای جیهانـی.

عەیشـێ پێشـتر ژنـی پیاوێکـی نـاو شـەنگە بـووە لـە ناوچـەی کەندێنـاوە لـە گونـدی پەرکانـە یـان گونـدی قەپـران دادەنیشـتن. شـەنگە پیاوێکـی بـێ نمـوود و نابـووت بـووە بـەڵام دەڵێـن ئـازا و ڕەشـید و زۆر دڕ بـووە و لـەوە دەچـێ هـەر بـە زەبـری دەسـتی خـۆی و بـە هەڕەشـەی ڕینگـۆ Ringo ئاسـای عەیشـێی لـە ماڵەبابـی سـەندبێ، ئەگینـا دەڵێـن بـە هیـچ جۆرێـک هاوقەرانـی یەکـدی نەبـوون. جـا بۆیـە دوای ماوەیـەک عەیشـێ لەگـەڵ ئـەو مێـردە هەڵـی نەکـردووە و دەسـتی لەگـەڵ پیاوێکـی نـاو شـەریف جەبـار تێکـەڵ دەکات و ڕەگەڵـی دەکـەوێ و پەنـا دەبەنـە ماڵـی سـلێمان ئاغـای دزەیـی لـە گونـدی قوشـتەپە. جـاران نەریـت بـوو هـەر پیاوێـک ژنێکـی هەڵگرتبایـە دەیبـرد بـۆ ماڵـی ئاغایەکـی دەسـەڵاتدار یـان شـێخێکی نـاودار تـا ئـەوان مەسـەڵەتی بـۆ بکـەن و بـە شـەرعی و ڕەسـمی ببـن بـە هاوسـەری یەکتـر. دەڵێـن شـەنگە گوتبـووی "بـۆ کـوێ دەچـن ؟ بشـفڕن دەیانکـوژم". ئەوەبـوو کـە بەدوایانـدا دەگەڕێـت و بەهـەر ڕێگایـەک بـێ خـۆی دەگەیەنێتـە قوشـتەپە و شـەریف جەبـار دەکـوژێ. بـەڵام دەسـتی ناگاتـە ماڵـی ئاغـا بـۆ ئـەوەی عەیشـێش بکـوژێ. پـاش ماوەیـەک عەیشـێ دەنێرنـە ماڵـی ئاغـای ترپەسـپیان کـە ئـەوەش هـەر گونـدی سـلێمان ئاغـا بـوو. ماوەیەکیـش لـەوێ دەمێنێتـەوە و شـەنگەی مێـردی هـەر سـۆراخ بـە سـۆراخ لـە دووی دەگـەڕا پارێـز بسـتێنێ بیکوژێ بـەڵام تەنیـا ماڵـە ئاغاکانـی دزەیـی بـوون دەیانتوانـی عەیشـێ بپارێـزن و هـەر واشـی لـێ هـات. ئینجـا پلـە لارەک (پـوورە لارەک) کـە ئاغاژنـە

گەورەی ترپەسپیان بوو و لەگەڵ کافیەخانی دایکم یەکتریان زۆر خۆش دەویست عەیشێ دەنێرێتە لای دایکم بۆ کابانی و سەپەرشتیی ماڵ. ئەوەبوو کە دوای ئەم هەموو سەین و بەینە عەیشێ لە ماڵی ئێمە لە دووگردکان گیرسایەوە و تا ماوەیەکی زۆر لە ماڵی ئێمەدا وەک کابانێکی لای هەموومان ڕێزدار و خۆشەویست مایەوە. لێرەدا لە زاری شەنگە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: "زۆر جار بیرم دەکردەوە خۆم بگەیەنمە دووگردکان و عەیشێ بکوژم، بەڵام کە لێی ورد دەبوومەوە کافیەخان سەیدە و کچی شێخ مارفی هەڵەجەیە ترس و سامێک بە ناو دڵمدا دەهات و فیکرم دەگۆڕی" دوای چەند ساڵێک بە ناوبژیکردنی ماڵی ئێمە دان و سەندن لەگەڵ شەنگە بۆ تەڵاقدانی عەیشێ دەستی پێ کرد. سەیر و سەمەرە لەوەدابوو کە شەنگە بە یەک مەرج ڕازی بوو بوو عەیشێ تەڵاق بدات. مەرجەکەش ئەوە بوو کە بە هیچ جۆرێک نابێ شوو بە پیاوێک بکات کە لە خۆی (لە شەنگە) بە نموودتر و بە هەیکەلتر بێ. گوتبووی با مێرد بە پیاوێکی پووخەڵە بکات قەیناکا بۆی تەڵاق دەدەم. ئیتر بیر بۆ حەمدینی مەیتەری ئەسپەکانی ئێمە چوو کە پیاوێکی فەقیری بێ دەسەڵات و بێ ژن بوو و لە بن داڵانەکەی ماڵێ ئێمە بۆ پاسەوانی لەوێ دەنووست. ڕاستییەکەی مام حەمدین پیاوێکی ئێسک سووکیش بوو هەرچەندە کە باڵای بە باڵای عەیشێت بگرتایە کورتی دەهێنا بەڵام دیار بوو شەنگەش تێگەیشتبوو کە ئیتر لە دووگردکان ناتوانێ زەفەری پێ ببات ئەوە بوو کە تەڵاقی دا. عەیشێش بۆ ئەوەی بە تەواوی ڕزگاری ببێ لە دڵپیسی شەنگە ناچار مێردی بە حەمدین کرد، حەمدینێک کە بەبێ ئاگا بیتاقەی یانسیبی بۆ دەرچوو، بوو بە مێردی ئەو مەلیکەی جەماڵە. عەیشێ ئیتر ئازاد کرا و ماڵیان گواستەوە بۆ ناو ئاوایی دووگردکان و کێشەکە بەم شێوەیە کۆتایی پێ هات، عەیشێ و حەمدینیش تا مردن ژیانێکی ئاسوودەیان بە کۆڵێک منداڵی جوان جوانەوە بەسەر برد. یادت بەخێر عەیشە جوان.

زۆر سوپاس و پێزانینیشم بۆ قەدریەخان گیانی تاکە خوشکم هەیە کە زانیارییەکی زۆری دامێ لەبارەی عەیشە جوانێ.

زولە و فاتۆکیش دوو کچی زۆر ئاقڵ بوون فاتۆکیان لە زولە جوانتر و باریکتر بوو و هەمیشە بۆڵە بۆڵیان لەگەڵ یەکدا دەکرد. لەپاشان ئەم دووانەش مێردیان کرد و ئیتر کارەکەری دیکەمان هاتنە ماڵ بەڵام لە قۆناخێکی دواتری منداڵیی مندا.

ئەم سێ چاوەی ماڵەکەی ئێمە ( ماڵی ئاغا ) کە لەسەرەوە باسم کرد هەر یەکە بە جیا جیا دەرگای خۆی نەبوو بەڵکو یەک دەرگای گەورە دەچووە ناو کۆریدۆرێکی ڕاست و چەپ بە پانایی خانوەکە و ئیتر هەرسێ چاوە وەک سێ هەیوان دەکەوتنە پشت کۆریدۆرەکە. بیرمە کلیلی ئەم دەرگایە و کلیلی دوودەرییەکەی دالانەکەش (قەمتەرەکە) زۆر گەورە بوون و یەکەمیان لە ئاسن و دووەمیان لە دار دروست کرابوون. بۆ زیاتر دڵنیایی شمشێرێکی درێژی ئەویش هەر لە دار دروستکراو لەلای ژوورەوە دەرگا و دوودەرییەکەی بە چاکی دەبەستایەوە. ئەو زەمانە دزی زۆر دەکرا چونکی سەوادی میللەت زۆر دەستکورت و هەژار بوون و ئی وا هەبوون کە تەنانەت پارووی نانیشیان بۆ منداڵەکانیان نەبووە. گەرماوێکیش هەر لە حەوشەکە و لەنێوان باخچە و تەنیشت چاوەی هیزان دروست کرابوو کە بریتی بوو لە ژوورێکی گەورەی خۆگۆڕین و ژووری خۆشتنیش. بە پێی کاک موحسینی برام ئەم گەرماوە پێشتر لە شوێنێکی تر بووە دوایی گواستراوەتەوە بۆ شوێنی زەمانی من بەڵام من گەرماوە کۆنەکەم بەبیر نایە.

ئەم پلان و دیزاینەی ماڵەکەمان کە لێرەدا باسم کردووە ئەوە لە سەردەمی منداڵیی مندا وا بوو، بەڵام دواتر گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا کرا و هەندێ ژووری تری خرایە سەر.

ئێمە دوو سەگمان بۆ پاسەوانی لەناو حەوشەکەماندا ڕاگرتبوو (سۆرە و بۆرە) بەڵام لە بیرمە لە درەنگانی شەوێکی ساردی زستاندا

دیـار بـوو ژمارەیـەک لـە سـەگی دیکـەی ئاوایـی نازانـم چـۆن بەسـەر دیـواری بـەرزی حەوشـەکەماندا گەیشـتبوونە نـاوەوەی و بـوو بـە شـەڕە سـەگێکی گـەرم لەگـەڵ سـۆرە و بـۆرەی ئێمـە و کەسـمان نەوێرایـن دەرگا بکەینـەوە. بـۆ بەیانـی کـە لەخـەو هەڵسـتاین بینیمـان کـە لاشـەی بـۆرەی بەسـتەزمان لەبـەر دەرگاکـە کەوتـووە و بووەتـە قوربانیـی ئـەو شـەڕە و خوێنێکـی زۆریـش دەرگاکەمانـی خوێنـاوی کردبـوو.

لـە سـەردەمی منداڵیـی مـن بـۆ ڕووناکـی فانـۆس و لامپـا و چـرادان بەکار دەهـات لـە پاشـان لۆکـس پەیـدا بـوو ئینجـا لـە سـەرەتای پەنجاکان مەکینـەی ئەلەتریکمـان کـڕی کـە بـۆ ئـەو زەمانـە زۆر دەگمـەن بـوو ئەلەتریـک لـە گوندێـکا هەبێ بۆیـە ئـەو ئەلەتریکـەی دووگـردکان لـە هەمـوو ناوچەکـە دەنگـی دایـەوە.

ئەمەیـان پلانـی بەشـی ماڵەوەمـان بـوو کـە پێـم وایـە زۆرترایەتیـی ئاغاکانـی دزەیـی بـە هەندێـک جودایـی هەمـان پـلان و دیزاینیـان بـۆ ماڵەکانیـان دادەڕێشـت. حـەز دەکـەم ئەمەشـی بخەمە سـەر کە لـە پیرەکانی جارانـم دەبیسـت گوایـا هەمـوو ئاغاکانـی دزەیـی ڕووی ماڵەکانیـان لـە باکـوور دەکـرد کـە نیشـانەی ئـەوە بـووە ئـەوان لـە بنەڕەتـدا لـە باکـووری کوردسـتانەوە هاتوونەتـە باشـوور ئینجـا ئایـا مەبەسـتیان لـە باکوورەکـە کوردسـتانی تورکیـا یـان ئێـران بـووە ئـەوە نازانـم چونکـە بـۆ دەشـتی هەولێـر ئـەو دوو دەڤـەرە هەردووکیـان مەیلـەو باکـوورن.

## دیوەخانەکەی بابم و دواتر هی کاکم

دیسان بە پێویستی دەزانم بە تێ بینییەکی زمانەوانی دەست پێ بکەم چونکە پەیوەندییەکی نزیکی بە بابەتەکەوە هەیە. بە تێڕامان و تێگەیشتنی خۆم کە مەرجیش نییە سەداسەد ڕاستی بۆ چووبم، ئەمن پێم وایە وشەی دیوەخان دەبێ لە دوو وشەوە پێک هاتبێ کە یەکەمیان (دیو) کوردییە و ئەوی دیکە (خان) مەغۆلییە. وشەی دیو لە زمانی کوردیدا بۆ دوو شت بەکار دێ یەکێکیان (لا)یە وەک کە دەڵێین (ئەملا، ئەولا) ئەوی تریشیان واتای (ژوور) دەگەیەنێ، بۆ نموونە تۆ ئەگەر لە ژوورێکا بچیت بۆ ژوورێکی تر دەڵێی دەچم بۆ ئەودیو واتا بۆ ژوورەکەی تر. وشەی (خان) مەغۆلییە و کورد لە عوسمانییەکانی وەرگرتووە. جا هەردوو وشە پێکەوە دەبێتە (ژووری خان) واتا ئەو ژوورەی کە پیاوێکی گەورەی دەسەڵاتداری وەک خانی لێ دادەنیشێ. نموونەیەکی تر بۆ دڵنیابوون کە وشەی (دیو) واتای (ژوور)یش دەداتەوە وشەی (دیوان)ە. خۆی وشەی (دیوان) کە عەرەب لە کورد زیاتری بەکاری دێنن هەر کوردییەکەی خۆمانە و کۆی وشەی ژوورە (دیو - ان) واتا (ژوورەکان) کە ئەمەش هەر پەیوەندیی بە کەسایەتییەکی دەسەڵاتداری سەردەمانی کۆنەوە هەبووە ئەگینا لە خان و میر و بەگ و ئاغا و کوێخوا بەولاوە کێ پێشان ئەو هەموو ژوورەی هەبووە و کێ پێی بەڕێوە دەچوو و بۆ چیی بووە؟ ئەگەر لەبیریشتان مابێ جاران لەسەردەمی مەلەکییەتی عیراق (رئیس الديوان الملكي) هەبوو کە کارمەندێکی باڵا بوو و سەرپەرشتکاری هەموو (ژوورەکانی یان ئۆفیسەکانی) فەرمانبەرانی مەلیک بوو کە بە ئینگلیزی بەم پۆستە دەڵێن chief of staff و لە کۆشکی شاهانەی بریتانیاش پێی دەڵێن ( بەتلەر Butler) بۆیە من پێم وایە ئەگەر ئێمە ئیمڕۆ وشەی دیوان کە هی خۆمانە بۆ

ئۆفیسی ئینگلیزی office لەجیاتی وشەی (نووسینگە) بەکار بێنین کە وەرگێڕاوی کتومتی (مکتب)ی عەرەبییە زۆر ڕاسترە. تێ بینییە زمانەوانییەکەم لێرەدا تەواو بوو.

بەشی دیوەخانی کۆمپاوندەکەی ماڵەبابی من ئەوسا و ئێستاش لەسەر یەکێک لە دوو گردەکەی دووگردکان بنیاد نراوە، گردی سەید وەسمانی کە گردی ناوماڵانیشی پێ دەڵێن. ئەمن ئەوە سێیەم شێوەی باڵاخانەی دیوەخانەکەمانە کە لە منداڵیمەوە تا ئەمڕۆ بینیومە مەبەستم ئەوەیە کە چەندین جار گۆڕانکاریی بەسەردا کراوە. تا ساڵی 1942 کە تەمەنم هەنگی شەش ساڵێک دەبوو هەر ئەو بینایەی زەمانی بابم بوو کە بریتی بوو لە هۆڵێکی گەورەی بڵند و هەیوانێکی جوانیش لەبەر دەمیا کە بە دوو کۆڵەگەی (ستوون)ی داری بە نەخش هەڵکەندراو ڕاگیرابوو. بیناکە بە خشتی گڵ دروست کرابوو و زۆر بە لووس و پووسی سواخ درابوو و ساڵانەش سواخدانەکە نوێ دەکرایەوە. ئەوسا دانیشتن لەسەر ئەرزا بوو و مافوور و لاکێشە و سەرەندازی ڕەنگاوڕەنگی جوان جوان ڕادەخرا. ئەم دیوەخانە بێجگە لە خودی ئاغا خۆی دەرگاکەی هەمیشە ئاوەڵا بووە بۆ دانیشتوانی گوندیش کە دەهاتن لەوێ قاوەچیی ئاغا قاوەی پێشکەش دەکردن و ئاوی ساردیشیان لە کووپە یان کەدینەیەکی گەورە نۆش دەکرد و بە باسوخواسی دەغڵودان و دنیاش یان بە یاریی دامە و شەترەنج کاتیان بەسەر دەبرد. بەڵێ ئێختیارەکانی گوندی دووگردکان دەیانگێڕایەوە کە لە سەردەمی حەمەدەمیناغای بابم تەختەی شەترەنج و دامە لە دیوەخان بۆ خەڵکی ئاوایی بەردەست کرابوون. بەڵام لە زەمانی منداڵیی من شەترەنجم لە دیوەخان نەدیوە و ئەوەی کە من دەمدی تەنیا یاریی دامە بوو. بەڵام بە بیرم دێ کە جارێکیان لەناو خۆڵ و خۆڵەمێشی بناری گردەکەی کە دیوەخانی لەسەرا دروست کراوە سەربازێکی دارینی چکۆلانەی شەترەنجم دۆزییەوە کە دڵم زۆر پێی خۆش بوو چونکە پێم سەیر بوو و پێشتر شتی وام نەدیبوو و هەر

یەکسەر بە کوتکی پەڕەی پەڕەچییەکانم دەشوبهاند. نەمزانی چییە و بە مام حوسێن عەسکەری قاوەچیم پیشان دا گوتی ئەمە هی شەترەنجە کە لە زەمانی حەمەدەمیناغای بابت لێرە لە دیوەخانەکەیدا هەبوو.

ئەم دیوەخانەی بابم کە نازانم چ ساڵێک بنیاد نرابوو لە ساڵی 1942 کاک ئەحمەدی براگەورەکەمان کە لە جێی بابم دانیشت گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا کرد و باڵێکی زۆر لەوەی پێشوو گەورەتری خستە سەر. ئەمن بنیاتنانی ئەو باڵەشم چاک لەبیرە و کە کاری بیناسازی تەواو بوو کاک ئەحمەدی برام بە دەستی خۆی لە بەرزایی دیوارێکدا لەسەر قوڕی کزر ئەمەی نووسی: عمل سالح 1942. وەستای بیناساز وەستا سالح بوو کە خەڵکی گوندی قشاغلوو بوو و وەستایەکی زۆر لێهاتووی بەناوبانگ بوو.

بەپێی هەندێ لە بیرەوەرییەکانی جەنابی مام جەلال تاڵەبانی دیارە کاک ئەحمەدی برام لەوساڵە (1942) بەرپرسی حزبی هیوای ناسیۆنالیست بووە بۆ پەیوەندی لەگەڵ عەشایردا. کاک ئەحمەد لەو تەمەنە بچووکەی کە تەنیا هەژدە ساڵێک دەبوو، بە سەرو سیما و ڕەفتاری پیاوانەی و بەژن و باڵای کەڵەگەت و ئاکاری ڕێک و جوانی ڕوو و ڕوخساری و چێژێکی زۆر بەرزی لە پۆشینی جلی کوردیدا و هەروەها بەوەی کە کوڕی حەمەدەمیناغای حاجی بایزاغا بوو، بووبوو بە کوڕەلاوێکی زۆر خۆشەویستی ناو عەشایر و شارستانیش. بیرمەندی گەورەی کورد مەسعود محەمەد ئەمەی دەرهەق بە حەمەدەمیناغای بابمان نووسیوە: "حەمەدئەمیناغای باوکی {باوکی ئەحمەد} کە لە تافی هەڵچوونیدا مەرگ پێچایەوە نیهاد پاکێک و نیک نەفسێکی ئەوتۆ بوو کە هەر خۆی بتوانێ ئەحمەدت لەبیر بباتەوە"

بەم جۆرە کاک ئەحمەد تۆڕێکی پەیوەندیی بەرفرەوانی لەگەڵ چالاکوانانی بزووتنەوەی کوردایەتی و لەگەڵ چینی ڕۆشەنبیر و کارمەند و فەرمانبەرانی پایەبەرزی دەوڵەتیش لە هەولێر و لە کۆیە پێکەوە

نابـوو و زۆریـش خۆشەویسـت بووبـوو لـەلای هەموویـان. ئـەوەی کـە کەسـایەتییەکەی بەتایبەتـی لـەلای بنەماڵـە گەورەکانـی ناوشـاری هەولێـر و کۆیـە و سـلێمانی هێشـتا خۆشەویسـتریش کردبـوو پەیوەندیـی خزمایەتیـی زۆر نزیکـی بـوو لەگـەڵ یەکێـک لـە بنەماڵـە هـەرە خانەدانەکانـی شـاری هەولێـر، بنەماڵـەی ئەحمـەد عوسـمان کـە بـە ئەحمـەد ئەفەنـدی ناسـراو بـوو و موتەسـەڕیف (پارێـزگار)ی پێشـووی هەولێـر و سـولەیمانی بـوو لـە سـاڵانی بیسـتەکان و سـییەکان و دواتـر بـوو بـە ئەندامـی ئەنجومەنـی پیرانـی عیـراق لـە بەغـدا ( مجلـس الاعیـان ). هاوسـەری ئەحمـەد ئەفەنـدی (نەعیمـە خانـی شـێخ مارفـی بەرزنجـی هەڵەجـە) پـووری ئێمـە بـوو، خوشـکی دایکمـان. هەروەهـا بـەوەی کـە نـەوەی شـێخ مارفـی بەرزنجی بـوو خزمێکـی زۆری نەجیبـزادەی لـە سـلێمانی هەبـوو. کاک ئەحمـەد، لەپـاش مردنـی باوکمـان سـاڵی 1936، بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە گـەورەی مـاڵ بـۆ دایـک و تاکـە خوشـک و چـوار براکانـی و لـە تـەک دایکیـا سەرپەرشـتیی ئـەو مـاڵ و دەوڵەتـە بـکات کـە باوکمـان بـۆی بەجـێ هێشـتبووین، بـە ناچـاری دەسـت لـە خوێنـدن هەڵدەگرێـت کـە لـە پۆلـی چـواری سـەرەتایی بـوو لـە قوتابخانـەی سـەرەتایی گونـدی قازیخانـە بەڵام سـەیر ئەوەیـە کـە لەسـەرەتا تـا بنەتـای ژیانـی کورتیـدا هـەر کەسـێک تـاوێ لەگـەڵ ئـەو پیـاوە دانیشـتبا هـەر وای دەزانـی لەگـەڵ دەرچـووی کۆلێژێکـدا گفتوگـۆ دەکات، ئەوەنـدە تێگەیشـتوو و ئـاگاداری دونیـا و بـە مەعلومـات بـوو.

جـا ئەمـن ئێسـتا وای بـۆ دەچـم کـە کاک ئەحمـەد ئـەم گۆڕانکارییـە میعمارییـەی کـە سـاڵی (1942) بـۆ دیوەخانەکـەی بابـی بـە خەیاڵـدا هاتـووە لـە ڕوانگەیەکـی زیرەکایەتـی بـووە کـە شایەسـتەی ئـەو پایـە کۆمەڵایەتییـە تازەیـە بێـت کـە بـۆ بنەماڵـەی ئێمـەی داچەسپاندبوو نـەک هـەر لەنـاو عەشـایر بەڵکـو وەک لەسـەرەوە باسـم کـرد لەنـاو چینـی ڕۆشـەنبیر و شارسـتانە بورژوازییەکانیـش.

دیزاینـی باڵـە تازەکـەی دیوەخـان بریتـی بـوو لـە ژوورێکـی گـەورەی

میوانان و لەو ژوورەشەوە دەرگایەک دەیبردی بۆ ژوورێکی دیکەی بچووکتر بۆ نانخواردن. لەوێشەوە دەرگایەکی تر کرابۆوە کە بەناو هەیوانێکی زۆر فرەوان و دڵگوشادا دەگەیشتیە دەرگایەکی تر بۆ دەستشۆر و گەرماو و تواڵێت.

ئەمانە هەمووی بە گەچ سواخ درابوون کە بۆ ئەوسا تازەگەرییەک بوو لای دیوەخانی ئاغاکانی دزەیی کە زۆرترایەتی، نەک هەموو، ماڵ و دیوەخانەکانیان هی خۆیشمانی لەگەڵدا بێ هەر بە قوڕەسوور سواخ دەدران. پێم وایە هەندێ لە ئاغاکانی دزەیی بەرەبابی پاشا دیوەخانی سپییان پێش ئەوەی ئێمە هەبووە. دیارە کاک ئەحمەد بیری لەوە کردبۆوە کە جۆری میوانە تازەکانی لە چینی ڕۆشەنبیر و فەرمانبەرانی دانیشتووی شار بوون کە - بە پێچەوانەی میوانی عەشایری جلی کوردی لەبەر - چاکەت و پانتۆڵیان دەپۆشی. ئەمانە بۆیان سەخت دەبوو بێن لەسەر ئەرز لەسەر مافوور دابنیشن چون لەلایەکەوە دانیشتنی سەر ئەرز بۆ پانتۆڵی تەسک خۆش نییە و لەلایەکی تریشەوە دەقی ئوتووی پانتۆڵەکانیان دەشکا و ئەمەش ئیحراجییەک دەبوو بۆ ماخۆماڵ و لە لایەکی دیکەشەوە دەبوایە کە دادەنیشتن یان لنگیان درێژ کەن یان پێڵاویان داکەنن کە دیسان شەرمەزارییەک دەبوو بۆ خانەخوێ. جا بۆیە ژووری میوانان بە دوو تاخم قەنەفەی لە دارێکی ساجی زۆر پتەو و توکمەو بە قوماشێکی ڕەنگ شینی زۆر جوان دروستکراو ڕاخرابوو و مێزێکی خڕی زۆر جوانیش لە لایەکدا داندرابوو کە چەپکە گوڵێکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگی لە ئاوریشم دروستکراوی زۆر سەرنجکێشی لەسەر داندرابوو. ئەو مێزە و هەموو تاوڵە بچووکەکانی نێوان قەنەفەکانیش بە سەرمێزی بە نەخشی زۆر دەگمەن بۆ ئەو سەردەمە داپۆشرابوون. ئەم تاخمە قەنەفە جوانە لەلایەن وەستای دارتاشی ناودار و زۆر خۆشەویستی ئەو زەمانە لە هەولێر (وەستا خدری نەجار)ەوە دروست کرابوو. مافوورێکی عەجەمیی زۆر پانی زۆر نایاب و زۆر گرانبەها ئەرزی ئەو ژوورەی

میوانانی داپۆشیبوو کە ئێستاشی لەگەڵدا بێت نەخش و نیگاری ناو ئەو فەرشە ڕەنگ سوورە و هی مێرابەکانیشیم وا لەبەرچاوە. چەند ساڵێک دواتر سێ چوار تابلۆی گەورەی زۆر گرانبەهای دەستکردی هونەرمەندی ئەوسای کوردستان دانیال عوزێر قەساب هەڵواسرابوو کە یەکێکیان تابلۆی کاک ئەحمەدی برام بوو بە جلی کوردییەوە کە ئێستاش ماوە وا لە دیوەخانی کاک وریای کوڕە گەورەی لە هەولێر هەڵواسراوە هەرچەندە کە کەمێک ڕووشاوە، یەکێکی تریش تابلۆی کاک ئەنوەری برام بوو ئەویش هەر بە جلی کوردی کە بەداخەوە ئەمەیان لە ئەنجامی ڕاوەرووت و ڕۆژە ڕەشەکانی 1963 لەناوچووە. یەکێکیشیان کە دیمەنی گوندێکی ئەوروپایە ئەویش ماوە و لە ماڵی کاک سەعدیی برام لە هەولێر هەڵواسراوە. دانیالی هونەرمەند کە جوو بوو ئەویش تەبای جووەکانی عیراق و کوردستان لە سەرەتای پەنجاکان باری کرد بۆ ئیسرائیل و ئێستا کۆچی دوایی کردووە. بەڵام کاک مونیری برای کە ئەمیش هونەرمەندێکی بۆیەکار بوو ئەو ماوە و لە ئیسرائیلە و براکانم زوو زوو تەلەفۆنی بۆ دەکەن و خۆیشم جارێکیان لە ئاڵمانیاوە قسەم لەگەڵا کرد چونکی ئەمیان لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە هەولێر ساڵی 1943-1942 مامۆستام بوو. یادیان بەخێر ئەو هونەرمەندە دەست ڕەنگین و مرۆڤە باشانە. پەنجەرەیەکی پانی لای باکووری ئەم ژوورەی میوانان کە دەیڕوانیە شاری هەولێر بە دەزگایەکی تایبەت گیرابوو کە قاڵبێکی لە تەل دروستکراو بوو و پڕ دەکرا بە حوشترالووک (جۆرە ڕووەکێکی ئەو دەشتەیە) و هاوینان ناوە ناوە ئاوی بەسەرا دەپرژێندرا و بای شەماڵ لێی دەدا کە ژوورەکەی بەڕاستی زۆر فێنک دەکردەوە. ئەمە (ئێر کۆندیشنی -air condition)ی ئەو زەمانە بوو ئەگەر ئەلەتریکت نەبوا. ئێمە لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیست ئەلەتریکمان برد بۆ دووگردکان. ژووری نانخواردنیش مێزێکی درێژ و دوانزدە کورسیی زۆر جوانی لێ داندرابوو کە ئەوەش دەستکردی وەستا خدری نەجار

بوو. دیوەخانە قورە کۆنەکەی جارانیش هەر مابوو و ئەو زیاتر بۆ خەڵکی ئاوایی و خزمە نزیکەکانی خۆمان بەکار دەهات و ئەوەش تواڵێتی تایبەتیی خۆی هەبوو کە کەمێک لە دووریی بیناکە لە لاپاڵ گردەکە کرابوو. شوێنی دەرگای ئەم ئاودەستە دەرگای بۆ نەکرابوو هەر وا بە کراوەیی لێی دادەنیشتی چونکە پێشی چۆڵ بوو و لاتەریکیش بوو. بۆ دانیشتنی ئێوارانی هاوین و پایز دوو شوێن تەرخان کرابوو. ئێواران تا ڕۆژئاوا لە پشتەوەی دیوەخانە تازەکە ڕوو لە ڕۆژهەڵات سەکۆیەکی درێژ لەپاڵ دیواری دیوەخان دروست کرابوو کە هەتاوی لێ نەدەدا. کە تاریکیش دادەهات دەمانگواستەوە بۆ گۆرەپانی پان و فرەوانی پێشەوە و لەوێ مافوور و دۆشەک بۆ میوانی عەشایر و کورسیش بۆ میوانی ئەفەندی ڕیز دەکران.

بیرمە کورسییەکان هەندێکیان حەیزەرانی شوێنی دانیشتنەکەی کون کون بوو و هەندێکیش لە شەپکەداری جوان جوان ساز کرابوو کە بەسەر یەکدا دەقوچێندرایەوە و دەبووە یەک پارچەی پان کە بۆ هەڵگرتن ئاسانتر دەبوو.

بە نەریت دیوەخانی ئاغاکان دەبوایە نۆبەتداری هەبێ. لەو سەردەمە وەک پێشتر باسم کردووە خەڵک دەسکورت و برسی بوون، بۆیە دزیی زۆر بەربڵاو بوو یانیش لە ئەنجامی دوژمنداری باوی نێوان عەشایران شەوان پیاویان دەنارده سەر ناحەزەکانی خۆیان دزییان لێ بکەن یان هەر نەبێ بە جۆرێک یا بە جۆرێکی تر هەتکیان بکەن و سووکیان بکەن وەک بۆ نموونە بڕینی کلکی ئەسپەکانیان. جا لە دیوەخانی ئێمەش لە دووگردکان هەمیشە شەوانە دوو چەکدار نۆبەتیان دەگرت. هەندێ لەو نۆبەتدارانە ئەمن خۆیشم لەبیرم ماون وەک پیردوداغای حاجی خەلیلی و سەید تۆفیق. بەپێی کاک موحسینی برام کە لە من گەورەترە و شتی دوورتری لەبیرە دەڵێ پێش ئەوانەش دوو نۆبەتداری ترمان هەبووە، ڕەشیدە و بلە حەسیری برای. نۆبەتدارەکان سەرو تفەنگی ئاغایان دەدرایێ لەگەڵ

خەریتەی فیشەکان. تفەنگەکانی ئەو زەمانەش یان ماوزەر Mauserی ئالمانی یان جانبێزار، کە نازانم لە کوێ ساز دەکرا، یان تفەنگێک کە تفەنگی ئینگلیزیان پێ دەگوت یان برنۆ Brnoی چیکی کە لە شاری برنۆ ساز دەکرا و ئەمەیان سێ جۆر بوو: برنۆی درێژ، برنۆی وەسەت و قوتە برنۆ. ئەم نۆبەتدارانە ئەرکی پاراستنی دیوەخان و ماڵ و حەساریان لە ئەستۆ بوو و دەبوایە شەوانە بە نۆرە چەند جارێک بۆ دڵنیایی بە دەوروپشتی کۆمپاوندەکەدا بگەڕێن و بەو شەوە تاریکە کە تەواوی چراکانی ئاوایی دەکوژێندرانەوە ئەگەر تارماییەکیان بەدی بکردایە دەبوایە یەکسەر تێی بخوڕن "کورە زەڵام کێی؟" ئەگەر کابرا خۆی نەناساندبوا ئەوا یەکسەر تەقەیان لێ دەکرد. دەڵێن دزی فێڵباز هەبوون کە دەچوونە دزی ماڵێک ئەگەر لە دوورەوە هەستیان بکردایە کە نۆبەداری ئاغا وا نزیک دەبێتەوە یەکسەر بە گاگۆلکێی چوارپەل دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی نۆبەتدارەکە فریو بدەن کە وا تێ بگات ئەوە سەگە نەک بەشەر و ئیتر ناچێ بە لایانا. دەڵێن دزیش هەمیشە دوو کەس دەبوون یەکێکیان (پاشدز)یان پێ دەگوت کە چاوەدێریی دەوروپشتی خۆیانی دەکرد لە کاتێکدا کە ئەوی تریان کە (پێشدز)ی ناو بوو ئەو بە دیواربڕ خەریکی بڕینی دیواری ماڵێک دەبوو.

وەک لە هەموو دیوەخانی ئاغاکانی دزەیی، لە دووگردکانیش ئێمە قاوەچیمان هەبوو کە بەرپرسیارەتیی لێنانی قاوەی سبەینانی لەسەرا بوو. ئەمن بەبیرم نایە بەڵام کاک موحسینی برام دەڵێ بە بیری ئەو مام ئەسعەد ناوێک قاوەچی بووە کە ئێستاش کچێکی ماوە (فاتم) و نەوەشی ماون. لە پاش مردنی ئەو ئینجا مام حوسێن عەسکەر بووەتە قاوەچیی دیوەخانی ئێمە.

حوسێن عەسکەر لە سالانی منداڵیی مندا بوو. تورک بوو تورکی زەمانی عوسمانلی و خەڵکی بورسە بووە. لە شەڕی گەورەی یەکەم لە ناوچەی هەولێر سەربازی عوسمانلی بووە و لە نزیک دووگردکان برینداردەبێ. باوکم دەنێرێ بیگەیەننە گوند و تیماری بکەن. مام

حوسێن چاك دەبێتەوە و پاش برانەوەی جەنگیش نەیویستووە بگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی و لە دووگردكان وەك پیاوێكی بەوەفا بۆ باوكم دەمێنێتەوە و باوكیشم دەیكا بە قاوەچیی خۆی و ژنیشی بۆ دێنێ، فاتمیلێ. مام حوسێن كچ و كوڕێكی بوو (عەیشێ) و (عەبدوللا) كە هەردووكیان برادەری زۆر نزیكی منداڵیم بوون. ئەمەی دواییان بە داخەوە نەماوە بەلام عەیشێ ماوە و ئێستا بە مێرد و منداڵە و لە مەخمور دادەنیشێ. فاتمیلێی ژنیشی پێشتر دایەنی قەدریەخانی تاكە خوشكمان بووە. حوسێن عەسكەر پیاوێكی ڕەشتاڵەی لەسەرەخۆ و كەمدوو بوو و تا مردیش كوردیی باش فێر نەبووبوو. هەموو بەیانییان سەرلەزوو دەچوو بۆ ماڵی ئاغا و قاوەی ئەو ڕۆژەی وەردەگرت كە قاوەی سەوزی كاڵ بوو و دەگەڕایەوە بۆ دیوەخان بۆ ئامادەكردنی قاوەكە. لێنانی قاوەش كەرەستەی تایبەتیی خۆی هەبوو كە بە برژاندنی دەنكە قاوە كاڵەكە دەستی پێ دەكرد لەناو شتێكی وەك تاوەیەكی دەسك درێژ كە پێی دەگوترا سێرۆك و بەجۆرە كەوچكێكی باسك درێژیش كە پێیان دەگوت ئەستیو تێك دەدرا بۆ برژاندنی قاوە كاڵەكە لەسەر مەقەڵە یان بەردەسێرە. ئینجا دوای برژاندن دەخرایە ناو هاون و دەسكهاون بۆ كوتانی و لەو پرۆسەی قاوەكوتانەدا بەم بەیانییە كپ و بێ دەنگە شەپۆلی زرینگە و دەنگدانەوەیەكی موزیكاڵی زۆر هەستبزوێن كە لە هاونەكە هەڵدەستا ئەو ناوەی پڕ دەكرد لە موزیك. ئینجا قاوە كوتراوەكە لەگەڵ ئاو دەكرایە ناو چەند جەزوەیەك و لەسەر ئاگر لە ئاگردانی دیوەخانە قوڕەكەی ئاغا دەكوڵێندرا و تا نیوەڕۆ بەگەرمی دەمایەوە. ئەركی قاوەچی لە دیوەخان هەر قاوەلێنان نەبوو. پاككردنەوەی دیوەخان و ئاوڕشێنكردنی سەكۆكان و پڕكردنی كووپەی ئاوی دیوەخان بۆ خەڵكی ئاوایی و بۆ میوانانیش هەمووی بەرپرسیارەتیی قاوەچی بوو.

ئەوەش دیوەخان بوو ئینجا با بێمە سەر سێیەم بەش كە بەشی دوایی كۆمپاوندەكەی ماڵەبابی من بوو لە دووگردكان، حەسار.

## حەسارەکەمان

سێیەم بەشی کۆمپاوندەکەی ماڵی ئێمە لە دووگردکان ڕووبەرێکی سێ چوار دۆنمی دەبوو کە کەوتبووە نێوان دوو بەشەکەی تر، ماڵ و دیوەخان. ئەم بەشە کە حەساریان پێ دەگوت بە دیوارێکی بڵندی مەیلەو لاکێشەیی دەورە درابوو و ئەمەیش وەک بەشەکەی ماڵمان بە قەمتەرە (داڵان)ێکی بڵند دەچوویتە ناوەوەی. هەر لە بن قەمتەرەکە لای چەپ تەویلەیەک بۆ ئەسپان و لای ڕاستیش تەویلەیەک بۆ هێستران دروست کرابوون. لەناو هەر تەویلەیەک لەپاڵ دیوار ئاخوڕی درێژ دروست کرابوون و کا و جۆی تێ دەکرا بۆ ئەو وڵاخانە. لەو ساڵانەی منداڵیی من کە لەبیرم مابێ بەڕێوەبەری گشتیی حەسارەکەمان مستەفا سەرسۆر بوو دوای ئەو حەمدین بوو بە مەیتەر کە دواتر بوو بە مێردی عەیشە جوانی ناوماڵمان، ئیتر ماڵیان گواستەوە بۆ ناو ئاوایی و ئێمەش مەیتەری دیکەمان گرت لە پێشان حەسەن مێرەم و دوای ئەو سابیری عەلی قادری ناسراو بە سابیرە قوتە. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لە ڕۆژگاری ئەم دووانەی دوایی کە ئۆتۆمۆبیل گەیشتبووە گوندەکان و زۆر لە ئاغاکانی وەک ئێمە دەستبەرداری ئەسپسواری بووبوون و مەیتەرەکان ئیتر کاری مەیتەرییان بووبوو بە کارێکی دووەمینە و زیاتر ڕۆڵی خزمەتکردنی حەسار و ناوماڵ و دیوەخانیشیان دەدی لەو ئیشوکارانەی کە بە ژن نەدەکران.

## خەپەی زبڵ ڕێژ

کە باسی تەویلەکانی دووگردکان بێتە گۆڕێ ناکرێ ناوی خەپە نەهێنرێ. ڕاستییەکەی نەک هەر تەویلەکانی دووگردکان بەڵکو تەویلەی ئەسپەکانی هەموو ئاغاکانی دزەیی. خەپە، پیاوێکی لەوانەیە سی و پێنج ساڵییەک دەبوو و پێم وایە خەڵکی گوندی دووسەرەی فەتاح ئاغای ئامۆزای باوکم بوو. خەپە بێکەس بوو نانی ئیللەڵای نەبوو و هۆشیشی ئەوەندە لەسەر خۆی نەبوو بۆیە هیچ کار و کاسبییەکی پێ نەدەکرا تەویلە پاککردنەوە نەبێ. ساڵانە چەند جارێک بە گوندەکانی ئاغاکانی دزەییدا دەگەڕا بۆ ماوەیەک لەوێ دەمایەوە بە بەرامپیل و بە کۆڵی خۆی زبڵی هەموو تەویلەکانی ولاخەکانیانی بۆ دەڕێشتن و زۆر بەجوانی گەسکی لێ دەدان. لە پاداشت، لەو ماوەیەی کە لەوێ دەمایەوە ماڵی ئاغا سێ ژەمە نانیان دەدایێ لەگەڵ هەندێ لە کۆنە جلوبەرگی خۆیان. ئیتر کە کاری لەوێ تەواو دەبوو دەڕۆیشت دەچووە گوندی ماڵە ئاغایەکی تر. جاری واش دەبوو کە ئاغایەک خۆی بەدوای خەپەیدا دەنارد بچێ تەویلەکانی بۆ پاک بکاتەوە. خەپە هەرچەندە کە سەروسمێڵی هەمیشە تۆزاوی و هەمیشەش بۆنی تەرس و زبڵی تەویلەکانی لێ دەهات بە دەموچاو پیاوێکی ئاکار جوانی ئێسک سووک بوو و زۆر کڕ و کەمدوو و لەسەرەخۆ بوو و بە بێدەنگی و بەبێ بۆڵەبۆڵی نارەزایی یان منجەمنجی ماندووبوون کاری خۆی بە ئەنجام دەگەیاند. هەرچیەکیشی بدرابوایە پێی ڕازی دەبوو.

یادی بەخێر، خەپە بەشێکی جیانەکراوەی حەسارەکەمان بوو. ئێستاش وێنەی ڕەنگو ڕوخساری خەپەی زبڵڕێژم زۆر بەچاکی لەبەر چاوە.

کە لە قەمتەرەکە بەرەو ناوەوەی حەسارەکە دەچوویت یەکسەر

بیری ئاو بوو کە بە بەکرە و دۆلاب و دەولک و بە یارمەتیی گوێدرێژێک ڕۆژانە ئاو بۆ ولاخەکانی ماڵی ئاغا هەڵدەهێنجرا و لە کۆڵێکی درێژ دەکرا بۆ ولاخەکان. لە ناوەڕاستی حەوشە فرەوانەکەشدا عەمبارێکی گەورەی گەنم و جۆ بوو. ئەمەیان خانووێکی گەورە بوو کە بە دوو بستێک لە ئەرز بڵند دروست کرابوو بۆ ئەوەی جورج و مشک نەگەنە ناوی. دوو دەرگای بچووکی بەتەنیشت یەکەوە هەبوو بۆ تێکردنی دانەوێڵە و لەپاشان کلیل دەدرا. بەڵام گەنم و جۆ هەر لەو عەمبارە هەڵنەدەگیران. لە خوار گردی کە دیوەخانەکەی لێ بنیاد نرابوو چەند چاڵێکی گەورە و قووڵ لێ درابوون ئەوانەش گەنم و جۆیان تێ دەکرا و بە جوانی سەریان سواخ دەدرا. لە عەمباری حەسارەکە کەمێک بەرەو هەورازتر بچووبایت ئیتر سێ چاوە خانوو بە ڕیز دروست کرابوون یەکێکیان بۆ ماڵی بەڕێوەبەری حەسار و دوو چاوەش بۆ هەڵگرتنی هەموو ئامێرەکانی کشتوکاڵی وەک هەوجاڕ و گاسن و شەغرە و جەنجەڕ و گوریس و بەنقادە و شەنە و بێرۆک و نیر و کۆپەران و هەموو پێداویستییەکانی پرۆسەی جووتکردن و درووێنەکردن و هەروەها زینی ئەسپەکان و کورتانی هێسترەکانیش. لە یەکێک لەو دوو ژوورانە تاخچەیەکی پان دروست کرابوو کە بۆ هەڵگرتنی ئامێری ورد بوو و زۆریش لە ئامێرەکان بە دیوارا هەڵدەواسران یان هەڵدەپەسێردران. بیرمە هێشتا کۆمباین (مەکینەی درەو) نەگەشتبووە کوردستان مەکینەیەکی بچووکی درووێنە کە ولاخ ڕایدەکێشا لە ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەم پەیدا بوو و کاک ئەحمەدی براگەورەکەمان دانەیەکی لەو مەکینەیە کڕیبوو کە بوو بە مایەی سەرسووڕمانی هەموو ئاوایی و بەتایبەتی ئێمەی منداڵ. ئەو مەکینەیەش لەناو مەخزەنی کەلوپەلە کشتوکاڵییەکاندا هەڵدەگیرا. ئیتر کە دەچوویتە ناو ئەو دوو ژوورە وەک چوویتە ناو موزەخانەیەکی کەلوپەلی فۆلکلۆری وابوو. لەلای باشووری حەوشەی حەسارەکە شوێنی تایبەت بۆ مانگا و گۆلک کرابوو و لەلای باکووری

حەوشەكەش ڕیزێك ئاخوڕ لە هەوای كراوە دروست كرابوون بۆ ئەسپەكانی ئاغا لە وەرزی هاوین و گەرمیدا.

بێجگە لەو ولاخ و ڕەشەولاخانە ئەم حەوشەی حەسارە پڕ بوو لە پەڕەوەر. مریشك و جووجەڵە و عەلەشیش و قاز و مراوی بە تایبەتی و هەندێ جار چینوماچینیشمان بۆ دەهات. ئەمانە بە ئازادی بەناو حەوشەكەدا دەگەڕان و سەرچاوەیەكی تێر و تەسەلیان بۆ خۆراك هەبوو، تەرسی ولاخی بەرزە و ڕیخی (تەپاڵە)ی ڕەشەولاخ. بەلام ڕۆژانەش یەكێك لە ماڵی حەساروانەكە دانی بۆ دەڕێشتن و هەموو ئەو باڵندانە ڕایان دەكرد بۆ لای و شوێنی حەسانەوەشیان زیاتر بن عەمبارەكە بوو. ئەگەر ڕۆژێك ژەمی خواردنمان مریشك بوایە دایكم داوای لێ دەكردین بچین بۆ حەسار و چەند مریشكێك بگرین بۆ سەربڕین. سەیر ئەوەیە كە ئەو مریشكانەی كاتی سەربڕینیان دەهات هەموو ناویان هەبوو بۆیە دایكم پێی دەگوتین بە ماڵی حەساروان بڵێین: مریشكە قوندە، مریشكە سوورەكە، مریشكە پنتك پنتكەكە، مریشكی ئەنوەری ... ئیتر بەم جۆرە. ئێمەی منالیش لەگەڵ چەند منداڵێكی ئاوایی خەنی خۆشیمان دەبوو بچین مریشك بگرین و زۆر جار بە سنگەخشكێ دەچووینە ژێر عەمبارەكە بە دوای مریشكا و هەموو جل و سنگمان بە ڕیقنە سواخ دەدرا.

یەكێك لە شوێنە خۆشەویستەكانی من لەم دووگردكانە ئەو حەسارە بوو. دیار بوو هەر لەو تەمەنەی منداڵیم چێژێكی زۆرم لە ژیانی ڕوستیكاڵ و وردبوونەوە لە ژیانی ئاژەڵ و باڵندە وەردەگرت. هۆیەكی تریش كە منی بە حەسارەكەمانەوە دەبەستایەوە و تا ئێستاش لەگەڵمدا دەژی ئەمەیان لە تەمەنی نەوجوانیم بوو كە هێشتا ماویەتی باسی بكەم.

ئیتر ئەم سێ دامودایەرەیە پێكەوە ئەو ژینگە خێزانییە بوو كە بە منداڵی لێی ژیابووم و گەورە بووبووم. خێزانی ئێمە تا ساڵی 1942 ئەو ساڵەی كە من لێی چوومەتە قوتابخانە لە هەولێر بریتی بوو لە

کافیەخانی دایکم، کاک ئەحمەدی براگەورەمان و ناجیەخانی هاوسەری و ڕەمزیەی کچیان کە تەمەنی ڕەنگە هەر ساڵێک دەبوو، ئینجا قەدریەخانی تاکە خوشکمان کە ئێمە براکانی ناومان نابوو (ئەدلە) و ئەمڕۆش هەر ئەوها بانگی دەکەین، دوای ئەو کاک ئەنوەر و کاک موحسین و کاک سەعدی ئینجا خۆم کە لە هەموویان بچووکتر بووم. لەو ساڵانە دایکم و کاک ئەحمەد و ناجیەخانی هاوسەری و ئەدلە و من نەبێ هەرسێ براکانی ترم لەبەر خوێندن بوون لە شاری هەولێر چونکی هەنگی قوتابخانە لە گوندی دووگردکان نەکرابۆوە. ئەو سێ برایەم هەموو ساڵێک دەبوایە خانووێک لە هەولێر بۆ ماوەی ساڵی سکۆلار (ساڵی خوێندن) بە کرێ بگرن و بۆ پشووی هاوینان دەگەڕانەوە بۆ دووگردکان.

دەڵێن بیری منداڵی تیژە، ئەمە ڕاستە چونکە ئەمن هەندێ شتی زۆر خۆش و زۆر ناخۆشی ئەو چەند ساڵانەی تەمەنی پێش چوونە قوتابخانەم لەبیر ماوە. بە ئاستەم لەبیرمە کە منیان ناردە مەدرەسەکەی دووگردکان تا لای مەلا سیپارە بخوێنم و فێری خوێندن و نووسین ببم. پێش من ئەدلەی خوشکم ئەویش بۆ ماوەیەک لای مەلا خوێندبووی و فێری خوێندن و نووسینێکی باش بووبوو و قورئان و شیعری کلاسیکیی کوردی بەڕەوانی ئەزبەر کردبوو. دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم کە سەرایی حەزم بۆ شیعری شاعیرانی کلاسیکیی کورد بە ڕێگای ئەو خوشکە نازدارەمەوە بووە کە ئەوەندە بە سۆز و هەوایەکی دڵڕفێن و بە دەنگ و سەدای ئاوازی دەروێشی و فەقێیانە بۆی دەخوێندین کە دیار بوو لە حوجرەی فەقێکان و دواتریش لە کوڕە خاڵە دەنگ خۆشەکانمان فێر بووبوو کە ناوە ناوە سەردانی دووگردکانیان دەکرد. لەو ساڵانە مەلای دووگردکان مامۆستا مەلا حوسێنی سەعدی بوو. مامۆستا مەلا حوسێن عالیمێکی زانا بوو لە بواری دین و دونیاش. چوار کوڕی هەبوو حەمەدەمین، عەبدە، تاهیر، بەشیر. هەموویانم لەبیرە بەڵام ئێستاکە پێم وایە بەس بەشیریان ماوە

و لە هەولێر دادەنیشێ.

لەناو ماڵی خۆمان لەو ساڵانەی کەوا باسی لێوە دەکەم ئێمە زۆر تەبا بووین و کاک ئەحمەدی برا گەورەمان کە لە جێی بابمان دانیشتبوو زەپتورەپتێکی سەیری پەیڕەو دەکرد و تا ڕادەیەک توند بوو لەگەڵمان. بە کولتووریش وابوو کە لەو سەردەمانە دەبوایە هەر قسەی باب یان براگەورە بێ بە بڕیار ئەگەر هەڵەش بوا و کوڕ و برا و خوشکی بچووکتریش و تەنانەت دایک و خوشکی گەورەتریش دەبوایە گوێڕایەڵ بن. هەڵبەت لەو تەمەنەی ئەوسامان ئەگەر برا گەورە هەڵەشی بکردایە ئێمە کەسمان نەماندەزانی کە هەڵەی کردووە و وامان دەزانی کە برا گەورەکان دەبێ فەیلەسوف بن و شت نییە نەیزانن. زۆر درەنگتر کە ئاستی ڕۆشەنبیریمان بەرزتر بوو ئینجا تێ دەگەیشتین کە ئەو بڕیارەی ئەوسا بڕیارێکی چەوت بووە و تەنیا لەعینادی و سووربوون لەسەر خۆسەپاندنی کەسایەتیی براگەورەوە سەرچاوەی دەگرت. ئەمن نازانم ئەگەر بابیشمان ئەوها بوویێ. بەداخەوە ئێمە جارێک لە دایکمان نەدەپرسی ئایا هەڵسوکەوت و ڕەفتاری بابمان لەناو خێزانی خۆی و لەگەڵ منداڵەکانی چۆن بووە. دایکم بۆ ئەوەی کوڕە گەورەکەی بەتەواوی هەست بە گەورەیی و سەرۆکایەتیی خێزان بکات زۆر زوو ژنی بۆ هێنا کە پێم وایە تەمەنی کاک ئەحمەد ڕەنگە هەر شانزدە ساڵێک دەبوو. دیسان هەر بە کولتووری ئەو سەردەمانە دایکەکان زۆریان لە دوو کوڕە گەورەکانیان دەدا و قسەیان لە قسەی نەدەکرد و بەم جۆرە جۆرێک لە ڕووحییەتی دیکتاتۆرییان لەناو مێشکی کوڕە گەورەکانیان دەڕواند کە زۆر جار ئاساری نێگاتیفی (نەرێنی)ی لەناو خێزانەکەدا بەجێ دەهێشت. هەڵبەت ئەم بیرکردنەوەیە و ئەم قسانە و ئەم خوێندنەوەیەم بۆ چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی خێزانی ئەو زەمانە هی ساڵانی منداڵیم نییە -کە ناشبێ ببێ - بەڵکو هی ئەمڕۆمە.

لەو چەند ساڵانەی بەر لە چوونە قوتابخانەم لە هەولێر واتا تا

پایزی ساڵی 1942 هەندێ شین و شایی ناو خزمانم بەبیر دێ. بیرمە زستان بوو کە ماڵ چۆڵ دەبوو و کوڕەکان کەسیان لە ماڵ نەدەبوون و ئەدلەی خوشکم و ناجیەخانی براژنم لەگەڵ کارەکەرەکان هەر یەکە لە لایەکا خەریکی ناوماڵ دەبوون تەنیا من و دایکم لە گوێ ئاگردانەکەی چاوەی ڕۆژهەڵاتی ماڵەکەمان بەدەوری بەردەسێرەی پڕ لە ئاگر و پەنگرەوە دادەنیشتین و من سەرم بە کۆشی دایکم دەکرد و ئەویش بە پەنجە ناسک و نەرمەکانی سەری دەخوراندم و دەستی بە سەردولکەی زۆر غەریب و مێلانکۆلیک دەکرد و فرمێسکی چاوەکانیشی دڕۆپ دڕۆپ بەسەر گۆنا جوانەکانیدا ڕێچکەیان دەبەست. ئەمن ئەو کورکانەوەی دایکمم زۆر بەلا خۆش بوو و، نازانم بۆ، بەڵام وەک لایلایە بۆ منداڵی شیرخۆرە ئەوها تەسکین و ئارامیەکی سەیری دەخستە ناو هەست و هەناومەوە. لێم دەپرسی "دایە بۆ دەگری؟" ئەویش بە دوو سێ وشە وەرامی دەدامەوە: "ڕۆڵە بۆ بابت" و دەستی پێ دەکردەوە. یەکێک لەو سەردولکانە کە هەڵبەتا خۆم وشەکانیم بەبیر نایە بەڵام ئەدلەی خوشکم لە زاری پلە بەگیسیمان (پلە بەکیسی کچە گەورەی خورشیداغای مامم بوو) بیستوویەتی و دەڵی ئەمەیان بووە:

* ڕەشمارۆک ڕەشە لە کەندێ دا.

* ئەمن دەچمە مەرقەدی هەرەجەی ئاغەکی گەلەک زەرد و تەنکی تێدا.

* بابی ئەحمەدی، ئەتو ڕۆیشتی ئەو مندارانەت ئامانەتی کێ دا

بابم لە مەرقەدی بنەماڵەی شێخ مارفی بەرزنجی باپیرم (بابی دایکم) لە گوندی هەرەجە (هەڵەجە) نێژراوە.

ئەو دیمەنەی خۆم و دایکمم ئێستاش دوای ئەم هەموو ساڵە وا زۆر بەچاکی لەبەرچاوە.

لەو ساڵانەی منداڵی من چەند شاییەکم لەبیرە وەک ئەوەی کاک ئەحمەدی براگەورەمان کە ساڵی 1940ناجیەخانی کە کچەمامان

و کچە پووریشمان بوو ئەوی هێنا کە کچی ڕەحمان ئاغای مامم (برای بابم) و نایلەخانی پوورم (خوشکی دایکم) بوو و هەر لە گەڕەکی ڕەحمانی گوندی دووگردکان دەژیان. شایەکی تریش هەر لە دووگردکان هی محەمەدی مەولود هەولێری کە یەکێک لە پیاوە نزیکەکان و یاوەری هەمیشەی کاک ئەحمەدی برامان بوو کە پێم وایە ئەوەش دەبێ ساڵی 1941 بووبێ. ئەویش فاتمی کچی مەحموودە گڕکەی هێنا کە ماڵی ئەمانیش لە گەڕەکی ڕەحمانی بوو. لە گوندەکانی خزمە دزەییەکانی دیکەشم سێ شاییم بەبیر دێ. یەکێکیان هی حوسێنی عەلی ئاغای بنئامۆزام بوو کە لە گوندی قەپران دادەنیشت و کچەمامی خۆی هێنا (بەسەخانی مەحموودی خورشیداغای) کە ئەمیشیان هەر بنئامۆزای من بوو و لە گوندی دەربەند دادەنیشتن. هەردوو گوند قەپران و دەربەند لە ناوچەی کەندێناوەن. حوسێن ئاغا و بەسەخان لەپاشان بوون بە خەزوور و خەسووی من کە ڕووناس گیانی کچیانم کرد بە هاوسەر. شاییەکیش لە گوندی سیاو لە ناوچەی شەمامکم لەبیرە کە هی هاواری برایم ئاغای ئامۆزام بوو و ئەویش (تنگر خان)ی بنئامۆزای خۆی هێنا کە کچی عەلی ئاغای (مەشهوور بە عەلۆی قورشیدی) ئامۆزامان بوو و لە گوندی قەپران دادەنیشتن. ئەمەش دەبێ ساڵی 42 - 1941 بووبێ. دواترین شایی ئەو ساڵانەی منداڵیم کە لەبیرم ماوە شایی کاک ڕەشیدی پلکم عەیشێ بوو (ڕەشیدی قەرەنی حەمەداغای دزەیی). دایکی کاک ڕەشید (عەیشێ حاجی بایزی) پوورم بوو (خوشکی بابم) لە گوندی گردەشینە لە ناوچەی مولکیە دادەنیشتن ئەویش (بەسێ خان)ی کچی خدری پاشای دزەیی هێنا کە لە گوندی (شێخانان)ی نزیک پردێ و لە گوندی (سۆربەش) یش دادەنیشت.

بەڵام خۆ ژیان بەردەوام هەر شایی و خۆشی نەبووە، ئەمن بانگی (تازیە)ی چەند خزمێکی خۆیشم لەبیرە کە لەو یەک دوو ساڵەی بەرایی چلەکاندا بووە. بانگی پلکم (بەسێ)ی ئامۆزام (کچی برایم

ئاغـای مامـم)م چـاک لەبیـرە کـە لـە گونـدی باقرتـەی سـەر ئاقـاری دووگـردکان دەژییا. ڕووی جـوان و ئـاکاری ڕێکـی پلکـم بەسێم چاک لەبیـرە کـە لەسـەر جێـی مەرگـی بـوو و لەگـەڵ دایکـم چووبوویـن بـۆ سـەردانی. هەواڵـی مەرگـی پوورزایەکیشـم لەبیـرە (کاک فەیسـەلی کـوڕی پـوورە نەعیمەخانـم و ئەحمـەد عوسـمانی ناسـراو بـە ئەحمەدەفەنـدی) کـە سـاڵی 1943 لـە هەولێـر لـە هەلومەرجێکـی تەماویـدا خـۆی کوشـت. ئەمـن کاک فەیسـەل خۆیـم بەبیـر نایـە هـەر ئەوەنـدەم لەبیـرە کـە هەواڵـی مەرگـی لـە هەولێـرەوە بـۆ دایکـم هاتـە دووگـردکان و ئیتـر بـوو بـە گریـن و زاریـن. دواتـر بـە درێـژی لـەم باسـە دواوم.

کۆچـی دوایـی ئامۆزایەکـی دیکەشـم چـاک لەبیـرە، ئاغـای ئەحمـەدی بایـزی کـە دانیشـتووی گونـدی (پیـرداود)ی ئەویـش هـەر نزیـک دووگـردکان بـوو و هاوینـی 1943 کۆچـی دوایـی کـرد. مام ئاغـا ئەویش نـەک هـەر ئامـۆزام بـوو بەڵکـو یەکێـک لـە ئامـۆزا خۆشەویسـتەکانی ماڵی ئێمـە بـوو و لەبیرمـە هەمیشـە بـە سـواری وڵاخ دەهاتـە دووگـردکان. مـام ئاغـا کـە بـە تەمـەن زۆر لـە کاک ئەحمـەدی بـرام گەورەتـر بـوو بـەڵام لەپاش مردنـی بابمـان ئیتـر سـەری لـە ئێمـە نەدەبـڕی و کاک ئەحمـەدی برامـی کـە هێشـتا منداڵیـش بـوو بـە سـواری وڵاخ هەمیشـە لەگـەڵ خـۆی دەگێـڕا. سـەپانانی ئـەو ڕۆژگارە ئـەو جووتـە سـوارەیان ئەوەنـدە زوو زوو بەیەکـەوە دەدی کردبوویـان بـە بەندێکـی دروێنـە کـە ئـەم دوو سـوارە بەلایانـا ڕەت دەبـوون بۆیـان هەڵـدەدان:

هۆ دیارە دیارە
پیرداودۆک دیارە
چەمی شێخ سالح
بە ئەسپینداره
دوو سوار وا هاتن
بە نەرمەغارە
یێکیان ئاغایە
ئەحمەد منداره

هەر بەم بۆنەی شینەوە وا دیسان بواری زمانەوانی سەرەتاتکێم لەگەڵدا دەکات و بیرم دەخاتەوە وشەیەکم بەکار هێناوە کە لەمێژە فەرامۆش کراوە، وشەی (بانگ) بە واتای تازیە. بەڵێ وایە و چاکم لەبیرە جاران لە لادێ کە یەکێک دەمرد دەیانگوت "دەچینە بانگێ". یان دەگوترا: "ئەوێ ساڵێ کە لە بانگی فلانە کەس بووین ـ". وشەی (تازیە) کە سووککراوی (تعزیە)ی عەرەبییە زیاتر لەلایەن شارستانەکانەوە بەکار دەهات، تەواوی لادێییەکان تەنیا وشە کوردییە ڕەسەنەکە (بانگ)یان دەزانی. بەداخەوە لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگار زمانی عەرەبی بە خشکەیی پەلوپۆی خۆی دەهاوێشتە ناو زمانی کوردییەوە. من ناڵێم وشەی بێگانە بۆ هەرچ زمانێک بێ دەبێ قەدەخە بکرێ، نا، بە پێچەوانەوە زمان بە خواستنەوەی وشەمەنی بیانی دەوڵەمەندتر دەبێ ئەگینا لە جێی خۆی دەچەقێ. بەڵام کە خۆت وشەت هەبێ بۆچی پەراوێزی دەکەیت و پەنا دەبەیتە بەر بێگانە. هەر بۆ نموونە جاران گوندییەکی کورد نەیدەزانی:

حەدیقە چییە ئەو دەیگوت باخچە، نەیدەزانی سەیارە چییە دەیگوت ترومبێل یان ئۆتۆمۆبیل، نەیدەزانی سایەق چییە دەیگوت شوفێر، نەیدەزانی متبەخ چییە دەیگوت ناندین، نەیدەزانی فرع چییە دەیگوت کۆڵان، نەیدەزانی حەرەس چییە دەیگوت پاسەوان نەیدەزانی عەلەف چییە دەیگوت ئالیک، نەیدەزانی دواجن چییە دەیگوت کۆڵیت و زۆر زۆری تریش. ڕاستە هەندێک لە وشە کۆنەکان کوردی نین یان ئینگلیزی یان فرانسین یان تورکی عوسمانین و بە ڕێگای عوسمانییەکانەوە کەوتبوونە ناو زمانی کوردییەوە، ئیتر بۆچی بیانگۆڕینەوە بە زمانێکی دیکە ئەگەر خۆت وشەت بۆی نەبوو. ڕاستییەکەی چ پێویستیش ناکات هەندێ وشەی ڕۆژاوایی کە لە تەواوی دونیادا و لەناو زۆرترایەتی میللەتان بەکار دەبردرێن و خەڵکەکە پێی ڕاهاتوون هەڵستین کوردییان بۆ دابنێین. تێبینییە زمانەوانییەکەم لێرەدا تەواو بوو.

ئەمن بۆیە باسی ئەو شایی و شینانەم هێناوەتە گۆڕێ چونکە ئەو بۆنانە بۆ گەورەکانمان خەماویش بوان بۆ ئێمەی منداڵ هەمیشە هەر شادی و خۆشی بوو. جاران لەناو عەشیرەتی ئێمەدا وا باو بوو کە بە بۆنەی مەرگی خزمێکی نزیک ماڵە ئاغا دیارەکان بەلانی کەم بۆ ماوەی دوو هەفتە یان زیاتریش ماڵیان دەگواستەوە بۆ ئەو گوندەی کە شینەکەی لێ بووە وەک نیشانێکی هاوخەمی لەگەڵ کەسوکاری کۆچکردووەکەدا. وەك باروبووش بۆ ماڵی کۆچکردووەکە لەو ماوەیە هەر ڕۆژەی ماڵە ئاغایەک چێشتی دەکرد بۆ هەموو ئەو میوانانەی کە لە دوورەوە دەهاتن و شەو دەمانەوە. بە بۆنەی شاییش دیسان ماڵە خزمە نزیکەکان لە دوویان دەگێڕدرایەوە و چەند ڕۆژێک بە ژن و پیاو و منداڵەوە لەوێ دەمانەوە. دەستەواژەی (لەدوو گێڕانەوە)ش زۆر کۆنە و واتای بانگهێشتن دەدا، کەچی ئیمڕۆ نەمبیستووە بەکار بهێنرێ و وشەی (دەعوەت)ی عەرەبی جێی گرتووەتەوە، یان بەم دواییانە وا وشەی (بانگهێشتن) بەکار دەبردرێ. بۆ ئێمەی منداڵ کە لەگەڵ دایک و باوکمان دەچووینە ئەو گوندانە ئیتر خەنیی خۆشیمان بوو کە لەگەڵ منداڵانی خزمەکانی دیکەمان یەکدیگر ببینەوە و یاری بکەین چونکە هێشتا نەچووبووینە قوتابخانەش بۆیە ئەگەر بۆنەی وا نەبوا درەنگ یەکدیمان دەدی.

ئێمە هەموو براکانم، هەڵبەت هەر یەکە بەپێی تەمەنی خۆی، لەناو ئاوایی دووگردکان کۆڵێک برادەری خۆشەویستمان هەبوون کە ڕۆژانە شەوانە گەمانمان پێکەوە دەکرد. هەندێک لە برادەرەکانی ئەو سالانەی من لە دووگردکان ئەمانە بوون کە بە داخی زۆرمەوە ئەمڕۆ زۆرێکیان نەماون یادیان بەخێر: کەریمی کێخوا وەسمانی، حاجی ی فەقێ عەولای، عەبدولای حوسێن عەسکەری، حەیدەری پیرداوداغای، برایم و هادی کوڕانی حەسەنی حاجی مستەفای، بەشیری مامۆستا مەلا حوسێنی، قادری سمایلە مووتەی، ئەحمەدی حوسێن هەباسی، محەمەدی ئەحمەدی خەجەبۆتێ، کاکلی شێخ فەرەجی، ڕۆستەمۆکی

(رۆستەم)ی مەرەگەی (داخەکەم زۆر زوو مرد)، شیدەی (رەشید)ی مام ئەسعەدی قاوەچی (داخەکەم زۆر زوو مرد) جەمە (جەمیل) و عوسمانی ئەحمەدی برای محێدینی، عزەدینی مام محێدینی، عومەی کاکە سمەی، عومەگێلی ئەحمەدی حەمەد مەحموودی، شێمحەمەدی کێخوا ئەحمەدی، کێشکە(حەمەد)ی عەولای مامیسای، ئەحمەد و قادری حەمەدی ڕەحمانی عەولاڕەشی، ئەمین و مستۆی (مستەفا)ی مۆمنێ، برایم و مستەفای پیرداودی مستەفای، محەمەدی ڕەحمانی ئەحمەدە ڕەشی، قەتۆ و شابانی مام برایم هەمزەی، ڕەسوورەی مام یاقووبی، عومەری قادری ئامانێ، خالید و عەلی حەسەن چارکلدانی و هەندێکی تریش کە لەمانە بچووکتر بوون بەڵام جارجار پێکی ئەوانیشمان دەکرد بۆ گەمان بەتایبەتی ئەگەر پێویستیمان پێیان بوایە لەمانەش: سەعید و حامیدی مام حاجی کەریمی، شێرکۆ و سمکۆی محەمەدی مەولود هەولێری، عەلی و عومەری حوسێنی کەریم هەباسی و واحێدی مام یاقووبی و عجیلی مام سمایل حاجی و شاترۆکی (قادر)ی ئەحمەدی خەجەبۆتێ و سابیر و متەی (سالح)ی حەسەن مێرەمێ، عوسمانی کێخوا ئەحمەدی، فەرهادی حەمەدی مام تەهای، حامیدی حەسەن چارکلدانی. ئەمن لێرەدا ناوەکانم وەک خۆی داناوە کە بە منداڵی هەر ئەوها بانگی یەکتریمان دەکرد و ڕاستییەکەی لەناو ئاواییش هەر ئەوها ناسراو بوون.

هەڵبەتا برا لەخۆم گەورەترەکان ئەوانیش برادەری هاوزای خۆیان هەبوو کە هەندێکیان ئەمانە بوون: سمایلی مام حاجی کەریمی، داودۆکە جوو (داودی کوڕی یاقووبە جوو)، سابیری مام حەمەد جبەی، حەمە ساتق، نوری کێخوا ئەحمەدی، سالحی شێخ فەرەجی، مەحمودەی مام تەهای، مەولوودەی قرمەی، محەمەد حەواش، عەلۆی سەلمانی، حوسێن و عومەری ئەحمەدی برای محێدینی، حاجی سمایل حاجی و ئی تریش کە بەداخەوە ئێستا نایەتەوە بیرم. گەمانەکانیشمان هەر هەمان گەمان بوون کە لە گوندەکانی ئەم دەشتی هەولێرە باو

بـوون و زۆریـان بـە سـپۆرت ( وەرزش) دەژمێردریـن وەک: قاشـوانێ، چغز، پێشـەبڕکێی ڕاکـردن، کەلایانـێ (هەڵماتێـن) پەلیکانـێ، بەردەقانیانـێ (قۆچەقانـی) کـە یارییەکـی خـراپ بـوو چونکـی سەرشـکان و لەوانەیـە کوێربوونـی چاویشـی ئەنجام بدابا. ئەمەیـان زیاتـر شـەڕە گـەڕەک بـوو و ئەمـن خـۆم جارێکیـان سـەرم شـکا و ئێسـتاش شـوێنەکەی بـە ئاسـتەم ماوە. تەنـدووره سـۆرێ و یاریـی تریـش وەک چاوشـارکێ، کـەری کەرئـاژۆ، شـەپ لـە قوونانـێ، ئاگرتەقانـێ (قـرم قرمانـێ)، قاقایانـێ، خانیچۆلانـێ، لـەو سـاڵانەدا بیـرم نایـە تۆپـی پێمـان (فوتبـۆڵ) یـاری کردبـێ ئەمەیـان دواتـر کەوتـە نـاو گوندەکەمانـەوە. زۆرێـک لـەم گەمانـە بـە شـەو دەکـران بـەڵام کەرەمسـتانێ (کلاومستێن) هـەر بـە شـەو لـە دیوەخـان دەکـرا هـەر کاتێکـی ئاغـا بڕۆیشـتبا بـۆ ماڵـی خـۆی بـۆ نووسـتن. بیرمـە یارییـەک هەبـوو بـە تێکـەڵاوی لەگـەڵ کچـان دەکـرا (گوریـس کێشـانێ) کـە تایبـەت بـوو بـە وەرزی بەهـار و لەسـەر فەرشـی نەرمـی سـەوزەگیای بەهـاران ئەنجـام دەدرا چونکـە بەربوونـەوەی تێـدا بـوو نەوەکـوو کچـەکان ئازاریـان پـێ بـگا. ڕاویـش بـۆ منـداڵان لـە دەرەوەی گونـدا لەنـاو پەرێـزان زۆر بـاو بـوو. ڕاوەکـەش چ بـە داودانانـەوە چ بـە فاقـە ئەنجـام دەدرا و نێچیـری منداڵانیـش قەتـێ و هێلکـە قەتـێ، ڕیشـۆڵە، هەوێـردە و باڵنـدەی بچووکـی ئـەو دەشـتە بـوو. لەنـاو خـودی گوندیشـا چۆلەکـە گرتـن زۆر بـاو بـوو یـان بـە دارلاسـتیک یانیـش شـەوان بـە پەیژەیـەک سـەردەکەوتین و دەسـتمان لـە کونەکانـی ژێـر سـواندەکان (گوێسـوانەکان) ڕادەکـرد و چۆلەکەمـان دەردێنـا. بـەڵام ئـەم ڕاوکردنـە مەترسـیی تێدابـوو چونکـی دەمانبیسـت کـە ڕووی داوە لـەو کونانـە مـار یـان دووپشـک بـە منداڵـی وەداوە.

ئەمانـە بـرادەری نـاو گوندەکەمـان بـوون. هەڵبەتـا بـرادەری زۆریشـمان لەنـاو خزمـە دزەییەکانـی دیکەشـمان هەبـوو بـەڵام ئـەوان لـە گونـدی خۆیـان دەژیـان و تەنیـا لـە کاتـی وەرزی قوتابخانـە لـە هەولێـر یـان لـە پشـووی هاوینـان بـە سـەردانی گونـدی یەکتـری یانیـش لـە بانـگ و شـاییان چاومـان بـە یەکـدی دەکـەوت.

## وەستاو وەستاکارانی دووگردکان Dougirdkani Artisans

ئەوەی بە بیری من بێت و ئەوەی لە خوشک و براکانیشم بیستبێت ژمارەیەکی بەرچاو لە وەستا و پیشەکاری سەنعەتی جیاجیا هەمیشە ڕوویان لە دووگردکان کردووە. لەوانە هەندێکیان هەرماڵیان لەوێ دادەنا و هەندێکیشیان دەهاتن بۆ ماوەیەک دەمانەوە کاری خۆیان بۆ ئاوایی و بۆ گوندەکانی نزیک دووگردکانیش بە ئەنجام دەگەیاند و دەڕۆیشتن تا ساڵی دواتر و دیسان دەهاتنەوە. بەڵام هەشبوو بەتایبەتی ژن کە هەر لە کۆنەوە خەڵکی دووگردکان بووینە و ناوبانگیان بە پیشەیەکی تایبەتی دەرکردووە. ئەمانە هەندێکیان بوون لەو پیشەکارانە: خومچی، زێڕینگر، زیوینگر، جۆلا، کارگەچی و پەڕەچی، سەفارچی، چرکچی، لێفەدروو، دێوەرە، ڕەحمانە پانکە، کوتاڵفرۆش، عەتار، سابوونکەران، میوە و تووتن و بەفرفرۆش (ئەم سیانەی دوایی زیاتر کاری خۆشناوان بوو.)

## ماڵە جووەکانی دووگردکان Dougirdkani Jewish artisans

چوار یان سێ خێزانی جوو هەر لە زەمانی بابمەوە هەمیشە ماڵیان لە دووگردکان بووە و لە زەمانی منداڵیی من تەنیا یەکێکیان مابوو، مام یاقوبی خومچی. مام برایم جۆلا بووە، وسووو و ئەستێرەی ژنی زێڕینگر بووینە و دەڵێن پلکە (باشە)ی لێفەدرووش زۆر زووتر لە زەمانی بابمان ئەویش ماڵی لە دووگردکان بووە و لەپاشان باری کردووە بۆ هەولێر و زوو زووش بە سەردان دەهاتەوە بۆ دووگردکان. ئەمن برایم و وسووم لە دووگردکان بەبیر نایە بەڵام خوشک و براکانم لەبیریانە و باسیان بۆ کردووم. پلکە باشە خوشک و براکانیشم

بەبیریان نایە ماڵی لە دووگردکان بووبێ بەڵام هەموومان لە هەولێر دەماندی و کە دایکم و خوشک و براژن بە سەردان دەچوونە هەولێر پلکە باشە سەری لێ دەدان و لێفەی جوان جوانی بۆ دروست دەکردن. مام یاقوبی خومچیشم زۆر چاک لەبیرە کە ژنەکەی ناوی وەردێ بوو و کوڕە گەورەکەی کە زۆر کەڵەگەت بوو ناوی عەبۆ بوو و کوڕەکەی تریشی کە لەگەڵ براکانم زۆر برادەر بوو ناوی داود بوو. مام یاقوب و پلکە وەردێ کچەزایەکی سەبری ناوی زۆر جوانکیلەشیان هەر لای خۆیان بەخێو دەکرد کە دایکی ناوی بولبول بووە و دەڵێن زۆر جوان بووە بەڵام دایکەکە بەداخەوە زوو مردووە و ئیتر ئەوانیش سەبریان هێناوەتەوە لای خۆیان و هەر لە ماڵی باپیری لە دووگردکان گەورە بووبوو. ئەم سێ چوار خێزانە خاوەن پیشەیە خزمەتێکی زۆری دانیشتوانی دووگردکانیان دەکرد و پێداویستییەکانیان هەر یەکە لە بواری خۆیدا بۆ دابین دەکردن. خەڵکی دووگردکانیش لەبەر جیاوازیی ئایین هیچ فەرق و جوداییەکیان لەگەڵا نەدەکردن تەنیا ئەگەر جۆری خواردن و ئاگرنەکردنەوەی ڕۆژانی شەممەی جووەکانی لێ دەربێنی ئەگینا کوردی موسڵمان و کوردی جوو زۆر ئاسایی تێکەڵ بە یەکتری دەبوون.

بێجگە لەم سێ چوار خێزانە جووە کە ماڵیان لە دووگردکان بوو فەقێ ونسی کارگەچی و پەڕەچی ئەویش پێشان ماڵی لە دووگردکان بوو لەپاشان باری کرد بۆ شارۆچکەی پردێ. فەقێ ونس دواتریش وەرزی هاوینان کارگەی دەهێنایەوە دووگردکان و لە ژوورێکی حەسارەکەی ئێمەدا دایدەمەزراند و لبادی ڕەنگاوڕەنگی زۆر جوانی بۆ ئێمەی ماڵی ئاغا و بۆ ئاواییش دەکرد. هەڵبەت خەڵکەکە لوا (خوری)یان دەدایێ و ئەویش دەیکردە لباد. فەقێ ونس و کوڕەکانیم چاک لەبیرە (ئەحمەد و محەمەد و بابۆ) کە هەموویان برادەری خۆم و براکانم بوون. ساڵح ناوێکی تایفەی (سوببە)ش ساڵی جارێک دەهات بۆ ماوەیەک لە دووگردکان دەمایەوە و ئەمیان کاری زیوینگەری دەکرد و بیرمە خشڵی زیوینی زۆر جوانی بۆ ژن و کچانی گوند

و بۆ ماڵى ئاغاش دەكرد. شاگردێكى لەگەڵا بوو ناوى فنجان بوو و دەموچاوى ئەويشم چاك لەبير ماوە. قەدرييەخانى خوشكم دەڵێ هەموو ساڵ جارێك وەستايەكيش لە هەولێرەوە دەهاتە دووگردكان و بۆ ماوەيەك دەمايەوە و كارى ئەميان (چرك) بوو. چرك ئامێرێكى ميكانيكى سادەى دەستگەڕ بوو چەرخێكى پێوە بوو دەخولايەوە بۆ دەرهێنانى پەمۆ لە قۆزاغەكەى و ئامادەكردنى وەك لۆكە. عەتارێكى ناو وەهابيشم چاك لەبيرە كە ئەويش ماوەيەك لە دووگردكان كارى عەتارى هەم بۆ ئاوايى و هەم بۆ گوندەكانى نزيكيش دەكرد بەڵام دواتر بارى كرد و ئەويش زوو زوو سەردانى دووگردكانى دەكردەوە. سەفارچيشم چاك لەبيرە كە ساڵى دوو جار نازانم لە كوێوە دەهاتە دووگردكان و هەموو جاريش كارگە سادەكەى خۆى لە ماڵى مام برايم هەمزە دادەمەزراند. كارى سەفارچى سپيكردنەوەى هيربار بوو (هيربار واتا مەنجەڵ و قاپ و تەشت و سينى و كەوگير و كەوچك و هەر شتێكى كە لە سفر درووست كرابوا و بۆ لێنان و تێكردنى خواردەمەنى بەكار بهاتبوا). بە نەريتيش وابوو هيربارى هەر ماڵێكى سپى بكردبايەوە ئەو ماڵە بۆ ئەو ئێوارە چێشتى بۆ دەكرد. ڕێكەوتێكى سەير كە لەو تەمەنە بچووكەى مندا نەبووە، زۆر درەنگتر بوو بەڵام چون پەيوەنديى بە سەفارچييەوە هەيە با بيگێڕمەوە.

زستانى ساڵى 1963 لە پاريسەوە گەڕابوومەوە بۆ كوردستان و بۆ ماوەى ساڵێك لە ئەشكەوتى گردەڕەشى نزيك گوندى عيساوێ سەر بە ناحيەى ماوەت لە شارباژێڕ ئێستگەى ڕاديۆى دەنگى كوردستانمان دامەزراندبوو. مەكتەبى سياسيى پارتيى ئەوساكە بارەگاى لە عيساوێ بوو و قەتارچييەكى بۆ دانابووين ڕۆژانە بە سوارى ئێستر نانمان بۆ بێنێ بۆ ئەشكەوتەكە. ئێمە تيمى بەڕێوەبردنى ئێستگەكە بووين و دەستەيەكيش پێشمەرگەمان بۆ داندرابوو. ناوى قەتارچييەكەم لەبير نەماوە بەڵام سەروسيمايم چاك لەبەرچاوە. زۆر جار لەگەڵيا دادەنيشتين نان و چامان پێكەوە نۆش دەكرد. دەركەوت كوردى ئێرانە. ئەويش لە منى پرسى خەڵكى كوێم، گوتم دەشتى دزەيياتيى

لای هەولێر، گوتی ئاخر هی چ گوندێکی لەو دەشتە؟ گوتم کاکە ئەتۆ کوردی ئێرانی چوزانی چ گوند هەیە لەوێ، گوتی نا نا پێم بڵێ ئەمن هەموو گوندەکانی دزەییاتی شارەزام. منیش ڕاستی باوەڕم پێ نەکرد و گوتم کاکە خەڵکی دووگردکانم دەشزانم هەر ناویشت نەبیستووە ئەویش یەکسەر گوتی ئەرێ توخوا مام برایم هەمزە ماوە؟ کە وای گوت حەپەسام و ئیتر زانیم ڕاست دەکات. گوتی من جاران سەفارچی بوویمە و هەر جارێکی بهاتباین بۆ دووگردکان بارەگامان لە ماڵی مام برایم هەمزە لێ دادەکوتا. کاکی قەتارچی ڕاستی دەکرد، هەموو سەفارچییەک بهاتایە دووگردکان کارگەی خۆی لە ماڵی برایم هەمزە دادەمەزراند. نازانم ئەو کولتوورە لە کەیەکەوە وابووە.

## ڕەحمانە پانکە

لە عەتارە یان کوتاڵفرۆشە گەڕۆکەکان کەسایەتییەکی لە سەردەمی ئێمەدا زۆر بەناوبانگ هەبوو کە پیرەمێردێکی جووی زۆر ئیسک سووکی بێ گوناه بوو بە ناوی ڕەحمانە پانکە. ڕەحمانە پانکە دانیشتووی هەولێر بوو و ڕیشێکی تەواو سپی پانی بەردابۆوە، کە هەر بۆیەش ناوی پانکەیان لێ نابوو، بە سواری کەرێک بەو گوندانەدا دەگەڕا و هەندێ کوتاڵی هەرزان هەرزان و وردەواڵەی دەفرۆشتە لادێییەکان. چیرۆکی ڕەحمانە پانکە سەرنجکێشە. کە بە سواری کەرەکەی و بارەکەیەوە دەگەیشتە گوندێک وەک هەموو لایدەیەک سەگی ئاوایی تێی بەردەبوون. ڕەحمانە پانکە یەکسەر رووی تێ دەکردن و دوعایەکی بە زمانی جوولەکان (زمانی عیبری) بۆ دەخوێندن کە تێکەڵەیەک بوو لە عیبری و کوردی. بەڕاستی ئێستاش مایەی سەرسوڕمانە کە سەگەکان دەلحاز لە جێی خۆیان دەوەستان، کلکیان شۆڕ دەکردەوە، پشتیان لە ڕەحمانە پانکە دەکرد و بایان دەدایەوە. ئەویش بە سەلامەتی لێیان دوور دەکەوتەوە و شڕوپڕەکانی خۆی بێ ترسی سەگان دەفرۆشتە ئاوایی و ئەو گوندەی

بەجێ دەهێشت. ئێمەی منداڵ هەندێکی ئەو دوعایەی ڕەحمانە پانکەمان لەبەر کردبوو بەڵام قەدریەخانی خوشکم و کاک موحسینی برام هەموویان لەبەر بوو کە ئەمە بوو:

تێشو عەسامۆت
قێدوشا، یێژ بە
کەلبە نەنۆخێ
ئبیێ، بەقسەی وی نەبیێ
چاوە کۆرەبیێ
کەلبە تخوێنێ، تەپشولە
سەگە مەڕەوە
قددووسە

ئەم دوعایە وەک نووشتە کاریگەر بوو و قەدریەخان بۆمان دەگێڕێتەوە کە جاران لە زەمانی بەعسیان هەرجارێکی سەفەرێکیان بکردایە و بگەیشتبانە خاڵێکی پشکنین بۆ ئەوەی سەربازە بەعسییەکان نەیانپشکنن دەڵێ لە دڵی خۆمدا دوعایە (تێشو عەسامۆت)ەکەی ڕەحمانە پانکەم دەخوێند و بەڕاستیش سەری دەگرت ئێمەیان نەدەپشکنی. هەر خۆیشم چەندین جار ویستوومە تاقی بکەمەوە و لە ئەمەریکا و لە هەر شوێنێکی تریشا ئەگەر تووشی حاڵەتێکی تەنگانە بووبم لەتەک فاتیحا و قەلوەڵڵا ئەم تێشوعەسامۆتەشم لەبن لێوان خوێندووەتەوە و زۆر جار یارمەتیی داوم.

وەک گەورەکانم بۆیان گێڕاومەتەوە برایمە جووش ماڵی لە دووگردکان بووە و کاری جۆڵای دەکرد. دەڵێن ئەو جاجم و چارشەو و بەڕە و بەرماڵی مام برایمە جوو دەیکرد وێنەیان نەبووە لە ناوچەکە. ئێمە هەتا دایکیشمان مابوو کە لە ساڵی 1963 کۆچی دوایی کرد ژمارەیەک لەو شاکارانەی مام برایممان مابوو بەڵام دوای ئەوە کەس نازانێ چییان لێ هات. ڕاستی خۆی هەر گۆڕانی شێوەی ژیان و گۆڕانی دیکۆری ناو ماڵان وای کرد کە خێزانەکان دەستبەرداری ئەو گەنجینە جوانەی دەستووری جاران ببن و ڕوو

لە ڕازاندنەوەی ناومال بکەن بە شتی مۆدێرن. دەزانم ئەمە شتێکی ئاساییە و ڕەوڕەوەی پێشکەوتن هەندێ کەلەپوور و دەستووری جاران دادەپەلۆسێت و شتی تازەبابەتیان لە جێی دادەنێت، بەڵام بەداخەوە کەم کەس هەستی نرخاندنی ئەم کەلەپوورە نایابەی هەبووە کە دەبوایە هەر مالێک شتێکی لەمانە پاراستبا.

## دێ وەرە

دێوەرە وشەیەکی تێکهەلکێشراوی کوردی کرمانجییە کە بەم جۆرەیە (دێ -وەرە) کە ئێمە بە سۆرانی دەلێین (دە -وەرە). ئەوەش عەتارێکی گەڕۆک بوو کە بەزۆری شەبەک بوون و لە لای مووسلەوە چەند وردەوالەیان لە کەرێک بار دەکرد کە لە دێهاتا دەست نەدەکەوت چونکە گوند دوکانی لێ نەبوو و دەهاتنە دەشتی دزەییاتی گوند بە گوند دەگەڕان و کالاکانیان نمایش دەکرد. ڕیکلامیشیان بۆ کالاکانیان بەم جۆرە بوو کە بە ئاواییدا دەگەڕان و بانگیان دەکرد: دێ وەرە بازنان، دێ وەرە گوستیلکا، دێ وەرە سنجاق و دەرزییا، دێ وەرە سابوونان، دێ وەرە نەینۆکان، دێ وەرە سۆتکە و قەنەفرا، دێ وەرە حەلوا و بنیشتان و... ئیتر بەم جۆرە. خەلکەکە هەر بە دێوەرە بانگیان دەکردن و کە دەنگیان دەهات ئیتر ئێمەی مندال بە ڕاکردن بۆ مالەوە "دایە دایە دێوەرە هاتووە". کڕین و فرۆشتنیش بە پارە نەبوو چونکە پارە نەبوو لە گوندا یان زۆر دەگمەن بوو. هەنگی سیستەمی بازرگانی لە دێهاتا سیستەمی ئالوگۆڕکردنی کالا بە کالا بوو کە بە ئینگلیزی پێی دەلێن barter economy یان barter trade فرۆشیار شتێکی پێ دەدایت کە تۆ نەتبوو تۆش لە بەرامبەر شتێکت دەدایە کە ئەو نەیبووە. لەو دەشتەی ئێمە دێوەرە داوای خوری و هێلکەی دەکرد بۆ کالاکانی. ئێمەی مندالیش زۆر جار دەچووین بەدزی چەند تیسکە خورییەکمان لە دوونگی چەند مەڕێک دەپچڕیەوە و دەمانبرد بۆ کابرای دێوەرە و ئەویش هەندێک حەلوای لە تەنەکەیەک کە

پڕی سەری مێش بوو بۆ دەردێناین و دەیداینێ. دێوەرە خورجێک یان تێرێکی دوولای لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی بار دەکرد و پڕی دەکرد لە شتومەکی کە لە گوندان دەست نەدەکەوت. بەتایبەتیش کیژوکاری نەوجوانی جوتیاران دەورەیان لێ دەدا و هەر یەکە داوای شتی جوانکاریی لە دێوەرەکە دەکرد. ئەویش دەبوایە دەست و باسکی خۆی بەناو خورجەکەدا شۆڕ بکاتەوە و بە هەموو لایەکدا بیگێڕێ تا شتەکەی بۆ دەدۆزرایەوە و دەیدانێ. جا ئەم دەست تێگێڕانەی کابرای دێوەرە بووەتە سەرچاوەی خەیاڵێکی قووڵی ئیرۆتیک بۆ کچە جەحێڵانی لادێ کە بیکەن بە حەیرانێکی ئا لەم شێوەیە:

* هەولێر هەولێرە، هەولێر هەولێرە.

* لەسەرەی قەراتە لەبنەی باژێڕە.

* ئەوجا ئەمن دەمگۆتە کوڕەتیم حەیرانەکەی خۆم ئەمن سینگێ خۆمت لۆ دەکەمە دوکانی دێوەرە و عەتاران دەتو وەرە بەکەیفی درێ خۆت دەستانی تێ گێڕە.

خوێنەری خۆشەویست، ئەمن هیچ نالێم، بەلام وەرە خۆت لێی ورد بەوە. توخوا ئەمە ئەوپەڕی قووڵیی فانتازیی کچە جوتیارێکی نەوجوانی نەخوێندەواری سادەی کورد نەبووە کە ئەم شاکارە هونەری و ئەدەبییەی بە خەیاڵدا تێپەڕیوە و بە چەند وشەیەکی کەم دەری بڕیوە؟

## وەستاکارانی ژن لە دووگردکان

**Dougirdkani women-artisans**

بەڵام بێجگە لە مام برایمی جۆلا چەند خانمێکی زۆر لێهاتووی دووگردکانی هەبوون کە هەر یەکە لە بواری خۆی کاری دەستکردی (artisanship) زۆر نایابی دەستووری جارانی دەکرد. لە بواری مافوورا ئەمانە: کچەکانی کێخوا ئەحمەدی، حەلیمێ حوسێن مکایلی، بەسێ عالڵای، پلکە زێزەی ژنی حەمەدی پیاوی ڕەحمان ئاغای مامم، پەرێخان و ناجیەخانی کچانی ڕەحمان ئاغای مامم پێش مێردکردنیان. لە بواری تەشیرستن و ڕیس کە پییان دەگوت (پەشتەک) و دورمانی زۆر ورد ئەمانە: بەهیەی خەجەبۆتێ، بەسێی خوشکی بەهیە کە ژنی حەمەدی مام تەهای و دایکی مامۆستا فەرهاد بوو. لە بواری دۆخینی جوان جوان (بەنەخوێن) لەعلیی ژنی کاکەسمەی کێخوا ئەحمەدی. لە بواری گوریس و بەنقادە دروست کردن: پلکە حەنیفە. سابوونکەری باشیش هەبووە لە دووگردکان کە بەسابوونەکەیان دەگوترا (سابوونی خۆ کردی) لەمانە خەجێی ژنی حەسەنە کۆری و خەجێی ژنی حوسێن مکایلی زۆر وەستا بوونە. پرۆسەی سابوون کردنەکەش بەم جۆرە بووە: لەماڵی ئێمە هەر جارێکی مەڕێک یان بەرانێک سەربڕابوا دونگەکەیان (دووگ) هەڵدەگرت بۆ دروستکردنی سابوون. ئینجا دەیانقرچاندەوە و هەندێکی وەک کسکە بۆ خواردن بەکار دەهات و ئەوی تریشیان لەگەڵ جۆرە ڕووەکێک (قلێشار) و هەندی خونچەگوڵ و توێکڵە پرتەقاڵ تێکەڵ دەکرد و دەیانکردە ناو چەند قۆرتێک (چاڵی بچکۆلە). کە وشک دەبۆوە و ڕەق دەبوو ئینجا بە سیکاردێکی گەورە وەک قالبە سابوون دەیانبڕی.

جاران لە دێهاتا شامپۆ و شتی وا نەبووە بۆ سەرشتن، ئەوسا

گڵەسەریان بەکار دەهێنا. گڵەسەری کەرکووک و گەرمیان زۆر بەناوبانگ بوون و ژنی ئەو زەمانە دەڵێن ئەو گڵە سەرە گەلێک لە شامپۆی ئەم سەردەمەی ئیمڕۆ بۆ سەر و قژ باشتر بووە و قژی زۆر نەرم دەکرد. ئەمن خۆیشم لەبیرمە کە مناڵ بووم سەریان بە گڵەسەر دەشووشتم قژم وەک ئاوریشم زۆر نەرم و نیان دەبوو. ئینجا لە دووگردکانیش مام عەلی بەقار هەبوو کە ناوەناوە دەچووە لای کەرکووک و گەرمیان بۆ گڵەسەر و دەهاتەوە بە کیلۆ دەیفرۆشتە ژنانی ئاوایی.

## میوەفرۆشانی خۆشناو لە دزەییاتی

لە ناوچەی دزەییاتی لە چاندنی گەنم و جۆ زیاتر هیچی تریان نەدەچاند. تا هەتا سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمیش کە هێشتا چەند کارێزێک مابوون مەرەزەش دەکرا و برنجێکی زۆر بەتام لە گوندی پیرداود و برایمەلەک و داڵداغان و تەندوورەدا دەکرا بەڵام لەگەڵ کوێربوونەوەی کارێزەکان ئەوەندە برنجەش نەما. بۆ میوە و تووتن و بەفریش تاکە سەرچاوە خۆشناوەتی بوو. هاوینان و پایزان خۆشناو بە کەروبارەوە دەهاتنە دەشتی دزەیی و بارگەیان لە ماڵێک دادەنا و میوەکەیان بۆ ئەو ماڵە بەلاش دەبوو و کا و جۆش بۆ کەرەکانیان خۆیان لەگەڵ خۆیانیان دەهێنا. ئیتر یەکێک لە خۆشناوەکان ناوەناوە دەچووە سەربانی ماڵەکە و بە دەنگی بڵند و ڕوو لە هەموو لایەکی ئاوایی بانگی دەکرد: "دە وارنە ترێیان، دە وارنە هەناران، دە وارنە هەنجیران، دە وارنە کرۆسکان... خلاس بووووووووو!" خەڵکی ئاواییش ڕوویان دەکردە ئەو ماڵە و بە گەنم یان جۆ یان مزاش شتەکانیان لێ دەکڕین. جاری وا دەبوو ئەگەر خەڵکی ئاوایی هەستیان بکردایە کە شتەکان گرانن سکاڵای خۆیان دەبردە بەر ماڵی ئاغا ئەویش یەکێک لە دەستوپەیوەندەکانی خۆی دەناردە لای کاکی خۆشناو کە نرخەکان دابەزێنێ. ئەگەر ڕازی بوا

کێشە نەدەبوو ئەگەر نەشیکردبا ئاغا ڕای دەسپارد ئاوایی بەجێ بێڵێت با بۆخۆی بچێ لە گوندێکی تر بیانفرۆشێ. بازاڕکردنی تووتن و بەفریش لەگەڵ خۆشناوان هەر ئەوها بوو.

سوپاس و پێزانینی یەکجار زۆرم ئاراستەی قەدریەخانی تاکە خوشکم دەکەم کە ئەم هەموو شتانەی لە دووگردکان بە چاوی خۆی دیوە و لەگەڵیا ژیاوە ئیتر وا بە یارمەتیی ئەو بۆ مێژوو تۆماریان دەکەم بەو هیوایە کە لە بزربوونی ئەبەدی ڕزگاریان بکەین.

سوپاسی زۆریشم بۆ مامۆستا فەرهادی حەمەدی مام تەهای کە بەردەوام وێنەی کۆنی دووگردکانییەکانم بۆ پەیدا دەکات.

## دەنگخۆش و موزیککارانی دووگردکانی

**Dougirdkani singers & musicians**

خۆشم پێم سەیرە کە دەبینم گەورەترین حەیرانبێژانی پیاو و ژن لە سەدەی بیستەمدا ئەوەی لەبیر ئێختیارەکان مابێ خەڵکی دووگردکان بوونە، (زایەر) و (خوچێ)ی خوشکی. گەورەترین موزیسیانی فووکاریش هەر هی سەدەی بیستەم کە ئەمانە لە ڕۆژگارانی خودی خۆمدا بوونە ئەوانیش لە باب و باپیریانەوە دووگردکانی بوونە ئەگەرچی خۆیان لە دووگردکان دانەنیشتوونە، حەمەسوور و خدری عەولا مەرجانی.

زایەر

زایەر کە لە بەرەبابی مام زێندینی دزەیی بووە تا هەرەتی لاوی لە دووگردکان ژیاوە لەپاشان بار دەکات بۆ لای خزمە مام زێندینییەکانی لە خۆیەوە نزیکتر لە گوندی قوڵتەپەی یابەی. ئەمن زایەرم لە یەک گرتەی ئاوا سەرپێیی لەسەر سەکۆی دیوەخانەکەی دووگردکان بەبیر دێ کە دەبێ سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم

بووبێ. پیاوێکی باریکەلەی باڵا مەیلەوبەرزی رەنگ زەردی قۆز بوو. کورتەک و شەرواڵێکی سپیاتی لەبەرا بوو. دەیانگوت زایەر بەخێر هاتی. هەر ئەوەندەم لەبیرە. رەنگە بۆیەش رەنگ و روخسار و بەژن و باڵا و جلوبەرگیم ئاوا لەبیر مابێ چونکە منێکی هەر لە منداڵییەوە ئەڤینداری هونەری گۆرانی و موزیک، پێش بینینی ئەو هونەرمەندە ناوادارە لە گەورەکانم دەبیست کە زایەر باشترین حەیرانبێژی سەردەمە بێ ئەوەی خۆم جارێکیش گوێم لێ بووبێ. دەڵێن نەزمی زایەر لە حەیرانا وێنەی نەبووە و هیچ پیرێک بە ژن و پیاوەوە نەیدەتوانی گوێی لە زایەر بێت و پڕی چاوی گریان نەبێ. سمایلی مام حاجی کەریمی دووگردکان کە خۆیشی حەیرانبێژێکی لێهاتووە بۆی گێڕاومەتەوە کە هەمووساڵێک کاک مستەفای هیرانێ (شاعیری تەسەووفی ناوداری کورد، سافی) بە خۆی و کوڕەکانیەوە، کە ئەوانیش زۆریان دەنگخۆش بوون، لە هیرانەوە دەهاتنە دووگردکان هەر بۆ ئەوەی گوێیان لە حەیرانەکانی زایەر بێت و کاک سمایل دەڵێ کە هەر لە سەرەتا تا بنەتای ئەو (کۆنسێرت)ە چکۆلانەی زایەر لە سەر سەکۆی دیوەخانی ئێمە کە لەسەرانسەری ئاواییش دەنگی دەدایەوە سافی و کوڕەکانی هۆڕهۆڕ دەگریان. محەمەدی مەولود هەولێری کە ئەویش جاروبار لەبەرخۆیەوە حەیرانی غەریبی چاکی بۆ دەهات، بۆی دەگێڕامەوە کە زایەر کۆچی دوایی کردووە خدر بەگی ئەحمەد پاشای دزەیی کە یەکێک بوو لە کەسایەتیە هەرە دیارەکانی خێڵی دزەیی بە ترومبێلی خۆی بە گوندی قوڵتەبەدا تێ دەپەڕێت و لەسەر گورستانی گوند هەڵوەستەیەکی بۆ دەکات. کوڕێژگەیەک لەوێ دەبێ خدر بەگ بانگی دەکا دەڵێ وەرە وەرە رۆڵە کامەیان قەبری زایەرە؟ کە پێی پیشان دەدا خدر بەگ دادەبەزێت بە تاقی تەنیا یەک سەعاتی تەواو لەسەر قەبری زایەر دەگریێ. خوێنەری خۆشەویست، تۆ ئەگەر بەوردی بیری لێ بکەیتەوە ئەمە بەڕاستی واتایەکی زۆر زۆر گەورەی پێوەیە. پیاوێکی وا گەورەی وەک خدری پاشای کە بۆ سەردەمی خۆی لە ئاستی پرینسێکی ئەوروپا بووە بە تاقی تەنیا یەک دانە سەعات

لەسەر گۆڕی هونەرمەندێک بگری و، ئەشکی چاوەکانی شاعیرێکی موتەسەووفی کوردی گەورەی وەک (سافی)ش بەو حەیرانانەی زایەر دڕۆپ دڕۆپ ڕێچکە ببەستن، ئاخر ئەمە بەڕاستی شتە! زایەر لە تەمەنی جوامێرییا کۆچی دوایی کردووە و سەد مخابن کە لەسەردەمی ئەو ئامێری دەنگبەند و شتی وا نەبووە. لەو سەردەمەش بە پێچەوانەی لاوکبێژان، هیچ حەیرانبێژێک نەدەچووە سەر رادیۆ. لاوکبێژ پیشەی لاوکبێژی بوو و هیچی تری نەدەکرد بۆیە لەلایەن گەورەپیاوانی ئەو زەمانەوە پاداشت دەکران. لەوەش زیاتر چونکە بابەتی لاوک مێژووە هەندێ ئاغا و سەرەک عەشیرەتی گەورە هەبوون لاوکبێژی تایبەتی خۆیان رادەگرت کە مێژووی شەڕ و شۆڕی عەشیرەتەکەیان لەدژی عەشیرەتانی تری کورد یان لەدژی دەوڵەتی عوسمانلی و ئێرانی و هەروەها داستانی پێکبەڕان و پێکنەبڕانی ئاشق و ماشووقی باب و باپیرانیان بە دەنگ بۆ دەگێڕانەوە. ئەمانە تایتلی ئاغاشیان پێ دەبەخشرا، مووچەیان بۆ دەبڕایەوە، ئەسپ و تاژی شایەستەیان دەدرایێ، جلوبەرگی پۆشتەی وەک ئەوەی ئاغاکانیان لەبەر دەبوو و بۆ هەر سەردانێکی ئاغاکانیان بۆ عەشیرەتێکی دیکە دەگەڵ خۆیان دەبردن و شەڕە لاوکیان (شەڕەفڕ) لەگەڵ لاوکبێژی عەشرەتەکەی دی پێ دەکردن. ئەمانە پلە و پایەیەکی زۆر تایبەتییان دەبوو لای براگەورەکانیان و بە هەقی ڕەوای خۆیان دەبوون بە شانازی و سەربلندی بۆ تەواوی عەشیرەتەکەیان و وەک کەریم شارەزا (یادی بەخێر) دەڵێ هەر لە ڕێگای ئەمانەشەوە بۆ تەواوی میللەتی کورد. بەکورتی، لاوکبێژی جاران مێژوونووسی کورد بوون بە دەنگی خۆیان نەک بە قەڵەم چونکە باوەڕ ناکەم هیچ یەکێکیان خوێندەوارییان هەبووبێ. شایانی ئاماژەپێدانە بۆ بەراوردکاری کە لە ئەورووپای سەدە ناوەندییەکاندا بەتایبەتی لە باشووری فرانسا و لە باکووری ئیتالیا چینە شایەرێکی لەم بابەتە پەیدا بووبوون کە پێیان دەگوتن Troubadours.

هەرچی حەیرانبێژە، چ کرمانج بوا چ ئاغا، ئەمیان، بە پێچەوانەی لاوکبێژ، کار و پیشەی خۆی هەبوو و حەیرانگوتن پیشەی نەبوو،

بەڵام حەیرانی بۆ دڵی خۆی دەچڕی و لە مێژووی هونەری موزیکی کوردیدا قەت پارە و پاداشت بۆ حەیران گوتن وەرنەگیراوە چونکە حەیرانبێژی بۆ گوزەرانی پیشە نەبووە. هەڵبەت ئەمە جاران وابووە، دواتر هەموو شت گۆڕا و ڕەوڕەوەی گۆڕانیش بە ئێمە لە خول ناکەوێ. داخی گران کە دەنگی زایەر لەدەست مێژووی هونەری کوردی چووە.

## خوچێ (خوشکی زایەر)

بەزمی زەمانە لەوەدایە کە ئەو خوشک و برایە لە دەنگ و لە بلیمەتیشیان بۆ دانانی حەیران هاوتایان نەبووە. خوچێ کە لە ماڵی حاجی ڕەحمان ئاغای مامم هەر لە دووگردکان لە گەڕەکی ڕەحمانی دەژیا دەڵێن حەیرانبێژی وا لەناو ژنان نەبووە و نابێتەوە. بە داخەوە کەسی وا نەماوە ژیننامە و سەر و سەربردەی ئەو خوشک و برایە بۆ مێژوو تۆمار بکات. ئەمن هەر ئەوەندەم لەبارەی خوچێ لە محەمەدی مەولود هەولێری بیستووە کە دەیگوت: خوچێ و ئامۆزایەکی حەزیان لێک دەکرد، بەڵام لەبەر هەچ هۆیەک بووبێ پێک نەبراون. ئینجا دەڵێ شەوانی هاوینان کە خەڵک لە سەربان دەنووستن و شەو رادەکشا خوچێ هەر بەدەم خەوەوە دەنگی هەڵدەبڕی و دەستی بە حەیرانان دەکرد هەتا درەنگانی شەو وەک تۆپ تەرەقە یەک بە دوای یەک ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە و هەمووشی هەر ئەو لەحزەیە بۆ دەهات و بەسەر کوڕەلاوەکەی (ئامۆزاکەی) خۆیدا هەڵدەگوت دەنگەکەشی لە هەموو ئاوایی دەزرینگایەوە. حەیرانەکانی و دەنگوئاوازەکەی ئەوەندە کاریگەر بووە لای ئاغا و ئاغاژن و تەواوی ماڵەکە خۆشبەختانە کەس نەدەچوو بەئاگای بێنێ. بەیانی کە ژنەکان لێیان دەپرسی: " کچێ خوچێ بابانکۆر ئەتو ئەوە ئەوشۆ چیت کردووە! " دەڵێن خوچێ سوێند و قورئانی دەخوارد کە ئاگای لە هیچ نییە و هیچی بەبیر نایە و هەر

گوتوویەتی: " ئەیەڕۆ رووم پێوە نەبێ، لەخۆم شەرمەزارێ، توخوا بەراستیتانە ! ". جا دەڵێن ئەمە جارێک و دووان نەبووە ناوەناوە خوجێ ئەم بەزمە تراژیکەی (خەماوی)یەی بەسەر دەهات و ماڵی ئاغا و تەواوی ئاواییش لێی ڕاهاتبوون.

بەڵام دووگردکان خۆ هەر زایەر و خوچێی نەبووە کە شانازییان پێوە بکات. ژمارەیەکی زۆری تریش لە هونەرمەندانی بواری جیاجیای هونەری گۆرانی و موزیک هەر لێرە سەریان هەڵداوە. لە بواری حەیراندا: حەمەد بسکان، کەریم ئاغا، پیرداود ئاغا (ئەم دوانەی دواییان هەردووکیان ئامۆزای زایەر و خوچێ بوون)، حاجی مستەفای جانەی، حەسەن عەباس، سمایلی حاجی کەریمی، حەمەدی ئەسعەدی، لە ژنانی حەیرانبێژیش هەمینەی مەولود هەولێری و عەیشە جوانی ماڵی ئاغای کە من خۆم لەگەڵ زۆرێک لەمانە هاوزەمان بوویمە و گوێم لە حەیرانەکانیان بووە. لە بواری بەیتی کوردی: حەمەد شابانی پالانی سەرتۆپ بووە. ئەمن بەخۆم نەمدیوو بەڵام ئێختیارەکانی دووگردکان دەڵێن ئەو بەیتانەی وەک (مەم و زین) و (لاس و خەزاڵ) و (خەج و سیامەند) و (شیرین و فەرهاد) و (دەروێشی عەبدی) و (ناسر و مارمار) و (حەسەن و مریەم) و ئی تریش کە حەمەد شابان شەوانە لە دیوەخانی ئێمە بە دەنگوسەدایە غەریبەکەی هەتا سبەینێ رۆژ لە هەموو کونان هەڵدەهات دەیگوت هەر کورکانەوەی گوێگرەکانی ئەنجام دەدا. حەمەد شابان دووگردکانی بووە، بەڵام دواتر ماڵی گواستووەتەوە بۆ لای خزمەکانی لە گوندی پالانیان لە بناری چیای قەرەچووغ روو لە مەخمووری.

لە بواری بەندی دروێنەو ساوارکوتانەوەشدا: مام قادری ئامانێ و حەمەدی مام تەهای و عارەبی مام سوڵتانی و عەلێ حەمە سووسکەی کە من خۆم هەموویانم لەبیرە ئەوانەش بەراستی وەستا و شارەزا بوون لە بواری خۆیان. عەلی حەمە سووسکەی لاوکی زۆر چاکیشی دەزانی هەڵبەت هەر بە شێوەزاری کرمانجی بادینی بەڵام تی کردنەوەیەکی بۆ سۆرانیی بە بادینییەکەوە هەر دیار بوو.

ئه‌مانـه هونه‌رمه‌نـدی حه‌یرانبێـژ و به‌ندبێـژ و لاوكبێـژی دووگـردكان بـوون واتـا ده‌نگخۆشـه‌كان و شـایه‌ره‌كان بـه‌ڵام ئـه‌دی موزیكـژه‌ن؟

مایـه‌ی داخ و مخابنـه كـه لـه كوردەواریـدا كولتوورێكـی ناپه‌سـند بـاوه هـه‌ر ده‌نگبێژمـان لا گرنگتـر بـووه لـه ئامێـرژه‌ن. لـه جیهانـی پێشـكه‌وتوودا گه‌لێـك موزیـككار بـه سـه‌دان بـار لـه گۆرانیبێژانـی ده‌نگخـۆش ناودارترن و زۆریـان زیاتریـش ڕێزیـان لـێ ده‌گیرێـت. راسـته ئامێرژه‌نـی كـورد ئه‌وانـه‌ی ئامێـری موزیكاڵـی گه‌لـه‌ری ده‌ژه‌نـن وه‌ك زوڕنـا و چووزه‌لـه و بلوێـر و شمشـاڵ و نـه‌ی و پۆسـت و ئیـداره و باڵه‌بـان، خۆیـان كۆمپۆزه‌ری واتـا دانـه‌ری هه‌مـوو ئـه‌و كاره هونه‌رییانـه نیـن كـه ده‌یانژه‌نـن یـان لێیـان ده‌ده‌ن وه‌ك لاوك و حه‌یـران، بـه‌ڵام ئـه‌و ئاوازانـه‌ی كـه بـۆ هه‌ڵپه‌ڕكـێ بـه هه‌مـوو جۆره‌كانییـه‌وه یـان بـۆ مه‌یته‌رخانـه بـه‌كار دێـن ئـه‌وه هه‌مـوو لـه دانانـی هونه‌رمه‌ندانـی ئامێرژه‌نـی نه‌ناسـراوی كـوردن. مه‌یته‌رخانـه جـۆره ئاوازێكـی تایبـه‌ت بـه ئه‌سپسـوارییه كـه هونه‌رمه‌نـدی ئامێرژه‌ن لێـی ده‌دات و سـوار ئه‌سـپیش له‌سـه‌ر ئـه‌و ئـاوازه ئه‌سـپه‌كه‌ی ده‌له‌نگێنێـت و له‌سـه‌ر ئـه‌و ئـاوازه نه‌رمه‌غـاری پـێ ده‌كات كتومـت وه‌ك هه‌ڵپه‌ڕكێكـه‌ر. ئاخـر ئه‌مـه وه‌سـتاییه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر شـاره‌زای ده‌وێ كـه تـۆ بـۆ بزووتنـه‌وه‌ی هـه‌ر پێیـه‌ك یـان هه‌نگاوێكـی هه‌ڵپه‌ڕكێكـه ئـه‌و ئـاوازه دابنێیـت كـه هه‌ڵپه‌ڕكێكـه‌ره‌كان له‌سـه‌ری بـڕۆن و شـاییه‌كه به‌ڕێكوپێكـی ببـێ هه‌ڵـه بگـه‌ڕێ. بێجگـه لـه‌وه ئـه‌و حه‌یـران و لاوكانـه‌ی كـه ئـه‌و موزیكژه‌نـه گه‌له‌رییانـه بـه ئامێـره فووكارییه‌كانیـان ده‌ری ده‌بـڕن زۆریـان لـه ده‌نگـی خـودی حه‌یرانبێـژ و لاوكبێـژه‌كان كاریگه‌رتـر و هه‌سـت بزوێنتـرن و خـۆم دیومـه پیره‌كانـی گریانـدووه.

بـێ گومـان به‌بیـری زۆرێـك لـه خه‌ڵكـی ئه‌مـڕۆی ده‌شـتی هه‌ولێـر دێـت كـه شـایی و زه‌ماوه‌نـد نه‌بـووه یـان حه‌مه‌سـوور یـان خـدری عه‌ولامه‌رجانـی نه‌یانگێڕابـێ.

## حەمەسوور و خدری عەولا مەرجانێ

حەمەسوور کە سالی 1923لە دووگردکان لەدایک بووبوو، بە بیری من و خوشک و براکانم نایێ لە دووگرکان ژیابێ. دیارە باوکی کە ناوی عەبدوللا بووە و زیاتر لای خەلک بە (کەچەر) ناسراو بوو دواتر چووەتە هەولێر و ئیتر لەوێ نیشتەجێ بوون. حەمەسوور کە برادەرێکی زۆر نزیکی خۆم و هەموو براکانم و بگرە هی تەواوی ئاغاکانی دزەییش بوو، زۆر جار کە لە ئەوروپا بە سەردان دەگەڕامەوە بۆ کوردستان چەندین جۆرە نای ئەورووپاییم بۆ دەهێنا کە لە کوردستان نەبوون و نامۆ بوون. سەرەڕای جیاوازیی ئەو ئامێرانە لەگەڵ ئەوانەی کوردی حەمەسوور هەر هەمووی بەئاسانی لێ دەدا. حەمەسوور هەموو ئامێرە فووکارییە کوردییەکانی بە شارەزاییەکی زۆر سەیرەوە لێ دەدا: زوڕنا، دووزەلە، نەی بە هەموو جۆرەکانی، شمشاڵ، بلوێر. ئاوازەکانی کە لێی دەدا لاوک و حەیران و مەیتەرخانە و هەموو ئەو ئاوازانەی کە هەڵپەڕکێی کوردیی سۆرانی و بادینانیشیان لەسەرا دەکرێت، وەک چۆپەیی و سێێ یی و رۆیین و تەمبۆلێ و شێخانی و سنجانێ و ملانێ و ئی تریش. هەڵبەت وەک هەموو ئامێرژەنانی رەمەکی نەخوێندەواری کورد حەمەسووریش ئەو هەموو ئاوازانەی لێ دەدا و هەر گورانییەکی تازەش دەر بچووبا یەکسەر فێری دەبوو و لێی دەدا بێ ئەوەی یەک دانە نۆتەی موزیک بزانێ. پێم وایە خۆی هەر نەخوێندەواریش بوو. ئەو لاوک و حەیرنانەی حەمەسوور بە هەر یەکێک لە ئامێرە فووکارییانی لێ بدابا سەرنجی ئەو گوێگرانەی وەها بەخۆیەوە دەبەستایەوە کە دەیبردنە ناو جیهانی خۆش و ناخۆشی داستانی ئەو لاوک و حەیرانانەوە. زۆر لە پیرەکان بە لاوک و حەیرانەکانی حەمەسوور کە بە (نەی) لێی دەدا پڕی چاویان فرمێسک دەبوو و هەندێکیان هەر لەژێر لێوان لاوکەکەیان لەگەلا دەگوتەوە بەتایبەتی لاوکی (سوارۆ) و لاوکی (چەتۆ).

حەمەسوور برایەکی هەبوو (نوری) کە ئەویش دەهۆڵژەنێکی زۆر کارامە بوو و هەمیشە یاوەری حەمەسووری کاکی بوو لە گێڕانی شایی و زەماوەندان، حەمەسوور بە زوڕناو نوری بە دەهۆڵ. بە رمبەی دەهۆڵی نوری و لەراندنەوەیەکی زۆر سەیری داردەهۆڵەکانی بەسەر هەردوو دیوی دەهۆڵەکەیدا شاییکەر هێندەی تر جۆش دەیگرت بە خەیاڵ لەم دنیایە دەردەچوو بۆ دنیایەکی تایبەتی کە بەو ئاوازە خۆی بۆ خۆی دەیئافراند. ئەو شێوە هونەرییەی لەراندنەوەی داردەهۆڵەکانی نوری ئێستاش کە پتر لە شەست ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە هێشتا وا زۆر بەروونی لەبەر چاوم ماوە و لەناو مێشک و خەیاڵمدا هەڵکەندراوە. ساڵی 1956 لە زەماوەندێکی ژن گواستنەوە لە کاتی هەڵپەڕکێ کردن هەڵپەڕکێکەرێک وەک دەستووری کوردەواری دەمانچە هەڵدەکێشێت تەقەی خۆشی و خۆدەرخستن بەرەو ئاسمان بکات کەچی گوللەیەک بە تەپڵی سەری نوریی بەدبەخت دەکەوێت لە کاتی دەهۆڵ ژەنینا و دەلحاز گیانی لەدەست دا. دوای نووری هونەرمەندێکی تری هەر خزمی خۆیان سەعدی مام نادری ئەویان بوو بە یاوەری هەمیشەی حەمەسوور بۆ شایی و زەماوەندان و ئەویش چ بە دەهۆڵ چ بە ئامێرە فووکارییەکان دەستوپەنجەیەکی زۆر رەنگینی لە تەواوی ئەو بوارانەدا هەبوو. سەعدی ئێستاش ماوە بەڵام بەداخەوە باری تەندروستیی تەواو نییە و لە هەولێر لەماڵەوەی ئێخستووە. مام نادری بابی سەعدی کە ئەویش هەر خەڵکی دووگردکان بووە خۆشەویستی هەموو ئاغاکانی دزەیی بوو و قسەخۆش و نوکتەچی و مەجلیس گەرمی وەکو مام نادر کەم هەبووە. مام نادر ئەوەندە لەگەڵ حەمەدەمیناغای بابم یەکتریان خۆش ویستووە و هەمیشە یار و یاوەری بووە کە بابم ساڵی 1936 لەپڕێکا بە هیرشی دڵ کۆچی دوایی دەکات ئەو ماڵی دەگوازێتەوە بۆ گوندی پیرداودی هەر هی ئامۆزایەکی خۆمان و دەڵی ئەمن پاش حەمەدەمیناغای تازە چاوم بەرایی نادا لە دووگردکان دابنیشم. خۆشبەختانە حەمەسوور چەند کاسێتێکی لە ئاوازەکانی بە نای و پێم وایە رەنگە بە زوڕناش پڕ کردبۆوە و

ماون. حەمەسوور ریزێکی تایبەتی لای ئاغاکانی هەموو بەرەبابەکانی دزەیی هەبوو و وەک برایەکی خۆیان تەماشایان دەکرد و رەفتاریان لەگەڵا دەکرد و لە دانیشتنی مەجلیسیشدا هەر لە ریزی خۆیانیان دادەنا. حەمەسوور هەرخۆیشی پیاوێکی تا بڵێی گران و سەنگین و لەسەرەخۆ بوو و هەر کەسێ لەگەڵی دانیشتبوا یەکسەر دەچووە ناو دڵیەوە و خۆشی دەویست. حەمەسوور هەر بە هونەرەکەی سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی رادەکێشا، کەسایەتیەکەشی شیرین بوو. پێم وایە لە کۆرەوەکەی ساڵی 1991بوو کە من لە ئەمەریکا بووم هەواڵی کۆچی دوایی ئەو هونەرمەندە گەورە و ئەو برادەرە خۆشەویستەم پێ گەیشت. یادی بەخێر.

ئەوەی کە لەبارەی حەمەسوورەوەم گوتووە هەر هەموویشی دەکرێ بۆ خدری عەولا مەرجانێش (1902-1971) بگوترێ. هونەرمەندی موزیسیانی گەورە خدری عەولا مەرجانێ ئەویش باب و باپیرانی دووگردکانی بووین بەڵام خۆی لە شاری هەولێر دادەنێشت. بە قسەی نەوزادی کوری حەمەسووری، دەبێ خدر کوری خاتو ئەسمەرخانی کچی مەرجان خانی دووگردکانی بووبێ و ئەمەیشیان هاوسەری عەولامەرجانی دووگردکانی بووە کە دیارە ئەمیان سەبارەت بە کەسایەتیی بەهێزی ژنەکەی لە دووگردکان هەر بە عەولا مەرجان دەناسرا واتا بە ناوی ژنەکەی. شایانی ئاماژەیە خدر باوکی هونەرمەندان یەحیا و واحید مەرجانیە، یادی هەموویان بەخێر.

ئەگەر کورد لە سەردەمی ئەو دوو هونەرمەندە بلیمەتە ئاستێکی پێشکەوتووی لە هونەری شانۆگەریی ئۆپەریتدا هەبوا دەکرا لاوەکانی کە حەمەسوور و خدر مەرجان بە ئامێر لێیان دەدا ببن بۆ ئۆپەریتی زۆر سەرکەوتوو کە کورد شانازییان پێوە بکات.

بێجگە لەم دووانە چەند ئامێرژەنێکی تریش کە هەر خزمی ئەمان بوونماڵیان لە دووگردکان بوو و بۆ شایی و زەماوەندی بچووکتر بەشدارییان دەکرد وەک مام عەلی، تۆفیق بسکان، عەولا قۆریات.

سوپاس و پێزانینی یەکجار زۆرم بۆ کاک نەوزادی کوری

حەمەسووری گەورە هەیە کە هەمیشە ئامادە بووە بۆ یارمەتیم لە زانیاری و وێنەکانی ئەو هونەرمەندە گەورانەی موزیکی کلاسیکی کوردی.

## هونەرمەندانی دەنگخۆش و موزیکژەن کە هاتوچۆی دووگردکانیان دەکرد:

### حەمەد ئاغا مەندۆ و عەزیز ئاغا

دوو هونەرمەندی گەورەی ناوچەی دزەییاتی کە خۆیان لە خێڵی دزەیی نەبوون بووبوون بە لاوکبێژی ناوداری نەک هەر هی ناوچەی دزەییاتی بەڵکو بۆ هەر شایی و بۆنەیەکی گەورەی سەرەک عەشیرەتەکانی کرمانجی زاریش لە بادینان و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش لە دوویان دەگێڕدرایەوە. حەمەد ئاغا مەندۆ و عەزیز ئاغا. لێرەدا پێتکێک هەیە کە سەرنج بۆ خۆی ڕادەکێشێت. ئەم دوو لاوکبێژە لە چینی ( ئاغا) نەبوونە بەڵام وەک کە پێشتریش باسم کردووە ئاستی هونەریی ئەمانە وەک مێژوونووسی عەشرەت و کوردیش ئەوەندە بەرز بووە کە ڕێزێکی تایبەتییان لێ دەگیراو تایتلی ئاغایان پێ دراوە.

لە نیوەی یەکەمی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بەر لەوەی بچم بۆ ئەورووپا ئەم دوو هونەرمەندە گەورەیەم کە بەناوساڵا چووبوون لە هەولێر دەدی و چەند جارێکیش لەگەڵیان دانیشتووم بەتایبەتی لەگەڵ حەمەد ئاغا. بەڕاستی خەمێکی زۆرم لێ دەخواردن کە دەمدی پشتگوێ خراون و بێ ئیشوکار و بە نیمچە لاتییەک، بەڵام هەر بە پۆشتەیی بەرگی کوردیی زۆر جوان و سەر بەستانەوەی بە زەوقی ئاغایانە،

بە شەقامەکانی هەولێردا دەخولانەوە و کەس نرخی نەدەزانین. لەبەر تەکنۆلۆجیای مۆدێرن و لەبەر دواکەوتوویی کۆمەڵگاکەی خۆشمان کەم کەس مابوون بەهای ئەو گەنجینەیە بزانن. چاکم لەبیرە ساڵی 1955کە کوردستانم جێ هێشت لە کۆمپانیای ئۆتۆمۆبیلی فۆردی کاک موحسینی برام دانیشتبووین و حەمەد ئاغاش هاتە ئەوێ. دڵم بەهاتنی زۆر خۆش بوو و بەدەم چاخواردنەوەوە پێم گوت "حەمەد ئاغا، ئەوا من دەڕۆم بۆ دوورە وڵات و دونیاش هەزار مەرگو مردنە کێ دەڵێ یەکتری دەبینینەوە تکایە ڕەسمێکی خۆتم بدەیی ئەتۆ (کاروزۆ caruso)ی کوردانی، ئەتۆ کتێبی مێژووی کوردستانی، دڵنیابە لە پاشە ڕۆژا بەدەیان کتێبت لەسەر دەنووسرێت " گوتی " بەخوای عومەر ئەمن چ ڕەسمو مەسمم نییە" گوتم "دە هەر ئێستا وەرە لەگەڵما بابچینە لای مام گیوی موکریانی وێنەگر لەوێ ڕەسمێکی جوانت بۆ بگرێ بۆ خۆت و بۆ منیش لەگەڵ خۆما دەیبەم بۆ ئەورووپا و لەوێ پێیان دەڵێم ئەتۆ چەند گەورەی " گوتی " ئەوجا هەر ئەوە مابوو عومەر ! بەتەمایت ڕەسمم لە کتێب ومتێیان بڵاو بکەیتەوەو پۆلیس بێن بمگرن بڵێن بوویتە شووعی". ئەوەندەی هەوڵم لەگەڵیدا نەهات لەگەڵما بچین وێنەیەکی بۆ بگرم. ئەمن کوردستانم جێ هێشت و زۆری پێ نەچوو هەواڵی مەرگی ئەو پیاوە گەورەیەم بۆ هات. ئای کە بەکوڵ گریام بۆ حەمەداغای مەندۆ و بۆ بەختی ڕەشی کورد.

ئەوەی دەربارەی حەمەدئاغای مەندۆ دەگوترێت ئەوەندەش شایەستەی عەزیزاغایە. پەیوەندیم لەگەڵ ئەمیان کەمتر بوو بەڵام لاوکێکی هەبوو کە ئەوسا لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر قەوانی قیری ئەو زەمانە تۆمار کرابوو و لەگەڵ کاک سەعدی و کاک موحسینی برام ڕۆژانە بە دەیان جار گوێمان لێ ڕادەگرت. ئەمن بەو منداڵییەی خۆم لەناو دڵی خۆمدا بەو لاوکە دەگریام ئەوەندە کاری تێ دەکردم. لاوکەکەش ناوی (نارین) بوو کە شتی وا پڕ لە سۆز و غەریبیم لە حەیاتی خۆما نەبیستبوو. ئیستاش ئەگەر ئەو لاوکە مابێت و دەستم کەوێ لای من دەبێتە یەکێک لە بەهادارترین گەنجینەی

هونەری گۆرانی کلاسیکی کوردی. لەوە دەچێ ئەو دوو هونەرمەندە گەورەیە لە زەمانی بابم زوو زوو هاتوچۆی دیوەخانی بابمیان لە دووگردکان کردبێ و لاوکی عەگید و سوارچاکیان بۆ گوتبێ. بەلام لە پاش بابم ئەمن قەت نەمدەدیت بێنە دووگردکان. حەمەداغا وەک بێتهۆڤن بەدەموچاو جوان نەبوو بەلام بە خۆی و بە کورتەک و شەرواڵە ئاغانیەکەی و هەیکەلی پڕیەوە کەسایەتیەکی بە سامو هەیبەتێکی سەرنجکێشی هەبوو و لە قسەکردنیشا متمانەی تەواوی بەخۆی هەبوو و زۆر زۆریش نوکتەچی بوو. بیرو باوەڕی حەمەد ئاغا لەسەر هونەرمەندی گەورە کاوێس ئاغا ئەمە بوو کە بە خۆمی گوتووە" ڕاستە دەنگی کاوێس لە دەنگی من خۆشتر بوو بەلام کاوێس قەت هێندەی من شارەزایی و وەستایی لە لاوکبێژییا نەبووە".
عەزیزاغا بەپێچەوانەی حەمەد ئاغا پیاوێکی زۆر قۆزی کەڵەگەتی بەژنوباڵا زۆر ڕێکوپێک و زۆر پۆشتەو بە زەوقیش بوو لە پۆشینی جلوبەرگی کوردیا و زستانان پەستەکێکیشی دەکردە سەر. عەزیزاغا سەروسمێلی خۆیشی ڕەش دەکردەوە بەلام بۆیەکەی زیاتر ڕەنگێکی مۆری دەدایەوە و بیرمە سمێلی لەبەر هەتاو وەک کلکی کەڵەباب خۆی دەنواند. یادیان بەخێر، ئەگەر میللەتێک هەستی نەتەوایەتیەکی پێگەیشتووی هەبێت دەبێ حەمەد مەندۆ ئاغا و عەزیزئاغا و کاوێس ئاغا بە سامانی نەتەوەیی دابنێت، شەرم و شوورەیی و جەهالەت و نەزانییە لەبیر بکرێن. لە تەک ئەم دوو کەڵە هونەرمەندە حەسەن لاوکیش لە دەشتی دزەیی هەبوو کە ڕاستە نەدەگەیشتە ئاستی ئەوان بەلام دەنگێکی ناسکی هەبوو و لاوکی چاکی دەگوت کە خۆم گوێم لێ بووبوو.

## سێ برای دەنگخۆش: جەمیل و حوسێن و فارسی عەلی ئاغای دزەیی ئامۆزایانم

سێ بنئامۆزای خۆم کە برا بوون ( جەمیل و حوسێن و فارسی عەلی ئاغای دزەیی) هەرسێکیان بەتایبەتی جەمیل و حوسێن لە حەیرانبێژییا ناویان لەناو عەشیرەتی خۆمان و وەک ئاگادارم لەلای ئاغاکانی کۆیە و میرەکانی شەقلاوەش دەرکردبوو. ئەم دوانە کە دەنگێکی زۆر خۆشیان هەبوو نەک هەر حەیران بەڵکو لاوکیشیان دەگوت بەڵام زیاتر بە حەیران ناسراو بوون و زۆرێک لە حەیرانەکانیان هەر خۆیان دایان دەنا و ئیمڕۆش لەسەر زاری هەندی حەیرانبێژان دەگوترێتەوە. حەیرانبێژی ناودار ڕەسوڵ گەردی خۆی بە منی دەگوت کە هەمیشە دەچووە لای کاک حوسێن و کاک جەمیل تا حەیرانیان لێ فێر بێ. ئەو دوو برایە تا هێشتا گەنج بوون هەرجارێکی یەکێکیان لە دووگردکان بوا و ئیمەش ئاغاکانی کۆیەمان میوان بوان حەیرانی وایان دەگوت کە میوان و ئاواییشیان سەرسام دەکرد. هەستم پێ دەکرد ئەم سێ برایە چون خۆیان هونەرمەند بوون بۆیە جۆرە هاوسۆزییەکیان لەگەڵ حەمەد ئاغا و عەزیز ئاغای لاوکبێژدا هەبوو. پێم وایە چەندین لاوکیش لەوان فێر بووبوون. جەمیل و حوسێن و فارسی عەلی ئاغای نەک هەر دەنگوسەدایەکی غەریبیان لە حەیرانگوتنا هەبوو بەڵکو هەرسێکیان زۆر قۆزیش بوون و لە شایی و هەڵپەڕکێ و سوارچاکی و ڕاوچییاتیی ئەو زەمانی بە ئەسپ و تاژی شۆڕە سواری بێ وێنە بوون. هەر سێکیان ئەم دنیایەیان بە جێ هێشتووە یادیان بەخێر بەڵام خۆشبەختانە هەندێ حەیرانیان لەسەر کاسێتا ماوە. حوسێن ئاغایان لەپاشان بوو بە خەزووری خۆم.

## خاڵوانەکانم، بنەماڵەی شاعیر و دەنگخۆشان

وەک کە باسم کردووە، هونەرمەندانی بواری موزیک و گۆرانی لە ناو بنەماڵەی ئێمەی دزەیی و هونەرمەندانی دیکەی دزەییاتی کە لە بنەماڵەی ئێمەش نەبوون ناویان دەرکردبوو و بۆ سەردەمی خۆیان خزمەتێکی گەورەی میللەتی خۆیان کردووە. بەڵام لە بنەماڵەی خاڵوانە شێخە بەرزنجییەکانیشم بەتایبەتی لە کۆیەو هیران و هەڵەجە ئەگەر بڵێم خوا بۆ بەهرەی شاعیری و دەنگخۆشی دەسنیشانی کردوون ڕەنگە زێدەڕۆییم نەکردبێ. عەیبیشە پیاو باسی خۆی بکات، بەڵام زۆر ڕێی تێ دەچێت بەندەی نووسەری ئەم دێڕانەش لەکانیاوی هۆزی باوک و هۆزی دایکەوە ئەم ئاوە سازگارەی دەنگخۆشی و هەستی هونەریم نۆش کردبێ. ئەمانە تەنیا هەندێ دەنگخۆشی ماڵە خاڵانمن کە من لێی ئاگادارم:

## شێخ نەجمەدینی شێخ کەریمی کۆیە (مامی دایکم)

یەکێک لە مامەکانی دایکم شێخ نەجمەدینی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆیی بوو کە من خۆیم دیبوو بەڵام گوێم لە دەنگی نەبووبوو کە دەڵێن نەک هەر دەنگێکی بێ وێنەی هەبووە بەڵکو پسپۆڕێکی زۆر شارەزای مەقاماتیش بووە. شێخ نەجمەدین وەک دەڵێن لە غەزەلیات و شیعری تەسەووف بە دەنگو ئاوازێکی پڕ لە سۆزی غەریبی بەبێ لەدەرگادان یەکسەر خۆی دەکرد بە قووڵایی ناخی گوێگرەوە. شێخ خالیسی شێخ جەوادی خاڵۆزام بۆی گێڕاومەتەوە کە زۆر جار لە مانگی ڕەمەزانا موزیککارو مەقامزانانی موسڵاوی دەچوونە

کۆیە بۆ لای شێخ نەجمەدین تا ئوسوول و ستاندارەکانی مەقاماتی لێ فێربن. خاڵوانە کۆیەکانم بۆیان گێڕاومەتەوە کە شێخ نەجمەدین جاروبار ڕووی دەکردە ناو دار و درەختەکانی دەوروپشتی کۆیە و لەوێ هەتا هێزی تێدا بووە دەنگی هەڵدەبڕی و ئاوازی غەزەلیاتی بۆ خۆی دەچڕی. جا دەڵێن ئەو هەموو تەیرو تەوارەی ناو دارستان کە پێش ئەوەی شێخ نەجمەدین بگاتە ناویان ئەوان ئەو ناودارانەیان پڕ دەکرد لە جرووکە جرووک و زریق و باقی خۆیان و هەر یەکە بە زمانی خۆی و بە ئاوازی تایبەت بە توخمی خۆی بە لەیلای خۆیدا هەلگوتووە. بەڵام دەڵێن کە شێخ لەوێ لەناو دارستانا دەیچریکاند و ئەوانیش گوێیان لەو ئاوازە بۆ ئەوان نامۆیە دەبوو هەر هەموویان یەکسەر وێکڕا بێ دەنگ دەبوون و گوێڕایەڵی ئەو دەنگە غەریبە دەبوون کە لە پڕێکا وا لەناویانا بەرز دەبێتەوە. بێ دەنگی ئەو مەلانە سەرنجکێش بووە تا شێخ بەخۆی بێ دەنک دەبوو. جا دەڵێن کە شێخ نەجمەدین پشوویەکی وەردەگرت بۆ ماوەیەکی کورت بێدەنگ دەبوو تا خۆی ئامادە بکات بۆ غەزەلێکی تر ئیتر تەواوی ئەو دارستانە دیسان پڕ دەبۆوە لە جووکە و خوێندنی تەیر و تەوارەکان وەک بڵێی بۆ شێخیان گێڕابێتەوە یانیش وەک داواکارییەک لە شێخ کە "توخوا قوربان بەردەوام بە". کە شێخ دەستی پێ دەکردەوە مەلەکانیش دیسان قورقەپیان لێ دەکرد و نوقەیان لێوە نەدەهات. ئەمە بەڕاستی سەرنجکێشە و ڕاستیشە چونکە باڵندە بەتایبەتی دەنگخۆشەکان هەستی خۆیان ڕادەگرن کە هەر دەنگێکی نامۆیان بێتە بەرگوێ و فزوولییەت وایان لێ دەکات بزانن ئەو دەنگە بۆ ئەوان نوێیە دەبێ هی چ تایفەمەلێکی دیکە بێ. ڕاستییەکەی سەریشیان لێ دەشێوێ بۆیە دەکەونە حاڵەتێکی کپ و بێدەنگییەوە.

## باوکێک و پێنج کوڕەکەی ( سەید ئەحمەدی مامی دایکم وکوڕەکانی) هەر هەموویان دەنگخۆش و شاعیر

سەید ئەحمەدی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆیە (1888-1933) مامی دایکم بوو و پێش بوونی من وەفاتی کردبوو. خاڵوانەکان دەگێڕنەوە کە دەنگخۆش و شاعیرێکی هەست ناسکی زۆر شارەزا بووە لە شیعری کلاسیکی کوردی و زۆر سەرکەوتووانە تەخمیسی هەندێ شیعری نالی کردووە. سەید ئەحمەد نازناوی (حوسەینی) بۆ هەڵبەستەکانی بەکار دەهێنا و دیوانێکی چاپکراوی زۆر بایەخداری هەیە بە ناوی (لالەزار، دیوانی حوسێنی). سەیر ئەوەیە کە هەر پێنج کوڕەکەی (بابە شێخ، ئەنوەر، جەلال، جەمال، کەمال) هەر هەموویان یان شاعیر و دەنگخۆش یان هەر شاعیر یانیش هەر دەنگخۆش بوونە. بەداخەوە ئێستاکە تەنیا شێخ کەمالیان ماوە ئەویش بە تەندروستییەکی زۆر خراپ لەماڵەوە کەوتووە. ئەمن خۆم چەندین جار لە مەجلیسی غەزەلخوانی سێ لەو خاڵۆزایانەم دانیشتووم (شێخ جەلال و شێخ جەمال و شێخ کەمال) چ لە دووگردکان کە بەسەردان دەهاتنە لامان چ لە هەولێر لە تەکیەی ماڵە خالانم. ئەو سێ برایە نەک هەر دەنگیان لە خوێندنی غەزەلیاتی شاعیرانی کلاسیکی کوردی هەر دەتگوت خوا بۆ ئەو جۆرە هەواو ئاوازانەی داناوە بەڵکو لە دەفژەنینیشا دیواری ئەو شوێنەیان دەهەژاند کە ئەو "چەیمبەر موزیکە chamber music "یان لێ دەگێڕا. چاکم لە بیرە کە هەرسێکیان دەستیان پێ دەکرد دیاربوو پێشتر رێک کەوتبوون چۆن چۆنی هەر یەکە چاوەڕوانی رۆڵی خۆی بێت لە چڕین و لە ژەنینا و ئینجا لەپڕێکا هەرسێکیان پێکەوە دەنگیان تێکەڵ بەیەکتری دەکردەوە کە بەڕاستی هارمۆنیەکی تا بڵێی دڵڕفێنی لێ دەردەهات. شێخ خالیسی شێخ جەوادی خاڵۆزام کە خوشکەزای ئەو پێنج برایە بەهرەدارانەیە

بۆی گێڕاومەتەوە کە ئەو خۆیشی لە زاری بیرمەندی گەورەی کورد مەسعود محەممەدەوەی بیستووە کە: لە کۆیە زۆر جاری وا ڕووی دەدا جەنابی مەلای گەورە (بابی مەسعود محەممەد) لەکاتی نوێژکردنا بووە لە مزگەوتەکەی خۆیان کە لەپڕێکا دەنگو سەدای غەزەلخوانی ئەفسووناوی شێخ ئەنوەر و شێخ جەلالی برای لە دوورەوە بەر گوێی کەوتووە یەکسەر نوێژەکەی بڕیوە تا گوێ شل بکات بۆ ئەو دوو برایە بلیمەتە. زانایەکی عەللامەی وەک مەلای گەورە نوێژی خۆی بۆ ئەو دەنگە موزیکالە بڕیبێ دەبێ چ بەهرەیەک بێ خوا بەو برایانەی بەخشیبوو. یادیان بەخێر هەموویان.

ئامۆزایەکی تری دایکم سەید حەسەنی شێخ محێدینی شێخ کەریمی بەرزنجی ئەویش هەر کۆیی (1980 - 1912) یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکە هەرە بە ئەزموونەکانی سەردەمی خۆی. خالە سەید حەسەنم دیوانێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (دیوانی عاسم) . بەم بۆنەیەوە حەز دەکەم سەری منەتباری و ڕێزو پێزانینم بۆ کاکە دکتۆر کەمال مەعروف دابنەوێنم کە زۆر بە پسپۆڕی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەیەکی زۆر ئەکادێمیانەی شیعرەکانی ئەم هەموو خاڵ و خاڵۆزایانەی من و بگرە بەگشتیش هی بنەماو هەیکەل و ستانداردی شیعر دانانیشی خستۆتە ڕوو.

کاکە شێخی کاکی هیرانێ (پوورزای دایکم)

کاک مستەفای هیرانێ کە شاعیری کلاسیکی گەورەی کورد (سافی) بوو هاوسەری پوورێکی دایکم بوو لە باوکیەوە (زیباخان). دەڵێن سافی نەک هەر شاعیر بووە بەلکو دەنگێکی زۆر خۆشیشی هەبووە. ئەمە لە سەردەمی تەمەنی مندا نەبووە بەڵام ئەمن ئەوەندە دەڵێم کە یەکێک لە کوڕەکانی سافی، (کاکەشێخ)، بە دەنگ و بە دەفژەنی خۆی منی گریاندووە. کاکە شێخ کە بەداخەوە زوو ئەم دنیایەی بەجێ هێشت لە غەزەلیات خوێندنا گەورەیێکی تا بڵێیت دەگمەنی هەبوو. نازانم ژێیەکانی دەنگی لەکاتی غەزەلیاتا چۆن ئەوها زەنگوڵ دەلەرینەوەو دەزرینگانەوە.

هەر لە مریدانی سافی دەرویش عەولایەک هەبوو کە ناوە ناوە دەهاتە دووگردکان و بە دەنگە پڕ لە جۆشی سووفیزمەکەی و پەنجە تەلیسماوییەکانی کە دەفەکەی پێ دەژەنی منی منداڵ و خەڵکی ئاوایی سەرسام دەکرد. پێم وایە - ئەگەر لەگەڵ دەرویش عەولایەکی تر لێم تێکەڵ نەبووبێ - ئەو دەرویش عەولایەی کە من باسی دەکەم خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەلاتێ بوو. هەر چۆنێکی بێ، دەورێشی جیاجیا ساڵی چەند جارێک بە گوندەکانی دەشتی دزەییدا دەگەڕان و بە خوێندنی غەزەلییات و دەفژەنی پارووی نانیان بۆ ماڵ و منداڵەکانیان پەیدا دەکرد. لە بیرمە کە منداڵ بووم دەرویش لە شوێنێکی بەرزی ناوئاوایی دووگردکان دەوەستاو دەستی بە غەزەل و دەفژەنی دەکرد و خەڵکیش هەرچییەکی بوا لە خۆراک بۆیان دەبرد کە دەیخستە ناو کەشکۆڵەکەی یان خورجێکەوە. ئەمن دڵم زۆر خۆش دەبوو کە دایکم ڕۆن و ئەرزاقی تری بە من دەسپارد بیبەم بۆ دەروێشی دەفژەن. ئەم تراديشنە لە سەدە ناوەندییەکانی ئەورووپاشدا زۆر باو بووە. لەوێش چینێکی بەیتبێژ و بەندبێژی گەڕۆک هەبوون کە بە زمانە ئەورووپاییەکان ڤاگابۆند vagabond یان پێ دەگوتن بۆ دابینکردنی گوزەرانیان بە شارۆچکەو دێهاتا دەگەڕان.چینێکی دیکەش هەبوو لەو هونەرمەندانە کە پێشتر باسم کردووە. ئەمان سوارچاکی خانەدانی بەیتخوان و دەنگخۆش بووین کە لە سەدە ناوەندییەکانا لە کۆشک دیوەخانەکانی میر و مارکیزان هونەری خۆیان پێشکەش دەکرد، ئەمانە خۆیان کوڕە میر و کوڕە ئاغا بووینە، بەم چینە دەگوترا تروبادوور troubadours.

## قەرەج و دۆم

جاران لە سەردەمی منداڵیی مندا قەرەج ساڵی چەند جارێک بە دێهاتی کوردستاندا دەگەڕان و ڕەشماڵ یان خێوەتی خۆیان لە گۆڕەپانێکی گوند لێ دادەکوتا و بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک دەمانەوە ئینجا بارگەیان تێک دەنا و ڕوویان دەکردە گوندێکی تر. ئەمە ژیانی قەرەجان بووە و ئێستاش هەر وان و حەز لە نیشتەجێبوونی هەمیشەیی ناکەن. کار و پیشەی ئەمانە زیاتر هونەرە جوانەکان بوو وەک گۆرانی و موزیک و سەما. بەڵام تایفەیەکی تریش هاتوچۆی دێهاتی کوردەوارییان دەکرد کە (دۆم)یان پێ دەگوتن و کورد لەگەڵ قەرەجیان تێکەڵ دەکات وەک بڵێی دوو عەشیرەتی یەک قەوم بن. پێم وایە ئەمانە زیاتر کاری دەستکردی خۆماڵییان دەکرد handicraft وەک کڵاش، سەبەتە، سەوەشیر، بێژینگ، هێلەگ، پنە، تیرۆک، باوەشێن، فڕفڕۆکەی ڕەنگاوڕەنگی منداڵان و شتی لەو بابەتە. بۆیە وا دەڵێم چونکە قسەیەکی کۆنی کوردەواری هەیە دەڵێ "دۆم بێ و کڵاش بۆ خۆی بکا" واتا کڵاشەکە زۆر بەوردی و بەچاکی دەکات چونکە بۆ خۆی دەکات. بەڵام ئەوەی کە لە بیرمە ئەو شتە دەستکردانەی لەسەرەوە باسم کردن هەورامییەکانیش دەیانکرد کەچی لەوە ناچێ دۆم هەورامی بن چونکە پێستی دۆمەکان بە گشتی ڕەشتاڵەیەکی مەیلەو تاریکە و کە لە کوردەواریی خۆمان یەکێک ڕەنگ ئەسمەرێکی کەمێک تاریک بێ پێی دەڵێن "دەڵێی دۆمە". هەورامی وا نین. ڕاستییەکەی نایەتەوە بیریشم دۆمەکان بە چ شێوەزارێکی کوردی قسەیان دەکرد. هەر چۆنێک بێ قسەیەکی کۆنی تریش هەیە دەڵێ "دۆم بێ و زوڕنا لە شایی کوڕی خۆی لێ بدا" کە ئەمەشیان ئەوە دەگەیەنێ دۆم دەبێ موزیکژەنیش بووبن. جا پێم وایە ئەم دوو سەنعەتە، کڵاش چنین و موزیکژەنی لێک دوورن و ڕاستییەکەی من هیچ لێکۆڵینەوەیەکم لەبارەی بنەچەی دۆمەکانی

کوردستان نەکردووە بۆیە لەمە زیاتر هیچی دیکەیان لەسەر نازانم.

هەرچی قەرەجە، ئەمن بە حوکمی ئەوەی هەر لە منداڵیمەوە لە دووگردکان تەماسم لەگەڵیانا بووە و لەپاشانا کە چووم بۆ ئەورووپاش زۆرم لەسەر دەخوێندنەوە و بەدوای دەنگوباسیاندا دەگەڕام و زوو زوو سەردانی ئەو لۆکاڵانەم دەکرد کە موزیکی قەرەجیان (جیپسی، چیگۆینەر) لێدەدا، بۆیە شتێکیان لەبارەوە دەزانم. بەپێی لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە قەرەج قەومێکی هیندی نەژادن و بەر لە هەزار ساڵێک پێش ئەمڕۆ لە هیندوستانەوە بە هەموو دنیادا بڵاو بوونەتەوە و لە هەر وڵاتێکا ناوی جیاجیایان لێ ناون وەک جیپسی، خیتانۆس، ژیتان، چیگان، چیگۆینەر، قەرەج، کیوەلی، کاولیە، غجر، نەوەر و ئیتریش. بەڵام ئەمڕۆ لە ئەورووپا و ئەمەریکاش ئەو ناوە کۆنانەی جارانیان کە جۆرە سووکایەتییەکی پێوە بوو ئیتر بەکار نایەن و ئێستا بە قانوون سەپێنراوە کەس نابێ بە وشەی (قەرەج) ناویان بێنێ بەڵکو لەجیاتی ئەوە (رۆما)یان پێ بڵێن کە خۆیان ئەمەیان پێ خۆشە.

ئەمن هەر لە ساڵە زووەکانی منداڵیمەوە ئاشقی موزیکی قەرەجان یان با بڵێم (رۆمایان) بوویمە. ئەو ئەشقە وەک نەخشی سەر بەرد تا ئەمڕۆش نەسوواوەتەوە. ئیستاش لە هەچ وڵاتێکا بم ئەگەر بزانم گرووپێکی هونەرمەندانی (رۆما) کۆنسێرتیان هەیە یەکسەر بلیتی بۆ دەبڕم و خۆمی دەگەیەنمێ. دیارە کانگەی ئەم حەزەشم زگماکە و لەگەڵ خوێنمدا تێکەڵاوە کە هەر تەنیا بۆ موزیکی قەرەجانیش نییە بەڵکو بۆ موزیک بە گشتی. هەر بۆیەشە کە لە منداڵیمەوە حەیرانبێژ و لاوکبێژ و بەندبێژ و بەیتخوان و فەقێی دەنگخۆش لە سەلەواتا و تێکڕای ئەو هونەرمەندە نازدارانەی جاران کە بە ناهەق ناوی سووکی چاوەش و لۆتی و متربیان پێ دەگوتن و قەرەجیشم خۆش ویستوون و رێزی تایبەتیم بۆیان هەبووە و هەر هەشە. ئەمانە لە زۆر مەسئوول و سیاسەتکارانی ئەم سەردەمە بەرێزترن چونکە بە ئارەقی ناوچەوانی خۆیان زیاتر خزمەتی کورد و کوردستانیان کردووە.

جا کە قەرەج (رۆما) دەهاتنە دووگردکان و هەواریان بۆ چەند هەفتەیەک لە گۆڕەپانی سەرجۆخینان (سەرخەرمانان) لێ دادکوتا ئیتر ئەو چەند هەفتەیە بۆ من جەژن بوو. بەو منداڵییەی خۆم تا درەنگانی شەو لەگەڵ منداڵانی دیکەی ئاوایی دەچووینە لای ئەو قەرەجانە و گوێمان لە موزیک و گۆرانییەکانیان ڕادەگرت و سەیری ڕەقس و سەماکانی بە چەقەوانەیانمان دەکرد. دایکم چەندین جار پیاوێکی دەنارده دووم بگەڕێمەوە شەو درەنگە هەر نەدەچوومەوە. لە دواییدا کە بە پەلکێشکردن دەیانبردمەوە دایکم زۆر لێم تووڕە دەبوو و دەیگوت: "بەخوا ڕۆڵە ئەتو ڕۆژێک هەر دەبیە تیاترۆ". کاری تیاترۆییش لەو زەمانە شتێکی زۆر سووک بوو و کۆمەڵگای ئەوسا بە چاوێکی زۆر نزم سەیری تیاترۆیان دەکرد کە واتای (راقصة)ی عەرەبی دەدایەوە هەر چەندە کە وشەکە گریکییە و واتای شانۆ یان باڵاخانەی شانۆ دەگەیەنێ کە کاری هونەریی لێ نمایش دەکرێ. هەر چۆنێکی بێ دڵی دایکان هەڵە ناکات و لە ئاخیری پێش بینییەکەی دایکم ڕاست دەرچوو و بووم بە تیاترۆ. بەڵام بریا زووتر هەتا گەنج بووم ببوومایە تیاترۆ نەک "بە پیری بچمە بەر هەویری".

جا خوێنەری خۆشەویست، ئەمە بوو ئەو ژینگەیەی کە لە دووگردکان لێی گەورە بووم ، حەیرانبێژ، لاوکبێژ، بەیتخوان، دەفژەن و غەزەلخوان، زوڕناژەن و دەهۆڵ ئەنگێو، بەندی دروێنە و ساوارکوتانەوە، ئەلفەسەلاتی فەقێ و مەلایان، کەڵەبابی نیوە شەوانی ژنە زیزبووان و قەرەج و سەما و چەقەوانەیان، ئێ باشە بابایەکی وەک منی بە زگماک ئەڤیندارى موزیک و گۆرانی کە قاڵبووی ژینگەیەکی ئەوهاش بووبێ دەبێ هەستی بەرامبەر بەو ژینگەیەی کە لێی فرچک دراوە چۆن بێ!

نەک هەر لە کوردستان، لە هەموو دونیادا وا باوە کە شاعیر و نووسەر و هونەرمەندان و چینی ڕۆشەنبیر بە گشتی ناتوانن بەبێ ئازادی گەشە بە بەرهەمە فیکرییەکانیان بدەن. بۆیە بۆ منی منداڵیش

دووگـردکان وێـڕای ئـه‌و ژینگه‌یـه‌ی له‌گـه‌ڵ خولیـا و خـه‌ون و خه‌یاڵـی منـا پـڕ بـه‌ پێسـتی یه‌کتری، ئاسۆیه‌کی بێ بنـی ئازادیشـی بـۆ به‌رده‌سـت کردبـووم.

شــه‌وانه ڕۆژانــه له‌گــه‌ڵ منداڵانــی ئاوایــی بــه پــای په‌تــی به‌بــێ چاوه‌دێریـی هیـچ که‌سێـك بـه ئـاره‌زووی خۆمـان ئـه‌و که‌نـد و جـۆم و گـرد و بسـتیانه‌مان ده‌کـرد و بـه قرچـه‌ی گـه‌رمـای چڵـه‌ی هاوینیـش له‌نـاو په‌رێـزان بـه‌دوای هێلانـه قه‌تێیانـدا ده‌گه‌ڕایـن هه‌رچه‌نـده کـه بـه ده‌یـان دڕکـه‌زه‌رده و قونجرکه‌شـمان لـه پێـی ڕاده‌چـوو. ئه‌مـن لـه شـیعرێکی ئـه‌م چه‌نـد سـاڵانه‌ی دواییـم ده‌ربـاره‌ی ئـه‌و ئازادییـه‌ی لادێ ئه‌مـه‌م گوتـووه:

سالّه‌های منداڵی و مێردمنداڵیم له گونده‌که‌مان
ڕائه‌بوارد به پای په‌تی و به ڕووی به‌گه‌رد و به گه‌مان
گرد و بستی و که‌ند و جۆم و که‌نده‌ڵان و وه‌رد و شۆ
به‌هاران له مێرغوزاران، هاوینان په‌رێزه‌جۆ

بۆیــه دووگــردکان بــۆ منــی منــداڵ به‌هه‌شــتی ســه‌ر ڕووی زه‌میــن بـوو. جـا کـه سـاڵی چه‌نـد جارێـك دایکـم له‌گـه‌ڵ خـۆی ده‌بـردم بـۆ شـاری هه‌ولێـر بـۆ سـه‌ردانی خزمـه هه‌ولێرییه‌کانمـان ئه‌مـن هه‌رچه‌نـده کـه پێـم خـۆش ده‌بـوو پـوورزا هه‌ولێرییه‌کانـم ببینـم بـه‌ڵام دوای یـه‌ك دوو ڕۆژ دڵـم لـه هه‌ولێـر ته‌نـگ ده‌بـوو و خواخـوام بـوو زوو بگه‌ڕێینـه‌وه بـۆ دووگـردکان. لـه هه‌ولێـر لـه لایه‌کـه‌وه ئازادییه‌کـه‌ی دووگردکانـم نه‌ده‌بوو و له‌لایه‌کـی تریشـه‌وه هه‌سـتم ده‌کـرد کـه که‌وتوومه‌تـه نـاو کولتوورێکـی نامـۆ کـه زۆر جیابـوو لـه‌وه‌ی خـۆم، کولتـووری شـار و کولتـووری دێ (دواتـر بـه درێـژی باسـی ئـه‌م بابه‌تـی کولتـووره ده‌کـه‌م). بـه‌ڵام کـه دایکـم سـه‌ردانی ماڵـه خزمـه دزه‌ییـه‌کان و ماڵـه خاڵوانه‌کانمانـی ده‌کـرد کـه ئه‌وانیـش وه‌ك ئێمـه دانیشـتووی گونـدان بـوون لـه‌وێ تووشـی ئـه‌و دڵته‌نگییـه نه‌ده‌بـووم کـه لـه هه‌ولێـر به‌سـه‌رم ده‌هـات.

حـه‌ز ده‌کـه‌م هه‌ڵوه‌سـته‌یه‌ك له‌سـه‌ر یـه‌ك دوو به‌زمـی ڕابواردنـی

شـەوانی دووگـردکان بکـەم کـە بـە شـێوەیەکی تایبەتـی کاریـان تێکـردووم و هـەر جارێکـی بیریـان لـێ بکەمـەوە نۆسـتالگیا دام دەگرێـت، سـاوەرکوتانەوە و کاکێشـان. هەڵبـەت ئـەم بەزمانـە تایبەتمەندیـی دووگـردکان نەبوون بەڵکـو لـە تـەواوی گوندەکانـی ئـەم دەشـتی دزەییە و دەشـتی هەولێـرەش بـە گشـتی هـەر هەبـووە، چونکـە کولتـووری دەشـت وەک هەمـوو (بنکولتـوور subculture)ێکـی تـر یەکڕەنگیـی تایبـەت بـە خۆیـەوەی هەبـووە و هەیـە.

## بۆنە خۆشەکەی ساوەرکوتانەوە

ڕەنگـە لـە ناوچـە شـاخاوییەکانی کوردسـتان کەمتـر بـەڵام لـە دەشـتاییەکانی وەک لای ئێمـە سـاوار ژەمێکـی سـەرەکیی دانیشـتوانی دەشـت بـوو بـە حوکمـی ئـەوەی کـە گەنـم زیاتـر لـە دەشـتەکان نـەک لەنـاو چیاکانـا دەچانـدرا. جـا لـە دووگردکانیـش خەڵکـی ئاوایـی سـەرە پاییـزان پـاش ئـەوەی هەمـوو درووێنەیـەک بـە کۆتایـی دەگەیشـت و پێـش ئـەوەی وەرزی بـاران دەسـت پـێ بـکات خۆیـان ئامـادە دەکـرد بـۆ سـاوارکوتانەوە. لـە دەشـتی دزەیـی چەنـد جـۆرە گەنمـی جیاجیـا هەبـوون بـەڵام ئـەوەی کـە بـۆ سـاوار دەسـتی دەدا گەنمێـک بـوو بـە نـاوی (ڕەشـگوڵ). هەنـگاوی یەکەمـی دروسـتکردنی سـاوار ئێـواران بـە کوڵاندنـی ئـەو ڕەشـگوڵە دەسـتی پـێ دەکـرد کـە لەنـاو چەندیـن مەنجەڵـی زل زلـی زنجیـردار بەڕیـز لەسـەر ئاگـر دادەنـدران و دەکـوڵان تـا گەنمەکـە نـەرم دەبـوو و بەمـە دەگوتـرا (دانـوو، دانولـە). بـۆ بەیانـی دانووەکەیـان لەسـەر ڕەشـماڵی ڕاخـراودا پـەرت دەکـرد بـۆ چەنـد ڕۆژێـک تـا وشـک دەبـووە. ئینجـا هـەر ئێوارەیـە و بـۆ ماڵێـک بەزمـی ساوارکوتانەوە دەسـتی پـێ دەکـرد. ئـەو ماڵـە بۆ ئێـوارە لـە دوو جەحێڵانی گونـدی دەگێڕایـەوە بەتایبەتـی ئەوانـەی ئەزموونیـان لـەو پرۆسـەیە هەبـووە کـە بێـن سـاواریان بـۆ بکوتنـەوە و ژەمـی ئـەو ئێوارەیـان لەسـەر ئـەو ماڵـە دەبـوو. سـاوارکوتانەوەکەش بـەم جـۆرە بـوو: لـە حەوشـەی ماڵەکـە

قۆرت (چاڵ)ێکی یەک دوو بست قووڵیان لێ دەدا و بەرەیان بەسەردا دەدا و بەرەکە دەبوایە قووڵایی قۆرتەکەش بەجوانی بگریتەوە و بۆ هەموو لایەکی قۆرتەکەش پان بکریتەوە. ئینجا ژن و کچی شارەزا دانووە وشکبووەکەیان دەهێنا و هەر جارەی هەندێکیان لە قۆرتەکە دەکرد و هەندێ ئاویان دەپرژاندە سەری. چوار گەنجی شارەزای ساوارکوتانەوە هەر یەکە کوتکێکی بە دەستەوە دەهاتن دوو دوو بەرامبەر یەکتری دەوەستان و دوانەکەی بەرامبەر یەکتری ڕێک پێکەوە کوتکەکەیان لە گەنمی ناو قۆرتەکە دەدا و کە کوتکەکانیان بۆ هەوا بەرز دەکردەوە ئیتر نۆرەی دوانەکەی تری بەرامبەر یەکتری بوو کە ئەوان کوتکەکانیان بوەشێنن. بەم جۆرە دەتدی کە هەمیشە دوو کوتک پێکەوە لە قۆرتەکەی دەداو دوو کوتکیش پێکەوە بە ئاسمانەوە بوون و هەر جووتە کوتکێکیش چاوەڕێی نۆرەی خۆی دەبوو و نەدەبوا هیچ یەکێک لەو کوتکانە، نە لەناو قۆرتەکە نە لە هەواش بە یەکتری بکەون. ئەگەر شتێکی وا ڕووی بدابا ئەوە سووکایەتی و کەمزانیی کوتکوەشێنەکەی دەردەخست و لەوانە بوو بۆ ساوار کوتانەوەی ماڵێکی دیکە بانگ نەکرابا. ئینجا بەزمە خۆشەکە لەوەدا بوو کە کچ و کوڕی جەحێڵی گوند و منداڵە ورتکەش ئەو شەوە بەبێ لەدوو گێرانەوە ڕوویان دەکردە ئەو ماڵە و حەوشەکە پڕ دەبوو لەو جەحێڵانە و ئەو زەمانەش ئەلەتریک نەبوو و تەنیا چەند چرا یان فانۆسێک شوێنی کۆڕی ساوار کوتەکانی ڕووناک دەکرەوە ئەگینا حەوشەکە بەگشتی تاریک بوو ئەگەر مانگەشەو نەبوا و حەز حەزۆکێی کیژ و کوڕان لەو پەنایانە دەستی پێ دەکرد. ساوارکوتەکانیش ئەگەر بیاندیبا کچی جوان جوان لە دەورویشتیان دانیشتوون و سەیریان دەکەن و گوێ لە بەندەکانیان ڕادەگرن و تەنانەت هەندێکیان بەندەکانیشیان بۆ کوڕەکان دەگێڕایەوە ئیتر ئەمانیش هێندەی تر تەکانیان دەدا خۆیان و خۆیان دەردەخست و بەندی خۆش خۆشی ساوارکوتانەوەیان دەگوت. هەڵبەت لە کاتی کوتک وەشێنا گەنمەکە بەملاو ئەولای بەرەکەدا پەرش و بڵاو دەبۆوە و کچەکانیش

ناوە ناوە کۆیان دەکردەوە و دەیانخستەوە ناو قۆرتەکەوە. بەندی ساوارکوتانەوەش ئەوەندە زۆر بوو لەبن نەدەهات. هەندێ جەحێل هەبوون کە بەندی چاکیان دەزانی و هەشبوو هەر خۆی بەندی دادەنا. هەیکەلی بەندی ساوارکوتانەوەش بە زۆری سێیینە بوون (سێ بەندی) کە کتومت لەسەر شێوەی سێبەندییەکانی شاعیری گەورەی گریکی کۆن (پیندار) بوون Pindar 522 - 443 پێش زایین. بە میتەری کوردی بە گشتی هەشت بڕگەیی بوون و هەرسێ دێڕیش دوادەنگیان وەک یەک بوو. یەکێک لە ساوارکوتەکان بەندەکەی دەگوت و سیانەکەی تریش پێکەوە بۆیان دەگێڕایەوە. بەندەکان زیاتر سادە و باسی جوانیی کچانی گوندەکەی خۆت و گوندی تریشی دەکرد و هەندێکیشی هەر وا بۆ پێکەنین بوون . هەموو بەندێکیش بە وشەی (حەلێ ... ئم حەلێ) دەستی پێ دەکرد کە هیچ واتایەکی نەبوو تەنیا وەک پشوودانێک و ڕێخۆشکردنێک بوو تا بەندبێژەکە بەندێکی تری بۆ دەهات. هەموو بەندێکیش بە (حالڵا ... حالڵا ) دەبڕایەوە. بەڵام بەندبێژی وا هەبوون کە چیرۆکێکی خۆشی هەر بەو میتەرەوە دەگێڕایەوە بەڵام هەر ستانزایەک دوادەنگی جودای هەبوو. ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو بەندانە.

کیژ هەر کیژێ دووگردکانە
چاویان ڕەشە بەژنیان جوانە
ماچی لێویان پێ گەمانە

***

کیژ هەر کیژێ باقرتەیە
سەرپەنجەیان بە خەنەیە
چارۆگەیان بە گورینگەیە

***

کیژ هەر کیژێ دیبەگەیە
ڕەفتیان بە لار و لەنجەیە

ماچکردنیان پێ گەمەیە

***

کیژ هەر کیژێ هەولێرە
بۆنیان بۆنی کنێرە
ماچکردنیان زۆر خێرە

***

چاوت وەکی چاوێ ماری
خۆم تێ هەردا سەر دیواری
ماچت دەکەم پڕ بە زاری

***

ئەو کانییەکەی لە چیغلۆکێ
بەخۆم لێم دا بە نینۆکێ
کێ ئاو لێ برد کیژ عەیشۆکێ

***

هەروا دەڕوا بۆ سەر بیرێ
چارۆگ مەرەزی چوشتیرێ
کارمامزە لۆم ناگیرێ

***

هەنـدێ لـەو بەندانـەی سـەرەوەم لـە کتێبـی (فۆلکلـۆری کـوردی لـە ناوچـەی دزەییاتـی) لـە نووسـینی بـرازای خۆشەویسـتم ئاوازخانـی ئەحمـەدی حەمەدەمینـی دزەیـی، چاپـی هەولێـر سـاڵی 1984 وەرگرتـووە. بـە سـوپاس و پێزانینـی زۆرمـەوە. یـەک دوانێکیشـیان خـۆم دامنـاون یـان دەسـکاریم کـردوون.

هـەر وەک گوتـم هەنـدێ بەندبێـژی چـاک هەبـوون کـە کورتـە چیرۆکـی خۆشەویسـتی و حەزحەزۆکێیـان بـە شـیعر و ئـاوازەوە دادەنـا و لـەو بۆنانـە و زۆر بۆنـەی دیکەشـدا دەیانگـوت کـە لەگـەڵ ریتـم و تێمپۆی کارەکـە یـان هەڵپەڕکێکـە هاوسـاز بێـت و بگونجێـت. ئەمەیـان یەکێکـە

لە چیرۆکە دیالۆگێکی زۆر بەناوبانگی ئەدەبیاتی زارەکیی کوردی (هەتیمەک بووم لە کاروانی). لە کاتی خۆی لە ساڵە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم کە لە رادیۆی دەنگی ئەمەریکا دەستبەکار بووم ئەم بەندەم لەگەڵ جۆرەها بەندی تر لەوێدا بڵاو دەکردەوە:

هەتیمەک بووم لە کاروانی
لەدوو قافرە و بازرگانی
گوندەک دیار بوو لە تەلانی
لامدا مارێک لەبۆ نانی
دیتم کیژەک لەبەر نانی
تیرۆگ لەسەر شلکەی رانی
سەد ماشەڵڵا چەندە جوانی
بە کەللام و بە قورعانی
دەرێی گوری ناوباغانی

***

گۆتی هەتیم بگرە نانی
تۆ بەجێ مای لە کاروانی
گۆتم زەرێ ناگرم نانی
سەت حاشا بێ لە کاروانی
هەتا نەتکەم راموسانی

***

گۆتی هەتیم چەند زۆر رەوی
مستەکت دەم لەبەر دەوی
زار و چەنەت پێک دەکەوی
وەک سەی لێرە وەربکەوی
بمری دەوت پێ ناکەوی

***

گۆتم جوانێ چاو لەخەوی
شلپەی ماچت پڕ بە دەوی

***

گۆتی هەتیم برۆ لێرە
دوو برام هەنە وەکی شێرە
گاسیان بکەم بێنە ئێرە
بە خەنجەران دەتکەن گێرە
ئەوجا کەچەر ئۆغرت خێرە

***

گۆتم چەتیم نارۆم لێرە
با هەردوو برات بێنە ئێرە
بە خەنجەران بمکەن گێرە
هەتا ماچت نەکەم تێرە

***

هەتیم کەچەر من کۆترم
بە هەردوو باران دەفرم
دەبمە کۆتری بار سپییە
چل گەز دەچمە پشت هەورییە
ئەوجا خوێڕی چارت چییە؟

***

تۆ کۆتری من کۆلارە
پەڕ و بارم سەت و چارە
لە عاسمانێت دێنمە خوارە
بە مامۆستای دەتکەم مارە

***

کورە سەیە ئەمن مارم
مارەکی حەفت سەری هارم

***

ئەتۆ ماری من شەهێنم
لەبن عەردی دەرت دێنم

لە کن مەلای دەتگەوزێنم

***

کورە هەتیم من قەراتم
کەس خشتەکی لێ نەبزافتم

***

تۆ قەراتی من لەشکرم
حەفت ساران دەورەت دەگرم
یان دەتگرم یان دەمرم

***

هەتیم کەچەر وەرە پارم
گوو بە ریشی مام و خارم

***

## بۆنە خۆشەکەی کاکێشانەوە

جاران لە گوندەکانی ئەو دەشتی هەولێرە کایان لە دوو شوێن دادەکرد: لەوەدە و کادین (کادێن). لەوەدە چوار لادیواری لاکێشەیی درێژ بوو کە بە خشتی لە گڵ دروستکراو دەکرا و پڕ دەکرا لە کا ئینجا سەری سواغ دەدرا هەڵدەگیرا بۆ کاتی پێویست.

کادین بچووکتر بوو و بۆ بەردەستی رۆژانە بەکار دەهات و کە کای تێدا نەدەما دەچوون سەری لەودەیان دەشکاند کادینەکیان لێ پڕ دەکردەوە و سەری لەودەکەیان سواغ دەدایەوە تا ماوەیەکی تر. هەندێ ماڵیش هەبوون کە بەس کادینیان هەبوو ئەمەیان لەسەر ئەوە دەوەستا چەندت کا هەبووە.

ئینجا بەزم و خۆشی ئەو زەمانە بۆ منداڵ و نەوجوانان کێشانەوەی کایەکە بوو لەسەر خەرمانەوە بۆ ناو لەودە کە بە ئێواران پاش

نوێـژی عیشـایێ دەکـرا. جوتیـار بـە بـاری رەشـکە (شـەڵتە) کاکەیـان بـە هێسـتران لەسـەر جۆخینانـەوە دەگواسـتەوە بـۆ نـاو لەودەکـە و لـەوێ روویـان دەکـرد. منـداڵ و مێردمنداڵـی کـچ و کوڕیشـیان بانـگ دەکرد بێن کایەکـە لەنـاو لەودەکـە بـە پێیـان بپەسـتنەوە و بڵاوی بکەنـەوە تـا جێـگای زۆرتـر کا ببێتـەوە. جـا لـەو پرۆسـەی کا پەسـتانەوە و بڵاوکردنەوەکـەی کـچ و کـوڕ بـەر دەبوونـەوە و دەکەوتنـە سـەر یـەک و دەبـوو بـە بـەزم و هـەرا و خۆشـییەکی زۆر بـۆ هەمـووان. ئەمـن دیمەنـی ئـەم بەزمـەم بـەم چەنـد بەنـدە شـیعرە وەسـف کـردووە و ئیتـر لەمـە زیاتـر چیتـر پێویسـت بـەوە نـاکات باسـی بەزمـی کاکێشـانەوەی گونـدەکان بکـەم چونکـە پێـم وایـە لێـرەدا تابلۆیەکـی ئیمپرێسیۆنیسـتم خسـتۆتە روو.

ئـەم چەنـد بەنـدە شـیعرە بەشـێکە لـە شـیعرێکی درێـژم بەنـاوی (چیرۆکـی ئەوینداریـم) کـە لەمێـژە دامنـاوە و دوو جـار لەچاپـم داوە.

چەند خۆش بوو سەردەمی پێشان
کە بانگ دەکراین بۆ کاکێشان
هەر لەدوای بانگی شێوانا
کچ و کوڕ لەسەر خەرمانا
کوڕ بە کا رەشکان پڕ دەکەن
کچ بەبا مەمکان خڕ دەکەن
بە بازدان و زۆرانێ و پاڵ
کوڕ بە زۆڵی خۆی دەخست و
دەکەوتە سەر یاری منال
لەناکاو دەبووە بێدەنگی
دوو مەمکۆڵەی خەپەتۆڵەت
وێکرا دەکەوتنە دوڕ چەنگی
وەک تۆزی سەر میوەی سەر دار
کوڵمی کاڵیم دەسڕیەوە

بە لێوی بۆ ماچ شێت و هار
بە دەنگی پڕ لە شەرمەوە
هەناسەی خاو و گەرمەوە
کە دەیگوت "جارێ نا... دیارن"
وەها تێکەڵ دەبوو گیانمان
لەتوابێ ئاگر و دارن
ئێستاش ئەو چەند وشەی دوێنێ
تەزووم بەناخا دادێنێ
گەوزەگەوز و ماچ ماچانێ
لەناو لەودە و سەرگیندانێ
لەلای من گەلێک خۆشتر بوو
لە چارپایەی شای ئیرانێ.

خاوەنی گوندی تریەسپیان ئەحمەدی سلێمان ئاغای دزەیی کوڕی حاجی لارەک خان (1950 کۆچی کردووە)

ئاغاژنە گەورەی تریەسپیان حاجی لارمک خانی حاجی پیرداود ئاغای دزەیی

پەریخانی هاوسەری ئەحمەدی سلێمان ئاغا (1993 کۆچی کردووە)

هۆمەر و عەبدولڕەزاقی کوڕی گوڵانی خوشکی شیری هۆمەر

کەریمی ئەحمەدی سلێمان ئاغا لەسەر ئارامگەی باوکی لە گۆڕستانی تریەسپیان

لەگەڵ دانیشتوانی تریەسپیان لە چەپەوە: سەعیدی شێ محەمەد بەگم، عومەری حەمەد مەولوودی، عەبدولڕەزاقی گوڵانی عوسمان نیگار، هۆمەر دزەیی، شێخ سمایلی شێخ سەدری مەلا شێخ جەلال، کەریمی ئەحمەدی سلێمان ئاغا، رزگاری شێخ سەدری مەلا شێخ جەلال

هۆمەر لە تریەسپیان لە نزیک شوێنی ماڵی دایەنەکەی خۆی

هۆمەر و دایکی لە هەولێر
1949

قەدریەخانی خوشکی هۆمەر

جەمیلی سلێمان ئاغای کوڕی
حاجی لارمک خان

هۆمەر لەگەڵ برادەری منداڵی عەیشێی مام حوسێن عەسکەر

هۆمەر 1939 (بە سێ ساڵی)

ناجیە خانی ڕەحمان ئاغای مامم
هاوسەری یەکەمی کاک ئەحمەد

کاک ئەحمەد بە جلی ئەفەندی

کاک ئەحمەد لە هەڕەتی لاویدا لەسەر
سەکۆی دیوەخانەکەی

تابلۆی کاک ئەحمەد بە فلچەی
هونەرمەندی کوردی جوو دانیال
قەساب

کاک ئەحمەد بە جلی کوردی

قەدریەخانی خوشکم و هاواری برایم ئاغای هاوسەری

مامۆستا مەلا حوسێنی سەعدی مەلای دووگردکان

خدری عەولاّ مەرجانی

حەمە سوور

سەعدی مام نادر

لە ڕاستەوە: حەمەسوور، هۆمەر، محەمەدی مەولوود هەولێری، بەفرینی حوسێنی عەلی ئاغا، حوسێنی عەلی ئاغا.

هەندێ لە برادەرانی خۆم و براکانم لە دووگردکان

کەریمی کوێخا وەسمانی

مەحموودی مام تەهای

عەلی حوسێن عەباسی (ئێستا مەلا عەلییە)

حاجی فەقێ عەوڵڵای 1933 - 2001

محەمەدی ڕەحمانی

شێخ جەلالی سەید ئەحمەدی بەرزنجی، دەنگخۆش لە غەزەلخوانیدا

شێخ ئەنوەر بەرزنجی، دەنگخۆش لە غەزەلخوانیدا

حوسێنی عەلی ئاغای دزەیی، دەنگخۆش و پسپۆڕی حەیران

جەمیلی عەلی ئاغا، دەنگخۆش و پسپۆڕی حەیران

بەهیەخانی خەجە بۆتێ

پەرێ خانی ڕەحمان ئاغای حاجی بایزی

بەسێ خانی هاوسەری حەمەدی مام تەهای

لەعلی خانی هاوسەری کاکەسمەی کێخوا ئەحمەدی

بەرگی دیوانی شیعری هەندێ لە مام و ئامۆزاکانی دایکی هۆمەر لە بنەماڵەی بەرزنجی

گۆڕی محەمەد ئەمین ئاغا دزەیی باوکی هۆمەر دزەیی لە گوندی هەلەجە

ئامێری تەونی مافوور (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان، قەڵای هەولێر)

نموونەیەک لە سندوقێکی خۆماڵی (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان، قەڵای هەولێر)

چەند نموونەیەک لە مافووری دەستکردی خۆماڵی (سەرچاوە: مۆزەخانەی لۆلان، قەڵای هەولێر)

هەولێری جاران

گوندی دووگردکان لە ساڵانی پەنجاکان، پێش ئەنفال و تەخت کردنی

دووگردکانی تەخت کراو

# بەشی 7

## خرامە بەر خوێندن، ساڵانی قوتابخانەم لە هەولێر 1942 - 1950

لەپاش ماوەیەکی کورتی سیپارە خوێندن لە مەدرەسەی دووگردکان لای مامۆستا مەلا حوسێنی سەعدی کە دەیانگوت مەلایەکی زۆر زانا و تێگەیشتوو بووە، ئیتر گەیشتمە تەمەنی چوونە بەر خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی. هەنگی، ساڵی 1943 قوتابخانە لە دووگردکان نەکرابۆوە و برا لە خۆم گەورەترەکانم بەدەر لە کاک ئەحمەد و هەروەها قەدرییەخانی تاکە خوشکیشمان ئەوانی دی (کاک ئەنوەر و کاک موحسین و کاک سەعدی) گشتیان پێش من لە هەولێر دەیانخوێند. ئەوان هەر ساڵێ خانوویەکیان لە هەولێر بەکرێ دەگرت بۆ تەواوی ساڵی خوێندن و بۆ پشووی هاوینیش چۆڵیان دەکرد دەگەڕانەوە دووگردکان تا ساڵی پاشتر ئیتر دیسان خانوویەکیان لە شار بەکرێ دەگرتەوە. هەندێ ساڵ هەمان خانوو دەگیرایەوە ئەگەر چۆڵ بوا و هەندێ ساڵیش خانوویەکی تر.

دایکم ساڵی یەک دوو جار سەردانی ئەو کوڕانەی لە هەولێرێی دەکرد و هەموو جاریش منی منداڵی لەگەڵ خۆیا دەبرد. لە یەکێک لەو سەردانانەمان براکانم لە خانوویەکی حاجی عومەری ئۆتراقچی بوون لە گەڕەکی سەعدووناوە هەر لەوبەر بەستەکەی کە هەرسێ گەڕەکی شەعبی (سەعدووناوا و تەعجیل و جوولەکان)ی لە گەڕەکەکانی تری شار جیا دەکردەوە. خانووەکە خراپ نەبوو خۆش بوو بەتایبەتیش من دڵم بە بنمیچی ژوورێکی کۆشکەکەی زۆر دەکرایەوە چونکە وەک کە بە ئیستیلاحی ئەمرۆ دەڵێن سەقفێکی سانەوی لە تەنەکە

دروستکراو بوو بەڵام دەبێ هونەرمەندێکی بۆیەکاری زۆر لێهاتوو نەخش و نیگاری ڕەنگاوڕەنگی وەک فەرشی ئێرانی لەسەرا کێشابێ. بیرمە ڕەنگی ئەرزی تابلۆکە شین بوو و مێرابەکانیشی هەمەڕەنگ بوون. ئەمن هەر لە منداڵیمەوە وێڕای موزیک حەزم لە بۆیەکاریش بوو و جاروبار ڕەسمی جوانیشم دەکرد. حاجی عومەری ئۆتراقچی کەسایەتییەکی ناسراوی بەڕێزی هەولێر بوو. پاش ماوەیەک من لەگەڵ هەردوو کوڕەکەی (گەیلانی و کەرخی) بووین بە برادەر و ئێستاش کە لە هەولێر بم ناوەناوە لە کووچەی ئۆتراقچیان لەناو قەیسەریی هەولێر کە دوکانی زەمانی بابیان بەڕێوە دەبەن سەریان لێ دەدەم و تاوێک لە گەڵیانا لە دوکانەکەیان دادەنیشم و بەدەم چاخواردنەوەوە باسی زەمانی قەدیم دەکەین و حەسرەتی بۆ هەڵدەکێشین کە بە ئینگلیزی بەمە دەڵێن (the good old days). ئەمن دڵم بە دوکانەکەیان زۆر دەکرێتەوە چونکە حەفتا ساڵ لەمەوبەر چۆنم دیبوو هەر ئەوها ماوە. ئەو کۆڵانەی کە براکانم خانوەکەیانی لێ بە کرێ گرتبوو مەیلەو هەوراز هەڵدەکشا و کە سەردەکەوتی لای دەستی چەپت کۆنە لادیوارێکی درێژی تەپیو بوو کە بریتی بوو لە ریزێک کەوانەی لە کەرپووچ دروستکراو، نازانم پێشتر چی بووە کە دروست کراوە بەڵام دیار بوو زۆر کۆن بوو. کەمێک هەورازتر ئاشێک بوو (ئاشی ئاگر) کە دەیانگوت ئاشی (عوسمان بابش)ە. فیکەفیکی لوولە بەرەو ئاسمان هەڵکشاوی ئەو ئاشەشم هەمیشە لە یادە چونکە پێشتر شتی وام نەدیبوو و فیکەفیکی واشم قەت نەبیستبوو. ماڵی خاڵە ئەحمەد تەبیبی نانەکەلیش کە برین پێچێکی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی هەولێر بوو و باوکی هونەرمەند فوئاد ئەحمەد بوو ئەویش هەر لەو کۆڵانە بوو لەولای ئاشەکە.

کە منیان بۆ ساڵی سکۆلاری (1943-1942) بۆ خوێندن بردە هەولێر براکانم خانووێکی ناجیەخانی هاوسەری قادر کەشافی باوکی پرۆفێسۆر مارف خەزنەدار و کاک جەمال خەزنەداریان لە گەڕەکی

تەعجیل بەکریّ گرتبوو. ناجیەخان کە ژنێکی زۆر جوانی بە جەستە تێکسمڕاوی خەڵکی لای کەرکووک و پێموایە حەقە و خزمی عەلی عەسکەری بوو باوەژنی دکتۆر مارف و کاک جەمال بوو. دایکی خۆیان ناوی فاتمەخان بوو و ماڵی خۆیشیان لەگەڵ خانووەکەی کە بە ئێمەیان بەکریّ دابوو دیواریان یەک بوو. هەر لە ماڵەکەی خۆیشیان کە زۆر گەورە بوو و چەندین چاوەی هەبوو ژوورێکی کۆشکیان بەکریّ دابووە کاک جەلالی خاڵە سەید ئەحمەدی بەرزنجیی ئامۆزای دایکم. کاک جەلال و بەدریەخانی هاوسەری و کوڕێکی منداڵیان ئازاد و یامەرجانی خەسووشی لەو کۆشکە دەژییان. هەر لە حەوشەکەی ئەواندا ماڵی هونەرمەند محەمەد ئەحمەد ئەربیللی و جەلالی براشی لیّ بوو کە هەردووکیان بوون بە برادەری من و هەردووکیشیان دەنگیان خۆش بوو. چەندین جار لەگەڵ محەمەدا لە ئاهەنگەکانی نەورۆزی چلەکانی سەدەی بیست سروودیشمان بەیەکەوە دەگوت. ناجیەخان هەمیشە جلی کوردیی دەستووری خۆیانی لەبەر دەکرد و زۆر بەزەوق بوو لە هەڵبژاردنی جۆری کوتاڵ و ڕەنگەکانی. تیلاکیشی هەمیشە لار بوو و بە ژێرچەنە (کرمۆکە)یەکی زۆر جوان گیری دەکرد. خوێندەوارێکی زۆر باشیش بوو هەم لە قورئان خوێندن و هەم لە شیعری کلاسیکیی کوردی و تورکییش و دەنگیشی خۆش بوو و زۆر جار لەبەر خۆیەوە قەتار و ئەڵلاوەیسیی دەگوت. مام قادر کەشافیش هەرچەندە کە بە جەستە وردیلە و چکۆلە بوو بەڵام بە ئاکاری دەموچاو پیاوێکی مووزەردەی چاوشینی ئاڵمان ئاسا قۆز بوو. چوار کوڕیان هەبوو مارف، عومەر، جەمال، جەودەت. کاک مارف زوو لەگەڵ براکانم و کاک جەمالیش لەگەڵ منا بووین بە برادەری زۆر نزیک. جەمالیش وەک من دەنگی خۆش بوو و زۆر جار لە ئاهەنگەکانی نەورۆزا پێکەوە سروودمان دەگوت. خانووەکەی ئێمە خۆش بوو و حەوشێکی باشی چەمەنتۆڕێژی هەبوو و دارتووێکی بڵندیشی لە ناوەڕاستا بوو. ئەمن زۆر جار دەچوومە سەر ئەو دارە و هەتا

دەنگم تیا بوو گۆرانیی فەرید ئەترەشم دەگوت بەتایبەتی گۆرانیی (عشک یا بلبل) کە لەگەڵ راکشانی من لەسەر لکێکی ئەستووری دارەکە دەگونجا.ماڵەکەی ئێمە لەسەر کەندا بوو و دراوسێکانی لای رۆژئاوای ماڵەکەمان هەموو ماڵە جوو بوون چونکە لەوێوە ئیتر گەڕەکی جوولەکانی ئەمبەر بەستەکە بوو و لەوبەر بەستەکەش دیسان هەر گەڕەکێکی دیکەی جوولەکان هەبوو. لە گۆڕەپانی تۆزێک بەولای ماڵەکەمان (دینگە)یەکی زۆر گەورە هەبوو کە بە ئێستر دەخولایەوە بۆ کوتانەوەی ساوار. ئەو دینگەیە بۆ ئێمەی منداڵ شتێکی سەیر و تازە بوو چونکە ساوارکوتانەوە لای ئێمەی خەڵکی دەشتێ وەک پێشتر باسم کردووە هەر بەدەست و بازوو و بە کوتکان ئەنجام دەدرا. رێک بەرامبەر ماڵەکەمان لەوبەری بەستەکە خانوویێکی دوو نهۆمی بە باڵکۆنێکی زۆر جوان رووەو ئاسمان هەڵکشابوو کە ماڵی شەریف موختار بوو. کوڕەکانی شەریف موختاریش کە دواتر زۆریان بوون بە دکتۆر و ئەندازیار، زێوەر، محەمەد، تەحسین، تەڵعەت و کەمال هەموویان (زێوەر نەبێ) لە قوتابخانە بوون بە برادەری براکانم و هی خۆیشم بە تایبەتی کاک تەحسین و کاک تەلعەت کە بەداخەوە تەنیا کاک تەلعەت لەژیانا ماوە و ئێستا دکتۆرێکی دانسازی ناسراوە لە هەولێر. لەگەڵ کاک محەمەدیش ساڵی 1955 - 1956 لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی ئانکەرە بووین و ئەو لەگەڵ کاک ئەنوەری براگەورەما بوون بە دکتۆر بەڵام من هەر یەک ساڵم لەوێ خوێند و وازم لە پزیشکی هێنا چووم بۆ ڤیەننا.

لەو ساڵانەی کە ئێمە چوار برا لە هەولێر و دواتر هەندێکمان لە کەرکووک و دواتریش لە بەغدا دەمانخوێند کاک ئەحمەدی براگەورەمان و دایکمان ژن و پیاوێکیان بۆ بنەوانی لەگەڵ دەناردین. یەکەم ساڵی من لە هەولێر پیاوەکە مام ئەحمەد وەیسی دووگردکانی بوو بەڵام بیرمە بۆ ماوەیەک (حەسەن عەباس)یشمان لابوو کە ئەویش هەر خەڵکی دووگردکان بوو. ژنەکەش خەجیج خانی کۆیی بوو.

ژنەکە بۆ چێشت لێنان و جل شتن و ماڵ پاککردنەوە و پیاوەکەش بۆ بازاڕکردن و پاراستنی ئێمەی منداڵ. پێش ئەوەی من بۆ خوێندن بچمە هەولێر براکانم مەلا قادر ناوێکیان لابوو بۆ خزمەتکردن و ئەو پیاوەشم چاک لەبیرە کە باریکەلەیەکی کەڵەگەت و دەموچاو درێژوکانی بوو. خەجیج خان هەر بە زگماک بە لچ و لێوی لەتلەت و براو لەدایک بووبوو بۆیە بەجوانی قسەی بۆ نەدەکرا و ئەوانەی لەگەڵیا دەژیان لێی راهاتبوون و تێی دەگەیشتن بەڵام بۆ خەڵکی تر تێگەیشتنی ئاسان نەبوو. براکانم و کاک ئاغای مامم رەحمانی ئامۆزام (یادی بەخێر) هەمیشە بە پێکەنینەوە دەیانگێڕایەوە کە خەجیج خان بەیانییان بە پیاوەکەی ناو ماڵێی دەگوت بچێتە بازار کەرەستەی یاپراغ بکڕێت ئەمەی لێ داوا دەکرد (عنق، عەنەوز، عۆشتی عەنەو) کە واتا (سلق، کەرەوز، گۆشتی قەڵەو). خەجیج خان تا چەند ساڵێکیش لە چوونی من بۆ خوێندن لە هەولێر هەر بنەوانمان بوو و برایەکی ناو (کاکە)ی هەبوو کە پێم وایە نائیب زابت بوو لە بەشی ئەندازەی فڕۆکەوانی، زوو زوو سەردانی دەکردین و پیاوێکی زۆر بەڕێزی باش بوو. کاکە جارێکیان ئێمەی لەگەڵ خۆی بردە فڕۆکەخانەی هەولێر و سواری فڕۆکەیەکی کردین هەر بۆ بینینی ناوەوەی نەک بۆ فڕین. ئەمە بۆ ئێمەی منداڵ شتێکی زۆر خۆش بوو.

## ساڵانی بەدبەختیم لە هەولێر

تا پۆلی شەشی سەرەتاییشم لە هەولێر لە قوتابخانەی (مدرسة اربیل الاولی واربیل الثانیة) تەواو کرد ئەگەر لەسەرەوەش پێمەوە دیار نەبووبێ، لەناخما هەرگیز خۆشیم لە دڵا نەبووە. لە هەولێر هەموو شتێک بۆ من نامۆ بوو. ساڵی یەکەم لە قوتابخانە کەسم نەدەناسی، لە ماڵەوەش دوای قوتابخانە ئیتر چوونە دەرەوەمان نەبوو، تەنانەت لە کۆڵانەکەی ماڵەکەشمان نەدەبوایە لەگەڵ منداڵانی گەڕەک یاری بکەین. کاک ئەنوەری برا گەورەکەمان کە چەند ساڵی پێش من لە هەولێر بوو زۆر توند بوو لەگەڵمانا، دیارە دەیزانی ئێمە کە لە دەشتێ کورە ئاغا بووین و خۆمان خاوەنی گوند بووین بەڵام لە شار کەس منداڵی وەک ئێمەی هەر نەشدەناسی هەرچەندە کە دانیشتووانی شاری هەولێر ئەوساکە لە سەرەتاکانی چلەکانی سەدەی رابردوو هەر 45 هەزار کەسێک دەبوو. جا نەوەکوو تووشی شەڕ و گێچەڵ ببین لەگەل منداڵە هەولێرییان یان لە شارێکی وا نامۆ بۆ ئێمەی منداڵ بەبێ چاوەدێری ببین بە بەرەڵڵا کە ئەمەش پنتکێکە شایەستەی لەسەرا وەستانە بۆیە پاسەوانەکەمان دەبوایە بۆ هەر کوێیەکی بچین یاوەرمان بێ. کاکە ئەنوەر خۆی ئەو قۆناخەی (منداڵی بە پاسەوان)ی بڕیبوو و ئیتر بە ئارەزووی خۆی بە ئازادی لە هەولێرا دەگەڕا. ئێمە موحسین و سەعدی و من تەنیا شەوانی پێنجشەممە بۆ هەینی مۆڵەتمان پێ دەدرا پاسەوانەکەمان بمانبات بۆ حەمام و بە رۆژیش گەڕانێکمان بەناو بازاڕ و قەیسەریدا پێ بکات. هەندێ ئێوارانی پشووش دەچووینە ماڵی یەکێک لە ئاشنایانی بنەماڵەکەمان کە ئەوانیش خەڵکی دەشت بوون بەڵام لەمێژ بوو هاتبوونە هەولێر و لەوێ نیشتەجێ بووبوون وەک ماڵی محەمەد حەسەن کە ئێمە بە (مامۆ) بانگمان دەکرد یان ماڵی مام عەلی عەبدوڵلای شوون هەڵگر کە هاوسەرەکەی (ئەسمەر خان)

و کچەکەی (ئەستی خان) وەکو دایک و خوشک بوون بۆ ئێمە و بەڕاستی سەبووریيەک بوون بۆ ئێمەی لە شارا غەریب. من خۆم وام هەست دەکرد. دوو کوڕیشیان هەبوو (حەمەدکۆ) و (شەریف) لەگەڵ خزمێکی خۆیان (قادری رەسووڵە کورد) ئەوانیش بوون بە برادەری خۆشەویستی ئێمە و کولتووریان وەک ئەوەی ئێمە بوو بەڵام ئەوان -بە پێچەوانەی ئێمە - ئازادیی تەواوی گەڕان و سووڕانیان بەناو شاردا هەبوو. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە منداڵانی ئامۆزا دزەییەکان و خاڵۆزا بەرزنجییەکانیشمان وەک ئێمە لە هەولێر دەیانخوێند و هاتوچۆمان لە گەڵیانا زۆر بوو. بەڵام ئەوانیش وەک ئێمە گیرۆدەی دابونەریتی دەشتێ بوون و ئەوانیش جووڵانەوە و هاتوچۆیان بەسترابۆوە بە مۆڵەتی برا گەورەکانیان. چەند پوورزایەکی هەولێریشمان هەبوو کوڕانی ئەحمەد عوسمانی پارێزەری ساڵانی بیستەکان لە هەولێر و سولەیمانی و کەسایەتیی ناسراو و ئامۆزای مەلافەندی بەڵام ئەوان باوکیان، کە بە ئەحمەدەفەندی بەناوبانگ بوو، هەولێری بوو بۆیە لەو قۆناخە ئاموشۆمان لەگەڵیانا کەمتر بوو.

## دوو کولتووری لێک لالووت، شار و دێ

نەک هەر لە کوردستان، لە هەموو دنیادا وا باوە کە ئەگەر کۆمەڵگایەک لە زۆر رووەوە بە یەکڕەنگیش پێناسە بکرێت کەچی هێشتا لەوانەیە ژمارەیەکی زۆر لە کولتووری جیاجیا ئەو یەکڕەنگییە بنەخشێنن و بیڕازێننەوە. بە ئینگلیزی بەو ژمارە زۆرەی کولتووری جیاجیای یەک کۆمەڵگا دەڵێن (سەب کەلچەر sub - culture) کە واتا بن کولتوور.

جارێ تێبینییەکی کورتی زمانەوانی پەیوەست بەو بابەتەی کە لەخوارەوە باسی دەکەم: وشەی بورژوا bourgeoi فرانسییە واتا خەڵکی شار یان دانیشتووی شار. بەڵام رەچەڵەکی وشەکە (بورگ Burg)ە و لە رووی ئێتیمۆلۆژییەوە جەرمانیی کۆنە کە بە کوردی و زۆر زمانی تریش (بورج)ی پێ دەڵێن و واتاکەشی قەڵا و تەلاری سەخت و دژوار دەگەیەنێ کە لە سەردەمانی کۆندا هەر ئەوە (شار) بووە و بۆ ئەوەی دوژمن زەفەری پێ نەبات و نەیگرێت دەبوایە لە هەرچوار لاوە شوورەبەند بکرێت.

جا لە هەولێر هەر لە زەمانی عوسمانییەکانەوە چینی (بورژوای سەروو upper bourgeoisie) واتا چینی ئەشراف و پیاو ماقووڵانی شار کە ئەوسا بریتی بوو لە ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییەکان و بنەماڵەی شێخەکان ئەمانە بالادەست بوونە. ئەمانە هەم پۆستە گەورەکانی دەوڵەت و هەم موڵکێکی زۆری ناو شاریش هەر پشکی خۆیان بووە. زۆریان زەوی کشتوکاڵیشیان لە گوندەکانی دەوروپشتی هەولێرا هەبوو و خۆیان هەر لە هەولێر - بەتایبەتیش لە قەڵا - دادەنیشتن چونکە قەڵا سەخت و پارێزراو بووە و سەرکاریان لە گوندەکانیان دانابوو بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری کشتوکاڵەکەیان. بەڵام بورژوازی ناوەڕاست و بچووکیش لە شاردا هەبوو کە بە

ئینگلیـزی و فرانسـەیی Petit Bourgeoisie و Middle Class یـان پێ دەڵێـن کـە یەکەمیـان چینـی ناوەنـدی رۆشـەنبیرانی وەک مامۆسـتایان و دکتـۆر و ئەندازیـاران و هونەرمەنـدو شـاعیرو نووسـەرانی دەگرتـەوە. چینێکـی دیکـەی لـە دووانەکـەی تـر نزمتریـش کاسـبکار و دوکانـدارو بازرگانانـی بچووکـی دەگرتـەوە. ئەمانـە گشـتیان دانیشـتووی شـار بـوون کـە جـاران گوندییـەکان پێیـان دەگوتـن شارسـتان.

هەرچـی ئێمـەی لادێ یـی کـە نیشـتەجێی دەشـت بوویـن و خاوەنـی چەندیـن گونـد و هـەزاران دۆنـم زەوی کشـتوکاڵ بوویـن، ئێمـە نەک هەر بـە تەنهـا خـاوەن گونـد بەڵکـو خاوەنـی تـەواوی دانیشـتوانی گوندەکانیـش بوویـن بـە جوتیـارو شـوان و گاوانیشـیانەوە واتـا (مینـی دەوڵەتێـک - mini state)مـان بەڕێـوە دەبـرد. ئەوسـا سیسـتەمی فێئـوداڵ لـە هەمـوو دونیـادا وابـوو و ئاغـا یـان بـەگ یـان میـر یـان شـێخ یـان کێخـوا یـان هـەر چ تایتلێکـی نۆبڵـی هەبـوا خـۆی بـۆی نەدەکـرا سـاڵانە ئـەو هـەزاران دۆنـم زەوی و زارە بکێڵـێ بەڵکـو دەیـدا بـە خەڵکـی ئاوایـی ئـەوەی کـە توانایـی فەلاحەتـی هەبـوا و لـە بەرامبـەر ئـەوەش ڕێژەیەکـی دیاریکـراوی بەرهەمەکانـی لـەو فەلاحانـە وەردەگـرت. بێجگەلەوەش تەواوی دانیشـتوانی گونـد دەبوونـە ڕەعیەتـی خـۆی و بـۆ هـەر کاروبارێـک بـوا هـەر ئاغـای خۆیـان دەناسـی نـەک دەوڵەتـی ناوەنـدی. بـەم جـۆرە دەکـرێ بڵێیـن کـە ئـەم سیسـتەمە پەیوەندییـەی نێـوان ئاغـای گونـدو ڕەعیەتەکـەی جـۆرە مینـی دەوڵـەت (mini state)ێـک بـوو بـۆ ئـەو سـەردەمە واتـا دەوڵەتێکـی چکۆلانـە لەنـاو دەوڵەتـی ناوەنـدی. جـا ئـەم ئاغـاو و بەگـو میـرە زەویدارانـە بـە ئیسـتیلاحی ڕۆژئاواییـەکان (ئەریسـتۆکراتی زەویـدار landowning Aristocrats)یـان پـێ دەگوتـن و لای ئـەوان سیسـتەمێک بـەکار دەهـات کـە بـە ئینگلیـزی پێـی دەڵێـن ( fiefdom) کـە پەیوەندیـی نێـوان ئاغـا و ڕەعیـەی ڕێـک دەخسـت وەک کـە هـەر ئێسـتا لەسـەرەوە باسـم کـرد. کەواتـا فیودالیـزم و ئەریستۆکراسـی سیسـتەمێکی کۆنـە و زۆر پێـش بورژواوییـەت هـەر هەبـوە.

کەچــی بورژوازییــەت بــە مەفهوومێکــی سیاســی و ئابــووری و کۆمەڵایەتــی لەپــاش شۆڕشــی پیشەســازی لــە ئەوروپــا ( industrial revolution ) ســەری هەڵــدا. ســیمای ئــەم بورژوازییەتــە تازەیــە هــەر ئــەوە نەبــووە کــە خەڵکــی شــارەو لــە شاریشــا یــان فەرمانبــەرە یــان کاردارێکــی(businessman) گەورەیــە یــان بازرگانێکــەو کاری نــاو بــازاری هەیــەو هیچــی تــر. بەڵکــو ســەرباری ئــەوە جــۆرە ئوســوول و ئیتیکێتێکیشــی لەگــەڵ خۆیــا هێنــا کــە جــاران نــە لــە شــار و نــە لــە گوندیشــا شــتی وا نەبــوو. ئیتیکێتــی هەڵســوکەوت و رەفتــارو ئوســوول و ئــەدەب و چۆنیەتــی یــەک یــەک بەرێــزەوە قســەکردن و بەکارهێنانــی ئیســتیلاحی وەک (ببــوورە) و ســوپاس) و زمــان پــاراوی دوور لــە جنێــو و ســووک کــردن و چۆنیەتــی راخســتنی ناومــاڵ و چۆنییەتــی بەکارهێنانــی ئامرازەکانــی نانخــواردن لەســەر مێــزا و بگــرە هــەر جــۆری خــواردن و چۆنییەتــی خــودی نانخــواردن خــۆی بەبــێ مڵچەملــچ و مشــەمش و چ جلوبەرگێــک بــۆ چ بۆنەیــەک بــەکار بێــت و زۆری تریــش.

هەروەهــا لەگــەڵ رەوتــی زەمانــە بورژوازییــە بــەرزەکان upper class وردە وردە خۆیــان لــە ســەوادی ئەهلــی بــازاڕو خەڵکــی کاســبی شــار دوور دەخســتەوەو رێگایــان بــە منداڵەکانــی خۆیــان نــەدەدا زۆر لــە نزیکــەوە تێکــەڵ بــە منداڵانــی ئــەو چینــە ببــن. راســتە ئەمانــەش وەکــو ئــەوان خەڵکی شــار بــوون و لەوانەیــە هیــچ کامێکیــان لــەوی تــر بــە ئەسلوفەســل نەبووبــن بــەڵام بــاری ئابووریــان نەگەیشــتبووە ئــەو ئاســتە کــە ئــەو ئیتیکێتــە تازانــە بیانگرێتــەوە بۆیــە بــۆ منداڵــە بــورژوازە بــەرزەکان راســت نەبــوو لەگــەڵ منداڵانــی بــورژوازە بچووکــەکان تێکــەڵ بــن نەبــادا فێــری بــێ ئوســوولی ببــن. بــورژوا بــەرزەکان بــە جــۆرە فیــزو لووتبەرزییەکــەوە دەیانڕوانییــە دانیشــتوانی شــار و دێهاتیــش کــە بــە ئینگلیــزی وشــەیەکی جــوان بــۆ ئەمــە بــەکار دێ (ســنۆب snob) و بــە کــوردی رەمەکــی خۆشــمان پێیــان دەڵێــن (تــرزل). بــە کورتــی بــورژوا بــەرزەکان بــە ئینگلیــزی وا پێناســە کــراون کــە (polite but not friendly) کــە واتــا بــە ئوســوول و بــە ئــەدەب و

زمانپاراو بوون بەڵام روویان خۆش نەبووە. سیفەتێکی دیکەی ئەم بورژوازییە بەرزانە ئەوە بووە کە زۆریان - نەک هەموویان - بە بن و بنەچەک و ئەسل و فەسل خانەدان نەبووینە بەڵکو پاش شۆڕشی پیشەسازی دەستیان بە کارو کاسبی (بە رێگای راست و رێگای چەوتیش) کردووە و موڵک سامانێکی زۆرو زەوەندیان پێکوەناوە و لە زۆر ئاغاو بەگو میرەکانی لادێ دەوڵەمەندتر بووینە و هەندێکیان هەر ویستوویانە لاسای ئاغاکان بکەنەوە لە گوندکڕین و ئەسپ و تاژی راگرتن بۆ راو و شکار. دوور نییە ئەو لووت بەرزییە و روونەدانەیان بەرامبەر بە سەوادی میللەت هەر لەو گرێیە رەوانی (عقدەی نەفسی) یەوە سەرچاوەی گرتبێ.

بەڵام هەر لەناو شار لەتەک بورژوازییەکاندا چینێکی ئەریستۆکراتیش هەبووە کە بەمە دەگوترا (ئەریستۆکراسیی شارنشین urban aristocracy) . ئەمانە بە رێگای کارداری و بازرگانیکردنەوە نەگەیشتبوونە ئەو پایە بەرزە بەڵکو هەر خۆیان وەک ئەریستۆکراتەکانی لادێ بە رەگو رەچەڵەک خانەدان بوونە و وەک ئەوانیش خاوەنی موڵگ و دێهاتێکی زۆر بوونە بەڵام ئەمانە عەشیرەتیان نەبووە و ئەگەر هەشیانبووبێ دیارە لەمێژ بووە لێک دابڕابن و چووبن لە شار دانیشتبن و بنەماڵەیەکی نوێیان پێک وەنابێ. ئەم جۆرە ئەریستۆکراسییە شارنشینە لە ئینگلتەرە و لە فرانساش زۆر باو بووە و لە کوردستانی زەمانی عوسمانیش.

هەرچی ئەریستۆکراتە خاوەن گوندەکان و دانیشتووی لادێ، راستە ئەمانە ئەو ئوسوول و ئیتیکێتانەی بورژوازییە گەورەکانی شارستان و ئەریستۆکراتە شارنشینەکانیان نەگەیشتبوێ بەڵام لەگەڵ کرمانجەکانی خۆیان تێکەڵاویی تەواویان هەبوو و منداڵەکانیشیان تەبای منداڵە کرمانجەکانیان پێکەوە بە پای پەتی لەسەر گووفەکان گەمەیان دەکرد و هەرگیز ئەمە لای ئاغاو ئاغاژن کێشە نەبووە. دیوەخانی ئاغاکانی گوندان هەر بۆ میوانەکانی ئاغا کراوە نەبووە بەڵکو هەمیشە بۆ

تەواوی جوتیارەکانیش ئاوەڵا بووە و کاری قاوەچی ئاغا خزمەتکرنی هەم میوانی ئاغاو هەم خەڵکی ئاواییش بووە کە رۆژانە دەبوایە دیوەخانەکە ئاوڕشێن بکات چونکە فەلاحەکان دەچوون قاوەیان دەخواردەوە و یاری دامەیان لەوێ دەکرد و هەر لەوێش بۆ حەسانەوە لێیان پاڵ دەدایەوە. شتی وا لە دیوەخانی ئەشرافە شارنشینەکاندا نەبووە کە کەسانێکی ئەهلی بازاڕ بەکەیفی خۆی بچێ لەوێ لێی پاڵ کەوێ. بە پێی پێناسەی ئەریستۆکراسیش دەبێ ئەو ئاغاو بەگ و میر و شێخ و کێخوایەی خاوەن زەوی گوندەکان لە بابو باپیریانەوە هەر خانەدان بووبن و ئەم تایتلی خانەدانییەیان لەوانەوە بۆ مابێتەوە بەڵام وەکو بورژوازییەکانی شار ئەو ئوسوول و ئیتیکێتەیان نەبووە. ئەمانە هەرچەندە کە بە پێچەوانەی بورژوازییەکان خۆیان لە سەوادی میللەت بە دوور رانەدەگرت بەڵام لە قسەکردنا قسە ڕەق و بێ باک وزمانپیس بوون کە بە ئینگلیزی وا پێناسە کراون (friendly but not polite) واتا لەگەڵ خەڵکا رووخۆش بوون بەڵام بە ئوسوول و ئەدەب نەبوون. کەواتا کولتووری گوند هەر یەک کولتوور بووە بۆ ئاغا و بەگ و میر و کرمانجەکانیش (مسکێن، رەعیە) چونکە تێکەڵاوی لە نێوانیانا هەبووە کەچی کولتووری شار لە دوو بنکولتوور (sub- culture)ەوە پێک دەهات ئەوەی بورژوازییەتی گەورە و ئەوەی بورژوازییەتی بچووک. بەڵام کولتووری شار و کولتووری دێ بە گشتی هەرگیز دانوویان بەیەکەوە نەدەکولا هەچەندە کە لادێییەکان زیاتر مەیلی بورژوازییە بچووکەکانی شاریان هەبوو و ئەوانەیان لە خۆیانەوە بە نزیکتر دادەنا. لەبەر بەرژەوەندیی خۆیشیان ئاسایی بووە کە بورژوازە بچووکەکان خۆیان زیاتر بە بچووکی ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییەکانی شار دابنێن هەروەک کە گوندییەکانیش زیاتر دڵسۆزی ئاغاو بەگ و میر و کێخواکانی خۆیان بوون. لە ئەنجام، جۆرە لالووتییەک (antagonism) لە نێوان کولتووری شار و کولتووری دێ سەری هەڵدابوو و بە سەدان نوکتەو گاڵتەیان بۆ

یەکتری هەڵدەبەستا. کۆمەڵگای کوردەواریش کە لە کۆنەوە لە شار و لە دێ پێک دەهات ئەوسا بە شارستانەکان دەگوترا (گۆران) کە رەنگە لە (گەوران)ەوە هاتبێت و بە دانیشتووی گوندەکانیش دەگوترا (کورد). جا قسەیەکی کۆن هەیە دەڵێ:

مانگەشەوە

تەقەو تەوە

گۆرانە حیزە

چاو لەخەوە

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە دیارە شەڕێک لەگەڵ دوژمنا رووی داوە و لە کاتێکا کە خەڵکی لادێ، کە گۆرانەکان پێیان دەگوتن (کورد)، خەریکی ئەو شەڕە بووین کەچی خەڵکی شار کە لادێیەکان پێیان دەگوتن (گۆران) پرخەی خەویان دەهات. خۆی لای ئێمەش هەر وا باو بووە کە شارستان ترسنۆکن و لادێیەکان پیاوانەتر و ئازاترن. قسەیەکی کۆنی دیکەش هەیە کە لادێیەکانی ناوچەی هەولێر بە هەولێرییەکانیان دەگوت " هەولێری بە مریشکە کورکەکی ناوێری". راستییەکەی ئەم قسانە هەر وا بەبێ بنەما دانەندراون و وەک دەڵێن " هیچ دووکەڵێک بێ ئاگر نییە". خۆی راستە ئەو کەسانەی کە خەریکی کاردارین (business) حەز لە شەڕ و شۆر ناکەن چونکە بازاڕیان لێ دەشڵەژێت و زیان بە داهات و دەرامەتیان دەگات. ئەمانە مەبەستیانە باری سیاسی بەردەوام چەسپاو و سەقامگیر بێ.

جا ئەمن ئەم باسەی (کولتووری شار و کولتووری دێ)یەم بۆیە هێناوەتە گۆڕێ چونکە پێویستیم پێی هەیە وەک رێ خۆشکردنێک بۆ گۆڕانی ژیانی خۆم کە لە ئەنجامی گواستنەوەم لە دووگردکانەوە بۆ هەولێر بە سەرما هات.

لە پایزی ساڵی 1942 منیان بۆ خوێندن بردە شاری هەولێر و لە پۆلی یەکی سەرەتایی لە قوتابخانەی (مدرسە اربیل الاولی) ناونووس کرام. ئەو ساڵە لەگەڵ برا لە خۆم گەورەترەکانم خانووی ناجیەخانی

هاوسەری قادر کەشافمان لە گەڕەکی (تەعجیل)ی شەعبی بەکرێ گرتبوو.

هەنگی ئەمن هەموو سیفەتێکی لادێم پێوە دیار بوو لە جلوبەرگ پۆشین و هەڵسوکەوت و تەنانەت شێوەزاری زمانی کوردیی لادێ کە بۆ نموونە ئەمن دەمگوت (دەرێم...) هەولێری دەیانگوت (دەلێم...) بەلامی سووک نەک (دەڵێم...)ی بە لامە قەڵەوەکەی سلەیمانیش. هەتا ماوەیەکیش زۆر گران بەسەر زارمدا دەهات بڵێم (مەکتەبی سانەوی) کە کاک ئەنوەری براگەورەم لەوێ دەیخوێند، ئەمن هەر دەمگوت (مەکتەبی سانەبی). براکانم هەموو جارێک بە پێکەنینەوە بۆیان راست دەکردمەوە کەچی ئەمن - بێ ئەوەی هەنگی بزانم بۆ - هەر (سانەبی)م پێ "لۆژیکتر" بوو. بەلای منەوە وشەی (سانەبی) لەڕووی فۆنێتیک و میتەر و دوادەنگی شیعریشەوە (وەزن و قافیە) زیاتر لەگەڵ وشەی (کانەبی)، کە ناوێکی باوی لادێ بوو، دەگونجا (سانەبی - کانەبی) هەرچەندە کە هەنگی هیچ شتێکم لەبارەی شیعر و موزیکیشەوە نەدەزانی، بەڵام دیارە هەر بە سەلیقە هەستم بە بنەما و هەیکەلی شیعردانان و هارمۆنی موزیکاڵم لە بەیتە شیعرێکدا کردووە . دیارە هەر بە لۆژیک و common sense - بێ ئەوەی بزانم لۆژیکیش چییە - ئەمەم پێ موزیکاڵتر و مەعقوولتر بووە (مەکتەبی - سانەبی - کانەبی) کە دوادەنگی هەسێکیان دەبێتە (بی بی بی).

براکانم کە چەندساڵێک پێش من بۆ خوێندن چووبوونە هەولێر ئەوان تا ڕادەیەک لە ژیان و ژینگەی شار راهاتبوون. هەر خۆی هەڵبژاردنی گەڕەکە شەعبییەکانی هەولێر بۆ ژیانی ئێمەی منداڵی خەڵکی گوندان لەلایەن باب و برا گەورەکانمانەوە بێ هۆکار نەبووە. ئاغاکانی عەشایر هەرچەندە کە خانەدان و دەوڵەمەندیش بوان بەڵام لەبەر دابونەریتی سادە و - هەندێکی زۆر دواکەوتووی - لادێ کە ئەوان سەرتا بە پا نوقمی بووبوون زیاتر لەناو چینە شارستانەکانی کاسبکار نەک چینی چەلەبی و ئەفەندی و ئاغاکانی شار هەستیان بە

سانەوەی دەروونی دەکرد و دڵیان دەکرایەوە وەک کە بە ئینگلیزی هەندێ ئیستیلاحی جوان بۆ ئەمە بەکار دێتن (more relaxed، feel more comfortable). راستە کە دەچوونە هەولێر قاوەیەکیان لای هەندێ لە ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییە دۆستەکانیان دەخواردەوە بەڵام بۆ مانەوەی شەویان ئەگەر بمابانایەوە و منداڵی قوتابخانەیان لە هەولێر نەبوا کە جێ و رێیەکیان هەبوایە ئەوا یان لە ماڵە جوولەکەیەکی ئاشنای خۆیان (جووی خۆیان) یان لە هەر ماڵە ناسیاوێکی بە رەچەڵەک دەشتەکی دەمانەوە. ئەگەر ئەوەشیان نەبوا لە یەکێک لە ئوتێلەکانی نهۆمی سەرەوەی چایخانە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمی شار وەک چایخانەی عەلی فلەیح و چایخانەی عەبۆ و چایخانەی جەمیل کە ئەرمەنییەکانی هەولێر بۆ ئوتێل بەکرێیان دەگرت یانیش لە ئوتێل فەرەح کە ئەمەیان دواتر لە دامەنی قەڵا کرایەوە لەوێ دەنووستن.

بێجگە لەوە، جیاوازییەکی زۆر زەقی دیکەش لەنێوان ئاغاکانی دەشتێ و ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییەکانی شار لەوەدا بوو کە عەشایرەکان هیچ بایەخێکی وایان بە منداڵە بچووکەکانی خۆیان و چۆنیەتیی پەروەردەکردنیان نەدەدا و راستییەکەی نەشیاندەزانی چۆنی بکەن. بۆیە سەرەتا - دەڵێم سەرەتا - لە شاری هەولێر یەک ئاغای عەشایرت نەدەدی خانووێکی رێکوپێک بۆ منداڵەکانی لە گەڕەکێکی دەوڵەمەندەکانی شار بەکرێ بگرێ. هەموویان روویان دەکردە گەڕەکە شەعبییەکان low-income neighborhoods چونکە کولتووری دانیشتووانی ئەو گەڕەکانە بە ئاسانتر باوەشی بۆ کولتووره لەزۆر رووەوە دواکەوتووەکەی منداڵە عەشایرەکان دەکردەوە.

کە ئێمەی منداڵی عەشایریش چووینە هەولێر ئەوە یەکەم جار بوو چاکەت و پانتۆڵ لەبەر بکەین. لە دەشتێ یان کورتەک و شەرواڵ یانیش ئەگەر زۆر بچووک بواین هەر عەزیزیە و چاکەتمان لەبەر دەکرد. جا گرێیە رەوانییەکە و هەست بە نزمییەکەی من

خۆم لێره‌دا له‌وه‌دا بوو كه هه‌ر چه‌ندی له خۆشم بخه‌فتبام وه‌كوو منداڵه هه‌ولێرییه بورژوازییه‌كان پۆشته و له ئوتوودراو و قشت و قنج ده‌رنه‌ده‌چووم. ئه‌وان قاتی جوان جوانیان لای خه‌یات بۆ ده‌دروا، ئێمه تا كه‌مێك گه‌وره‌تر نه‌بووین قاتی خه‌یاتمان بۆ نه‌ده‌كرا. بۆ ئێمه لای سه‌ید مه‌عرف بۆیان ده‌كڕین. سه‌ید مه‌عرف هه‌بوو كه له شه‌قامه سه‌ره‌كییه‌كه‌ی هه‌ولێر، شه‌قامی موزه‌فه‌ریییه، دوكانێكی هه‌بوو چاكه‌تو پانتۆڵی ئاماده‌كراوی منداڵانی له به‌غدا ده‌هێنا بۆ فرۆشتن و كڵاشیشی ده‌فرۆشت. جله‌كان زۆر هه‌رزان و قوماشه‌كه‌یان زۆر خراپ بوون و خوری و نه‌خشه‌كانیان زوو ده‌سووانه‌وه و ته‌نك ده‌بوون و شوێنی ئه‌نیشكیان زوو ده‌دڕا. برا گه‌وره‌كه‌مان ئێمه‌ی ده‌برده لای سه‌ید مه‌عرف چه‌ند قاتێكیان پێ تاقی ده‌كردینه‌وه و یه‌كێكیان بۆ هه‌ڵده‌بژاردین كه نه به دڵی خۆمان بوو و نه، هه‌ندێ جار، سایزه‌كه‌شی سایزی ئێمه بوو. خۆ ئه‌گه‌ر چاكه‌ته‌كه كه‌مێك زیاد له پێویست شۆڕ یان فشوفۆڵیش بوایه ده‌یانگوت ده‌ی قه‌یناكا بۆ ساڵێكی دیكه‌ش ده‌ست ده‌دا. یانی لای ئه‌وان هیچ گرنگ نه‌بووه ئه‌مساڵ تۆ به چاكه‌تی شۆڕ و قۆڵی درێژه‌وه وه‌كو مه‌یموونیش بخولێیته‌وه. جاری واش هه‌بوو ئه‌گه‌ر قاته‌كان به سه‌لامه‌تی و بێ هه‌ڵزڕان ساڵیان ته‌واو بكردایه ئه‌وه بۆ ساڵی خوێندنی داهاتوو هی برا گه‌وره‌كه ده‌كرایه به‌ر برا بچووكه‌كه و هی ئه‌و بچووكه‌ش ده‌كرایه به‌ر ئه‌وه‌ی له‌و بچووكتر. به هیچ جۆرێك زه‌وق و جوانی و قشتی و رێكوپێكیی منداڵ له‌لای گه‌وره‌كانی عه‌شایر له‌به‌رچاو نه‌ده‌گیرا. وه نه‌بێ ئه‌مه‌یان له نه‌بوونی یان له قرچۆكی بووبێ، نا نا! ئاغاكان زیاتر خه‌ریكی میوانداریكردنی "پیاوانه‌ی" پیاوی گه‌وره‌ی عه‌شایرانی دیكه و فه‌رمانبه‌رانی گه‌وره‌ی ده‌وڵه‌ت بوون و بۆ ئه‌وه‌ش به‌ڕاستی پاره‌یان هه‌ڵده‌ڕێشت. لای ئه‌وان ئه‌مه زۆر له‌پێشتر بوو تا بایه‌خدان به منداڵه‌كانیان. له‌لایه‌كی دیكه‌شه‌وه - ئه‌مه‌یان دواتر بۆم ده‌ركه‌وت - كه بنه‌ماڵه‌ی ئێمه پاره‌یه‌كی بێ حیسابی له چالاكیی حزبه كوردییه

ناسیۆنالیستەکان خەرج دەکرد و یارمەتیی دارایی بەردەوامی بۆ دابین دەکردن. وەک پێشتریش باسم کردووە پارتی دیموکراتی کوردستانی سالانی چلەکان و پەنجاکانیش بە پەنجا فلوسی ئابۆنەی ئەندامەکانی بەڕێوە نەدەچوو بەلکو بە یارمەتیی دارایی زۆر لە دەولەمەندانی کورد بەتایبەتیش هی ئەم سێ بنەمالەیە: ئەحمەد حەمەدەمینی دزەیی و ئێمەی براکانی (لە هەولێر)، کاکە زیادی حەماغای (لە کۆیە) و شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی (لە سلەیمانی). عەشایر لاریان نەبوو بە چاوتێری پارە بە هەموو لایەکدا خەرج بکەن و خەلکیش وایان دەزانی ئەگەر ئەمانە ئەو پارەیە وا بە مشەیی بۆ دەرەوە خەرج بکەن دەبێ لەناو مال و مندالی خۆیانا چۆن ژیانێکی خۆشگوزەران بەسەر بەرن، کەچی وا نەبووە. مندالەکانی خۆیانیان (مندالی بچووک نەک گەورەکان) ئەوەندە لا گرینگ نەبوو و هەرچی هەرزان بوایە ئەوەیان بۆ دەکڕین و هەر خانووێک لە گەڕەکی ڕەشوڕووتەکانی هەولێر بووا، با ئەلەتریک و ئاویشی نەبوا، ئەوەیان بۆ مندالە وردیلەکانیان بەکرێ دەگرت. لەبیرمە لە هەندێ لەو گەڕەکانە بیرێک و پەمپێکی ئاو لە گۆڕەپانی گەڕەکەکەدا هەبوو بۆ تەواوی دانیشتوانەکەی کە دەبوایە بە پەقرەج و بە تەنەکە ئاو بۆ مالەکانیان بگۆزنەوە. چاکم لەبیرە سالێکیان لەبەر فانۆس و تەنانەت لەبەر تیشکی چرادانی بە فتیلەی نەفت کونی لووتمان بە دووکەلی چرادنەکە هەمووی ڕەش هەلدەگەڕا چونکە خانووەکە ئەلەتریکی نەبوو. هەر وەکو گوتم وەنەبێ ئەمەیان لە نەبوونی یان لە ڕەزیلی بووبێ بەلام کولتوورەکەیان هەر ئەوەندە ئەقلەی بۆ دابین کردبوون، فامیلی ئەوەندە گرینگ نەبووە لایان. کە سەفەری شارانیان دەکرد بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو جارێک یارییەکی مندالانمان بۆ بکڕن کە دلمان پێی خۆش بێ. بیرمە کە مندال بووین خۆمان دوو سەلکە تەشیمان دەکردە عارەبانە و ترومبێلۆکە و ئەسپۆکە و خانیچۆلەشمان بۆ خۆمان لە قوڕ دروست دەکرد. ژیانی مندالە شارستانەکان وا نەبوو، ئەوان بەناز گەورە دەکران.

خـۆ ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ دواوە بـۆ مێـژووی رۆمانـەکان بۆمـان دەردەکـەوێ بۆچـی تەنهـا دانیشـتووی شـارەکان بـە هـاووڵات (سـیتیزن citizen) دادەنـدران و لـەوە بـەدەر ئەوانـی دی هیـچ حیسـابێکی ئینسـانییان بـۆ نەدەکـرا. خـۆی هـەر وشـەی سـیتیزن citizen لـە (سـیتی) یـەوە وەرگیـراوە کـە ئەمـڕۆش بـە ئینگلیـزی واتـا شـار. یـان وشـەی پۆلیـس police کـە ئەمەیـان گریکییـە و ئەویـش هـەر واتـا شـار. بـە کورتـی، جـاران هـەر شـار و شارسـتان شـت بوونـە و ئـەو تێڕوانینـە نەرێنییـە بەرامبـەر بـە گوندیـان تـا ئێسـتاش تـا رادەیـەک هـەر مـاوە هەرچەنـدە کـە زۆرترایەتیـی دانیشـتوانی شـارەکانی ئەمـڕۆی کوردسـتان پێشـتر گونـدی بوونـە ئێسـتا بوونەتـە شارسـتان. ئێسـتاش هەنـدێ جـار کـە لـە هەولێـر تاکسـییەک دەگـرم لـە شـۆفێرەکە دەپرسـم ئـەرێ کاکـە ئەتـو خەڵکـی کوێنـدەری؟ هەسـت دەکـەم ئـەو حـەز نـاکات بڵـێ خەڵکـی فلانـە گونـدم، هـەر دەڵـێ هەولێریـم. ئێسـتاش لـە شـاری هەولێـر بچیتـە ماڵـە ئاغایەکـی عەشـایر هەرچەنـدە دەوڵەمەندیـش بـێ هەسـت دەکەیـت کـە ناوماڵەکـەی بـە زەوقێکـی ئاسـت نـزم راخـراوە کەچـی بچـۆرە ماڵـی خێزانێکـی بـورژوازی بـەرزی شـار کـە لەمێـژ ساڵە بـە کولتـووری راخسـتنی ناومـاڵ ئاشـنایە و لەگـەڵ خوێنیـا تێکـەڵ بـووە، دەبینـی کـە کیـاری و زەوقبەرزیـی پێـوە دیـارە کـە بـە ئینگلیـزی پێـی دەڵێـن کلاسـی classy.

یەکـەم قوتابخانـەی سـەرەتایی کـە لـە هەولێـر کرایـەوە (مدرسة اربیـل الاولـی) بـوو کـە تـا چەنـد سـاڵێک هەمـوو وانەکانـی هـەر بـە کـوردی بـوون. دواتـر وانـەی عەرەبیشـیان لەپاڵ کوردیـا تـێ خسـت و دواتریـش عەرەبییەکـە زاڵ کـرا بەسـەر وانـە کوردییـەکان. بـەڵام پاشـان کـە قوتابخانەیەکـی تریـش (مدرسـة اربیـل الثانیـه) کرایـەوە و ئەوەیـان تەنهـا بە عەرەبـی بـوو ئیتـر منداڵـە هەولێرییـە دەوڵەمەنـدەکان و منداڵـی کارمەنـدە عەرەبـەکان هەمـوو روویـان کـردە ئـەوێ و قوتابخانـەی یەکەمیـش مایـەوە بـۆ منداڵانـی ئەهلـی بـازاڕی شـار و منداڵـە عەشـایرەکانی وەک ئێمـە.

جا مــن زۆر جــار بــە چــاوی حەســرەتەوە دەمڕوانییــە منداڵــە ئاغــا و ئەفەنـدی و چەلەبییەکانـی هەولێـر کـە لـە قوتابخانـەی ( ثانیـة) دەیانخوێنـد و هەسـتم دەکـرد قوتابخانەکـەی ئـەوان لـەوەی ئێمـە راقیتـرە. ئـەوان زۆر لەمـن پۆشـتەتر بـوون و قـات و کراسـەکانیان هەمیشـە ئوتـوو کرابـوون، پێڵاوەکانیـان پـاک و بۆیەکـراو بـوون و ترومبێـل و شـۆفێر دەیهێنـان و دەیبردنـەوە. زۆریشـیان پانتۆڵـی شـۆرتیان لەپێ دەکـرد و قاچوقولیان لووس و پـووس بـوون بـێ شـوێنی کۆنەبرینـی وەک قاچەکانـی ئێمـە. کەچـی کـە سـەیری خۆمـم دەکـرد شـوێنی هـەردوو ئەژنـۆم لـە پانتۆڵەکەمـەوە زەق بووبـۆوە چونکـە هـەر ئـەو قاتـە هەرزانەمـان بـۆ دەکـڕا و هەتـا فڕێش دەدرا نـە خـۆی و نـە کراسیشـمان ئوتوویـان بـە خۆیانـەوە نـەدەدی. پێڵاوەکانـم تـا پشـووی هاویـن بۆیەیـان نـەدەدی و قەیتانەکانیشـی شـۆڕ دەبوونـەوە و لـە رێـی قوتابخانـە پـووز و بەلەکمیـان بـە لیتـەی قـوڕی زسـتان سـواغ دەدا. گۆرەویـش هـەر ئـەو جووتـە بـوو و هەنـدێ جـار پەنجەکانمـی لـێ دەردەهـات دەبوایـە بنەوانەکـەیماڵمـان شـەوان بـۆم بدروێتـەوە، ئـەوە ئەڵـڵا قۆیسـەن ئێمـە کـوڕە ئاغـاش بوویـن. زۆرم حـەز دەکـرد ئەمنیـش وەک منداڵـە هەولێرییـە دەوڵەمەنـدەکان شـۆرت لەپـێ بکـەم بـەڵام کـە دەمـدی بەلـەک و چۆکـی مـن هێشـتا هەمـووی شـوێنی داڕووشـان و داماڵینـی کۆنـی پێـوە دیـارە کـە لـە ئەنجامـی غارغارۆکێـی نـاو گونـدی و بەربوونـەوەی سـواری کـەرێ تێـی کەوتبـوو و لاقـی خۆمـم لەگـەڵ ئـەوەی منداڵـە هەولێرییـەکان بـەراورد دەکـرد ئیتـر لـە دڵی خۆمـا دەمگـوت نەبەخـوا هـەر پانتۆڵـە شـڕە درێژەکـەی خـۆم لەپـێ بـێ باشـترە.

من و کاک موحسین و کاک سەعدیی برام و قەدرییەخانی خوشکمان لەنێـوان خۆمانـدا جـۆرە ئیسـتیلاحێکمان بـۆ وشـەی ناشـیرین بەکاردێنـا (ئەفڵـەس) کـە نازانـم لـە چییـەوە وەرمـان گرتبـوو. هـەر یەکێکـی یـان شـتێکی ناشـیرنمان بدیبایـە دەمانگـوت ئـەوە ئەفڵەسـە. جـا هـەر جارێکـی دایـک و خوشـکم بەسـەردان لـە هەولێـر بـووان کـە مـن بەیانییـان جلـم

دەگۆڕی و سەرو توالێتە لادێییەکەم بە رۆنی (بریلکریّم) چەور دەکرد پێش دەرچوونم بۆ قوتابخانە دەچوومە بەر ئاوێنە سەیرێکی خۆمم دەکرد رام لە خۆم نەدەبوو و لە خوچە قەدریم دەپرسی: توخوا خوچە ئەفلەس نیمە؟ ئەویش کە سەیرێکی دەکردم من یەکسەر تێ دەگەیشتم کە بە دلّی ئەویش نیم بەلاّم بۆ دلّدانەوەی من دەیگوت: "نا بەقوربان، بە خوای گەلێک جوانی!" کە دەشمزانی وانییە. مەسەلەکەش هەمووی لەوەدا بوو کە جلوبەرگمان هەرزان و خراپ بوون و خۆشمان نەماندەزانی چۆن چۆنی خۆمان پۆشتە و پەرداخت بکەین، چونکە کەسوکارمان خۆیان ئەو رۆشەنبیرییەیان نەبوویوو دەنا وەنەبێ خۆم ئەفلەس بووبم. بیرمە کەسوکارمان زەوقیان لە پۆشینی جلوبەرگی کوردی هەم هی ژنان و هەم هی پیاوانیش زۆر بەرز بوو، بەلاّم لە جلوبەرگی شار نا. هەر لە مالّی ئێمە کاک ئەحمەدی براگەورەمان بە جلە کوردییەکەیەوە نموونەی کۆکی و پۆشتەیی و ئێلێگانس بوو و دایکم و خوشک و براژنەکانیشم بە جلی کوردییانەوە هەروەها.

## کورە ئەدی هیشکە بیرۆ؟

وەکوو پێشتر باسم کرد منداڵ لە گوندان بێ بایەخ بوون و تەنانەت لە خواردنیشا هەتا گەورە هەبوا پشکی شێری لە خواردنی چاک هەر بۆ ئەوان دەبوو، کە دەبوایە زیاتر بۆ منداڵەکان بوایە چونکە بۆ گەورەبوونیان ئەوان زیاتر پێویستیان بە خۆراکی تێروتەسەل دەبوو. بەلاّم لێرەشدا لە کەمزانی و کەمپەروەردەیی گەورەکان خۆیان ئەم لایەنەی بەخێوکردنی منداڵەکانیان پشتگوێ دەخست. لە ئەنجام، روومەتی خۆم و زۆر لە منداڵانی خزمەکانی تریشم هیشکەبیرۆی لێ دەهات کە پێموایە لە ئەنجامی بەدخۆراکییەوە (سوئی تەغزیە

malnutrition) لە رووەمەتمان بەدەر دەکەوت و شتێکی ناشیرین بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لە قوتابخانەی سەرەتایی هەموو بەیانییان رۆنی ماسی یان رۆنی جگەری نەهەنگ (حوت)یان دەداینێ. لێرەشدا کە رووەمەتی لەبەر هەتاوی لادێ هەڵقرچاو و بە هیشکەبیرۆ ناشیرینبووی خۆمم لەگەڵ رووەمەتی لووس و پووس و بێگەردی منداڵە ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییەکانی هەولێر بەراورد دەکرد دیسان دەکەوتمە بن باری خەم و خەفەتان و ئاواتەخواز دەبووم تەیرێکی ئەفسانەیی بێت بمخاتە سەر شاپەڕی باڵی خۆی و لەسەر جۆخینانی دووگردکانم فرێ بدا تا هەتا ماوم جارێکی تر چاوم بە هەولێرە نەگبەتەکە نەکەوێتەوە.

کە من ئێستا بە تەمەنی ئەمڕۆم لێی ورد دەبمەوە وا ئێستا تێ دەگەم کە دیارە هەر لەو زەمانە، بە تەمەنی بچووکی ئەوساکەم جوانیپەرستی لەناخمدا گەرای خۆی داکوتابوو، چوون وەک هەموو منداڵێکیش هیچ دەسەڵاتێکم نەبووە بە جۆرێک یان بە جۆرێکی کە دەریبڕم ناچار دەبوایە ئەو خەفەتە هەر بخۆم و بخۆمەوە، قووتی بدەم و لەناخما کەڵەکەی بکەم. جا ئەمڕۆ کە تێی رادەمێنم دەبینم کە (ئەشق و خەفەت) وەک جمکانە (دووانە) لەگەڵمدا گەورە بوونە. بێ گومانیش ئەمە لە رووی سایکۆلۆژییەوە کاریگەریی خراپی لەسەر رەوتی ژیانی منداڵ دەبێت و تا هەتایە دەبێتە مۆرکێکی پێوەنووساوی نەفسیەتی و کەسایەتیی پاشەڕۆژی. بەداخەوە ئەم لایەنە سایکۆلۆژییە لەلایەن خاوەن منداڵانی کۆمەڵگا دواکەوتووەکانا کەم و زۆر لەبەرچاو ناگیرێت و گلەییشیان لێ ناکرێت چونکە ئەوان خۆیشیان قوربانی و بەلاگێڕی ئەو کۆمەڵگا دواکەوتووەن.

ئەدی ئەمن ئەمڕۆ دوای حەفتا ساڵی رەبەق بۆچی ئەم شتانەم لەبیر نەچووە؟ چما ئەمە هەمووی لە عوقدە نەفسییەکەی منداڵیمەوە سەرچاوە ناگرێ؟

ئێمە لە هەولێر تەنانەت لەگەڵ پوورزاکانیشمان کە ئەوان هەولێری

بوون تا رادەیەک لێک نامۆ بووین. راستە دایکی ئەوان خوشکی دایکی من بوو (لە شێخەکانی بەرزنجە بوون) بەڵام باوکیان ئەحمەد عوسمان کە بە ئەحمەدەفەندی ناسراو بوو ئەو هەولێری و ئامۆزای مەلافەندی بوو و لە کاتی خۆی لە بیستەکان یەکەم موتەسەڕیفی (پارێزگار)ی هەولێر بووە و دواتر هی سلەیمانیش و لە سییەکانیش بووەتە ئەندامی ئەنجومەنی پیران لە بەغدا. جا پوورزاکانم زادە و پەروەردەی دابونەریتی خێزانێکی ئەریستۆکراتی شارنشین urban aristocrats بوون منیش زادەو پەروەردەی خێزانێکی ئەریستۆکراتی خاوەن مولکی دەشتێ بووم rural aristocrats. دوو کولتووری لێک لالووت، دوو فەرهەنگی دوو رەنگی جیاجیا.

لەوانەیە ئێمە لە زۆرێک لە ئاغا و ئەفەندی و چەلەبییەکانی هەولێر دەوڵەمەندتریش بووبین، بەڵام ئەقڵی گەورەکانمان بۆ وەرگرتنی شتی تازە هەر ئەوەندەی بڕ دەکرد. ئەوان شارستان بوون، ئێمە لادێ یی.

بەڵام راستییەکی زانستیش هەیە کە ئەشرافەکانی نیشتەجێی قەڵای هەولێر زوو زوو تووشی نەخۆشیی بەرهەنگ (سیل) دەبوون چونکە کۆڵانەکانی قەڵا تەنگ بوون، هەتاوی کەم دەگرتەوە و ژنەکانیشیان زۆر کەم دەچوونە دەرەوەی قەڵا. بە پێچەوانەی ئەمە دانیشتوانی لادێی وەک ئێمە چونکە لە ژینگە و هەوایەکی ساف و پاکدا دەژیاین خۆ دەبوایە تەندروستیمان لە بورژوازییەکانی شار زۆر چاکتر بووا. بەڵام هۆکاری دیکەی وەک نەبوونی پزیشک و خوێندەواری لە گوندان و کەمزانی لە چۆنیەتیی پەروەردەکردن و چۆنیەتی هەڵبژاردنی خۆراکی سوودبەخش بۆ تەندروستی ئێمەی تووشی جۆرەها دەرد و پەتای دیکە دەکرد.

ئەمن وای بۆ دەچم لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کە دەوڵەت پێویستی بە هێزی عەشایر هەبوو بۆ شەڕوشۆڕەکانی و بۆ وەرگرتنی باج و خەراج و جۆرەها یارمەتیی دیکە لە لایەکەوە و هێشتا دروستبوونی تەواوی بورژوازییەتی پارەداری شاریش نەگەیشتبووە ئەو

پلەیەی کە حکوومەت ئەو بایەخەیان پێ بدات لە لایەکی ترەوە، ئەمە وای کردبوو کە دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەرژەوەندیی خۆی زیاتر روو لە عەشایرەکان بکات. بەڵام دواتر تای تەرازووەکە تا دەهات بەلای چەلەبییە بورژوازییەکانەوە upper Bourgeoisie لاسەنگ دەبوو و هێزی پارە زیاتر کەوتە دەست ئەوان ئیتر دەوڵەتیش وردە وردە پشتی لە عەشایر دەکرد و رووی خۆی دەدایە بورژوازییەکان.

پێشم وایە لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقیش لە ساڵی 1921 و بەرەبەرە تەشەنەکرنی شارستانییەتی بریتانی و رۆژئاوا کە شوێنی شارستانییەتی عوسمانیی گرتەوە، ئیتر نفووزی عەشایر رووی لە پووکانەوە دەکرد و رۆڵی سیاسی زیاتر بە رۆشەنبیرانی شارەکان دەسپێردرا.

بەم جۆرە ئاغاکانی لادێ هەستیان بەو (روور - وەرگێڕانەی) دەسەڵات، ئەوەی عوسمانییەکان و دواتریش ئینگلیزەکان، دەکرد و ئەمەش لالووتییەکەی نێوان بورژوازییەکان و ئاغاکانی عەشایری هێشتا توندتر دەکرد.

جا بەدبەختی و مەینەتیی من لە هەولێر لە ساڵانی بەرایی قوتابخانەم نامۆیی و لێکترازانێکی تەواوی رۆحم بوو لە ژینگە سروشتییەکەی دووگردکانم. منێک کە لە فەزایەکی بەرفراوانی گوند بە کەماڵی ئازادی و رەهایی و پێخاوسی بەوپەڕی شادی و بەختەوەری دەژیام و گۆشدراوی کانیاوە سروشتییەکەی دەشتێ بووم، ئاخر ئێستا لە شارا، لە خانووی کۆلانێکی تەنگوتارا، چۆن هەست بە زیندان نەکەم؟

ئای کە رکم لە کۆڵانە تەنگەبەرەکانی شار بوو! ئای کە رکم لە خانووی شار بوو کە لەچاو ئەوەی دووگردکان وەک زیندان بوو! ئای کە رکم لە جۆگەلە پڕ چلکاوەکانی ئەو کۆلانانە بوو کە بۆنی قورەشێنێکی گەنییان لێ دەهات! ئای کە دڵم بەو (بالاخانە) بەرزانەی شار، کە تەنیا دوو نهۆمیش بوون، دەگوشرا چونکە بەرچاویان دەگرتم تا چاو حوکم بکات بڕوانمە زەوی وزاری

بەرفراوان، بڕوانمە ئاسۆ و ماچە بێ دوایەکەی ئەرز و ئاسمان! ئای کە خەم و خەفەت دای دەگرتم کە بەهۆی گلۆپی کۆلانەکانەوە نەمدەتوانی چێژ لە تەماشاکردنی ئاسمانی شین و ئەو هەموو ئەستێرە ورد و درشتانە وەرگرم کە لە شەوانی بێ ئەلەتریکی دووگردکانم لێم بوو بوو بە خولیا و بەو خەیاڵەوە خەوم لە دنیایەکی بێ بنی تەلیسماویا دەدیتەوە! ئەدی ئەوە هەر بەردەوامبوونی ئەو عیشقەی منداڵیم نییە کە بەم دوایانە ئەم چەند بەیتەم خستووەتە ناو قەسیدەیەکی دوور و درێژمەوە:

من ئەشقی ئەستێرەی دوورم
کە دەیڕوانمێ گریانم دێ
لەبۆ ڕۆژانی رابوورم
بۆنی لەودەی کام پێ خۆشە
تۆزی شەنەبام پێ خۆشە

ئای کە بیری حەیرانەکانی نیوەشەوانی سەر جۆخینانم دەکرد، بیری مەلابانگدان و ئەلفەسەلاتی فەقێیان، بیری بانگی کەڵەباب و حەچەحەچی ڕێبوارانی شەو، بیری سەگوەڕ و زەڕەی نێرەکەرم دەکرد! بۆ من دەشت لە کوێ و شار لە کوێ؟

بەڵام وەک دەڵێن: "پیاو با قسەیەك بۆ دزیش بکات" ئەم نامۆییەم کە هەتا قوتابخانەی سەرەتاییم لە ساڵی 1950تەواو کرد وردە وردە لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگار دەڕەویەوە و کولتووری شار بەخشکەیی بێ ئەوەی خۆم هەستی پێ بکەم خۆی دەخزاندە ناو جۆری بیرکردنەوە و بۆچوونم. هەڵبەت کولتووریش لە پڕێکا و بە پێنج و دوو ڕۆژێک وەرناگیرێت و ناچەسپێت بەڵکو بە پرۆسەیەکی مێژوویی درێژخایەن.

شتێکی تریش لە هەولێر سەرنجی ڕادەکێشام کە پێشتر شتی وام نەدیبوو. ڕەمەزانان بۆ بەربانگ تۆپێک لێ دەدرا و لە تەواوی شاردا دەنگی دەدایەوە بۆ ڕۆژوو شکاندن. تۆپەکە لە چۆڵەوارییەک دادەمەزرا کە ئێستا بووەتە گەڕەکی سەیداوا. بۆ پارشێویش دەهۆڵئەنگێوێک بە

کۆلانی کەڕەکەکاندا دەگەڕا و دەهۆڵی لێ دەدا تا خەڵکەکە لە خەو هەڵسێنی بۆ پارشێو. بۆ ئیمساک دیسان تۆپەکە دەتەقێندرایەوە. جا دوای رەمەزان هەر ماڵەو شتێکی دەدا بە دەهۆڵەنگێوەکە. ئەمە بۆ من نوێ بوو چونکە لە دەشتێ بەربانگ و پارشێو و ئیمساک هەمووی بە بانگی مەلای ئەنجام دەدرا. لە هەندە گوندان یەکێک لە فەقێکان کۆلان بە کۆلان دەگەڕا و تەنەکەیەکی لێ دەدا.

## ساڵی یەکەمم لە قوتابخانە لە هەولێر
## 1943 - 1942

(مدرسە اربیل الاولی الابتدائیە - یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی هەولێر) باڵاخانەیەکی دوو نهۆمیی زۆر جوان بوو کە ئێستاش ماوە بە هەندێ دەسکارییەوە. حەوشێکی پانوبەرینی هەبوو کە وەک یاریگای تۆپی ڤالی بۆڵ و باسکت بۆڵیش بەکار دەهات. سێ لای حەوشەکە هەمووی ژووری کلاسەکان و هی مامۆستایان و بەڕێوەبەریش بوو بەڵام لای پێشەوە کە دەکەوتە سەر جادە سەرەکییەکەی ناوشاری هەولێر ئەمەیان بە شیشەبەندێکی زۆر جوان و نزم گیرابوو و دەروازەکەشی شیشەبەندێکی گەورەی دوودەری بوو کە لەلایەن دەرگەوانێکەوە دەپارێزرا. ژووری بەڕێوەبەر کە لە نهۆمی سەرەوە بوو یەکسەر کەوتبووە دەستەڕاستی دەروازەکە و بە چەند پلیکانەیەک بۆی دەچوویتە سەرەوە. هەر لەناو ژوورەکەی بەڕێوەبەر دەرگایەک دەیبردی بۆ ژووری سپۆرت. ئەمەیان پڕ بوو لە کەلوپەلی وانەی سپۆرت وەک تۆپ و جلوبەرگی یاریزانان و تۆڕ و تۆپ و راکێتی پینگ پۆنگ و زۆر شتی تریش. ئێمەی منداڵ دڵمان زۆر دەکرایەوە ئەگەر لەگەڵ مامۆستای وانەی سپۆرت بۆ هێنانی هەندێ شت بچووباینە ناو ئەو ژوورە. لە نهۆمی ئەرزی هەر لە دەستەڕاستا کە دەکەوتە ژێر ژوورەکەی سپۆرت سێ شوێنی لێک جیا هەبوو

یەکێکیان ئاوی خواردنەوەی لێ بوو بۆ قوتابییەکان کە بریتی بوو لە تانکییەکی زۆر گەورە و چەند قوتیلکەیەکی لە سفر دروستکراو کە بە زنجیر بە تانکیەوە بەسترابوونەوە. لایەکەی تریشی ریزێک توالێت بوو ئینجا حانووتێک کە شیر و چا و هەندێ خواردنی سووکی منداڵانیان لێ دەفرۆشت. پێم وایە کلاسەکانی تا پۆلی چوارەم لە خوارەوە بوون و پۆلەکانی پێنج و شەشیش بە هەموو شوعبەکانیانەوە کەوتبوونە نهۆمی سەرەوە.

پۆلی یەک، پۆلی من، لە نهۆمی ئەرزی لای هەرە دەستەڕاست بوو. چەند پەنجەرەیەکی بەلای حەوشەکە و چەند پەنجەرەیەکیشی هەبوو بەلای پشتەوەی قوتابخانەکە کە ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم خانێکی لێ بوو. خان ئەو زەمانە وەکو ئوتێلێک بوو بۆ نووستنی رێبواری سوار ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژیش کە خۆیان و وڵاخەکانیان بۆ شەو لەوێ دەمانەوە.

کە من لە پایزی 1942 لەو قوتابخانەیە ناونووس کرام تەمەنم رەنگە شەش ساڵێک دەبوو و نەدەبوو. براکانم سەعدی لە پۆلی سێ و موحسینیش لە پێنج بوو. کاک ئەنوەری براگەورە و بەرپرسمان لە هەولێر ئەو گەیشتبووە قۆناخی ناوەندی و لە قوتابخانەی ( ثانوی) هەولێر. بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەو ساڵەمان پیاوێکی باریکەلەی سیدارە لەسەر بوو پێیان دەگوت ئاپۆ، نازانم ناوی خۆی چی بوو و کاک موحسینی برام دەڵێ کوردی کەرکووک بووە. مامۆستاکانم ئەوانەی لەبیرم مابن ئەمانە بوون: جەمال جەمیل، کەریم یونس، تایر عەبدوڵلا، نوری ئەمین، جیهاد عەبدولرەزاق، سیۆن دەرویش، سەلیم بنیامین، مونیر عوزێر قەساب، عەزیز مەولود، عەلی جوکل، وەحدەدین عەدلی. بەشیر مستەفا. ئەمانە هەندێکیان کە من لە پۆلی یەکەمدا بووم هێشتا نەهاتبوون، لە ساڵانی درەنگتر هاتن و هەمووشیان وانەی پۆلی یەکەمیان نەدەگوتەوە.

ئەو ساڵەی کە من لێی چوومە هەولێر دونیا لە گەرمەی دووەم

جەنگی جیهانیدا بوو. ئاگری شەڕ، عێراق و کوردستانیشی گرتبۆوە. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم جارجار "ئینزار" لێ دەدرا کە واتای تەنگەتاوی بوو بۆ دانیشتوانی شار و لە سەرانسەری شار گوێیان لێ دەبوو کە بچن خۆیان لە حەشارگان بشارنەوە، چونکە فڕۆکە جەنگییەکانی ئاڵمانیای ناتزی بەڕێوە بوون بێن شار بۆردومان بکەن. ئەمن بۆیە دەڵێم "ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم" چونکە ڕاستییەکەی لەوە زۆر دڵنیا نیم ئایا من خۆم ئەمەم بینیبوو یان بۆیان گێڕاومەتەوە، لێم تێکەڵ بووە. هەروەها بیرمە کە قوتابیانی قوتابخانەکەی ئێمە بۆ خۆشاردنەوە ڕایان دەکرد بۆ پارکەکەی یانەی فەرمانبەران کە بەرامبەر قوتابخانەکە بوو و پڕ بوو لە دارودرەختی بەرز و چڕ.

تەریب لەگەڵ شەڕا بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی زۆر بەهێز بوو. کوردێکی زۆر لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهان دڵی لە ئینگلیز سارد بووبۆوە چونکە بریتانیا ئەو نەهامەتییەی بەسەر میللەتی کوردا هێنابوو و بە ڕێگای دوو پەیمان (سایکس - پیکۆ 1916) و (لۆزان 1923) کوردستانی پچڕپچڕ کردبوو. خۆی سایکس -پیکۆ کە زۆر بەنهێنی پلانی بۆ داندرابوو و ڕوسیای تزاریش واژۆی کردبوو وا داڕێژرابوو نەک هەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەڵوەشێندرێتەوە بەڵکو خودی خاکی تورکیاش شەتوپەت بکرێت و تەنانەت شاری ئەستەمبۆڵیش بەر ڕوسیای تزاری بکەوێت. بەڵام ساڵێک دواتر 1917 شۆڕشی بۆلشێفیک، بەناخێری گیانی، ڕووی دا و ڕووسیای نوێ خۆی لە شەڕەکە کێشایەوە و هەموو بەندە نهێنییەکانی سایکس پیکۆشی ئاشکرا کرد. تێ ناگەم بۆلشێفیکەکان بە چ ئەقڵێک ئەمەیان کرد و شاری ئەستەمبۆلی ستراتیجیشیان لەدەست خۆیان دا کە لەمێژ ساڵیش بوو ڕوسیا هەر بەتەمای گەیشتنە سەر ئاوە شیرتینەکان بووە. ئەوە بوو ئەتاتورکێکمان لێ پەیدا بوو کە لەجیاتی شەتوپەتکردنی خاکی تورکیا توانی کوردستان بە لۆزان شەتوپەت بکات و ئەم نەخشەیەی تورکیای ئەمرۆ بپارێزێت. بۆیە دوای جەنگی یەکەم ژمارەیەک لە

ڕێکخراو و کۆمەڵەی میللیی جیاجیای کورد لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان دادەمەزران. یەکێک لەو ڕێکخراوانە حیزبێکی ئولترا ناسیۆنالیستی کورد بوو بە ناوی (هیوا) کە سالّی 1939 سالّی دەسپێکی دووەم جەنگی جیهان دامەزرا (لە سالّی دامەزراندنەکەی زۆر دڵنیا نیم) و ئەمجارەیان لە ڕکی ئینگلیز ڕووی لە ئاڵمانیای ناتزی کردبوو. لە ڕاستیدا، هیوا بەردەوامبوونی هەندێ ڕێکخراوی زووتری ڕۆشەنبیران و قوتابیانی ناسیۆنالیستی کورد بوو وەک (کۆمەڵەی دارکەر). ڕەفیق حیلمی کرابوو بە (سەرۆکی باڵا)ی حیزبی هیوا لەسەر شێوەی هیتلەر کە تایتلی (فیورەر Fuehrer)ی بۆ داندرابوو واتا (ڕێبەر). هەر لەسەر شێوەی هەیکەلی ڕێکخراوەکانی حزبی ناتزیش کە یەکێک لە ڕێکخراوە کاریگەرەکانی (هیتلەر یووگەند Hitler Jugend) واتا (لاوانی هیتلەر) بوو حزبی هیواش هەمان ڕێکخراوی بۆ منداڵ و لاوانی کورد دامەزراند بە ناوی (بەچکەشێرانی کوردستان). ئەمن خۆم نەمدیبوو بەلّام بیستوومە کە لە کۆبوونەوەکانی حزبی هیوادا سلّاوکردنیش لەسەر شێوەی حزبی ناتزی بە دەست درێژکردن بۆ پێشەوە دەکرا.

## سەرایی کاری سیاسیم

هەر منداڵێک کە تازە بهاتایە قوتابخانە حزبی هیوا یەکسەر دەیقۆستەوە و دەیانکردە ئەندامی ڕێکخراوی (بەچکەشێرانی کوردستان). منیش سالّی 1942هەر یەکسەر کرام بە ئەندام، "بووم بە بەچکەشێر" و ئەمە یەکەمین «کاری سیاسی»م بوو لە ژیانما. واتا من بە شەش سالّی بوومەتە ئەندامی ڕێکخراوی (بەچکەشێرانی کوردستان) کە ڕێکخراوێکی لاوانی سەر بە حزبی (هیوا)ی زۆر نەتەوەپەرست بوو. دوای تێپەڕبوونی 73 ساڵ ئەمڕۆ شانازی بەو کوردایەتییەوە دەکەم کە بۆ زەمانی خۆی چ عەیبی نەبوو. هەڵبەت بەو تەمەنەم نە دەمزانی

ئاڵمانیا چییە نە ناتزی چییە و نە هیتلەریش کێ بووە و ڕاستییەکەی نە کوردایەتیش وەک ئایدیۆلۆژی چییە. بەڵام لێرەدا با قسەیەکی خۆشی هەر پەیوەندیدار بەم بابەتەوە بگێڕمەوە کە خۆم لەوێ نەبوومە، بەڵام دواتر لە گەورەترەکانم دەبیست.

ساڵی 1941 لە بەغدا چەند ئەفسەرێکی عەرەبی قەومی سەر بە ئەڵمانیای ناتزی لەگەڵ ڕەشید عالی گەیلانی کودەتایەکی بۆ چەند ڕۆژێک سەرکەوتوویان دژی حکوومەتی عێراقی سەر بە ئینگلیز و مەلیکیش کرد. لە کوردستانیش حزبی هیوا کە ئەمیش مەیلی ئاڵمانیای ناتزیی هەبوو کردی بە جەژن و نەیدەزانی کە ڕەشید عالی و ئەفسەرەکان قەومی عەرەبیی زۆر توندڕەون و چاوەڕێی دانپیانانی هیچ مافێکی کوردیان لێ ناکرێ. جا لە هەولێریش بوو بە شایی و خۆشی و خۆپیشاندانی کوردە ناسیۆنالیستەکانی حزبی هیوا و سەر بە ئاڵمانیا و دژی بریتانیا. خۆپیشاندەرەکان ڕژانە ناو گۆڕەپانەکەی بەر دەرکی سەرا کە ئێستا بنایەی قائیمقامییەتە و لەوێ ئاگریان لە ترومبێلی موتەسەریف (پارێزگار) سالح زەکی بەگی ساحیبقڕان بەردا. بە قسەی شێخ خالیسی شێخ جەوادی کوڕی خاڵم کە بەم دواییانە بۆی گێڕامەوە گوایا شێ محێدینی شێخ سالح و شێخ تایەری هەڵەجەی خاڵم ئەوان سالح بەگی پارێزگاریان بەلای پشتەوەی بیناکەدا دەرباز کردووە. یەکێک لە خۆپیشاندەرەکان (شێ حەسەنی شێخ نیعمەتوڵلا) کە بە حیساب خەتیبێکی زۆر قسە ڕەوان بووە بڵند کرایە سەر شانان و دەستی بە خوتبە لە دژی ئینگلیز و حکوومەتی بەغدا کرد و ستایشی ئاڵمانیا و هیتلەری دەکرد. لە کۆتایی خوتبەکەی زۆر بە حەماسەوە تەحەدای سەرەک وەزیرانی بریتانی (چێرچل)ی بەم چەند وشەیە کرد: " ... منم شێ حەسەن کوڕی شێخ نیعمەتوڵا وازیعی ئەم خوتبەیە ... دەوەرە پێش ئەی چێرچلی گەوواد !" ئیتر بوو بە چەپڵە و شایی و گۆڤەند.

لەو ساڵەی پۆلی یەکەمم (43-42) بە بیرم نایە هیچ کۆبوونەوە

و شتی وای ڕێکخراوەکەیان بە ئێمەی منال کردبێ بەلام بیرمە کە گەورەکانمان فێریان دەکردین لە پەراوێزی لای سەرەوەی هەموو لاپەڕەکانی کتێبەکانماندا بە قەلەمی ڕەنگاوڕەنگ ڕەسمی ئالای کوردستان بکەین و لە ژێریشیا ئەمە بنووسین (B.K) کە فێریان کردبووین چۆنی بنووسین و پێشیان دەگوتین واتا بژی کورد. فێر کرابووین ڕەسمی ئالاکەش چۆن بکێشین. سەرەوە سوور، ناوەڕاست سپی، ژێرەوە سەوز بەلام بیرم نایێ لەناو سپییەکە چی هەبوو، خۆرێکی زەرد یان نازانم چیتر. واش فێر کرابووین کە ڕەسمی ئالاکە بە کەمێک لوولدراوییەوە بکێشین و بەڕاستیش بەم شێوەیە جوانتر بوو و یەکسەر دەچووە ناو دلەوە. هەروەها لەبیرمە فێریان کردبووین کە یەکتریمان بدیبا بلێین (ڕۆژ باش) و دەبوایە ئەوی کەش لە وەراما بلێ (بژی). دیار بوو هەول دەدرا زمانی کوردی لە وشە و دەستەواژەی عەرەبی پاک بکرێتەوە. ئەو زەمانە لەو تەمەنە ئەوندە کوردایەتییەم کردووە.

## ئەدەبییاتی ئاودەسخانە

دەلێن قسە قسە ڕادەکێشێ، لەو سالانەی جەنگا هەستی نەتەوەپەروەریی کورد ئەوەندە بەهێز بوو کە لای ناوەوەی دیوارەکانی توالێتەکانی قوتابخانەکەشمان هەر هەمووی بە نووسینی بژی کورد و کوردستان و شیعری قەومی بە تەباشیر و بە قەلەمی ڕەنگاوڕەنگ دادەپۆشران. هەلبەت ئەمن لە پۆلی یەک جارێ هێشتا فێری خوێندن و نووسین نەبووبووم بەلام لە سالانی دواتر ئەمنیش قسوورم نەدەکرد و هەرچی لە گەورەکانمان ببیستبا لە دیواری ئاودەسخانەکانا دەمانووسییەوە. بەو تەمەنۆکەشم ئەوەندە کوردایەتییەم کردووە. تا پێم وایە گەیشتبوومە پۆلی چوار مامۆستایەکی زۆر نازدارمان بۆ هات کە ناوی مەحمود بوو و خەلکی سلەیمانی بوو. مەحمودەفەندی ئەوەندە

بە ئیتیکێت و بەڕێز ڕەفتاری لەگەڵمانا دەکرد کە پێشتر شتی وامان لە هیچ مامۆستایەک نەدیبوو. ئەو دەیگوت من هەرگیز لێتان نادەم چونکە لێدان بۆ کەر هاتووە. ئەم قسانەیم ئەوە پتر لە حەفتا ساڵە هێشتا لە یادە. پێم وایە دەبێ هەر مەحمودەفەندی خۆیشی بووبێ کە بەلایا جوان نەبووە وشەی پیرۆزی کورد و کوردستان بکەونە سەر دیواری ئاودەسخانەکانەوە و ڕەنگە هەر ئەو خۆی بووە کە ئەمەی لە سەر دیواری تواڵێتیکا نووسیبوو: "نووسینی ژنی کورد زۆر ناشیرینە لەم تەرزە جێگایانە". ئەمە دەقی ئەو نووسینەی حەفتاساڵ لەمەوبەرە لەسەر دیواری ناوەوەی یەکێک لە ئاودەسخانەکانی قوتابخانەکەمان کە هەڵبەت نەماندەزانی کێ نووسیویەتی، چونکە خۆ کەس ناوی خۆی لەژێر نووسینەکان دانەدەنا، بەڵام من خۆم زۆر درەنگتر و تا ئێستاش ڕەملم هەر بۆ مەحمودەفەندی چووە چونکە لەوسەردەمەی ناوەڕاستی چلەکانا لە قوتابخانەکەی ئێمە نە لەناو قوتابیان و نە لەناو مامۆستاکانیشا کەس ئەو زمانە کوردییە پاراوەی نەدەزانی. چاکم لەبیرە کە من خۆشم هەر لە تەمەنێکی زۆر زووەوە حەزم لە زمانپاراوی بووە. دەشمزانی کە ئێمەی منداڵ وانە کوردییەکانمان وا بە شێوەزاری سلەیمانی دەخوێنین و زۆریشم لا خۆش بوو چونکە ئێستا وا بۆم دەرکەوتووە کە ئەوسا بەو منداڵییەی خۆم هەستم بە جوانیی ئێلێگانسێکی بورژوازی bourgeois elegance لەو شێوەزارەدا دەکرد. کاک سەعدیی برام ئێستاش دوای حەفتا ساڵ دەگێڕێتەوە دەڵێ کە لە کاتی یاریکردنماندا ئەگەر (من هۆمەر) لە هاوڕێکانی دیکەم تووڕە بووبوما خۆم لێیان جیا دەکردەوە و بە شێوەزارێکی سلەیمانی کەمێک تێکشکاو قسەم لەگەڵیانا دەکرد. هەر قوتابییەکی خەڵکی سلەیمانیش بهاتایە کلاسەکەم یەکسەر خۆم لێی نزیک دەکردەوە و دەبووین بە برادەر. هەندێ لەو هاوکلاسانەی خەڵکی سلەیمانی سالانی چلەکانم ئەمانە بوون: ئەژی عەبدولڵا گۆران، موفید عەبدولڕەحمان جادر، ئەنوەر عیزەت نەجیب، عومەر فەخری.

ئـەو سـاڵە، سـاڵی پۆلـی یەکەمـم، ڕکـی زۆرم لـە قوتابخانەکـەم بـوو نـەک لەبـەر ئـەوەی کـە ڕکـم لـە خوێنـدن بووبـێ، نـا، بەڵکـو لەبەرئەوەی کـە لـە دووگـردکان و ژینگـەی دووگردکانـی دابڕیـووم. بـە ڕۆژ لـە قوتابخانـە هەمیشـە بـێ وزە و داوەشـاو بـووم و بـەرە بـەرە دەبنیسـام. بـە شـەویش لـە ماڵـەوە بەدزیـی براکانـم لەنـاو جێگاکەمـا دەگریـام. تـا چەنـد جارێـک بەڕێوەبـەر و مامۆسـتاکانم بـە بـرا لەخـۆم گەورەترەکانمیـان گوتبـوو کـە ئـەم برایەتـان زۆر مردۆخـە لـەوە دەچـێ نەخـۆش و دەردەدار بـێ بۆچـی نایبەنـەوە؟ پێـم وایـە تەمەنـم هەنگـی شـەش سـاڵی تەواویـش نەبـووە.

ئـەوەی کـە تاکـە خۆشـییەکی دەخسـتە نـاو هەسـت و هەناومـەوە دەنگوسـەدای ئـەو هەمـوو قوتابییانـە - خۆیشـم لەگەڵیانـا - بـوو کـە هەمـوو بەیانییـەک بەرلـەوەی بـۆ وانـەی یەکـەم بچینـە کلاسـەکانمانەوە لـە حەوشـەی قوتابخانەکـە دیوارەڕیـز دەکرایـن و یـەک بـە دوای یـەکا سـروودی کـوردی نیشـتمانپەروەریمان دەچـڕی.

مامۆسـتاکانمان بە جووەکانیشـەوە گشـتیان یان کوردپەروەری سـەربەخۆ یانیـش ئەندامـی یەکێـک لـە حزبـە کوردییەکانـی ئـەو سـاڵانە بـوون. هەندێـک لـەو سـروودانەی کـە پێـم وایـە بـۆ ئـەو سـاڵە دەمانگـوت ئەمانـە بـوون کـە زۆریـان لـە شـیعری شـاعیرانی وەک زێـوەر، بێخـود، بێکـەس، پیرەمێـرد، ئەحمـەد موختـار جـاف، حەمەرەسـوڵ هاوار بـوون وەک: (چەند شـیرینە لام داروبـەردی وەتەنـم...)، (برایینـە لەخەو هەڵسـن بەیانـە...)، (ئەی کوردینـە ئـەی مەردینـە...)، (دەمـی ڕاپەڕینـە دەمـی ڕاپەڕیـن...)، (وەتەنـی من کوردسـتانە...)، (دڵ لە دەردی وەتەن پەسـت و گیراوە...)، (کوردسـتان جێـگای بەچکـەی شـێرانە...)، (شـاخی ڕەنگاوڕەنگـی گوێـژە...) و زۆری تریـش. بێجگـە لـەو سـروودە کوردییـە نیشـتمانپەروەرییانە هەمـوو بەیانییـان شـیعری ناسـیۆنالیزمی کوردیـش پێشـکەش دەکـران. هـەر قوتابییـەک توانـای لەبەرکردنـی ئـەو شـیعرانە و بەبـێ شـەرم توانـای پێشکەشـکردنێکی جـوان و کاریگـەری لەنـاو حەشـاماتێکا هەبـوا ئـەوا مامۆسـتا بانگـی دەکرد

بێتە پێشەوە و شیعرەکە لەناو ئەم هەموو قوتابییانە پێشکەش بکات. یەکێک لەو قوتابییانەی کە بە حەماسێکی یەکجار جوانەوە شیعری دەخوێندەوە کاک موحسینی برام بوو کە ئەو لە پۆلی پێنج و منیش لە پۆلی یەک بووم. تا ئێستاش دوای پتر لە حەفتا ساڵ ئەو شیعرە و ئەو جۆش و خرۆشەی کە کاک موحسین شیعرەکەی پێ پێشکەش دەکرد وەک فلیمی سینەمایی وا لەبەر چاومە. کاک موحسین بەو شیعرە ناوبانگی دەرکرد و زۆر کەس هەر بە (موحسین دڵ لە میحنەت) دەیانناسی. شیعرەکە تەخمیسێکی مەلا حەسەنی قازی بوو بۆ شیعرە بەناوبانگەکەی ئەحمەد موختار جاف. ئەمەیان بڕگەی یەکەمی شیعرەکەیە کە تا ئێستا لەبیرم ماوە. سێ دێڕی یەکەمی هی مەلا حەسەنی قازییە و دوانەکەی دواییان هی ئەحمەد بەگە:

دڵ لە میحنەت کەیلە ساقی سا بە ڕووی خەندانەوە
بمدەرێ جامێ بە یادی تەلعەتی جانانەوە
چونکە ئێستا وا لە سازی سینەیی بوریانەوە
دێتە گوێم دەنگێ بە سۆز و شیوەن و گریانەوە
نالەیی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە

هەڵبەت ئەوساکە لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی زۆر کەم لە شیعر دەگەیشتم، بەڵام هەندێ وشەی سەرنجکێشی وەک کورد و کوردستان و شیوەن و گریان و وشەی (تەلعەت) کە لەناو شیعرەکەدا هاتبوو ناوی ئامۆزایەکم بوو، ئەمانە و هەروەها داڕشتنی موزیکاڵی بە (وەزن و قافییە)ی شیعرەکە و هی هەموو شیعری ئەو زەمانە کاری زۆری تێ دەکردم.

بێجگە لە سروودی کوردی، زۆر سروودی عەرەبیی عیراقیشمان دەگوت کە وشەکانمان ئەزبەر کردبوو بێ ئەوەی واتاکانیان بزانین.

مـن ئاوازەکانـی ئـەو سـروودە عەرەبییانەشـم بەڕاسـتی زۆر پـێ خـۆش بـوو و ئێسـتاش هـەر حـەز دەکـەم بیانبیسـم وەک (موطنـی موطنـی...) و (نحـن الشـباب لنـا الغـد...) و (اهـلا بکـم صحبـی یاخیـرة الامجـاد...) و (سـمعت شـعرا للعندلیـب -تـلاه فـوق الغصـن الرطیـب -اذ قـال نفسـی نفـس رفیعـة - لـم تهـوی الا حسـن الطبیعـة). ئـاوازی هەنـدێ بڕگـەی ئـەم سـروودەی دواییانـم بـەو تەمەنـە بچووکـەی خـۆم، کارێکـی عاتیفیـی یەکجـار زۆری تـێ دەکـردم بەتایبەتـی کـە دەڵـێ (اذ قـال نفسـی نفـس رفیعـة - لـم تهـوی الا حسـن الطبیعـة...) هەروەهـا سـروودی (اهـلا بکـم صحبـی ...) کـە پـڕ بـە واتـای وشـە لەناویانـا دەتوامـەوە. سـروودی (سـمعت شـعرا للعندلیـب...) کرابـوو بـە کوردیـش بـەم شـێوەیە (بولبـول بـە نەغمـەی دڵکێـش و خۆشـی - گوڵـزاری پـڕ کـرد دەنگـو خرۆشـی...) و ئـی تریش. ئـەم سـروودە عیراقییانـەش بەڕاسـتی خـۆش بـوون و مـن هـەر لـە کۆنـەوە گوتوومـە ئـاواز و مێلـۆدی ئەگـەر خـۆش بـوو ئیتـر خۆشـە و بڕایـەوە، مـن کارم بـەوە نییـە هـی چ میللەتێکە و ڕاستییەکەی دەسخۆشـانە لـەو گەلـە دەکـەم کـە خاوەنـی بەرهەمێکـی موزیکاڵـی جـوان بـێ. چەنـد سـاڵێک دواتـر لـە بەغـدا ئاشـنایەتیم لەگـەڵ موزیـککاری گـەورەی عیراقـی (سـەعید شـابۆ) پەیـدا کـرد کـە دەرکـەوت ئـەو دانـەری ئـاوازی زۆرێـک لـەو سـروودە عیراقییـە خۆشـانە بـوو. لـە بیریشـمان نەچێـت کـە ئێمـەی کـورد لـە سـەرەتای چلەکانـی سـەدەی بـۆری کـە مـن وا باسـی لێـوە دەکـەم بـاوەڕ ناکـەم ئاوازدانەرمـان بووبـێ و ئـەو سـروودە کوردییـە خۆشـانەی کـە منیـان گریانـدووە ئاوازەکانیـان دەتوانـم بڵێـم هـەر هەمووی تورکـی بـوون. شـتی خـۆش خۆشـە! لـە دیوانێکـی ئـەم ساڵانەی دوایـی شـاعیری گـەورە زێـوەر کـە مەحمـودی کـوڕی لێـی کۆڵیوەتـەوە و بـە چاپـی گەیانـدووە لەتـەک هـەر سـروودە کوردییـەک نـاوی ئـەو سـروودە تورکییـەش دانـدراوە کـە ئاوازەکـەی لـێ وەرگیـراوە. دەسخۆشـانەی زۆرم بـۆ بـرای بەڕێـز کاک مەحمـود زێـوەر.

ئـەوەی کـە لـە قوتابخانەکەمـا برینـی دووگردکانـی پتریـش

دەکولاندمەوە دیمەنی کەروباری کوورەچییان بوو کە رۆژانە بە بەردەم قوتابخانەکەمدا کەرپووچیان لە کوورانەوە بۆ شوێنی مەبەست دەگواستەوە. هەنگی پیکەپ و عارەبانە و لۆری بۆ گواستنەوەی کەرپووچ بەکار نەدەهاتن و چەرخداری وا هەر زۆر کەمیش بوو و کوورەچییەکان هەر کەریان بەکار دەهێنا. جا منی دەشتەکی چون غەریبی کەرێم دەکرد کە لە گوندەکەمان ماڵ نەبوو نەیبێت و لە هەولێریش کەرم هەر لای کوورەچییەکان بەدی دەکرد ئەو دیمەنی کەروبارە بە خەیاڵ دەیگەڕاندمەوە بۆ دووگردکان. بۆیە ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەست بە جۆرە خۆشەویستییەک و سەبوورییەک و ئارامییەکی سایکۆلۆژی دەکەم بەرامبەر بە بنەماڵە کوورەچییەکانی هەولێر کە راستییەکەشی زیاتر لەبەر خاتری کەرەکانی هەیانکەیانە.

لەساڵی یەکەممدا بەدەر لە سروود و گۆرانی و رەسم لە هەموو وانەکانی دی خراپ بووم. ئێواران لە ماڵەوە کە کاتی سەعیکردن دەهات کاک ئەنوەری برا گەورەمان ئیتر نەیدەهێشت لە خوێندن و ئەرکی ماڵ home work بەولاوە هیچی تر بکەین. ئەمە بۆ من هەمووی نوێ بوو و هەر لەسەر کتێبەکەما خەوەکوتکەم دەبردەوە و تکام لە کاکە سەعدیی برام دەکرد ئەرکەکانم بۆ بنووسێتەوە ئەگینا بۆ بەیانی لێدانێکی باشم لەلایەن مامۆستاکانمەوە دەخوارد. کاک سەعدیش وەنەبێ بە خەتێکی ناخۆشی پۆلی یەکەم شتەکانم بۆ بنووسێتەوە هەڵدەستا بە دەسنووسی پۆلە سێیەمەکەی خۆی هەمووی بەجوانی بۆ پڕ دەکردمەوە. بۆ بەیانی لێدانێکی گەرمترم دەخواردەکە مامۆستا دەیزانی ئەمە دەسخەتی خۆم نییە. دواتر لەگەڵ کاک سەعدی رێک کەوتین کە هەوڵ بدات دەسنووسی خۆی ناشیرین بکات. داماو بە دەستی منەوە، ئەویش نەیدەزانی چۆن چۆنی دەسخەتی خۆی بگۆڕی ناشیرینی بکات ئەمجارەیان بیری بۆ نوقتەکان (points) چوو کە ئەمەیان بۆ خۆی ئاسانترین رێگا بوو منی لەکۆڵ بێتەوە. هەر نوقتەیەکی دەیخستە سەر وشەیەک - بەبێ زێدە ڕۆیی - هێندەی

پوولەکەیەک دەبوو و لاپەڕەکەم پڕ بوو لەو پنتکە پوولەکە ئاسایانە. منیش دڵم خۆش بوو کە کێشەکەم ئیتر چارەسەر کرا. بۆ بەیانی ئەمجارەیان سەت شەقم تێ هەڵدرا. ئەلحوکمو لیللا!

ئەمەبوو حاڵم لە پۆلی یەکەم. بەڵام لە دواییدا هەر بە ناجیحیان دەرچوواندم. کە نمرەکانمان وەردەگرتەوە قوتابخانە بۆ گەورەی ماڵی هەر قوتابییەکی دەنارد کە واژۆی بکات یان ئەگەر چ تێبینییەکی هەبێ بینووسێت و ڕەوانەی قوتابخانەی بکاتەوە. بیرمە هەموو جارێک کاک ئەحمەدی براگەورەمان لە شوێنی تێبینیدا لەسەر کارتی من و سەعدی و موحسینی براکانم ئەمەی دەنووسی: "هیچ لێی ڕازی نیمە، تکایە تەنبیە بکرێ". ئیتر چاک یان خراپ هەموو ساڵێک کاک ئەحمەد ئەمەی کردبوو بە کلیشە.

هەر چۆنێکی بێ پۆلی یەکەمم بە جرەجڕ تەواو کرد و دەرچووم بۆ دوو. ساڵی سکۆلاری 44-43 لە پۆلی دوو بووم. لەو ساڵە و ساڵی پێشتریش لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوکلاسەکانم بووین بە برادەر کە هەندێکیان هەر خزمە دزەییەکانی خۆم بوون و هەندێکیان هەولێری یان وەک من لادێ یی عەشرەتەکانی دی بوون. لەوانە: خورشید ئیبراهیم (دکتۆر خورشیدی ئەمرۆ)، ڕەشید حەمەد (دواتر ناسراو بە ڕەشید گۆسکە)، حەوێز قادر {ئەم سیانە لە خزمە دزەییەکانی خۆم بوون}، جەودەت نافیع، مارف شێخ ڕەوف، سەلاح شێخ ڕەوف، فەتحی شێخ جەمیل، بەکر وەلی، ئەبوبەکر مەلا محەممەد فەرهادی، عومەر مەلا محەممەد فەرهادی، نەمروود داود، جەبار ڕەحمان، کەمال ڕەحمان، کەمال عەبدلڕەزاق، عزەدین مەلا محەممەد، غازی مەلا محەممەد، فاروق سەید حەسەن، یاسین تەها، محەممەد کەریم، سەباح لەتیف، سوبحی لەتیف، جەمال قادر کەشاف (دواتر ناسراو بە جەمال خەزنەدار)، سادق جەمیل، حەسەن شەریف (کە لە قورئان خوێندن و گۆرانییەکانی عەبدولوەهاب دەنگی زۆر خۆش بوو)، عادل سالح، جەودەت سالح، تەلعەت شەریف، عەونی

رەشید، رەقیب سەلیم کوورەچی، نادر یونس، محەمەد مەحموود، سیراج شێخ فەتاح، عەتا شێخ محەمەد، سەلاح شێخ سدیق، فەتحی خەلیفە. بێ گومان دەبێ هەندێ ناویشم هەر لەبیر چووبێت یانیش هەندێ لەوانەی کە ناوم هێناون رەنگە لە پۆلی یەکەمدا هاوکلاسم نەبووبن بەڵکو لە ساڵەکانی دواتر پێکەوە بووبین. بەڵام تا ئەوانەشم لەبیر نەچووە و تا بیر و هۆشم هێشتا هێز و توانای یادئاوەری تیا ماوە با بەسەریان بکەمەوە.

لەو ساڵانە، ساڵانی دووەم جەنگی جیهان (1945-1939) جموجۆڵی سیاسی لە کوردستاندا گەیشتبووە ئەو پەڕەکەی. هەر ماوەیەک و حزبێکی سیاسیی نوێ دادەندرا و بۆ ماوەیەک چالاکیی خۆی دەکرد لەپاشان وەک ئەستێرە بەرەو کزی دەڕۆیشت، دەپووکایەوە و حزبێکی دیکە سەری هەڵدەدا و ئەویش هەروەها.... هەڵبەت لە هەموو دونیاشدا هەر وابووە کە چینی خوێندەوار و رۆشەنبیر ئەوان کۆمەڵە و حزبیان دادەمەزراند و خەڵکی ئاساییش بە دوویان دەکەوتن. ئەو حزبانەی کە لە ساڵانی جەنگا پەیا بوون و من لەبیرمە ئەمانە بوون: هیوا کە لە سەرەوەتر باسم کردووە، ژ. ک. (ژیانەوەی کورد) کە ئەوسا نا بەڵام دواتر زانیم کە قازی محەمەد لە کوردستانی ئێرانا دایمەزراندبوو و لکێکی لە کوردستانی عیراقیش بە سەرۆکایەتیی ئیبراهیم ئەحمەد کردبۆوە. رزگاری کورد، شۆڕش، حزبی شیوعی عیراقی کە دواتر دوای بڕانەوەی جەنگ بۆ ئەوەی مۆڵەتی رەسمی وەرگرێت ناوی خۆی گۆڕی بۆ (الحزب التحرر الوطنی) بەڵام مۆڵەتیشیان هەر پێ نەدا و پارتییش ساڵێک پاش کۆتایی جەنگ ئەویش ساڵی 1946 دامەزرا.

هەیئێکە ئێمەی منداڵیش و راستیەکەی برا گەورەکانیشمان کە ئەوانیش هێشتا هەر خوێندکاری قۆناخی ناوەندی و دواناوەندی بوون ئەو پێگەیشتنە سیاسییەمان (political maturity) نەبوو کە چاکە و خراپە لێک بکەینەوە. لە هەموو دونیاشدا جیلی گەنجان و نەوجوانان

بـەدوای مـۆدەی تازەبابـەت دەکـەون، تازەبابـەت لـە هەمـوو بوارێکـدا. گەنـج حـەزی لـە گۆڕانـە. بۆیـە دەتوانـم بڵێـم کـە نـەک هـەر مـن و براکانـم بگـرە تـەواوی قوتابـی و خوێندکارانـی سـاڵانی دووەم جەنگـی جیهـان و سـاڵانی دواتریـش هەمـوو ئـەو حزبانەمـان تاقـی دەکـردەوە. چاکـم لەبیـرە کـە لـە حزبێـکا دەبوویـن و هـەر ئـەو حزبەمـان بـە راسـت و رەوا دادەنـا لەپـڕ بـرا گەورەکەمـان حزبـی دەگـۆڕی و هەڵبـەت داوای لـە بـرا بچووکەکانـی خـۆی دەکـرد ئەوانیـش بـا بدەنـەوە. نـەک هـەر ئەوەنـدە بەڵکـو داوامـان لـێ دەکـرا گاڵتـە بـە حزبـە پێشـووەکەی خۆمـان و گاڵتـە بـە سەرکردەکانیشـی بکەیـن. تـا حزبـە چەپڕەوەکانـی وەک شـۆڕش و دواتـر حزبـی شـیوعی و دواتریـش حـزب (التحـرر الوطنـی) پەیـدا نەبووبـوون کاک ئەنـوەری براگەورەمـان و ئێمـە هەموومان ئەندامەتیـی حزبـە ناسیۆنالیسـتە کوردییەکانـی وەک (ژ. ک.) و (هیـوا) و (رزگاری)مـان تاقـی کردبـۆوە. چاکـم لەبیـرە مـن و براکانـم هەموومـان ئەندامـی حزبـی هیـوای ناسیۆنالیسـت بوویـن و سـەرۆکەکەمان عەزیـز فەتـاح بـوو. کاک عەزیـز گەنجێکـی هەولێریـی بـاڵا کورتیلـە بـوو و کـە دەهاتـە ماڵمـان بـۆ رێکخسـتن و رۆشـەنبیرکردنی کاک ئەنـوەری برامـان هەڵبـەت لـە دەرگای دەدا و ئێمـەش یەکێکمـان دەچوویـن دەرگاکـەی لـێ بکەینـەوە و بـە راکـردن دەگەڕاینـەوە بـۆ لای کاکـە ئەنـوەر و پێمـان رادەگەیانـد کـە (عەزیـز) لـە دەرگایـە. ئەویـش لێمـان تـووڕە دەبـوو دەیگـوت: "مەڵێـن عەزیـز بڵێـن کاک عەزیـز". ئەمـە ماوەیـەک وابـوو لـە پاشـان حزبـی دی پەیـا بـوون و هەنـدێ لەوانـەی کـە لـە حزبەکـەی کاک عەزیـزا نەمـان و روویـان لـە حزبـی دیکـە کردبـوو، ئەوانـە بـۆ گاڵتەپێکـردن ناویـان لـە کاک عەزیـز نابـوو (گێـزەر) بـەو حسـابەی کـە بەژنـی هـەر هێنـدەی گێزەرێـک دەبێـت و لەوانەشـە بابـی گێزەرفـرۆش بووبێـت، حزبەکەشـیان هـەر بـە حزبـی گێـزەر نـاو دەهێنـا. پێـم وایـە سـەعدەدین شـەریف کـە زۆر نوکتەچـی و گاڵتەبـاز بـوو ئـەو ئـەم تایتلـی گێـزەرەی بـڵاو کردبـۆوە. سـەعدەدین بەداخـەوە هـەر لـەو سـاڵانە خـۆی

کوشت و هۆی خۆکوشتنەکەشی نەزانرا. کاک ئەنوەری براشمان و هەڵبەت ئێمەش لەگەڵیا حزبمان گۆڕیبوو و لە (هیوا) نەمابووین. رۆژێکیان ئەمن بەڕێکەوت لە جادە تووشی کاک عەزیز بووم و ئەو چاکوخۆشیی لەگەڵا کردم. کە گەڕامەوە بۆ ماڵ بە کاکە ئەنوەرم گوت "کاکە ئەنوەر ... کاکە ئەنوەر، ئەمڕۆ کاک عەزیزم دی" ئەویش بەتووڕەییەوە گوتی: "مەڵێ کاک عەزیز، بڵێ گێزەر"! لا حەولە وەلا! ئەوها بوو کوردایەتی کردنی ئەو زەمانە لای منداڵان و هەرزەکاران.

لە پێش جەنگی دووەم و لە ساڵانی جەنگ و تا دواتریش ژمارەیەکی زۆر لە منداڵە دزەییەکانی خزممان و خاڵۆزا بەرزنجییەکانیشمان ئەوانیش وەک ئێمە بۆ خوێندن هاتبوونە هەولێر و خانوویان لەوێ بەکرێ دەگرت. هەندێک لەو خزمانەمان وەک ئێمە درێژەیان بە خوێندن دا تا زانکۆشیان لە بەغدا یان لە دەرەوە تەواو کرد، بەڵام هەندێکیشیان یان هەر لە قۆناخی سەرەتایی یانیش تا ناوەندی و دواناوەندییان بڕی و ئیتر دەستیان لە خوێندن هەڵگرت و گەڕانەوە بۆ گوندەکانی خۆیان یارمەتیی بابیان بدەن لە کاروباری کشتوکاڵا هەرچەندە کە بابیان هەوڵی زۆری لەگەڵا دەدان بخوێنن کەچی ئەوان دیارە زیاتر حەزیان دەکرد لاسای ئاغاتییەکەی بابیان بکەنەوە و گەڕانەوە. ئەو منداڵە خزمانەشم تەبای هەموو قوتابیانی شار بەگەڵ یەکێک لەو حزبانە دەکەوتن کە پێشتر باسم کردووە. ئەوانەی لەبیرم مابن لە ئامۆزا دزەییەکانم و خاڵۆزا بەرزنجییەکانم لە چلەکان ئەمانە بوون: ئاغای رەحمانی، بورهانی بایزی رەحمانی، جەوهەری حوسێنی مەلای، ئەنوەری حوسێنی مەلای، رەقیبی حوسێنی مەلای، جەوادی حوسێنی مەلای، حەمەی حوسێنی مەلای، عەلی فەتاح، ئەحمەد فەتاح، محەمەدی ئاغای جوکولی (ناسراو بە محۆ سەرسۆر)، مەحمود کانەبی، نوری کانەبی، عەزیز رەشید، عەبدوڵڵا حەوێز مامەند، عومەر عەلی خورشید، فارس عەلی خورشید، جەوهەر حەسەن رۆستەم، ئەنوەر عەزیز پاشا، عەولا پاشا عەزیز پاشا، سەعید عەزیز پاشا، عومەر خدر

پاشا، محەمەد خدر پاشا، جەوهەر شێمحەمەد پاشا، سمکۆ شێمحەمەد پاشا، نامیق حەمەد پاشا، کەمال حەمەد پاشا، یونس قادر پاشا، ئەحمەد عەلی ئۆمەراوە، موحسین عەلی ئۆمەراوە، جەمیل سلێمان، خورشید ئیبراهیم، مەحمود ئیبراهیم، رەشید حەمەد، حەویز قادر، خالید ئیسماعیل، عومەر ئیسماعیل، عەلی ئیسماعیل، عەزیز حوسێن، ئەحمەد عەلی کاکەخان، خدر عەلی کاکەخان، ئەنوەر شێخ عەزیز، خالیس شێخ جەواد، مستەفا شێخ جەواد. وەک پێشتریش گوتم ئەمانە هەندێکیان قۆناخی زانکۆشیان تەواو کرد و بوون بە دکتۆر، ئەندازیار یان فەرمانبەری پلەبەرزی دەوڵەت. هەندێکیشیان یان هەر سەرەتاییشیان تەواو نەکرد یان گەیشتنە قۆناخی ناوەندی و دواناوەندی ئیتر لەوێدا وازیان لە خوێندن هێنا. لە پوورزا هەولێرییەکانیشم (کوڕانی ئەحمەد عوسمان) جارجار مەحمود و فوئاد و نەوزادمان دەدی بەڵام کەمتر، چون ئەوان زیاتر لەگەڵ بابیان لە بەغدا دەبوون.

لە پشووی هاوینانمان پەیوەندیمان لەگەڵ هەندێک لەو خزمانەمان هەر دەما و لەگەڵ گەورەکانمان هاتوچۆی گوندی یەکتریمان دەکرد.

بەڵام خۆشیی بەڕاستیمان لە گوندی هەڵەجە و گوندەکانی تریماڵە خاڵانم بوو بەتایبەتی بۆ من و سەعدیی برام کە بچووک بووین. هەڵەجە بۆ ئێمە هاوینە هەوار بوو. ئاوێکی لە مشەی کارێز کە رەز و باغی دارهەنار و هەنجیر و مەرەزە و تەنانەت تووتنیشیان لەبەر دەکرد. دوو دارتووی زۆر بەرز و چڕیشی لێ بوو کە جۆلانەمان لە لکەکانی دەبەستایەوە و جۆرەها یاریشمان لەبەر سێبەرەکانیانا دەکرد. ئەو دوو دارتووە لە دووگردکانیشەوە دەبینران. کارێزەکە کە دەردەکەوت دەبوو بە مەلەگایەکی زۆر خۆشی پڕ لە ماسی و بۆق و قرژاڵ و کیسەڵ. ئەم بەشەی کارێزەکە ناوی (کونە بۆقان)یان لێ نابوو و بۆ ئێمەی دووگردکانی بەهەشتێک بوو بۆ خۆی. دووگردکان کە خۆم ئەوەندە ئاشقی بووم نە ئاوی لێ بوو نە یەک تاکەدار، هاوینان هیشک و بریشک و رەق و تەق.

له چەپەوە: هۆمەر، دۆستی دێرینی بەووەفامان ئەحمەد وەیسی، سەعدی
برای هۆمەر، موحسینی برای هۆمەر. ئەوەی پشت هۆمەر شێخ خاڵسی شێخ
جەواد خاڵۆزای هۆمەر

برادەری منداڵیم گەیلانی حاجی عومەر لە
دووکانەکەی خۆی لە قەیسەری هەولێر

برادەری منداڵیم کەرخی حاجی عومەر لە
دووکانەکەی خۆی لە قەیسەری هەولێر

خانوەکەی ناجیەخان (ئەمڕۆ)

خانوەکەی حاجی عومەر (ئەمڕۆ)

ڕاوەستاوەکان لە چەپەوە: موحسین دزەیی، عومەری عەلی ئاغا، سەعدی دزەیی،
دکتۆر ئەنوەر دزەیی، نوری کانەبی، حوسێن عەلی ئاغا، حەوێز بایز.
دانیشتوەکان لە چەپەوە: ئەحمەد وەیسە، وریا دزەیی، محەمەدی تایەر ڕەشید، عەزیز ڕەشید،
هۆمەر دزەیی

مامۆستا ڕەفیق حیلمی

ڕیزی پێشەوە لە چەپەوە: ئاغای ڕەحمانی، ئەنوەر حەمەدەمین (برای هۆمەر)، بورهان بایز،
شێخ جەبار شێخ عەزیز، شێخ ئەنوەر شێخ عەزیز
ئەوانەی پشتەوە لە چەپەوە: ئەحمەد حەمەدەمین (برای هۆمەر)، عەزیزی شێخە بڵباسی.

ڕیزبوونی بەیانیانی قوتابیان لە حەوشەی قوتابخانەکەمان بۆ سروود و شیعر خوێندنەوە

هۆمەر دزەیی، لەنێوان دوو ئامۆزای عومەری عەلی ئاغا و فارسی عەلی ئاغا
هەولێر 1939

ریزی پێشەوە لە چەپەوە: هۆمەر و براکانی موحسین و سەعدی و نووری کانەبی ئامۆزای.
ریزی پشتەوە لە چەپەوە: قادر ڕەسووڵە کورد، حەسەن عەباس دووگردکانی.

یەکەم قوتابخانەی هەولێر

هەندێ لە مامۆستاکانم

سیۆن دەرویش
(باری کرد بۆ ئیسرایل)

جەمال جەمیل

جیهاد عەبدولڕەزاق

نوری ئەمین

سەلیم بنیامین
(باری کرد بۆ ئیسرایل)

لە ئاغاکانی هەولێری: سوعادی نافیع ئاغا و موسا ئاغای مامی

لە ئاغاکانی دزەیی: حوسێنی عەلی ئاغا (ئامۆزا و خەزووری هۆمەر)

لە ئاغاکانی هەولێری: موحسین ئاغای محەمەد ئاغا

ئەحمەد چەلەبی، یەکێک لە پیاوە گەورەکانی بنەماڵەی دەباغ

لە ئاغاکانی دزەیی: ئەحمەدی حەمەدەمین ئاغا (برای هۆمەر)

هەندێ لە ماڵە ئەشرافەکانی هەولێر لە قەڵا

# بەشی 8

## ساڵانی قوتابخانەم لە هەولێر

## پێشمەرگە دێرینە لەبیر کراوەکانی کوردستان، سێ رووداوی مێژوویی ساڵانی دووەم جەنگی جیهانی

### ئەحمەد عوسمان (ئەحمەد ئەفەندی)

کورد لەوەتەی وشەی پێشمەرگەی خستووەتە ناو فەرهەنگی سەربازی و سیاسییەوەی کە پێم وایە دەبێ لە سەردەمی کۆماری مەهابادا بەدەرکەوتبێ هەر وای لەبەر چاو گرتووە کە پێشمەرگایەتی واتا شەڕکەرێکی بۆ کوردایەتی تفەنگ بە شانەوە. ئەمە تێڕوانینێکی ناتەواوە چونکە راستە پێشمەرگایەتی ئەوەیە بەڵام هەر ئەوەش نییە. تۆ ئەگەر بێتو ئاوڕێک لە مێژووی میللەتان بدەیتەوە بۆت دردەکەوێ کە زمان و قەڵەم زۆر جار لە گوللە کەم کاریگەرتر نەبوونە ئەگەر کاریگەرتر نەبووبن. خۆ زۆر جار هەر زمان و قەڵەم بووین کە رێیان بۆ بەکارهێنانی چەک خۆش کردووە وەک کە لە شۆڕشی فرانسی (1789) و شۆڕشی بۆلشیڤیک (1917) رووی دا. خۆ ئەگەر راستیشت دەوێ هەتا بکرێ باشترە هەوڵ بدرێ بەبێ چەک بگەیتە ئامانجەکانت وەک کە لە (شۆڕشی گوڵان Rose Revolution)ی ئاشتییانەی گورجستان (2003) و (شۆڕشی نارنجی Orange Revolution)ی ئاشتییانە لە ئوکرانیا (2004) سەری گرت. کەس حەز لە شەڕ و کوشتن ناکات و کەسیش حەز ناکات ئەو ئاسنە قورسە لە خۆی بار بکات. گیتارێک سووکترە و جوانترە و

دەنگیشی خۆشترە. ئەگەر هەر چاری نەما ئەوجا با: زمانی بنەڕێنێ، قەڵەمی بگەڕێنێ، تۆپ و تفەنگی بلرمێنێ.

تا ئەوەندەی ئەمن پێی بزانم پێشمەرگایەتیی بنەماڵەی ئەحمەد ئەفەندی لە خودی ئەحمەد ئەفەندی خۆیەوە دەستی پێ کردووە.

ئەفسەری بریتانی ئارنۆڵد. تی. ویڵسن لە کتێبەکەی کە فوئاد جەمیل لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە عەرەبی (بلاد مابین النهرین بین ولائین) و منیش ئەو شوێنانەم کردووە بە کوردی کە مەبەستمە. ویڵسن لە لاپەڕە 258ی عەرەبییەکەدا دەڵێ: "ئەوە بوو کە لە سەرای هەولێر یەک بە دوای یەک چاوم بە وەفدی کوردەکان دەکەوت .... لێرەدا دوو دەمڕاستیان، خورشید ئاغا و ئەحمەد ئەفەندی، بەکورتی پێیان ڕاگەیاندم کە بڕیاریان داوە ئەمن و ئاسایش دابین بکەن و پشتی بەڕێوەبەرایەتیی سیڤیل بگرن. بەڵام ئەمەشیان خستە سەر گوتیان ئێمە دوو شتمان لە ئێوە دەوێ: یەکەم نابێ تورک بگەڕێنەوە بۆ ئەم وڵاتە و ڕێگا بە عەرەبیش نەدرێ حوکمی کورد بکات..."

هەر بۆ زانیاری، خورشید ئاغا مامی من بوو و ئەحمەد ئەفەندیش مێردی پوورم. لەم بیرەوەرییانەمدا ئەمن پێشتریش باسی ڕۆڵی کوردپەروەرانەی ئەحمەد ئەفەندیم کردووە کە دە دوانزدە ساڵ لە پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقیش هێشتا هەر لە پێشمەرگایەتییەکەی خۆی بەردەوام بووە و زۆر بوێرانە و بە بێباکی بیروڕای خۆی بۆ ئینگلیزەکان و دەسەڵاتدارە عیراقییەکانیش دەربڕیوە لە کاتێکدا کە خۆی سەر بە ئینگلیزەکان و لە یەکەم جەنگی جیهاندا پشت و پەنایان بووە دژی تورکە عوسمانییەکان و دواتر ئەندامی ئەنجومەنی پیرانیش بووە لە بەغدا. من ئەمەی خوارەوەم لە لاپەڕە 21 22-ی کتێبی (مصابیح و ظلمات) وەرگرتووە کە محمود ئەحمەد عوسمانی پوورزام کوڕی ئەحمەد ئەفەندی بە عەرەبیی نووسیوە و ئەم چەند بڕگەیەم لێ کردووە بە کوردی. تەواوی کتێبەکە ئیسماعیل بەرزنجی خاڵۆزام تەرجەمەی کوردی کردووە.

"رۆژی شەممەی ڕێکەوتی 1930\8\9 جێگری سەرەک وەزیران جەعفەر پاشای عەسکەری و مەندوبی سامی بریتانی لە کەرکووکەوە چوون بۆ هەولێر و لەوێ لە کاتژمێر دەی پێش نیوەڕۆ لە سەرای حکوومەت (باڵاخانەی پارێزگا) لەگەڵ خانەدان و سەرەک عەشیرەتەکان کۆ بوونەوە. لەوێ جێگری سەرەک وەزیران ئەو بەیاننامانەی خوێندەوە کە پێشتر لە کەرکووکیش پێشکەشی کردبوون و لەپاش ئەو ئینجا مەندوبی سامی هەڵسایەوە و ئەویش بەیاننامەیەکی خوێندەوە کە تیایدا پشتگیری لە ناوەرۆکی بەیاننامەکانی جێگری سەرەک وەزیران کرد. لەپاشان ئەندامی ئەنجومەنی پیران ئەحمەد ئەفەندی عوسمان هەڵسایەوە گوتی: (بەرلەوەی دەست بە قسە بکەم بە پێویستی دەزانم جارێ با سەرەک عەشیرەتەکان بیروڕای خۆیان دەربڕن.) لێرەدا سەرەک عەشیرەتەکان گوتیان ئەوان خدری ئەحمەد پاشا لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی دزەییان دەستنیشان کردووە بەناوی هەموان قسە بکات. ئەویش هەڵستا و گوتی: (ئێمەی عەشایر پشتگیری لە داخوازییەکانی خەڵکی سلەیمانی دەکەین و ئێمە یەکگرتووین و ناکرێ کەرکووک و سلەیمانی و هەولێر لێک جیا بکرێنەوە.) ئینجا دوای ئەو جەنابی ئەعیان ئەحمەد بەگ هەڵستا گوتی: (ئێمەی کورد داوای مافی خۆمان دەکەین و ئەو مافانەش لەلایەن کۆمکاری نەتەوەکانەوە {عصبة الامم} بڕیاری لەسەر دراوە.) لەپاشان رووی قسەکانی کردە جەعفەر پاشای عەسکەری و گوتی: (گەورەم پاشا، ئەتو لەپێناو بەرگریکردنت لە عەرەب دوو پەنجەت قرتاوە، ئێمە بۆ ئەمە رێزت لێ دەگرین. جا ئێمەش مافی خۆمانە گیانی خۆمان لەپێناو مافە نیشتمانییەکانمان بەخت بکەین و هیچ کەسێکیش ئەو مافەی نییە گلەییمان لێ بکات. پێویستە لە ناوچە کوردییەکانی عیراقدا زمانی کوردی لەتەک زمانی عەرەبی ببێ بە زمانی رەسمی."

ئەمە بووە هەڵوێستی کوردپەروەرانەی ئەحمەد عوسمان هەم لەپێش دامەزراندنی عیراق و هەم لە سەردەمی پادشایەتیی دەوڵەتی عیراق

کە جڵەوی عیراقیش بەپێی (انتداب) هێشتا بە بریتانیا سپێردرابوو.

جا هەندێ کەس لەو سەردەمەی کە بریتانیای تێدا گەورەترین سوپەر پاوەر بووە لە دونیا دەیانگوت ئەحمەد عوسمان پیاوی ئینگلیزە. چەند کەمزان بووین ئەوانە! ئەدی ئەمڕۆ دەڵێن چی کە کورد بە میللەت و حکوومەتەکەشیەوە سەر بە ئەمەریکان و خواخوامانە ئەمەریکا مەرحەبایەکمان لێ بکات! بەڵێ راستە کوردمان هەبووە سەر بە ئینگلیز، کوردمان هەبووە سەر بە ئاڵمانیای ناتزی، کوردمان هەبووە سەر بە یەکیەتیی سۆڤییت و کوردمان هەیە سەر بە ئیسرائیل. زۆر ئاسایی و تەندروستیشە هەر کۆمەڵ و چینێکی کورد تێگەیشتن و بیر و بۆچوونی خۆی هەبێ بۆ کێشەی میللەتەکەی با ئەم بۆچوونانە لە یەکتری جیاش بن، بیرمەندی سیاسی ناوداری بریتانی (جۆن ستیوارت میل John Stewart Mill) گوتوویەتی the truth emerges from the clash of opinions واتا (راستی لە پێکدادانی بیروباوەڕانەوە دەردەکەوێ).

کوردە خوێنگەرمەکانی سەدەی رابردوو - لە چەندساڵێکا خۆیشم لەگەڵیانا - هەر وا لە سیاسەت دەگەیشتن کە دەبێ مل لەبەر ملی (ئیستیعمار) بنێیت و تەحەدای بکەیت. لای ئەمان هەموو شتێکی یەمینی (راستڕەو) خراپ بووە و هەموو شتێکی یەساریش (چەپڕەو) باش بووە. کوردە واقیعیەکانی وەک ئەحمەد عوسمان و سەعید قەزاز و توفیق وەهبی و رەشید عارف و فوئاد عارف و زۆر زۆری تریش دەیانزانی کورد بێ رازیکردنی ئیستیعمار ناگات بە هیچ و بە رای ئەوان دەبێ بە جۆرێک یان بە جۆرێکی تر خۆتی لەگەڵا بگونجێنیت. باشترین نموونەش بۆ ئەو بۆچوونە راستەیان دامەزراندنی دەوڵەتە سیستەم پادشایەتیە عەرەبیەکانی ئەمڕۆیە. جا ئەمڕۆ دوای نزیکەی سەت ساڵ وا تازە کورد لەم راستیە گەیشتووە و مەمنوون دەبێت ئیستیعمار لێی رازی بێت و دەپاڕێتەوە بنکەیەکی سەربازیی هەمیشەیی لە کوردستان بکاتەوە. جاران خۆنیشاندان دژی ئستیعمار

دەکرا کە وا تێ گەیەندرابووین گوایا بەنداوی بێخمە بە مەبەستی سەربازی دروست دەکات بۆ ئەوەی (پەیمانی بەغدا Baghdad Pact) لە دژی یەکیەتیی سۆڤییەت بەکاری بێنێ. ئەمڕۆ بارودۆخی جیهان وا دەخوازێ کە کورد بزانێت ئەمەریکا چاک بێ خراپ بێ، ئێمە مەجبووری ئەوین. کورد نە ئیسرائیلە کە دونیا ماستاوی بۆ دەکات، نە ڤیەتنامە چین و یەکیەتیی سۆڤییەتی لە پشت بێت.

بەڵێندەری کوردپەروەر و قسەخۆش رەشید عارف کۆیی لەپاش شۆڕشی چواردەی تەمووزی 1958ی عیراق سەردانێکی لەندەن دەکات لەوێ چاوی بە دۆستێکی کۆنی ئینگلیزی خۆی دەکەوێ ( پێم وایە مەکێنزی بووە) کە لە مام رەشید دەپرسێ: "ئەرێ میستەر عارف ئەوە عیراقییەکان بۆ رۆژانە ئەم هەموو قسەیە بە ئینگلیز دەڵێن ؟" ئەویش دەڵێ: "ئێ هەقی خۆیانە چونکە ئێوە ئیستیعمارتان کردبوون" کابرا دەڵێ: "ئێ باشە کورد بۆ قسەمان پێ دەڵێن؟" مام رەشید دەڵێ: "ئاخر ئەوانیش هەقیانە چونکە ئیستیعمارتان نەکردبوون !". توخوا مایەی داخ و مخابن نییە کە (حافز مستەفا قازی)ی بەڕێوەبەری لەمێژینی نووسینگەی کۆمپانیاکەی مام رەشید کە ئەمیان ئەوەندە باوەڕی پێ هەبوو و مووچەیەکی زۆر چاکی بۆ بڕیبۆوە هەر یەکسەر دوای چواردەی تەمووز بوو بە شیوعی و چووە لای ئاسایشی حکوومەتی قاسم و ئەم بوختانەی بۆ رەشید عارفی چاکەلەگەڵکەرەکەی خۆی هەڵبەستا کە "سەرمایەدارێکی گەورەی جاسووسی ئینگلیز و ئیسرائیلە". مام جەلال و کوردە دەسرۆیشتوەکانی ئەوسا نەبوونایە رەشید عارف ئیعدام دەکرا.

دەبا ئینجا هەڵوێستێکی کوردپەروەرانەی سەعید قەزازیشتان بۆ بگێڕمەوە کە ئەویش لە لایەن هەندێ لە کوردە خوێنگەرمە کەمزانەکانی ئەو سەردەمە بە "کلکی ئیستیعمار" دەخرایە روو.

کاک موحسینی برام بۆی گێڕاومەتەوە کە لە پەنجاکانی سەدەی رابردوو سەعید قەزاز وەزیری ناوخۆی عیراق بوو. دەڵێ سەعید

بەگ پێشنیار دەکات قەزای کۆیە لە هەولێر دابپچرێندرێت و بخرێتە سەر ئیدارەی کەرکووک. دەڵێ شاندێکی هەولێری و کۆیی بریتی لە ئەشراف و عەشایر و رۆشەنبیر کە خۆیشی لەگەڵیانا دەبێ دەچنە لای سەعید قەزاز و پێی دەڵێن بە هیچ جۆرێک ئەم پێشنیارەیان قەبووڵ نییە و چۆن سەعید بەگ دڵی هاتووە ئەمە بکات. دەڵێ لەوەراما سەعید قەزاز پێی گوتن براینە هەندێ شت هەیە ئێوە ئاگاتان لێی نییە. ئەوە چەند ساڵێکە حکوومەت بەخشکەیی و بەبێ هەرا خێزانی عەرەب یەک بەدوای یەکدا دەگوازێتەوە بۆ کەرکووک و لەوێ نیشتەجێیان دەکات بۆ ئەوەی دیمۆگرافی دانیشتوانی لیوای کەرکووک بگۆڕێنێت و ئیتر کورد لەوێ زۆرترایەتییەکەی لەدەست بدات. جا دەڵێ سەعید قەزاز کە هەست بەم سیاسەتە لەبن عەبایەی عیراق دەکات ئەویش بۆ ئەوەی ئەو سیاسەتی عەرەباندنە (تەعریب) پووچەڵ بکاتەوە کە حکوومەتی عیراق نەخشەی بۆ کێشابوو هەڵدەستێ ئەم پلانە پێشکەش دەکات کە کۆیە نزیکی کەرکووکە و وا باشە بخرێتە سەر ئەو شارە. نیازی سەعید قەزاز ئاشکرا و دیارە کە لەبەرامبەر هەوڵی عەرەباندنی کەرکووک ئەویش پلانێکی کوردادندنەوەی کەرکووکی لەبەرچاو گرتووە تاکو تای تەرازووی دیمۆگرافی هەر بەلای کوردا لاسەنگ بمێنێتەوە.

خوێنەری خۆشەویست ئەگەر ئەمە هەستی کوردایەتی و دڵسۆزی بۆ کوردستان نەبێ ئەدی چی ناو دەنێیت؟ ئێمە هەڵە دەکەین ئەگەر هەر کەسێک پۆستێکی باڵای لە دەوڵەتی عیراقا هەبووبێ بە پیاوی بێگانەی دابنێین. لە قۆناخی پێش سەربەخۆیی کوردستان ئێمە لە بەغداش پێویستیمان بە هەبوونی ئەم توێژە کوردییە هەر دەبێ کە بەلای منەوە بەشێکی تەواوکەری بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردییە نەک هەڵستین بە ئەقڵییەتی مندالانەی خوێنگەرم زوڵمیان لێ بکەین و لە خۆمانیان بتۆرێنین.

جا با بگەڕێمەوە بۆ لای ئەحمەد ئەفەندی. خۆشبەختانە، هەر لەم

یەکدوو رۆژانە، ئاراز خانی نەوەی ئەحمەد عوسمان، کچە بچکۆلەی عزەدینی مەلافەندی ئەم زانیارییە نوێیانەی بۆ ناردم لەبارەی هەڵوێستی کوردپەروەرانەی ئەحمەد عوسمانی باپیری.

مێژوونووسی عێراقی بە بنەچە تورکمان نەجدەت فەتحی سەفوەت کتێبێکی بە عەرەبی لەسەر سالح جەبر نووسیوە کە لە سەردەمی پاشایەتیی عێراق وەزیری ناوخۆ و دارایی و دواتر سەرەک وەزیرانیش بووە.

. لەم چاپتەرەی کتێبەکەیدا نووسەر باسی کێشەی کورد دەکات بەتایبەتیش باسی سەرهەڵدانەکانی شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلامستەفای بارزانی کە ئەوسا ئەحمەد عوسمان نوێنەری هەولێر بووە لە پارلەمانی عێراقی.

ژمارەی لاپەڕەی کۆپیی کتێبەکەم بۆ دەرنەکەوتووە کە بەڕێز نەجدەت فەتحی سەفوەت تیایدا دەڵێ، ئەمە کوردییەکەیەتی:

"پرسی کورد لە ساڵەکانی دواترێ پەرەسەندن و رووداوی زۆری بە خۆیەوە دی. هەر بۆ نموونە لە ساڵی 1945 ئەحمەد عوسمان پارلەمەنتاری هەولێر بوو و لە دانیشتنی رۆژی 10ی کانوونی دووەم (یەنایر) قسەی لەسەر پرسی کورد و یەکیەتیی عێراقی و یەکیەتیی عەرەبی کرد و ئاماژەی بە کەمتەرخەمیی حکومەت دا لە کاروباری باکوری وڵات و گوتی (ئێمەی کورد دڵخۆش دەبین بە دامەزراندنی یەکیەتیی عەرەبی تاکو لەگەڵ حکوومەتێکی پەنجا ملیۆنی بژین لەباتی حکوومەتێکی پێنج ملیۆنی، گوتیشی کۆکردنەوەی بڕێ پارە بۆ بارزانییە هەژارەکان تاوان نییە... ئێمە هەڵوێستی مرۆڤایەتیی عەرەبەکانی باشوور بەرامبەر بە کورد لەبیر ناکەین...")

ئینجا نووسەری کتێبەکە پێیدا دەچێت و دەڵێ:

ئەمەش کوردییەکەیەتی:

(لە هەمان دانیشتنا ساڵح جەبر کە ئەوسا وەزیری دارایی بوو وەرامی دایەوە گوتی: "... بەڕێزان، بەرلەوەی قسەکانی خۆم تەواو

بکەم دەمەوێ تێ بینیی خۆم بدەم لەسەر ئەو وشانەی کە لە پارلەمێنتاری بەڕێز ئەحمەد عوسمانم بیست. وشەکانی بەڕاستی منی هەژاند و لەو باوەڕەم کە تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنیشی هەژاندبێ. ئەمن ئەو هەستە جوانەی بەرز دەنرخێنم کە باسی بابەتی کورد و عەرەبی کرد. بەڕێزان، هیچ یەکێک لە ئێمە ناتوانێ نکۆڵی لە هەقی کوردەکان بکات هەستی نەتەوەیی خۆیان دەربڕن و شانازی بە نەتەوایەتیی خۆیان بکەن و بە مێژوو و گەورەیی و خەسڵەتەکانی خۆیاندا هەڵبڵێن..."

دیارە سالح جەبر تەنیا چەند رستەیەکی کەمی وەک نموونە لە گوتارەکەی ئەحمەد عوسمان هێناوەتەوە کە ئەمیان پێشتر پێشکەشی کردبوو. ئەمن تەواوی گوتارەکەی ئەحمەدعوسمانم لەبەردەستدا نییە، بەڵام تۆ ئەگەر هەڵوەستەیەک لەسەر قسەکانی سالح جەبر بکەیت و بەوردی لەنێوان دێڕەکانی رابمێنێیت تێ دەگەی ئەحمەد عوسمان چی گوتووە. هەر ئەو چەند وشە ناسکە پڕ سۆزەی کە وەزیری دارایی سالح جەبر وەک کۆمێنت لەسەر گوتارەکەی پێشتری ئەحمەد عوسمان بەکاری هێناون هەر ئەوە خۆی گەواهێکە کە دەبێ ئەو پیاوە بەوپەڕی سۆز و خرۆش و زیرەکی و دووربینییەوە باسی کێشەی کوردی کردبێ. راستە نە من و پێم وایە نە زۆرترایەتیی کوردی ئەمڕۆش لەگەڵ ئەو بۆچوونە نین کە: "باشترە بۆ کورد لەگەڵ پەنجا ملیۆن عەرەب نەک پێنج ملیۆن عەرەبا بژیت". بەڵام لە قسەکانی سالح جەبر دەردەکەوێ کە لەو ساڵانە پرسی (الوحدە العربیە) لە ئارادا بووەو دیارە لە پارلەمانی عێراقیش باسی لێوە دەکرا. جا سیاسەتکارێکی بەئەزموونی وەک ئەحمەد عوسمان کە ئەندامی پارلەمان بووە لە بەغدا خۆ نابێ بۆ ئەو سەردەمە ناسکەی دوای جەنگ کورد وا پیشانی رای گشتیی عەرەبی عێراقی بدات وەک لەمپەر و رێگر لە یەکیەتیی عەرەب. ئەو زۆر حەکیمانە و زیرەکانە هاوسۆزی کوردی لەگەڵ کێشەی وەحدەی عەرەبیدا دەربڕیوە بۆ ئەوەی ئەوانیش

هاوسۆزییان لەگەڵ پرسی کوردا لا بچەسپێ. سیاسەتیش هەروا بووە و دانوسەندن ستوونێکی بنچینەییەتی.

ئەدی لە سەردەمی بانگەوازی جەمال عەبدولناسریش بۆ (الوحدة العربیة)، پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەو زەمانە و ژمارەیەکی زۆری کوردی عێراق ئەوانیش هەر پاڵپشتی ناسر نەبوون و رۆژێک دژایەتییان بۆ وحدەی عەرەبی دەردەبڕی؟ هیچ رۆژێک شۆڕشی ئەیلوولیش دژایەتیکردنی وەحدەی عەرەبیی بەسەر زارا نەهاتووە بەڵکو مەرجی خۆی هێناوەتە ئارا کە بەشی کورد لەناو ئەم وەحدە عەرەبییەدا دیاری بکرێت.

دڵنیام لەوەی کە ئەحمەد عوسمانێکی قاڵبووی سیاسەت لەگەڵ عوسمانییەکان و بریتانییەکان و عەرەبەکان ئەویش هەر شتێکی وای لەژێر زمانیدا هەڵگرتووە و قسەی سەر زمانیش لە هەندێ دۆخ و هەلومەرجی ناسکدا مەرج نییە تەعبیر لە بن زمانت بکات. چما ئەحمەد عوسمانێکی یەکەم پارێزگاری هەولێر و دواتر هی سلێمانی و دواتر سیناتۆر لە ئەنجومەنی پیرانی عێراق و تا رۆژی مەرگیشی نوێنەری هەولێر لە پارلەمانی عێراقا نەیدەزانی کورد لەناو پێنج ملیۆن عەرەبا قورسایی خۆی دەبێت بەڵام لەناو پەنجا ملیۆندا کەس حیسابی بۆ ناکات! ئەدی سیاسەت چییە! خۆ نابێ لە هەموو هەلومەرجێکدا دوژمنایەتی خۆت ئاشکرا بکەیت.

نابێ ئەحمەد عوسمان و فەیسەڵ و زەیدی کوڕانی، کە هەر ئێستا لە خوارترەوە دێمە سەر چیرۆکی ئەم دوو پێشمەرگە دێرینە لەبیرکراوانەش، ببن بە سەربازی بێ سەروشوێن. پێویستە شوێنی شایەستەی خۆیان لەناو کتێبەکانی مێژووی کوردا بۆ تەرخان بکرێت. شەرمە مێژووناسانی کورد بەسەر ئەو تێکۆشەرانەدا باز بدەن. ئەدی شوورەیی نییە ئینگلیز و عەرەب و تورکمان رۆڵ و هەڵوێستی ئەو کوردپەروەرانە لە کتێبەکانی مێژووی خۆیاندا تۆمار بکەن کەچی کورد خۆی لێی بێ ئاگا بێ!

لە وشەی دواییمدا لەسەر ئەم بنەماڵە کوردپەروەرە دێرینە دەمەوێ سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆ ئەم خزمە خۆشەویستانەم دەربڕم بۆ ئەو کەرەستە و زانیارییانەی کە بۆیان بەردەست کردم: کاک مەحمودی ئەحمەد عوسمانی برای فەیسەڵ و زەید، کاک هۆشمەندی کوڕی کاک زەید، کاک دلاوەری کوڕی کاک فەیسەڵ، ئارازخانی کچی عزەدینی مەلا ئەفەندی نەوەی ئەحمەد عوسمان، کاک تەواری کوڕی ئاراز خان، کاک دکتۆر عەبدوڵا دەباغ و کاک نەجاتی موحسین ئاغا و تاراخانی شێخ ئەنوەری بەرزنجی نەوەکانی ئەحمەد عوسمان، تاراخانی کچی کاک زەید و کاک ئیحسان موفتی هاوسەری کە ئامۆزای باوکیەتی، کاک نەوزاد و کاک فوئادی کوڕانی ئەحمەد عوسمان.

ئەمە بوو ئەحمەد عوسمان (ئەحمەد ئەفەندی هەولێری). پیاوێکی قاڵبووی سیاسەت و ئیدارە کە هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانا شارەوانی هەولێر بووە و یەکێک بووە لە پشتوپەنای هێزەکانی بریتانی بۆ وەدەرنانی تورکە عوسمانییەکان لە هەولێر. پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقیش ئینگلیزەکان دەیکەن بە یەکەم موتەسەڕیف (پارێزەر)ی هەولێر و دواتریش هی سلەیمانی کە لەوێ ناوبژی لە نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیزەکان دەکرد. لەپاشان بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (مجلس الاعیان) لە بەغدا و دوا پۆستیشی هەتا لە ساڵی 1946 کۆچی دوایی کرد نوێنەری هەولێر بوو لە پارلەمانی عیراقی. سیاسییەکی ئەزموونداری لێهاتوو و لێوەشاوە کە بریتانییەکانیش ڕێزیان بۆی هەبوو لەبەر راشکاوی و هەڵوێستی مەبدەئیانەی بۆ کێشەی میللەتەکەی خۆی بێ پەنابردن بۆ چەک.

بۆیە ئیتر دەمی هاتووە ئەم قسە مۆدە بەسەرچووانە بنێین بەلاوە و پەردەی فەرامۆشی لەسەر ئەو پێشمەرگە دێرینانەی خۆمان هەڵدەینەوە و رۆڵی ئەو رۆڵە کوردپەروەرانەمان بنرخێنین و بیانخەینە شوێنی شایەستەی خۆیان لەناو کتێبی مێژووی کوردستانا. هەر وەکوو

لەسەرەوەش باسم کردووە کوردایەتی و نیشتمانپەروەری هەر تەنیا بە تەقەی تفەنگ نەکراوە. رۆڵی زمان و قەڵەم و سیاسەتکردنی پشت پەردە ئەگەر لە چەک کاریگەرتریش نەبووبێ کەمتر نەبووە و ناشبێ.

## سێ ڕووداوی مێژوویی ساڵی 43 لە کوردستان

ساڵی 1943کە من لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بووم و هەمووی هەر چەند مانگێک دەبوو چووبوومە هەولێر و قوتابخانە، ساڵێکی پڕ لە ڕووداوی سیاسی بوو بۆ کورد. لێرەدا ئەمن باسی سێ ڕووداوی مێژوویی ئەو ساڵە دەگێڕمەوە کە خۆم کەم شتێکم لەبارەیانەوە بە چاوی خۆم دیوە و بەبیرم دێت و دواتریش زانیاریی پترم لەسەریان کۆ کردەوە و وردەکاریم لەملا و لەولا پەیدا کرد و بیروڕا و تێبینیی ئێستای خۆشم خستۆتە پاڵ.

## ڕووداوی یەکەمی ساڵی 43، لە هەولێر:
## خۆکوشتنی فەیسەڵی ئەحمەد ئەفەندی پوورزام

فەیسەڵی جوانەمەرگ رۆڵەی ئەو کەڵە پیاوە بوو کە هەر ئێستا لە سەرەوە باسم دەکرد. فەیسەڵ کوڕە گەورەی کەسایەتیی ناوداری هەولێر بۆ ماوەی نزیکەی تەواوی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئەحمەد عوسمان بوو کە بە ئەحمەد ئەفەندی ناسراو بوو. هاوسەری ئەحمەد ئەفەندیش (دایکی فەیسەڵ) نەعیمەخانی شێخ مارفی بەرزنجی بوو و خوشکی گەورەتری دایکی من بوو و نەوەی شێ حەسەنی گلەزەردە بوون.

فەیسەڵ (1922-1943) گەنجێکی ڕەنگوڕوخسار جوانی تەمەن بیستویەکدوو ساڵی بووە و لە پۆلی دوو یان سێی (کۆلێژی ڕەوا)

ی زانکۆی بەغدا بووە. هەرچەندە کە لەگەڵ منا پوورزای هەقیش بووین بەڵام ئەمن کاک فەیسەڵم بەبیر نایە، هەنگی ئەمن منداڵ بووم و ئەویش بۆ خوێندن لە بەغدا بووە. بەڵام لەملاو لەولام بیستووە کە کوردێکی زۆر ناسیۆنالیستی زەمانی خۆی بووە و زۆر ڕێی تێ دەچێ کە تەبای ڕۆشەنبیرانی ئەو سەردەمە دەبێ ئەویش ئەندامی حزبی (هیوا)ی ناسیۆنالیست بووبێ.

کاک مەحمودی برای بۆی گێڕاومەتەوە دەڵێ ئەو بەبیری دێ کە ڕەفیق حیلمی سەرۆکی حزبی هیوا زوو زوو دەهاتە لای فەیسەڵی برای لە ماڵەکەیان لە قەڵای هەولێر. مەحمود هەروەها دەڵێ کە عەلائەدین سەجادیش هەمیشە سەردانی فەیسەڵی کردووە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە فەیسەڵ دەبێ هەم چالاکیی سیاسیی حزبایەتی و هەم ڕۆشەنبیریی بووبێ، چونکە پێم وایە سەجادیش ئەو وەختە کۆڤاری (گەلاوێژ)ی دەردەکرد. بەداخەوە کەسێکی وا نەماوە کە هاوزای فەیسەڵ بێت و زانیاریی زیاتری لەسەر ئەو کوردە نیشتمانپەروەرە لێ بزانین. بەڵام چەند بەڵگەیەکی تری نووسراوی زۆر ڕوونمان لەبەر دەستایە کە فەیسەڵ چۆن کوردێکی نیشتمانپەروەر بووە.

کۆڤاری گەلاوێژ (ژمارە 2 ساڵی 5) کە دەکاتە ژمارەی شوباتی 1944 یادئاوەرییەکی لاواندنەوەی پڕ لە سۆز و خەم و پەژارەی برادەرێکی خەڵکی سلەیمانی فەیسەڵی بڵاو کردووەتەوە کە بەبۆنەی تێپەڕبوونی یەک ساڵ بەسەر خۆکوشتنی فەیسەڵا نووسیویەتی. بەداخەوە نووسەر تەنیا تیپێکی ناوی خۆی لەژێر نووسینەکەیدا بەجێ هێشتووە (هـ..) و باوەڕ ناکەم کەسێکی وا مابێت بزانێ نووسەرەکە کێ بووە. ئەمن ڕەملم بۆ (فائیق هوشیار) دەچێ. نازانم.

ڕاستە نووسینەکە زۆر درێژە پێنج لاپەڕەی کۆڤاری گەلاوێژی گرتووەتەوە، بەڵام بایەخێکی مێژوویی پتر لە حەفتا ساڵ کۆنی لێ دەتکێتەوە و وێنەیەکی ڕوونی نەک هەر هی کەسایەتیی فەیسەڵ خۆی، بگرە هی ئەو برادەرە نووسەرە زمان پەتی و پاراوە بیر

وردبینە بێناوەی فەیسەڵیشمان دەخاتە بەرچاو. بۆیە ئەمن زۆر بە پێویستی دەبینم ئەم سەردولکە و لاواندنەوە پڕ لە ئەشک و ئەسرینە لە گەردی مێژوو داتەکێنم و تەواوی دەقی ئەم نووسینە حەفتاودوو ساڵ کۆنە سەرلەنوێ لەم بیرەوەریانەمدا بەسەر بکەمەوە. ئەمەش دەقەکەیە کە من بە ڕێنووسی ئەمڕۆم نووسیوەتەوە. سەرنجێکی ورد بدەنە ئەم کوردییە جوانەی ساڵی 1944.

برای کۆچ کردووم

"پار لەم مانگەدا کە لە گەلێ شوێن تازە نەمام ئەپشکوێ و گوڵ ئەگەشێتەوە و گیاندار ئەژیەتەوە و بێ گیان ئەبووژێتەوە، لەو حەلەدا نەونەمامێک وشک بوو، گوڵەباخێک هەڵوەری، دایکی نیشتمان جگەرگۆشەیەکی لێ ون بوو کە لاوێکی ژیر و گەنجێکی تازەپێگەیشتووی نێژرا و خرایە ژێر گڵەوە. وا لە یادی ساڵانەیدا ئەم یادەی ئەکەمەوە."

هـ.....

14-13 ساڵێ لەمەوبەر لە خوێندنا هێشتا لە ئەلفوبێدا بووم، سەری ساڵی خوێندن بوو ڕۆژێ کە چوومە ژووری دەرسخانەوە روانیم قوتابییەکی نەناسیاو لە نزیکمەوە دانیشتبوو. دوای پرسیار زانیم کە ناوی (فەیسەڵ)ە و لە شارێکی تری کوردستانەوە هاتۆتە سلەیمانی. پاش چەند ڕۆژێ بووین بە دەستەبرا و هەر وەک دوو منداڵ بووین بە هاوڕێ. ئینجا نازانم ساڵێکمان بردەسەر یان نە، لێک دوورکەوتینەوە و لەبیر یەک چووینەوە. چەند ساڵێک تێ پەڕی، لە بەغدا بووم، گەیبوومە دووەم ساڵی خوێندنی (ثانوی). سەری ساڵ بوو تازە مەکتەب دانرابووەوە ڕۆژێکیان لە ژووری دەرسخانە دانیشتبووم قوتابییەک هاتە ژوورەوە و بەرێکەوت لە ریزی پێشەوە لە تەنشت منەوە دانیشت کە سەیری یەکتریمان کرد سەرسامییەک گرتینی و تێر بە یەکتردا هەڵمانڕوانی، توومەز هەر وەک من شێوەی ئەوم کرد ئەویش شێوەی منی کردبوو و یەکتریمان ناسییەوە و

دەستی یەکتریمان گوشی و چۆنی و چاکیەکی گەرم و گوڕمان کرد. بەڵێ ناسیمەوە ئەو هاوڕێیەی منداڵیم بوو کە باسم بۆ کردن وا ئێستا بە یەک شاد بووینەوە، بەڵام گومانی نییە کە فەیسەڵی ئەمجارە فەیسەڵی جاری پێشوو نەبوو. لەو ڕۆژەوە یەکترمان گرتەوە بووینەوە بە برایەکی گیانی بەگیانی و دوای (ثانوی)یش پێکەوە چووینە حقوق تا گەیشتینە سێیەم ساڵ. لەم چەند ساڵەدا بۆم دەرکەوت کە (فەیسەڵ)ی ئەمجارە قوتابییەکی زیرەک و ئیشکەر و گەنجێکی ڕاستگۆ و ژیر و کوردێکی ڕاست و نیشتمانپەروەر بوو. خوویەکی پاک و ڕەوشتێکی خاوێنی هەبوو. لەگەڵ ئەوەدا کە ماوەی ئەوەی نەئەدا لە خوێندن و قوتابخانە دوا بکەوێ هەرواش هەمیشە بیری لە خزمەتی نیشتمان و یارمەتیی هەژاران و دەستگرتنی دەستکورتان ئەکردەوە و حەزی بە چاکەکردن ئەکرد، تا لە توانایشیا بوایە و پێی بکرایە ئەوەی لە دڵیا بوایە بە کردەوەش دەری ئەبڕی.

ئێستاش وێنەی کردەوە پەسندەکانیم لەبەر چاوە، ئێستاش ئەو ڕۆژەم لە یادە کە لێرە لە قوتابخانەی (ثانوی مرکزی) لەبەر بەرۆچکەکە وەستابووین چەند قوتابییەکی کەشمان لەگەڵدا بوو کە لە خۆمان نەبوون ئەم گەلاوێژەی کەوا ئێستا ناوی (فەیسەڵ)ی لە پەڕی دڵیا نووسیوە تازە دەرچووبوو. فەیسەڵ ژمارەکەی خۆی بەدەستەوە بوو لە دەستی کەوتە خوارێ بەڵام گورج هەڵیگرتەوە و تەکاندی و پاکی کردەوە. یەکێ لە قوتابییەکان پێی وت: بۆچ وا بە پەرۆشەوە هەڵتگرتەوە؟ وا وەرامی دایەوە کە گەلاوێژەکەی ماچ کرد و وتی: ئەمە تاقانە ئەستێرە گەشەمانە و تازە هەڵاتووە بە تیشکی پرشنگەکانی ڕێگای یەکیەتی و پێشکەوتن و سەرکەوتنمان بۆ ڕووناک ئەکاتەوە لەبەر ئەوە نەک هەر هەڵیگرمەوە بەڵکو پێویستە ماچی کەم و لەسەر سەرمی دانێم..، هەروا لەپێش چاومە کە چۆن هەمیشە هەوڵی ئەدا بۆ کۆکرنەوەی نووسراوی کوردیی دەسنووس و چاپکراو وە تا بیتوانییایە یارمەتیی بڵاوبوونەوە و سەرکەوتنی نووسین و چاپی کوردیی ئەدا. تا

شیری بڕی بکردایە خەریکی ئەوە بوو لە هەموو ئادەمیزاد بگەیەنێ کە نابێ بە چاوێکی سووک بڕوانینە کەمدەستان و لێقەوماوان...

تا پاریش پێکەوە بووین. بەڵێ پار بوو، هەر وا ئەزانم دوێنێیە، کە (تعتیل)ی نیوەی ساڵمان بوو ئەڕۆیشتمەوە بۆ سلەیمانی تا سەر شەمەندەفەریش لەگەڵما هات. کە کەوتمە ڕێ وتی: بەم زووانە یەکتری ئەبینینەوە. کەچی هێشتا نەگەڕابوومەوە ڕۆژێ لەناکاو دەنگێ هاتە گوێم کە ئەیگوت: فەیسەڵ مردووە. بەڵام هەروەک چاو شوێن دەنگەکەی نەئەبینی هەروا دڵیش بڕوای نەکرد. تا پاش چەند ڕۆژێ هاتمەوە چوومە مەکتەب چاوم گێڕا فەیسەڵ دیار نەبوو. ڕوانیم هەموو هاوڕێکان ڕەنگ هەڵبزڕکاو و لێو بەبار و کش و ماتن. تێگەیشتم کە ڕاستە و بە ڕاست گەڕا.

ئەرێ هۆ برای کۆچ کردووم!... ئەرێ هۆ فەیسەڵ!... لەبیرتە کە پار لەم ڕۆژەدا بەڵێنت دامێ یەکتری ببینینەوە؟... من هاتمەوە کەچی تۆ نەبوویت! بەتەمات کردم هەر دیار نەبوویت!.. ساڵێکیش تێپەڕی هەر دەر نەکەوتیت! وا گشت هاوڕێکانت بانگت ئەکەن و هاوارت ئەکەنێ و ئەڵێن:

"هەر وەک خۆت هەستت کردبوو و بارەها ئەتوت، دایکی نیشتمان چاوەڕێمانە، چاوی لێمانە و هیوای پێمانە، وا بەم زووانە ژیانی قوتابخانە جێ دێڵین و ماوەمان ئەبێ، لەسەرمان پێویستە لە خەو هەستین، چاو هەڵبێنین و بە دەوروپشتی خۆماندا بڕوانین ئینجا بازووی لێ هەڵکەین، سەری لێ هەڵبڕین و هەنگاوی هەڵنێین، بێ پشوودان و ئاوڕدانەوە بەرەو پێشەوە و بۆ پێشکەوتن، لە ڕێیەکی ڕاستەوە و ڕووەو ئامانجێکی بەرز، بە ژیری و دڵپاکی خزمەت کەین بەڵام خزمەتێکی ڕاست و بەردار. ئینجا دە تۆش وەرەوە بمانگەڕێ، لەسەرت وەستاوین!.."

بەڵام بێ سوودە، نایەتەوە، وەرامیش ناداتەوە چونکە کۆچەکەی کۆچێکی دواییە و گەڕانەوەی نییە.

نازانم بۆچ خۆت کوشت، بۆچ جێت هێشتین؟ ئایا لە لێقەوماوی و بەشخوراوی و دواکەوتەیی قەومەکەت ژیانت لا تاڵ بوو بوو؟ یاخود بەم چەند ساڵە لە خراپی و ناپوختەیی ژیانی سەرزەمین دڵت هەڵئەنگوت؟ یا لە نارێکیی گوزەرانی ئادەمیزاد بێزار بوویت؟ یان نەتتوانی بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆت بجووڵێتەوە؟ لەبەر هەرچییەک بێ و نەبێ هەرچەند ناتوانم رەخنەت لێ گرم بەڵام ئەوەندە ئەڵێم کە پەلەت کرد، کاشکی تاوێکی تریش دانت بەخۆتا بگرتایە و بتزانییایە ئەتوانی ئەم چەوتییانە راست کەیتەوە یان نە!

کاک فەیسەڵ! ... هاورێکانت ناچارن و هەر ئەوەندیان لەدەست دێ کە ئەمجارەش بانگت کەنەوە و پێت بڵێن:

وا نەزانی مردووی!... تۆ هەر زیندووی! لە دڵماندا جێگیر بووی، گیانی پاکت هەمیشە لامانە و ناوی پیرۆزت لەسەر زبانمانە و کردەوە باڵاکانت لەبەر چاومانە و داخی رۆینیشت لە دڵمانە!

کاک فەیسەڵ!... لەم مانگەدا کەوا ساڵێکە کۆچت کردووە، لەگەڵ گشت هاوڕیکاندا ویستمان یادێکت بکەینەوە، بەڵام ئەبێ لێم ببووری کە نەمتوانی وەک خۆم ئەمەوێ و چی لەتۆ ئەزانم بینووسم، چونکە بەدەس خۆم نییە وا دەستم کەوتە لەرزین، لەبەر فرمێسک چاویشم نووسینەکە نابینێ، گوێم نابیسە و مێشکیشم وەستا...، بمبەخشە!... تا ئێرەم هێنا وا لێرەدا نووکی خامەش شکا...

---

لاواندنەوەکەی ناو کۆڤاری گەلاوێژ لێرەدا بە کۆتایی هات. بەڵام با بزانین شاعیری گەورە پیرەمێرد ئەو فەیسەڵی ئەحمەد ئەفەندیی چۆن لاواندووەتەوە.

بۆ (فەیسەل)

هەورێکی سوور لە کاولی وەتەن کەوتە گرم و هوور

دایڕشت بە شین و گریەوە فرمێسکی خوێنی سوور

وامزانی پێشڕەوێکی گوڵاڵەی بەهارییە

گوڵی نەورۆزە، بەرگی سووری کوردەوارییە

هەی ڕۆ! توومەز گوڵاڵە نەبوو، خوێنی لاوێک بوو

هەڵکەوتوویەک بوو بۆ هەموو کورد نووری چاوێک بوو

لەم کاتەدا کە گوڵ لە هەموو لاوە دەپشکوێ

کوێر بی فەلەک لە تازەگوڵی ئێمە چیت ئەوێ؟!

چرایەک بوو بۆ نیشتمان، خۆی بەو هیوایەوە

ئەیویست ڕووناکی بنوێنێ، ئاخ زوو کوژایەوە!

توخوا کوڕینە سا تێر بگرین شینی فەیسەڵە

ئەو خوێنەی وا ڕژاوە هیوای کوردی تێکەڵە

کۆمەڵ غەزایە، ماتەمە، شینە لەناو گەلا

تاریخییە: فەیسەڵە چووە بۆ خزمەتی مەلا.

ئێستا ئەوەی کە زیاتریش هانم ئەدات بڵێم نووسەری لاواندنەوەکەی ناو کۆڤاری گەلاوێژ ڕەنگە هەر فائیق هوشیار بووبێ نەک هەر لەبەر ئەوەی کە ئەمیش لە سەرەتای چلەکان لە کۆلێژی ڕەوا بووە لە زانکۆی بەغدا، بەڵکو بەکارهێنانی هەندێ وشە و جۆری بیرکردنەوەی نووسەرەکەشە کە لە شیعرەکەی پیرەمێردیش بەدی دەکرێت. پیرەمێرد دەڵێ: "لەم کاتەدا کە گوڵ لە هەموو لاوە دەپشکوێ، کوێر بی فەلەک لە تازەگوڵی ئێمە چیت ئەوێ؟!" نووسەرەکەش دەڵێ: "پار لەم مانگەدا کە لە گەلێ شوێن تازە نەمام ئەپشکۆێ و گوڵ ئەگەشێتەوە..". لەبیریشمان نەچێ کە فائیق هوشیار نەوەی پیرەمێرد بوو، کچەزای بووو بۆیە دوور نییە لە نووسیندا کەوتبێتە بەر کاریگەریی باپیرییەوە بەتایبەتی کە بابەت برادەرێکی خۆشەویستی جوانەمەرگی خۆی بووبێت. هەرچۆنێکی بێ هەروەکوو پێشتریش

گوتم ئەمە هەر رەملم بوو و بەردەوامیش بە دوای راستیەکەدا هەر دەگەڕام. تا، خۆشبەختانە، بە رێگای کاک شوانی ئەحمەد زرنگەوە کە ئەمیان برازای فائیق هوشیارە دەرکەوت، بەڵێ راستە ئەم (هـ..)یە فائیق هوشیاری مامی بووە. کاک شوان پێی گوتم کە ئەو زەمانە مامی گوتارەکانی خۆی بە سێ ناوی جیاجیا بڵاو دەکردەوە: (فائیق هوشیار)، (ف. هـ)، (هـ..). سوپاس و پێزانینی بێ پایانم ئاراستەی کاکە شوانی خۆشەویستم دەکەم کە گرێکۆرەیەکی مێژووی بۆ کردینەوە. منەتباری کاک مەحمودی ئەحمەد ئەفەندیی پوورزاشمم (برای فەیسەڵی جوانەمەرگ) کە ئەم دوو وێنە مێژووییەی فەیسەڵ و نەفیسەخانی هاوسەری بۆ ناردووم.

تێبینی 1-: لەکاتی خۆیدا ساغ نەبووەوە کە فەیسەڵ لە رۆژی 1943/3/6 خۆی کوشتووە یان کوژراوە. زانا و کەسایەتیی ناوداری هەینێکەش جەنابی مەلافەندی کە ئامۆزای بابی فەیسەڵ بووە، ئەویش چل رۆژ بوو کۆچی دوایی کردبوو جا دوا میسراعی شیعرەکەی پیرەمێرد ئەو تاریخە تۆمار دەکات.

خوێنەری خۆشەویست، سەرنجێ بدەرە پیرەمێرد کە دەڵێ:

چرایەک بوو بۆ نیشتمان، خۆی بەو هیوایەوە
ئەیویست رووناکی بنوێنێ، ئاخ زوو کوژایەوە
توخوا کوڕینە سا تێر بگرین شینی فەیسەڵە
ئەو خوێنەی وا رژاوە هیوای کوردی تێکەڵە.

ئایا پڕ بە دونیایەک کوردایەتی لەم چەند وشە کەمانەدا هەستی پێ ناکرێت؟

لە کاتی ناشتنی تەرمی فەیسەڵ لە هەولێر محەمەد حەسەن دزەیی شیعرێکی لاواندنەوەی شاعیرێکی دیسان نەناسراوی خوێندووەتەوە کە شاعیرەکە ئەویش هەر تەنیا بە دوو تیپ ناوی خۆی دانابوو و ئەویش کەس نازانێ کێ بووە. ئەمن تەواوی شیعرەکەم لابوو بەڵام جارێ بۆم نادۆزرێتەوە تەنیا ئەم چەند دێڕەیم - ئەویش بە بێ سەروبەری

- لەبیر ماوە:

ئەی میللەتی کورد ئەی شێری ئازاد
بگرین بناڵن بۆ فەیسەڵ فەریاد

..............

هەر با بگرین هەر بکەن قولە
(نازانم لێرە مەبەست لە قولە چییە)
غازی و فوئاد و نەوزاد و خولە
ئەم چوار ناوەی دوا دێڕەکە هەرچواریان لەگەڵ زەیدی، دوای
فەیسەڵ، برا گەورەیان هەموویان برای فەیسەڵن.
سوپاسی زۆرم بۆ دلاوەری تاکە رۆڵەی کاک فەیسەڵ هەیە کە ئەم
بەڵگانە و وێنە جوانەکەی باوانی خستە بەردەستم.

**زەید ئەحمەد عوسمانی پوورزام، برا بچووکتری فەیسەڵ ( 1978 - 1924)**

لە سەرەوە باسی یەکێک لە بنەماڵە پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان، بنەماڵەی ئەحمەد عوسمانم کرد لە هەولێر کە بە ئەحمەد ئەفەندی ناسراو بوو و هەڵوێستی کوردپەروەرانەی خودی ئەحمەد ئەفەندی و فەیسەڵی کوڕە جوانەمەرگەکەیم بەپێی ئەو بەڵگە بریتانی و کوردییانە و ئەو زانیارییانەی کە خۆم دەستم کەوتوون خستە روو. بەڵام کاروانی ناسیۆنالیزمی کوردی لەپاش ئەو باوک و کوڕە پەرتەی لێ نەکرد. شۆڕەسوارێکی دیکەیان ئەمجارە بوو بە سەرقافڵەچی و قۆڵ و باسکی کوردایەتی و مەردایەتیی لێ هەڵماڵی و بەرەو دواقۆناخ کەوتە رێ ئەویش زەید ئەحمەد عوسمان بوو.

دەبێ خوا ئەو پیاوەی زۆر خۆش ویستبێ: جوان، سەروەت و سامان، ئەقڵێکی رۆشەن و زمانێکی رەوان، گوڵی مەجلیسان و خاوەن دیوەخان.

کاک زەید سەرباری ئەوەی کە لاوێکی تا بڵێی شۆخ و جوان بوو و سامان و سەروەتێکی زۆری لە باوکییەوە بۆ مابۆوە، خوا بەهرەیەکی زیرەکی و کەسایەتییەکی کاریزماتیکی زۆر دەگمەنیشی

پێ بەخشیبوو. واتا پاکێجێکی لە هەموو رووەوە عەیار بیست و چوار.

زەیدی زادەی بنەماڵەیەکی خانەدانی کوردپەروەر لەپاش مەرگی تراژیکی فەیسەڵی کاکی لەسەر رێچکە کوردایەتییەکەی باب و برای و بنەماڵەکەی بەردەوام دەبێت و تەبای هەموو لاوە خوێندەوارەکانی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستی پڕ لە هەراوهۆریای سیاسی ئەویش نوقمی چالاکیی سیاسی و کولتووریی ئەو سەردەمە دەبێت. ئەمن بە تەواوی نازانم بەڵام زۆر رێی تێ دەچێت ئەویش سەرەتا ئەندامی حزبی هیوای ناسیۆنالیست بووبێ کە هەتا نیوەی یەکەمی چلەکانی سەدەی بیستەم بەهێزترین حزبی کوردی بووە و زۆرترایەتیی لاوان و قوتابییان و رۆشەنبیرانی ئەوان رۆژان بەپەرۆشەوە دەبوونە ئەندامی. بەڵام دووریش نییە دواتر بووبێت بە ئەندامی حزبی (رزگاریی کورد) ئەویش هەر ناسیۆنالیست، چونکە لە بەرگی پێشەوەی ئەو کتێبەی کە بە عەرەبی نووسیویەتی دروشمێکی حزبی رزگاریی داناوە (هدفنا الاسمى هو توحيد وتحرير كردستان الكبرى) واتا (ئامانجی بەرزمان یەکگرتن و ئازادکردنی کوردستانی گەورەیە). لە چەند دێڕی هەرە دوایی لاپەڕەی هەرە دوایی (ل 134-)ی کتێبەکەیدا ئەمەشی نووسیوە: (ان الشعلة في يد رزگاري كورد فاتبعوها...) واتا (مەشخەڵەکە بەدەست رزگاریی کوردە شوێنی کەون...). بەڵام هۆشمەندی کوڕی دەڵێ رەنگە بابی هەر لایەنگری ئەو حزبانە بووبێت نەک ئەندام.

کوردی ئەو زەمانە کە لە ئەنجامی جەنگی یەکەم بە نامرادی مابۆوە هیوای نوێ بووبووەوە دوای بڕانەوەی جەنگی دووەم ئەمجارە بگات بە مرازی. ئەگەر لێم تێک نەچووبێ دەبێ ئەم چەند دێڕە شیعرەی کە بەشێکە لە سروودێکی نەورۆزی پەیوەندیدار بە سەرەنجامی جەنگەوە و کە خۆم لە ئاهەنگەکانی نەورۆزی چلەکاندا دەمگوت هی حەمەتۆفیق وردی بووبێ: "ئەمڕۆ و سبەیە جەنگ ئەبڕێتەوە... سوپای سەرکەوتوو ئەگەڕێتەوە... میللەتان هەقیان پێ ئەدرێتەوە... وریا بن کە کورد بیر نەچێتەوە... بەخێر بێن ئێوە و نەورۆزو بەهار

... دوارۆژمـان ئـەویٚ لـە گـەورە و سـەردار". دواتـر کـە شـیوعیەت لـە کوردسـتان پـەرەی سـەند ئـەم دێـرەی دوایـی سـروودەکەیان گـۆڕی بـە " دوارۆژمـان ئـەویٚ بـۆ پاڵـە و جوتیـار".

زەیـدی ئەحمـەد ئەفەنـدی لەپـاش مەرگـی ناوەختـی فەیسـەڵی بـرا گـەورەی لـە بەهـاری 1943زیاتـر رشـت دەبـیٚ لەسـەر چالاکـی سیاسـی کوردایەتـی. بەپێـی هۆشـمەندی کـوڕی کـە لـە دایکـی و لـە قەدریـە خانـی پووریشـی (خوشـکی گـەورەی باوکـی) بیسـتووە دەڵـیٚ هـەر لـەو چەنـد سـاڵەی سـەرەتای چلەکانـا زەیـدی باوکـی لەگـەڵ عزەدینـی مـەلا ئەفەندیـی ئامـۆزای باوکـی (خاڵـی خـۆی) چەکێکـی زۆر دەکـڕن بـۆ ئـەوەی بینێـرن بـۆ بـارزان بـۆ بزووتنـەوە چەکدارییەکـەی مـەلا مسـتەفای بارزانـی کـە تـازە بـە یارمەتیـی حزبـی هیـوا و شـێخ لەتیفـی شـێخ مەحمـوود لـە دەسبەسـەریی سـلەیمانییەوە خـۆی گەیاندبـووەوە بـارزان و چەکـی هەڵگرتبـووەوە. زەیـد ئەحمـەد عوسـمان هـەر لـەو کتێبەیـدا لـە لاپـەڕە 112 لەبـارەی ئـەم رووداوە نووسـیویەتی کـە ئەمـە تەرجومـە کوردییەکەیەتـی: "شۆڕشـگێڕەکان سـەرکەوتن و رای گشـتیی کوردیـش دەسـتی پـیٚ کـرد پشـتگیریی بـکات و رێکخـراوە کوردییـەکان کەوتنـە جموجـۆڵ. زۆر لـە ئەفسـەرانی کـوردی لەشـکری عێراقـی فیراریـان کـرد و بەگـەڵ شـۆڕش کەوتـن. شۆڕشـەکە لـە بزووتنەوەیەکـی عەشـائیرییەوە گـۆڕا بـە خەباتێکـی نیشـتمانی کـە لاوەکان بـوون بـە سـتوونی.."

هۆشـمەند دەڵـیٚ عزەدیـن ئەفەندیـی خاڵـی تەنانـەت گوندێـک لـە گونـدە زۆرەکانـی خـۆی فرۆشـتووە تـا چەکەکانـی پـیٚ بکڕێـت. دەڵـیٚ لـە هەمـان کاتـدا زەیـدی باوکـی کـە تـازە خوێندنـی ئامادەیـی تـەواو کردبـوو و تەمەنـی هـەر نـۆزدە سـاڵێک دەبـوو خۆیشـی ئامـادە دەکـرد بچـیٚ چەکـەکان بگەیەنـیٚ یانیـش نیـازی هەبـووە هـەر بەیەکجـاری نەیەتـەوە و بەگـەڵ بزووتنەوەکـە بکەوێـت. هەنگـی ئەنـوەر عەبـدولا (ئەنـوەر دڵسـۆز)ی خزمیشـی ئەویـش بەگـەڵ بزووتنەوەکـە کەوتبـوو و ئەفسـەرە کوردەکانـی سـوپای عێراقیـش ئەوانـەی ئەندامـی حزبـی هیـوا

بـوون کـه هەندێکیـان وەک (ئەفسـەری پەیوەنـدی liaison officers) لەلایـەن بەغـداوە داندرابـوون پەیوەنـدی بـە بارزانییـەوە بکـەن بـەڵام لەپاش سـەرنەگرتنی گفتوگـۆ ئەوانیـش بـە بڕیاری حزبەکەیـان زۆریـان بەگـەڵ بزووتنەوەکـە کەوتـن. هەرچۆنێکـی بـێ ئەحمـەد ئەفەنـدی زەیـدی کـوڕی ئیقنـاع دەکات کـە جـارێ بـا خوێندنەکـەی تـەواو بـکات لەپاشـان درێژە بـە چالاکیـی سیاسـیی خـۆی بـدات. بـەم جـۆرە بیرۆکـەی ناردنـی کوڕەکـەی بـۆ زانکـۆی قاهیـرە لا گەڵاڵـە دەبـێ.

مەحمـوودی بـرای کاک زەیـد هەروەهـا بـۆی گێڕاومەتـەوە کـە جارێکیـان هـەر لـەو سـاڵانەی نیـوەی چلـەکان، دەڵـێ ئەگـەر بەهەڵـەدا نەچووبـێ، (مسـتەفا العمـری) وەزیـری ناوخـۆی عێـراق بـووە داوای لـە کەسـایەتیە کـوردە نـاودارەکان کـردووە لەگەڵـی کـۆ ببنـەوە باسـی کێشـەی کوردیـان بـۆ بـکات هەڵبـەت لـە دیـدی حکوومەتـەوە. کاک مەحمـوود دەڵـێ ئەحمـەد ئەفەندیی باوکـی و کاک زەیـدی براشـی لـەو کۆبوونەوەیـەدا دەبـن. دەڵـێ کـە وەزیـر لـە قسـەکانی دەبێتـەوە کاک زەیـد راسـت دەبێتـەوە کاغەزێـک لـە گیرفانـی دەردێنێـت دەسـت دەکات بـە نمایشـکردنی کێشـەی کـورد لـە دیـدی بزووتنـەوەی رزگاریخـوازی کـوردەوە و داخوازییەکانـی کـورد لـە حکوومـەت. بـەڵام پۆلیسـی هۆڵەکە یەکسـەر تـاوی دەدەنـێ و نایەڵـن قسـەکانی تـەواو بـکات و کاغەزەکـەی لـێ دەسـەنن. کاک مەحمـوود دەڵـێ خـۆی ئـەوەی چـاک لەبیـرە کـە هـەر ئـەو رۆژە بـۆ ئێـوارە پۆلیـس دەچنـە ماڵـی ئەحمـەد ئەفەنـدی لـە بەغـدا تاکـو زەیـدی کـوڕی بگـرن بـەڵام بـە حوکمـی ئـەوەی کـە ئەحمـەد ئەفەنـدی ئەندامـی ئەنجومەنـی پیـران (سـیناتۆر) بـووە نەیانتوانیـوە کوڕەکـەی بگـرن و وازی لـێ دێنـن. مەحمـوود چیرۆکێکـی دیکەشـی هەڵوێسـتی کوردایەتـی و مەردایەتیـی کاک زەیـدی بـرای بـۆ گێڕامـەوە. هـەر لـە ناوەڕاستی چلەکانـا کاک عەونـی یوسـف لـە هەولێـر دەگیـرێ. هەرچەنـدە کـە لەسـەر کوردایەتـی گیرابـوو بـەڵام حکوومـەت تۆمەتـی شـیوعیەتیان نابـووە پـاڵ. کوردپەروەرانـی ئـەو سـەردەمە سـەردانی دەکـەن

لە بەندیخانە. مەحمود دەڵێ پۆلیس دەچن دەڵێن کە کاتی سەردانی زیندانییان تەواو بووە با بڕۆن، کاک زەید سوور دەبێ دەڵێ ئێمە ناڕۆین هەتا عەونیش لەگەڵ خۆمانا نەبەینەوە. دەڵێ پۆلیسەکان بە زۆر زەید لە بەندیخانەکە دەبەنە دەرەوە. مەحمود دەڵێ چوار ئەفسەرە کوردەکەی سوپای عێراقی کە دوای رووخانی کۆماری مەهاباد گەڕانەوە بۆ عێراق و لەپاشان ئیعدام کران دەڵێ کاک زەیدی برای یەکێک لەو کوردانە بووە کە چووبوون تەرمەکانیان لە حکوومەتی عێراق وەرگرتبۆوە و بردبوویانەوە بۆ کوردستان.

دیارە کاک زەید تینوەتیی هەر بەو چالاکییانە نەشکاوە بەڵکو نامیلکەیەکی بۆ ئەو زەمانە زۆر بایەخداریش بە زمانی عەرەبی لەسەر مێژووی هەر چوار پارچەی کورستان دەنووسێت و بە ناوێکی شاراوە (محمد شیرزاد) ساڵی 1946لە قاهیرە بە چاپی دەگەیەنێت. تایتلی کتێبەکە (نظال الاکراد)ە و بەم ساڵانەی دوایی سامی قادر وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە.

ئەمن نازانم کاک زەید کتێبەکەی پێش چوونی بۆ قاهیرە نووسیوە یان کە لە قاهیرە بووە. راستە کتێبەکە لە ساڵی 1946 لە قاهیرە لەچاپ دراوە بەڵام مەحموودی برای دەڵێ کاک زەید ئەو ساڵە لە قاهیرە نەمابووەوە و گەڕابووەوە بۆ عێراق و دەڵێ دوور نییە لە عێراقەوە بۆ قاهیرەی ناردبێ بۆ چاپکردنی. یانیش لەگوینە هەندێکی لێرە و هەندێکی لەوێ نووسیبێ. ئیتر ساڵی مەزبووتی هەندێ لە رووداوەکانی ئەو ساڵانە هێشتا کەمێک لێڵە و جۆرە ئاڵۆزییەکی ناوەتەوە.

کاک زەید دوو ساڵی یەکەمی (لەوانەیە 43 44- بووبێ، بەتەواوی نازانم) کۆلێژی رەوا لە زانکۆی قاهیرە تەواو دەکات بەڵام لەوێش کاتی خۆی زیاتر بۆ جموجۆڵی کوردایەتی تەرخان دەکات. لە دووریی رووداوەکانی کوردستان و لە ژیانی پەراوێزییدا زەید ئۆقرە ناگرێت خوێندنەکەی بەجێ دێڵێت دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا و دواتر لە

زانکۆی بەغدا تەواوی دەکات. لە قاهیرە کاک زەید ئاشنایەتی لەگەڵ بنەماڵە میسرییەکانی بە رەچەڵەک کورد دەبەستێت وەک بنەماڵەی توێژەر و نووسەری ناودار محەمەد عەلی عەونی کە تەرجومانی تایبەتیی دیوانی مەلیک فاروق بوو.

کتێبەکەی کاک زەید پوختەیەکی زۆر بەکەڵکی مێژووی کۆن و هاوچەرخی کورد و کوردستانە و باسی هەموو ئەو پارتییە سیاسییە کوردییانە دەکات کە لەنێوان یەکەم و دووەم جەنگی جیهان و دواتریش دامەزراون و هەڵوێستی زلهێزەکان بەرامبەر بە کێشەی کورد.

تەواوی لێکدانەوە و بیروبۆچوونی کاک زەید لەو کتێبەدا لە روانگەیەکی چەپرەوی دژ بە کۆلۆنیالیزمی بریتانییە کە بۆ لاوە کوردە خوێن گەرمەکانی ئەو سەردەمە زۆر ئاسایی و باویش بووە. کێشە لەوەدا نییە تۆ لەو سەردەم و هەلومەرجە سیاسییەی ئەوسا بیرو بۆچوونت چۆن و چی بووە، کێشە لەوە دایە ئەگەر دنیا گۆڕا و هەلومەرجی سیاسیشی لەگەڵ خۆیدا گۆڕی ئەتو هەر بە ئەقڵی پێشانت بیر بکەیتەوە.

بۆ سەردەمی خۆی نووسین لەسەر مێژوو و جۆگرافیا و پارتییە سیاسییەکانی کوردستان زۆر کەم بووە بۆیە کتێبەکەی زەید ئەحمەد عوسمان بۆ ئەو زەمانە کەلێنێکی گەورەی مێژوو و جۆگرافیا و سیاسەتی پڕ کردبووەوە.

لەپاش برانەوەی دووەم جەنگی جیهان بە دۆڕانی ئاڵمانیا و سەرکەوتنێکی بێ هاوتای ستالین کە تەواوی ئەورووپای رۆژهەڵاتیشی خستە ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەت، لەپاش هەرەسهێنانی کۆماری کوردی لە مەهاباد و لەپاش پەنابردنی مەلا مستەفای بارزانی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت و پایانی بزووتنەوە چەکدارییەکەی کورد تەرازووی سیاسی لە کوردستانیش لاسەنگییەکەی جارانی گۆڕی. ژمارەیەکی زۆر لە کوردە ناسیۆنالیستەکانی پێشوو یان روویان دەکردە حیزبی شیوعی عیراقی کە بە سەرکەوتنی سۆڤیەت پشتئەستوور بووبوو یانیش

ئومێدۆکەکیان بە تازە لە دایکبوونی حیزبی دیموکراتی کورد دەهاتەوە بەر. واش دیار بوو بەرنامەی حیزبێکی کوردی ناسیۆنالیست لەسەر شێوەی حیزبەکانی پێشووی وەک (هیوا، ژ. ک.، رزگاری) لەبەر پەرەسەندنی شیوعییەت ئەو وزە موگناتیسییەی جارانی بۆ راکێشانی لاوی کورد نەمابوو. راستە ئەو حیزبە کە دواتر ناوی بوو بە پارتی دیموکراتی کوردستان هێشتا هەر حیزبێکی قەومی بوو بەلام ئەویش ئەگەر هەندێ مەیلی چەپایەتی نەنواندبا و هەندێ بیرۆکەی فەلسەفەی مارکسی لینینیی نەخستبایە ناو بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی و دژایەتی کردنی ئیستیعمار هەلۆیستی نەبووا و ستایشی سۆڤییەتی نەکردبا بەتایبەتی کە بارزانی خۆی لەوێ لە پەناهەندەیی دەژییا ئەوا دوور نەبوو هەر بە ساوایی لەناو لانکە تازەکەی خۆیدا سەری بنابایەوە. سەرەڕای ئەوەش حیزبی شیوعی هەر لە پارتی نارازی بوو چونکە نەیدەویست هیچ حیزبێکی دیکە لە کوردستان پێشەبڕکێی لەگەلا بکات هەرچەندە کە ئەم سیاسەتەی بە ئاشکراش دەر نەدەبڕی.

لەتەک ئەو سەرلێشێوانەی لاوانی کوردی دوای جەنگ: یان شیوعی یان پارتی، بۆچوونێکی سێیەم کە پێشتریش هەر هەبوو بەلام کز بوویوو سەری هەلدایەوە کە دروشمە ئاشکرا نەکراوەکەی ئەوەبوو "کوردایەتی خۆ هەر ئەوە نییە یان چەک هەلگرتن یان حیزبایەتی کردن". ئەوەبوو کە کۆمەلانێکی بەرچاوی رۆشەنبیرانی لە لاوەکان بەتەمەنتر و قالبووی ئەزموونەکانی پێشوو هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە بۆ ئەو هەلومەرجە نوێیەی دوای جەنگ باشترە بۆ کورد رێچکەی دیپلۆماسییەتێکی هێمن و دیموکراتیکانە و ئاشتیانەی دوور لە توندوتیژی بگرێتە بەر. یان دەیانگوت شان بەشانی حیزبایەتیکردنی هەندێک با چینێکی دیکەی کوردپەروەرانی سەربەخۆ ئەوانیش لەلای خۆیانەوە خەباتێکی نەرمڕەوانە بکەن. جا بەرامبەر بەو بۆچوونە سێیەمە کوردە شیوعییەکان و هەندێ لە مارکسی و چەپڕەوە بێ ئەزموونە عاتیفییەکانی ناو پارتیش ئەم "ئاراستەی سێیەم"ەیان بە کلکایەتی ئیستیعمار دادەنا.

زەیـد ئەحمـەد عوسـمان تەبـای گەلێکـی تـر لـە ڕۆشـەنبیرانی دوای جەنـگ پەیـڕەوی ئـەو ئاراسـتەی سـێیەمەی دەکـرد. کاک زەیـد کـە هـەم لـە هەولێـر و هـەم لـە بەغـداش دادەنیشـت کەسـایەتیەکی سیاسـی و کۆمەڵایەتـی و ڕۆشـەنبیریی ئەوتـۆی بۆخـۆی دروسـت کـرد کـە بـوو بـە مایـەی ڕێزگرتـن هـەم لەنـاو کۆمەڵـگای کـوردا هـەم لەنـاو ناوەنـدە سیاسـییەکانی عەرەبـان لـە بەغـدا. دۆسـتێکی زۆری لـە سیاسـەتکارو پەروەردەکارە ناودارەکانـی عەرەبـی عیراقـی چ لـە ئۆپۆزیسـیۆن چ لەنـاو دەوڵـەت ئەوانـەی کـە نەرمـڕەو بـوون و هاوسـۆزییان لەگـەڵ کێشـەی ڕەوای کـوردا هەبـوو بـۆ خـۆی ڕاکێشـا وەک کامـل چادرچـی و محەمـەد حەدیـد و حوسـێن جەمیـل و فائیـق السـامرائی و ناصـر الحانـی و عەبدولڕەحمـان بـەزاز و عەبدولعەزیـز الـدوری و د. کاظـم شـبر، ئـەوە هەر ئەوەنـدەی مـن پێـی بزانـم، ئینجـا لـە کەسـایەتییە کوردەکانـی بەغـداش باباعەلـی شـێخ مەحمـود و فوئـاد عـارف و سـەعید قـەزاز و عەلـی کەمـال و بابانـەکان و ڕەشـید نەجیـب و ڕەشـید جـەودەت و ڕەشـید عـارف و کاکەزیـادی کۆیـە و مەسـعود محەمـەد و سـەمەد بەننـای کۆیـی (ناسـراو بـە سـەمەد مەنجـەڵ) و فـەوزی جەمیـل صائیـب و د. عەبدولڕەحمـان عەبـدولا و د. قەرەنـی دۆغرەمەچـی و ئیحسـان شـێرزاد و کەریـم مەکەنزی و زۆری تریـش. ماڵەکـەی بەغـدای کاک زەیـد سـالۆنێکی کۆمەڵایەتـی بـوو بـۆ ئـەو زاتانـەو دیوەخانەکـەی هەولێریشـی ئـاوەڵا بـوو هـەم بـۆ دۆسـت و ڕۆشـەنبیران و هـەم خەڵکـی لادێـی دەسـتکورتیش. کاک زەیـد کـە لـە هەولێـر پارێـزەری دەکـرد هەرگیـز پـارەی لـە کەمدەرامـەت و ڕەنجبـەران وەرنەدەگـرت و دەعـوای بـۆ دەگرتـن لـە دژی ئاغاکانیـان ئەگـەر بیزانییـا غەدریـان لـێ دەکـەن و پـارەی عەرزوحـاڵ و پـوول و ئـەو وردە خەرجییانەشـی هەمـووی خـۆی بـۆی دەدان. سـاڵی1958 کـرا بـە نوێنـەری هەولێـر لەپارلەمانـی (الاتحـاد الهاشـمي) نێـوان عیـراق و ئـوردون.

لـە پـاش بەرپابوونـی شۆڕشـی ئەیلولـی 1961یـش هـەر شـاندێکی کـوردی بـۆ گفتوگـۆ بچووبایـە بەغـدا کاک زەیـد لـە ماڵـی خـۆی

دانیشتنێکی بۆ دەکردن و بیروڕای لەگەڵیانا دەگۆڕییەوە و ئامۆژگاری دەکردن.

گۆڕانێکی گەورە لەچاو سالآنی لاویتیی بەسەر بیرکردنەوەو دنیاڕوانی (worldview)ی دواتریی زەیدا هاتبوو. لەوێ رۆژێوە کاک زەید ئیتر بوو بە پیاوێکی دیموکرات بە هەموو واتاکەیەوە و سیستەمی پارلەمانی و ئازادی دەربڕین و سیستەمی فرەپارتی multiparty system لە پرەنسیپە پیرۆزەکانی بوون. رۆشەنبیر و بیرمەندی دۆستی لەمێژینی کاک زەید (زیوەر خەتاب) ئەمەی بە عەرەبی لەسەر نووسیوە کە وا من دەیکەم بە کوردی " زەید ئەحمەد عوسمان لیبەراڵ بوو و بڕوای تەواوی بە دیموکراسی هەبوو و ئاواتەخوازی ئەوە بوو لەژێر باڵی سیستەمێکی دێموکراتی پارلەمانیدا بژی کە ئازادی رادەربڕین و مافی شایەستەی هاوڵاتی تێدا مسۆگەر بێت و هەوڵیشی دەدا خۆی ببێ بە ستوونێکی سەرەکی تا ئەو سیستەمەی لەسەرا بنیاد بنرێت. لەوەش گرنگتر زەید خاوەنی رەوشتێکی مەردانە بوو، زمانێکی پاکژ و پاراو کە یەک تاکە وشەی بێڕێزی لە دەما دەرنەدەچوو و هەرگیز خۆی دانەدەبەزاندە ئاستی ناحەزانی و گەلێک خەسڵەت وسروشتی تریش کە مرۆڤی پێ گەورە دەبێ" (بڕوانە: محمود احمد عوسمان، مصابیح وظلمات ل- 67).

کە عەبدولڕەحمان بەزاز لە سەردەمی سەرکۆمار جەنەڕاڵ عەبدولڕەحمان عارف بوو بە سەرەک وەزیرانی عیراق هەر یەکسەر زەید و ئەو کۆمەڵە کوردە نیشتمانپەروەرە سەربەخۆیەی کە پێش خۆی بۆ خوارووی عیراق دوورخرابوونەوە هەموویانی ئازاد کرد و بە رێگای زەیدی برادەرییەوە دەستی بە ئاڵوگۆڕی نامە کرد لەگەڵ بارزانی. جا بەپێی هۆشمەندی کوڕی زەید پرۆژە بەناوبانگەکەی لامەرکەزی (بەیاننامەی 29ی حوزەیرانی1966)کە بەزاز رایگەیاند و سەرکردایەتی شۆڕشی کوردیش پێی رازی بوو ئەوە هەمووی بە ئامۆژگاری و هاوکاری و هەمئاهەنگی لەگەڵ زەید ئەحمەد عوسمانا بووە.

بەڵام کە بەعسییەکان بۆ جاری دووەم لە تەموزی 1968 کودەتایان کرد و هەر یەکسەر لە مەیدانی (ساحة التحرير)ی ناوەندی بەغدا یانزدە کەسیان بە داریێ وەکرد شت بۆ کاک زەیدیش گۆڕا. دیارە بەعسییەکان لەمێژ بووە چاوەدێری جموجۆڵی نهێنیی زەیدیان کردووە ئەویش بە ڕێگای تایبەتی خۆیەوە بۆی دەرکەوتبوو کە مانەوەی لە بەغدا ترسناکە. ئەو کاتە ئەمن لە بەغدا بووم لە ئەورووپا گەڕابوومەوە بۆ ژنهێنان. چاکم لەبیر نەماوە ساڵەکە هەر 68 بوو یان کەوتبووینە ناو 69وە کە کاک زەید تەلەفۆنی بۆ کردم دەیەویێ بمبینیێ. چووم بۆ لای گوتی بە خێرایی بچۆرەوە بۆ هەولێر و بۆ ناو شاخ لەویێ بە موحسینی برات بڵیێ تەگبیرێکم لیێ بکەن لە بەغدا دەرچم و بمگەیەننە ناو پێشمەرگە چونکە لێرە وەزعم لە مەترسیدایە. منیش بەبیێ گیربوون چووم راسپاردەکەم بەجیێ گەیاند. ماوەیەک دواتر بیستم کە کاک زەید بە سەلامەتی گەیشتۆتە ناوچەی ناوپردان لە باڵەکایەتی. ئۆخەیەکی قووڵ!

زەید ئەحمەد عوسمان پێشوازییەکی گەرمی لەلایەن بارزانییەوە لیێ کرا. وەکوو بیستوومە مەلا مستەفا کردبووی بە راوێژکاری سەرەکیی خۆی senior political advisor و دەڵێن بارزانی نەدەچووە ماڵی کەس ماڵی زەید نەبێت و بەتەنیا دوو بە دوو لەگەڵیا کۆدەبۆوە. پێم وایە ساڵی 73 بوو کە بە قسەی ( برایەن رۆبێرت گیبسن Bryan Robert Gibson) "بارزانی کەوتبووە ژێر گوشاری مۆسکۆ لەگەڵ بەعس ڕێک کەویێ زەید دەنێریێ بۆ ئەمەریکا بۆ ئەوەی واشنتن قانەع بکات زیاتر یارمەتی کورد بدات" زەید عوسمانی نوێنەری بارزانی بە ڕێگای عیسمەت کەتانی یاریدەدەری سکرتێری گشتیی UN کە کورد بوو چاوی بە کاربەدەستانی باڵای ئەمەریکی دەکەوێت و داوای " دانوسەندنی بەردەوامی کورد لەگەڵ ئەمەریکا و یارمەتی دارایی و وێستگەیەکی رادیۆ و هاوکاری CIA لەگەڵ موخابەراتی

کـوردا" دەکات (بڕوانــە ل - 200: Bryan Robert Gibson , U.S. Foreign Policy, Iraq, and the Cold War 1958-1975

زۆری نەبـرد پـاش گەڕانـەوەی لـەو سـەفەرە کاک زەیـد بـۆ یەکجاری کوردستان جـێ دێڵێـت و دەچـێ لـە پاریـس دادەنیشـێ. قسە هەبـوو کـە (سـاڤاک)ی ئێرانـی پێـی خـۆش نەبـووە ئـەو پیـاوە راوێـژکاری بارزانـی بێـت و ئەوەنـدە لێـەوە نزیـک بـێ. سـاڤاک هەسـتی بـەوە دەکـرد کـە زەیـد رێـگا بـۆ بارزانـی خـۆش دەکات راسـتەوخۆ، نـەک بـە رێـگای ئەوانــەوە، پەیوەنـدی بـە ئەمەریـکاوە ببەسـتێت. دیـارە ئەمـە پێچەوانـەی سیاسـەتی ئێرانـێ بـوو بۆیـە پـلان و تەگبیرێکـی بـۆ دروسـت دەکـەن لـەوێ دەری پەڕێنـن. کاک زەیـدی وردبیـن و دووربیـن هەسـت بـەو پلانـە دەکات و دەزانـێ کـە لەوێندەرێـش جێـی لەقـە ئـەوە بـوو کـە بارگـەی تێـک دەنێـت و دەچێتـە پاریـس. ئەمـن ئەوسـا لـە ڤیەننـا و دواتـر لـە ئینگلتـەرا بـووم. چەنـد جـارێ چوومـە سـەردانی لـە پاریـس کـە دیـار بـوو بـە گلەیـی بـوو بـێ ئـەوەی هیـچ وردەکارییـەک بدرکێنێـت و جگـەرەی بـە جگـەرە دادەگیرسـاندەوە. بـە داخـەوە سـاڵی 1978هـەر لـەوێ لـە پاریـس لەپڕێـکا دوچـاری نەخۆشـی شـێرپەنجەی گـەروو بـوو و ماڵئاوایـی لـێ کردیـن کـە هێشـتا لەتەمـەنی پەنجـاو سـێ چـوار سـاڵی بـوو. لێرەشـدا دەنگـۆ بـڵاو بـۆوە کـە گوایـا حکومەتـی بەعـس دەرمانخـواردی کردبـوو بـەڵام بەڵگەیەکـی سـەلمێنەر بـۆ ئـەم قسـانە لەبـەر دەسـتا نەبـوو.

بـا بـواری سیاسـەت لـە ژیانـی زەیـد ئەحمـەد عوسـمانا بنێیـن بـەلاوە. هونـەرو کولتـوور و زانیـاری گشـتی (general knowledge) زاخـاوی مێشـکی ئـەو پیـاوە بوونـە. رۆشـەنبیر پـڕ بـە واتـای وشـە. بـە پێنـج زمـان قسـەی دەکـرد: کـوردی، عەرەبـی، تورکـی، ئینگلیـزی، فرانسـی. هەتـا ئـەم سـاڵانەی دواییـش فۆتۆگرافێکـی سـاڵانی سـییەکانیش مابـوو و خـۆم دیبـووم کـە لەقوتابخانەیەکـی هەولێـر شـانۆگەرییەکیان لەسـەر ژیانـی سـەلاحەدینی ئەیوبـی پیشـکەش کـردووە. مـن هـەر وێنەکـەم بەبیـر دێ کـە کاک زەیـد رۆڵـی ریچـارد شـێردڵی نوانـدووە Richard the

Lionheart و کاک موحسینی براشم دەڵێ ئەو خۆی شانۆگەرییەکەی بە بیر دێ کە حەمەڕەش حەویزیش رۆڵی سەلاحەدینی تێدا بینی بوو. جا وەکوو دەیانگێڕایەوە کاک زەید لەو رۆڵەدا سیفاتی ئاکتەرێکی گەورەی بە تواناو بە ئەزموونی پێوە دیار بووە. تەبای هەموو بنەماڵە ئەریستۆکراتەکان کاک زەیدیش، سەرباری سیاسەت، حەزی زۆری لە خوێندنەوەی کتێب و هونەری تیاتەر و تابلۆی جوان جوان و موزیکی کلاسیک بووە. نەک هەر خۆی، بگرە هەموو خوشک و براکانیشی وا بوون. کاک مەحمودی برای ( 1932 *) کە لە سەرەتای پەنجاکانا لە زانکۆی ناوداری کێمبریج Cambridge خوێندوویەتی هەموو شانۆگەرییەکانی شەیکسپیری رەنگە بە دەیان جار خوێندبێتەوە و لە لەندەنیش هەمووی بە دەیان جار لەسەر شانۆ بینیبێت. لەو ساڵانەی کە لەبەغدا فەرمانبەر بووە مەحمود پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵێک هاوبیرو هاوهۆبی عیراقیی خۆی کە هەموویان وەک خۆی لە زانکۆکانی ئەوروپا و ئەمەریکا خوێندبوویان کۆمەڵەیەکی کولتووری زۆر سەرکەوتوویان لە شەستەکانی سەدەی رابردوو لەبەغدا دامەزراندبوو بە ناوی (الجمعية البغدادية) و ناوە ناوە شانۆگەرییان بە ئینگلیزی و بە عەرەبی پێشکەش دەکرد. لەو شانۆگەرییانە مەحمود هەمیشە وەک ئاکتەرێکی کارامە رۆڵی تیا دەبینی. ئێستاش کە لە هەولێر دادەنیشێت کتێبێکی پڕ لە بیرەوەری و زانیاری رۆشەنبیری هەمەڕەنگی بە زمانی عەرەبی بە ناوی (مصابيح وظلمات) بڵاو کردۆتەوە کە ئیسماعیل بەرزنجی کردوویە بە کوردی. کاک مەحمود ئینسایکلۆپیدیایەکە بۆ خۆی، هەرگیز لە دانیشتنی تێر نابیت ئەوەندە زانیاریی هەمەجۆری لایە. فوئادی براشیان (1936*) کە ئارکیتێکتێکی زۆر سەرکەوتووی دەرچووی ئەمەریکایە و بۆ ماوەیەک لە زانکۆی بەغدا و لە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت و لە عەرەبستانی سەعودی مامۆستای ئەندازیاری بووە ئێستا لە ئەمەریکا دەژی و خانەنشینە ئەویش وێڕای تایبەتمەندییەکەی خۆی لە ئەندازەی خانەسازی هونەرمەندێکی بۆیەکار و پیانۆژەنێکی زۆر

شارەزای موزیکی کلاسیکە و لە هەرەتی لاویدا سپۆرتکارێکی پلەی یەک بووە لە جۆرەها سپۆرتیشا. نەوزادی برا بچووکیان (1940*) ئەویش هەر دەرچووی ئەمەریکایە و لە ئەمەریکا دەژی ئەندازیارێکی زۆر سەرکەوتوو و خاوەنی کۆمپانیای ئەندازیاری خۆیەتی کە دوانزدە ئۆفیسی تەنیا لە ئەمەریکا هەیەو لە ئیماراتیش لکێکی هەیە. نەوزاد لەو شارەی کە لێی دەژی شاری پۆرتلاند لە ویلایەتی ئۆریگن (Portland , Oregan) ناوە ناوە کۆڕێک بۆ دانیشتوانی شارەکە دەگێڕێ بۆ باسی کێشەی کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی.

## دوا وشەم لەبارەی بنەماڵەی ئەحمەد عوسمان

کە دەڵێم دوا وشە ئەمە دیارە هەر بەپێی زانیارییەکانی خۆمە لەسەر ئەم بنەماڵە تێکۆشەرە کولتور پەروەرە. ئەزموونی کەسیی خۆم لەگەڵ ئەم خزمانەم و زانیاری و بەدوادا چوونیشم لەسەریان، هەر ئەوەندەی بڕ کردووە کەوا لەم چەند پەڕی ئەم نووسینانەمدا خستوومنەتە سەر کاغەز. دەشزانم کە زۆر لایەنی تریش هەن لە کاروانی ڕێگا دووری ژیانی ئەم بنەماڵە هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە کوردپەروەرە کە من پێی نازانم. هیوادارم ئاگاداران لێ نەگەڕێن مێژوو ببێ بە بەردی بن گۆم.

بەڵام ئەوە دەزانم کە ئەحمەد عوسمان خۆی و هەردوو کوڕی (فەیسەڵ و زەید) شایەستەی ئەوەن پەیکەریان بۆ بکرێت، شەقام و مەیدانیان بەناو بکرێت و لە بەرنامەی خوێندنی قوتابخانەکان و زانکۆکانا لە بەشی مێژوو لێ کۆڵینەوەیان لە سەردا بکرێت. بێ وەفایی لەگەڵ پێشمەرگە پێشڕەوە دێرینەکانمان نەنگە. پێشینان گوتوویانە هەر زەمانێک و پیاوی خۆی.

## رووداوی دووەمی ساڵی 43 لە سلێمانی مەلا مستەفای بارزانی سلەیمانیی بەجێ هێشت

رووداوی مێژوویی دووەم ساڵی 1943 لە سلەیمانی بوو. هەستی ناسیۆنالیزمی کوردی تەکان و تەوژمێکی لەپڕی بە خۆیەوە دی کە دەنگوباس بڵاو بۆوە مەلا مستەفای بارزانی کە ماوەیەک بوو بۆ سلەیمانی دوور خرابۆوە و لەوێ دەستبەسەر بوو بە یارمەتیی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود و حزبی هیوا بەرێگای ئێرانەوە خۆی گەیاندووەتەوە بارزان و دەستی بە بزووتنەوە چەکداریەکەی لە دژی بەغدا کردووەتەوە. ئەم کردەوەی بارزانی هەناسەیەکی سازگار و هومێدێکی نوێی نایەوە بەر کۆمەڵانی ناسیۆنالیستی کوردەوە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە ململانێی نێوان ئەو هەموو حزبە کوردییانەش تا دەهات پەرەی دەسەند، بەتایبەتی کە ئاڵمانیای نازی لە هێرشی بۆ سەر یەکیەتیی سۆڤیەت لە ستالینگراد لە رۆژی دووی مانگی رەشەمەی 1943بە سەرشۆڕییەکی زۆر خراپەوە شکا. لەو شەڕەدا سوپای ئاڵمان 150هەزار سەربازی لێ کوژرا و ئەوەی ماشبوون 91 هەزار ئەوانەیش گشتیان خۆیان دا بەدەستەوە و بەدیل گیران. ئەمەریکاش ساڵێک پێشتر لە ساڵی 42 وەوە ئەویش هاتبووە ناو شەڕەکەوە و تەرازووەکە خەریک بوو بە بەرەی دژی ئاڵمانیا لاسەنگ دەبوو و هەست دەکرا کە ئاڵمانیا وا بەرەو دۆڕان دەڕوات. لە ئەنجام، تەریب لەگەڵ باڵی ناسیۆنالیزمی کوردی باڵی چەپڕەویش لە کوردستانا بەو سەرکەوتنە گەورەیەی سۆڤییەت گەشەیەکی بەخۆیەوە دی و کوردێکی زۆری ئەندامانی حزبە ناسیۆنالیستەکان روویان دەکردە حزبە چەپڕەوەکانی وەک شۆڕش و لەپاشانا شیوعی. حزبە ناسیۆنالیستەکانی وەک (ژ. ک.) و (هیوا) و (رزگاری) خەریک بوو ئەو شەوق و رەونەقەی جارانیان لەدەست دەدا. خەباتی دوور و درێژی بارزانی لە پێناو کوردا چەندین

کتێبی تایبەتی پێ دەوەێ و ئەم چەند پاراگرافە تەنها باسی رۆیشتنە پەنهانییەکەیەتی لە سلیمانی بۆ بارزان. لە میانەی ئەم بیرەوەرییانەشما لە شوێنی تر بەوردی باسم لە خەباتی بارزانی کردووە.

هەر لەو ساڵەی 1943دا رووداوێکی تری زۆر سەرنجکێش لە مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی لە هەولێر قەوما.

## رووداوی سێیەمی ساڵی 43، لە هەولێر رەمزی نافیع ئاغا، سەربازە ونەکەی کوردستان

رەمزی کوڕی نافیع ئاغای کوڕی رەشید ئاغا بوو کە لە بنەماڵەیەکی خانەدانی لەمێژینی شاری هەولێرن. ئەمن رەمزیم نەدیبوو، بەڵام جەودەتی برا بچووکەکەی کە هاوزای من بوو هەر لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە تا رۆژی مەرگی ناوەختی کە تازە پۆلی شەشەممان تەواو کردبوو هەمیشە برادەری گیانی بەگیانیی یەکتری بووین. منێکی پەروەردەی دەشتێکی رەقوتەقی بێ دارودرەخت کە لە حەیاتی خۆما فەریکە بستە (فستق)م نەخواردبوو و هەر نەشمدیبوو، جەودەت لە رەزوباخە پڕ میوەجاتی کۆشکەکەی ماڵەبابی کە (قەسری عەتاولاغا)یان پێ دەگوت لە وەرزی خۆیدا هەمیشە چنگێک فەریکە بستەی بۆ دەهێنام بۆ قوتابخانە. هەروەها سوعادی براگەورەشی کە لە دیدی منەوە رەنگە یەکێک بووبێت لە گەنجە هەرە قۆز و شۆخەکانی نەک هەر شاری هەولێر بەڵکو لە هەموو کوردستانیش و دەتگوت ئاکتەری سینەمای هۆلیوودە، ئەویش لەگەڵ هەموو براکانم و دواتر لەگەڵ خۆشما برادەرێکی نزیکی خۆشەویستمان بوو. لە پاشان سوعاد ئەوەندە قسە خۆشیش بوو کەس نەبوو تاوێک لەگەڵیا دانیشتبێت و خۆشی نەویستبێ. سوعادی نافیع ئاغا یەکێک لەو کەسانەیە کە لەبیر ناکرێن. نەک هەر براکانی رەمزی بگرە هەموو ئامۆزاکانیشی هەموویان برادەری نزیکی بنەماڵەی ئێمە بوون

و ئێستاش هەر واین. هەر خۆی بنەماڵەی ڕەشید ئاغای باپیری ڕەمزی نەک هەر بەگشتی جوان و ئێسک سووکن بەڵکو ئاستی پەروەردە و ڕۆشەنبیریشیان هەمیشە ئاستێکی بەرچاو و سەرنجکێش بووە لە هەولێر و لە هەر جێیەک بیاناسیبان. جا ڕەمزیش وەک ئەندامانی تری بنەماڵەکەی، دەڵێن گەنجێکی زۆر قۆزی موو سوور بووە. تەبای گەنجانی ئەو ساڵانەش ڕەمزیش ئەندامی حزبی هیوای ناسیۆنالیست بووە و سروشتانە لایەنگری ئاڵمانیای ناتزی بووە دژی ئینگلیز. نافیع ئاغای باوکی کە یەکێک بووە لە ئاغا دەوڵەمەندەکانی هەولێر ڕەمزیی کوڕی بۆ خوێندن دەنێرێتە بەیروت. لەوێ پەیوەندی لەگەڵ کوردە ناسیۆنالیستەکانی وەک خۆی پەیدا دەکات کە خەڵکی کوردستانی تورکیا بوون بەڵام لەپاش شکستهێنانی سەرهەڵدانەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئەوەی ئیحسان نووری پاشا لە دژی مستەفا کەمال ئەتاتورک و نەمانی حزبەکەیان (خۆیبوون) روویان لە سووریا و لوبنان کردبوو کە هەنگی لەژێر ئینتیدابی فرانسەدا بوون و لەوێ بووبوون بە پەنابەر. هەندێک لەوانە برایان جەلادەت بەگ و کامەران بەگی بەدرخان، قەدری جەمیل پاشا، نوورەدین زازا، جگەرخوێنی شاعیر، قەدری جانی شاعیر، عوسمان سەبری، مەمدوح بەگ و زۆری تریش بوون. پاش ماوەیەک لە بەیروت ڕەمزی بە سەردان یان بۆ خوێندن یان بە پێشتەگبیر لەگەڵ حزبەکەی خۆی (بەتەواوی ئەوە نازانم) دەچێتە ئەستەمبۆل. ئەستەمبۆلیش ئەوساکە و لەو ساڵانەی جەنگدا بووبوو بە ناوەندێک بۆ تۆڕە جاسووسییەکانی هەموو لایەک. هەموو زلهێزەکان دەزگای جاسووسییەتی خۆیان لەوێ دانابوو. ڕەمزی لەوێ بەڕێکەوت یان بە تەگبیری پێشتر لەگەڵ حزبەکەی خۆی حزبی هیوا (ئەمەیان تا ئێستا نەزانراوە) پەیوەندی لەگەڵ چەند ئاڵمانێکی دانیشتووی ئەستەنبۆل دەبەستێت و حاڵی کوردیان بۆ روون دەکاتەوە. دیار بووە ئەو ئاڵمانانە لە دەزگایەکی جاسووسییەتی ئاڵمانیا بووینە لە ئەستەمبۆل.

هەنگی ئالْمانیا لیکاوی بۆ بیرە نەفتەکانی کەرکووک و ئەوانەی باکو لە ئازەربایجانی ژێر دەستی سۆڤیەت دەهاتە خوارێ. لەو شەڕە ئالْمانەکان پێویستیەکی زۆریان بە نەفت و سووتەمەنی هەبوو بۆ فڕۆکە جەنگیەکانیان لە سەرچاوەیەکی نزیکی شەڕ وەک کەرکووک و باکو. پێ دەچێ رەمزی لەگەڵیانا وا رێککەوتبێ کە ئەگەر بێتو ئالْمانیا یارمەتیی کورد بدات بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە باکوری عیراق ئەویش یارمەتییان دەدات بگەنە ناو عەشیرەتی خۆشناو کە خالْوانی رەمزی بوون و دەتوانێ لەلایەکەوە عەشرەتەکەهان بدات بۆ یاخیبوون لە حکوومەتی بەغدای سەر بە ئینگلیز و لەلایەکی تریشەوە حیزبەکەی خۆیشی، حیزبی هیوا، پشتیان دەگرێت و بە یارمەتیی ئالْمانیا دەتوانن کۆنترۆڵی بیرە نەفتەکانی کەرکووک بکەن.

ئەمن وردەکاریی ئەم چیرۆکەم لە کتێبی Im brennenden Orient واتا (لە رۆژهەلاتی گڕ گرتوودا) بە زمانە ئالْمانییەکەی خوێندووەتەوە کە (گۆتفرید یۆهانێس میوللەر Gottfried Johannes Mueller) بە ئالْمانی نووسیبووی کە چیرۆکی خۆی و رەمزی نافیع ئاغای لە کوردستان تیدا دەگێڕێتەوە. بەلام با ئەمە بمێنی بۆ قۆناخی سالانی ئالْمانیام 1959-1961کە خۆم لەوێ ئەو میوللەرەم بە شەخسی ناسی و کتێبەکەشی بە دیاری پێشکەش کردم.

هەر چۆنێکی بێ لەوە دەچێ ئەم بیرۆکەیە بە دلی ئالْمانەکان بووبێت بەتایبەتی کە کوردیش وەک ئالْمان ئاری نەژادن و هیتلەریش لەوە دەگەرا. جا بەو ئومێدە و بۆ ئەو پلانە رەمزی دەبەن بۆ بەرلین. لەپاش ماوەیەک راهێنان ئیتر بڕیار دەدرێ کە چەند ئەفسەرێکی ئالْمان لەگەل رەمزی بە فڕۆکەیەکی جەنگی خۆیان بگەیەننە کوردستان و لەوێ لەناو عەشیرەتی خۆشناو بە پاراشووت دابەزن و خۆیان لەلای مالە خالانی رەمزی بشارنەوە و دەست بە جموجوڵی نهێنیی خۆیان بکەن بۆ سەرهەلْدانی عەشایر لە دژی ئینگلیز و بەغدا.

یەكێك لە ئەفسەرە ئاڵمانەكان ئەو میوللەرە بووە كە دواتر ئەم چیرۆكەی بە دوورودرێژی لە كتێبەكەیدا گێڕاوەتەوە و كە لەگەڵ مندا لە ئاڵمانیا بووین بە ئاشنا.

میوللەر دەڵێ لە بەرلین داوامان لە رەمزی كرد دیزاینێكی جلی كوردیی پیاوانمان بۆ بكێشێ تا بەرگدرووی سەربازیی ئاڵمان ئەو جلە كوردییانە بۆ ئەفسەرەكان و بۆ رەمزی بدروون و بە جلی كوردییەوە بە پاراشووت خۆیان لە كوردستان فڕێ بدەنە خوارەوە. هەر واشیان كرد و هەموویان بە جلی كوردی بە فڕۆكە دەگەنە كوردستان. بەڵام یان بەهەڵە لەباتی ئەوەی لەناو عەشیرەتی خۆشناوا خۆیان فڕێ بدەن ئەوان لە ناوچەی بادینان لە نزیك گوندێكی ناو (بیوكە) خۆیان فڕێ دابوو یانیش گوایا بە هەڵە نەبووە بەڵكو فڕۆكەوانەكە لەژێرەوە پەیوەندیی لەگەڵ ئینگلیزەكاندا هەبووە و بەتەگبیر لە شوێنێكی دووری ناوچەی خۆشناوەتی دایبەزاندبوون تا بگیرێن. هەرچۆنێكی بێ دابەزینەكەیان لای ئینگلیزەكان ئاشكرا دەبێت و حكوومەت پارەیەكی زۆر وەك خەڵات دادەنێ بۆ هەر كەسێك ئەم ئاڵمانانە بگرێت یان خەبەریان لێ بدات ئەگەر بیانبینن. جا میوللەر دەڵێ كە بڕیاریان وابووە لە رەمزی بەولاوە كەسیان ورتەی لە دەما دەرنەچێت بۆ ئەوەی ئاشكرا نەبن كە ئاڵمانن. دەڵێ بە پیادەیی گەیشتنە سەر زێی بادینان لەوێ رەمزی بە پارە داوا لە كابرایەكی بەلەمەوان دەكات بیانپەڕێنێتەوە و ئیتر دیسان هەر بە پێ و هەندێ جاریش بە ولاخی بە كرێ خۆیان دەگەیەننە ئەشكەوتێكی ناوچەی خۆشناوەتی. لەوێ دەزگاكانی بێ تەل و شتی وا دادەمەزرێنن و رەمزیش هەوڵ دەدات دەست بە كاری پەیوەندیكردن بكات. من خۆم هەر ئەوەندەم بە چاوی خۆم لە هەولێر دیوە كە ساڵی 43 جارێكیان فڕۆكەیەكی ئینگلیزەكان ئاگادارییەكی نووسراوی بەسەر هەولێردا باراند كە وەك دەیانگوت تێیدا نووسرابوو جاسووسی ئاڵمان خۆیان بە پاراشووت فڕێ داوە و هەر كەسێ خەبەریان لێ بدات (10000) دینار (یان

شتێکی وا) خەڵات دەکرێ. دەیانگوت لە ئاگادارییەکەشدا نووسرابوو "هەر بۆ ناسینەوە، ئاڵمانەکان دەموچاویان لە دەموچاوی شێر دەچێت." جا کوردی ئەو زەمانە کە هێشتا سینەماش نەگەیشتبووە هەولێر لە کوێ بزانن شێر چۆنە! ئیتر شەوێکیان رێبوار بە لای ئەشکەوتەکەدا رەت دەبن و دەیانەوێ وچانێکی بۆ بدەن دەبینن ئەمانەی لێنە. دواتر کە دەگەنە هەولێر خەبەریان لێ دەدەنە حکومەت و هێزێک دەچێ هەر هەموویان دەگیرێن. ئەفسەرە ئاڵمانەکان وەک دیلی جەنگ رەفتاریان لەگەڵا دەکرێت و دەیانێرن بۆ بەندیخانەیەک لە قاهیرەی میسر. رەمزیش کە عیراقی بوو حوکمی ئیعدام دەدرێت بەڵام بە واسیتە حوکمەکەی دەکەنە ماوەی ژیان. رەمزی دوو سێ ساڵ لە زیندان دەمێنێتەوە، بەڵام وا بڵاو بووەوە کە هۆشی تێکچووە و دوای کۆتایی جەنگ ئازاد دەکرێت و هێندەی پێ ناچێ لەماڵی باوکی لە هەولێر کۆچی دوایی دەکات. ئەفسەرە ئاڵمانەکانیش کە میوللەر یەکێکیان بووە ئەوانیش دوای جەنگ لە میسرەوە رادەستی ئاڵمانیا دەکرێنەوە. ئەمن لە ئاهەنگێکی نەورۆزی ساڵی 1960 لە شاری میونیخ لە ئاڵمانیا میوللەرم ناسی.

لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە هەولێر بووم و دەستم بە وەرگێرانی کتێبەکەی میوللەر کردبوو لە ئاڵمانییەوە بۆ کوردی. چەند چاپتەرێکم لێ کرد بەڵام دواتر کە شەڕی ئێران - ئێراق قەوما رامکردەوە بۆ ئەورووپا و بۆم تەواو نەکرا. خۆشبەختانە دوای من کاک بەدران ئەحمەد حەبیب ئەو لە ئینگلیزییەوە کردبووی بە کوردی و بەڕاستی جوانیشی وەرگێڕاوە.

کە تەرجەمە کوردییەکەی کتێبەکەی میوللەر لە کوردستان بڵاو بۆوە مشتومڕێکی زۆری نایەوە. چونکە رەمزی کاری لەگەڵ دەزگایەکی زانیاریی ئاڵمانیای ناتزی کردبوو هەندێ کەسی نزیک لە حزبی شیوعیی عیراقییەوە بە جاسووسی ئاڵمانیان دادەنا و دەیانووسی کە رەمزی لە جاسووسێکی ئاڵمانیای ناتزی بەولاوە هیچی تر نەبووە.

ئەمن خۆم بۆ چەند ساڵێکی کەم لە تەمەنی منداڵی و نەوجوانیمدا ئەندامی حزبی شیوعیی عیراقی بوومە و ئێستاش ڕێزی تایبەتیم بۆ خەباتی دوور و درێژی ئەوسا و قوربانییەکانی ئەم حزبە هەیە. ئەمن ئێستاش کارل مارکس لەلام یەکێکە لە ئینسانیترین بیرمەندانی مێژوو هەرچەندەکە بە گوێرەی ئەو ڕەخنە و دژەبۆچوونانەی کە ڕووبەڕووی مارکس بوونەتەوە دیارە فەلسەفەی مارکسیزمیش کون و کەلەبەری زۆری تێدایە. جا ئەمڕۆکە لەپاش ئەم تەمەنە درێژە و ئەو هەموو ئەزموونە جۆراوجۆرەی کە لە ڕێچکەی ژیانمدا پێیدا تێپەڕ بوویم دەبێ بە چاوێکی بابەتییانەی بێ دەمارگیری بۆ ئایدیۆلۆژی - هەر ئایدیۆلۆژییەک بێ - بیروڕای خۆم بخەمە ڕوو. یەکێک لەو وانانەی کە لەو ڕێچکەیەدا فێری بوویم ڕەتکردنەوەی ئایدیۆلۆژییە ئەگەر بێ بە دۆگما dogma و بە داخیشەوە زۆریان هەر دەبن بە دۆگما یان هەر لەبناغەدا دۆگمان.

سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆ کاک سەنگەری سوعاد ئاغا هەیە، بۆ ئەو وێنانەی کە بۆی ناردووم.

جا ئەگەر هاتو لەسەر ڕەمزی پرسیار لە من بکرێت، دەڵێم: "قارەمانێکی کوردپەروەری کەم وێنە و پێشمەرگەیەکی پێشڕەوی دێرین بووە"، چونکە:

یەک: کەسێک کە جاسووسی دەکات دیارە بۆ پارەیەتی. ڕەمزی ڕۆڵەی بنەماڵەیەکی زۆر دەوڵەمەند و خانەدانی هەولێر بوو کە پێویستی بە پارە نەبووە و ئەو زەمانە کە باوکی بۆ خوێندنی ناردووەتە دەرەوە کەم باوک هەبوون منداڵی خۆیان بنێرنە دەرەوە.

دوو: ئەگەر جاسووس بێ خۆ جاسووس دەبێ بنێردرێتەوە وڵاتی خۆی لەوێ تێکەڵ بە عێراقی و ئینگلیزەکان ببێت تا نهێنییان لێ بدزێت و بۆ ئاڵمانەکانی بنێرێت کەچی ئەوان ڕەمزییان نەناردەوە بۆ دەسکەوتنی دەنگوباسی نهێنی، بەڵکو خۆیان لەگەڵی چوون بۆ مەبەستێکی تایبەتی کە ڕاپەڕاندنی عەشایری کورد بووە لە دژی ئینگلیز و بەغدا.

سێ: رەمزی ئەندامێکی زۆر چالاکی حزبی هیوای زۆر ناسیۆنالیستی کورد بووە و ئایدیۆلوژیی نەتەوەپەروەری هەموو بیر و هەست و هۆشی داگرتبوو و زۆر ڕێی تێ دەچێ بە تەگبیر لەگەڵ حزبەکەی خۆی ئەم پەیوەندییەی بە ئاڵمانەکانەوە کردبێ.

چوار: کە ئینگلیز لە ئەنجامی یەکەم جەنگی جیهانا ئەو کارەساتە بەسەر میللەتەکەتدا بێنێت و بیکا بە چوار پارچەوە، ئیتر وەک ناسیۆنالیست زۆر ئاسایی و هەقی رەوای خۆتە روو لە زلهێزێکی تر بکەیت بەڵکو ئەو شتێک بۆ میللەتەکەت بکات کە ئاڵمانیاش یەکێک بووە لە زلهێزەکانی ئەو سەردەمە. لەپاشان تۆ وەک ناسیۆنالیست چ کارت بەوە دایە ئاڵمانیای نازی دوژمنی یەکیەتیی سۆڤییەتە یان دۆستیەتی، ئایا ئەگەر دوژمنی ئەو بوو دەبێ دوژمنی تۆش بێ؟ ئایا ئەگەر رەمزی لەباتی ئاڵمانەکان هاوکاریی لەگەڵ سۆڤییەتەکان بکردایە ئەو کەسانەی کە بە جاسوسیان دادەنا نەیاندەکردە قارەمانێکی قەومی! ئەم قسە بەسەرچووانە مۆدەیان نەماوە و ئەمڕۆ هەموو کورد سەر بە لایەنێکی سوپەر پاوەرە.

دەڵێن قسە قسە رادەکێشێ دەبا ئاوڕێک بۆ دواوە بدەینەوە:

ئەدی هەر سۆڤییەت نەبوو کە یەکسەر لەپاش برانەوەی جەنگی دووەم چونکە کێشەی نەفتی لەگەڵ ئێراندا هەبوو هەڵستا دوو کۆماری لەناو ئێراندا قیت کردەوە، کۆماری ئازەربایجان و کۆماری کوردستان، کە مافێکی نەتەوەیی زۆر رەوای خۆشیان بوو؟ بەڵام کە سەرەک وەزیرانی ئێران ئەحمەد قوام السلطنة بە مەرجەکانی سۆڤییەت لەسەر کێشەی نەفت رازی بوو و سۆڤییەتیش بە مەرجی ئێران رازی بوو کە دەست لەو دوو کۆمارە هەڵگرێت، واتا بەرژەوەندیی هاوبەش common interest ئیتر سۆڤییەت یەکسەر ئارتەشی سووری خۆی لەو دوو کۆمارە کێشایەوە کە دیار بوو هەر بۆ گوشار خستنەسەر ئێرانیشی دامەزراندبوون و هەردوو کۆمار یەکسەر تەپین. جەعفەر پێشاوەری سەرکۆماری ئازەربایجان زوو رای کرد و بۆی دەرچوو.

سەرەنجامی کۆماری کوردستانی مەهاباد و سەرکردەکانیشی هەموومان دەزانین بە چی گەیشت.

ئێمە لەو سەردەمەی کە ئەم پلان و تەگبیرە نهێنییانە لەپشت دەرگای داخراودا دەکران بێ ئاگا بووین لە پێچ و پەنای سیاسەتی جیهانی و هەر چەپڵەمان بۆ یەکیەتیی سۆڤییەت و ستالین لێ دەدا.

ئەمە بوو هەڵوێستی سۆڤییەتەکان کە تەنها بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئەو دوو کۆمارەیان دروست کردبوو نەک لەبەرچاوی ڕەشی کورد و ئازەرییەکان.

بەڵام بۆ مێژووش دەڵێم: یەکیەتیی سۆڤییەت بە تایبەتیش خودی لینین چاکەیەکی یەکجار زۆری بۆ نەژادە جۆراوجۆرەکانی ناو سۆڤیەتستان بووە و هەندێکیانی هەر لە چەند خێڵێکی پەرشوبڵاوی دەشت و بانەکانی (ئوراڵ -ئالتای)ەوە کرد بە نەتەوە nation و سنووری نەتەوەیی کۆمارێکی ڕێکوپێکی بۆ دیاری کردن کە ئەمڕۆ دوای نەمانی سۆڤیەتستانیش وا بۆ خۆیان بەر و بەرهەمەکەی دەڕنن و بە دەردی کورد نەچوون.

قسەیەکی کۆنی کوردی هەیە دەڵێ: "کێ چۆلەکەم بۆ بگرێ بەو دەڵێم مامە". جا توخوا نەک هەر گەنجێکی وەکوو ڕەمزی حەفتا ساڵ لەمەوبەر بەڵکو ئەمڕۆکەش ئەگەر ئەمەریکا یان رووسیای پوتین یان ئیسرائیل یان عەرەبستانی سەعودیش یارمەتیمان بدات بۆ سەربەخۆیی کوردستان ئایا دەبێ ڕەتی بکەینەوە؟ بۆ کورد، خۆهەڵپەساردن بە زلهێزێکەوە نەک هەر ڕەوایە بەڵکو بێ ئەوە هەر ناشکرێت. کورد لە هەرچوار لاوە بە دوژمن دەورە دراوە و هیچ سەرەدەرێکیشی نییە لەسەر ئاو. کەسیش بەخۆڕایی چۆلەکەت بۆ ناگرێ ئەگەر بەرژەوەندیی خۆی لە وڵاتی تۆدا ڕەچاو نەکردبێت. لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا کەس شت بۆ مرۆڤایەتی ناکات بەڵکو بەرژەوەندی لەبەرچاو دەگیرێت نەک ئیدیۆلۆژی و ئەو قسە بەسەرچووانە. بۆیە لە سیاسەتی ئەمرۆدا کورد دەبێ بە لایەنەکەی

تر بسەلمێنێت و بازاڕی لەگەڵا بکات: ئەوەندە بۆ تۆ و ئەوەندەش بۆ من. جا لێرەدا ئەگەر کورد و لایەنێکی بیانی بەرژەوەندیيان لە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ یەکدی گرتەوە کورد بۆ نەیکات؟ ئاڵمانیا مرخی لە نەفتی کوردستان خۆش کردبوو، رەمزیش دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستانی لە بەرچاو گرتبوو، ئەریّ کاکە بۆ خراپ دەبوو ئەگەر سەری بگرتایە... ها؟

بۆ رەمزی، کورد دەبیّ پەیکەرێک بە بەرزیی باڵای قەلا لە مەیدانێکی گەورەی شاری هەولێر و لە شارەکانی دیکەی کوردستانیش بەرز هەڵبدات و چیرۆکی رەمزی نافیع ئاغا بخرێتە ناو وانەی مێژووی سیاسیی کورد لە قوتابخانەکانماندا.

ئەمە بوو کورتەیەکی سەربردەی رەمزی نافیع ئاغا، بەڵام ئایا حکوومەتەکەی هەرێم یەک تاکە جاریش بیری لەوە کردووەتەوە نوێنەرێک بنێرێت چەپکە گوڵێک بخاتە سەر گۆڕە بێنازەکەی رەمزی؟ رەمزی مێژوویەکی دروست کرد ناکریّ لەبیر بکریّ.

هەر وەک کە پێشتر ئاماژەم پیّ داوە باری سەربازیی جەنگ وای پیشان دەدا کە ئاڵمانیای ناتزی بەرەو شکست دەڕۆیشت. لە هەولێریش گەنجێکی زۆری کوردپەروەر رووی خۆیان دەدایە یەکیەتیی سۆڤیەت و ستالین. لە ماڵی ئێمەش براکانم کاک ئەنوەر و کاک موحسین و خۆیشم بووین بە شیوعی. هەینیّ ئەمن منداڵ بووم هەر بەگەڵ کەوتبووم. ئیتر ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم وای لیّ کردین کە دۆستایەتی تەنها لەگەڵ هاوبیرەکانمانا ببەستین. ئەو شیوعیيانەی کە ئەوسا بوون بە دۆستی زۆر نزیکی ئێمە و هەمیشە کۆبوونەوەی نهێنییان لە ماڵی ئێمە و ماڵی ئەوانیشدا دەکرد هەندێکیان ئەمانە بوون: لە خزمەکانی خۆمان عەلی فەتاح و مەحمود کانەبی و جەوهەر و حەمەی حوسێنی مەلا و خالیسی شێخ جەواد (لەوە زۆر دڵنیا نیم ئەگەر کاک خالیس ئەندام بووبێت) و لە هەولێرییەکانیش تەواوی بنەماڵەی حەیدەر ئەفەندی حەیدەری کە بریتی بوو لەو برایانە: عاسم

حەیدەری، جەمال حەیدەری، موهیب حەیدەری، مومتاز حەیدەری، جەمشید حەیدەری (ئەم دووانەی دواییان ئەوسا هێشتا وەک خۆم منداڵ بوون). سالح حەیدەریی براشیان لە بەغدا دادەنیشت و هەنگی من هەر ناوبانگیم دەبیست خۆیم نەدیبوو، ئینجا حەمید عوسمان، یەحیا سەلیم، عەزیز محەمەد، شێخەشەل، عادل سەلیم، موسا سولەیمان، نافیع یونس، سالم حەیدەری، هاشم عەبدوڵلا. مەجید ڕەووفی کۆیی و شێخ سولەیمانی ڕواندزیش دەهاتنە لامان.

## پلکە سوڵتان و ئەحمەد وەیسی

وەک کە پێشتریش ئاماژەم پێ داوە براکانم و من کە لە وەرزی خوێندنا خانووێکمان لە هەولێر بەکرێ دەگرت دایکم و کاک ئەحمەدی براگەورەکەمان ژنێک بۆ بنەوانی و پیاوێکیشیان بۆ خزمەتکردن لەگەڵمانا دەنارده هەولێر. ماوەیەکی کەم نەبێ ئەگینا بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە من لە هەولێر دەمخوێند ئەو دوو کەسە پلکە سوڵتان و ئەحمەد وەیسی بوون و هەردووکیان لە دوو بنەماڵەی جوتیاری ناوداری دووگردکان بوون. پلکە سوڵتانی حەمەد مەحمودی ئۆرمزیار ژنێکی تێکسمراوی تەمەن شەست ساڵیەکی ئێسک سووک بوو و سەر و پرچی خۆی لە خەنە دەنا و کابانێکی چێشت زۆر خۆش بوو. ئەمن زۆر جار کە غەریبیم هەڵدەستا و بیری دایکمم دەکرد شەوان دەچووم لە باوەشی پلکە سوڵتان دەنووستم کە دەبوو بە سەبوورییەکی هێورکەرەوە بۆ گیانی پڕ لە ژانی لە هێلانە دابڕاوم. ئێستاش کە بەبیرم دێتەوە مەلی نۆستالگیا دەمگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ساڵانەی کە غەریبیی خۆم لە باوەشە گەرمەکەی پلکە سوڵتانا دادەمرکاندەوە. پلکە سوڵتان نەک هەر لای من و براکانم بەڵکو لای هەموو ئەو میوانانەی کە دەهاتنە لامانیش خۆشەویست بوو و گاڵتە و قسەی خۆشیان لەگەڵا دەکرد. بە تایبەتی شیوعییەکان کە زۆر جار

نەشرە و مەشرەیان دەدایێ لە باخەڵی خۆی بیشاریتەوە و بیگەیەنێ بۆ ماڵێکی دیکەی مەبەست.

هەرچی ئەحمەد وەیسی یە کە کوڕی مام تەهای پاڵانی بوو ئەویش لەناومانا وەک برایەک وابوو و بۆ هەرکوێ بچووبایەن لەگەڵمان دەبوو. ئێوارانیش کە ئێمە خەریکی خوێندن دەبووین کاغەز و قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگمان دەدایێ بۆ خۆی ڕەسم و شتی وا بکێشێ. لە هەموو خۆپیشاندانێکیشا مام وەیسی لەگەڵمانا لە پێشەوەی جەماوەر دەڕۆیشت و تۆبزێکیشی لە باخەڵی دەشاردەوە ئەگەر ببوا بە شەڕ لەگەڵ پۆلیسا. ڕەوانیان شاد بێ و یادیان بەخێر پلکە سوڵتان و ئەحمەد وەیسی، ساڵانی دوور و درێژمان پێکەوە بەسەر برد.

ئەو چەند ساڵانەی قۆناخی خوێندنی سەرەتاییم لە هەولێر (1950-1943) پڕ بوون لە ڕووداو و چالاکوانانی سیاسیی دیار و بەرچاو لە هەولێر. یەکێک لەو کەسایەتییانەی کە لەو ساڵانەدا ڕۆڵی گرنگیان لە بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دەگێڕا عەونی یوسف بوو کە لای سەوادی خەڵکەکە هەر بە کاک عەونی ناسراو بوو.

## عەونی یوسف

کاک عەونی کوڕی یوسف ئەفەندی بوو و باوکی لە سەرایییەکانی سەدەی بیستەم قازیی هەولێر بووە. پێم وایە بە عەشیرەت باجەڵان بوونە بەڵام هەر لە هەولێر گەورە بووبوو و وەک خۆیشی دەیگوت دایک و باوکی لە ماڵەوە بە تورکمانی قسەیان کردووە هەر چەندە کە کوردیش بوون بەڵام ئەو زەمانە کاریگەریی زمان و کولتووری عوسمانلی هێشتا زاڵ بووە هەر وەک کە هەندە ماڵە کوردیش کە ماوەیەک لە بەغدا دادەنیشن منداڵەکانیان لە نێوان خۆیاندا بە عەرەبی قسە دەکەن. کاک عەونی کۆلێژی ڕەوا لە بەغدا تەواو دەکات و بۆ ماوەیەکیش دادوەری دەکات. هەر لە ساڵانی کۆلێژی

بەغدای تەبای هەموو کوردە رۆشنبیرەکانی بەغدای ئەو سەردەمە تێکەڵ بە بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردی دەبێت. ئەمن بە تەواوی نازانم چ ساڵێکی چلەکان بووە، بەڵام ئەوەندەم لەبیرە کە کاک ئەحمەدی کاکم کە لە دووگردکانەوە دەهات بۆ هەولێر هەمیشە برادەرێکی لەگەڵ خۆی دەهێنایەماڵەوە و هەڵسان و دانیشتنیان هەمیشە پێکەوە دەبوو. ئەو برادەرە کاک عەونی بوو کە دیار بوو کاکمی لەناو رێکخراوی یەکێک لە حزبە ناسیۆنالیستەکانی کوردی رێک دەخست، نەمدەزانی کامە حزب بوو. بەڵام دواتر ئاگام لەوە هەبوو کە هەردووکیان و کاک سەعدیی براشم لەگەڵیانا ئەندامی حزبی دیموکراتی کورد بوون کە لەپاشانا ئیبراهیم ئەحمەد ناوەکەی گۆڕی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان. کەچی هەردوو براکانی ترم کاک ئەنوەر و کاک موحسین و خۆیشم لەگەڵیانا وەک پێشتریش باسم کردووە ئێمە بووین بە ئەندامی حزبی شیوعیی عێراقی کە ئەویش لەپاش بڕانەوەی جەنگ بۆ ئەوەی مۆڵەتی رەسمیی پێ بدرێت ناوی خۆی گۆڕی بۆ (الحزب التحرر الوطنی) بەڵام مۆڵەتەکەشی هەر پێ نەدرا. جا هەر جارێکی کاک ئەحمەدی برام کاک عەونیی لەگەڵ خۆیا بهێنایە ماڵەکەی ئێمە لە هەولێر، ئەمن بەو منداڵییەی خۆم رکم لێی دەبۆوە چونکە دەمزانی هاتووە کۆبوونەوەی پارتایەتی لەگەڵ کاکما بکات. پاش ساڵانێک کە گەورە بووم و کاک عەونی بوو بە خۆشەویستی هەموومان بە بیری دەهێنامەوە دەیگوت: " ئای کە ئەتو مەبدەئی بوویت کاک عومەر! " توومەز هەستی دەکرد کە رکم لێی دەبۆوە.

جا دوای جەنگ کە تەواوی ئەورووپای رۆژهەڵات کەوتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤییەت و دواتریش سەرکەوتنی ماو تسی تونگ ساڵی 1949 لە چین ئەمە هەمووی وای لە زۆر لاوی کوردیش کرد ئەمجارەیان ئیتر روو لە مۆسکۆ بکەن. راستییەکەی، سەرکەوتنی سۆڤییەت و ژێرکەوتنی نازیزم و فاشیزم لە جەنگا شەپۆلێکی چەپڕەوی لە تەواوی

دونیادا لێ کەوتەوە. چینی رۆشەنبیری وەک بیرمەند و نووسەر و شاعیر و هونەرمەندی موزیک و بۆیەکار و ئاکتەری سینەما و زۆر بواری تری کولتوور یان بوون بە شیوعی یان مارکسیەکی سەربەخۆ یان هەر نەبێ مەیلی سۆسیالیزم و چەپیان لا گەڵاڵە بووبوو. چەپڕەوی بوو بە مۆدە و وەک زەنگێکی ترسناک لە وڵاتە سیستەم سەرمایەدارەکاندا دەنگی دایەوە. وەک کاردانەوەی پەرەسەندنی شیوعییەت بزووتنەوەی (اخوان المسلمين)یش کەوتە جموجۆڵ و دەوڵەتیش پشتی دەگرتن، لە کوردستانیش هەروا. ئەمانە ئاگر کردنەوەی نەورۆزیان بە ئاگرپەرستی لای خەڵک پیشان دەدا و پرۆپاگەندەیان دەکرد کە شیوعییەکان دەیانەوێ ژن بێ عەبا بگەڕێنت و ئەمەیان کردۆتە دروشمی خۆیان "چیتان دەوێ ؟... سەربەستی، عەبا و پێچە هەڵبستی". جا لە ئەنجامی تیژبوونی ئەم ناکۆکییانەی نێوان چەپ و راستی کۆمەڵگای کوردا شەوێکیان لە ساڵی 1948 لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیی هەندێ شیوعیی پلە بەرزی هەولێر لە ماڵی ئێمە کە ئەوسا لە خانووی حاجی یونس بووین لەپشت سەرای هەولێر دەسرێژێکی گوللە لەو پەنجەرەیەوە بۆ ناو ژووری کۆبوونەوەکە کرا کە کەوتبووە سەر کۆڵان. ئەوانەی لە کۆبوونەوەکەدا بوون کاک ئەنوەری برام و کاک عاسم حەیدەری و رەنگە کاک جەمال حەیدەری و نازانم کێی تریش. خۆشبەختانە گوللەکان هەمووی بە دیوار کەوتن هەر چەند سەنتیمێترێک بە تەنیشت سەری دانشتووەکانەوە.

دەنگۆ بڵاو بۆوە کە کۆمەڵەی (اخوان المسلمين) بەو کارە هەڵساوە بەڵام حکوومەت رووداوەکەی پەردەپۆش کرد و کەسی نەگرت.

لەو هەموو حزبە کوردییانەی کە هەبوون هەندێکیان بەگەڵ حزبی شیوعی و هەندێکیش بەگەڵ پارتیی تازە دامەزراوا دەکەوتن. ململانێی سیاسیی سەرەکیش کەوتە نێوان ئەو دوو حزبەوە. لە راستیدا پارتیش خۆی بە حزبێکی چەپڕەو دادەنا و هەر واش بوو و یەکێک لە پرەنسیپەکانی پارتی ئەوە بوو کە "سوود لە دۆکترینی مارکسی

- لینینـی وەردەگرێـت" کـە بـە تـەواوی نایەتـەوە بیـرم لـە چ سـاڵێکا ئـەم دۆکترینـەی خسـتبووە نـاو بەرنامـەی خۆیـەوە. هـەر حکوومـەت و ئینگلیزەکانـی عێراقیـش پارتیـان هـەر بـە مەیلـەو شـیوعی دەناسـی بـە تایبەتـی کـە مـەلا مسـتەفا سـاڵی 1947 پەناهەنـدەی یەکیەتیـی سـۆڤیەت بـوو و ئـەوان لـە نووسـینەکانیانا هـەر بـە مـەلای سـوور The Red Mulla ناویـان دەهێنـا. بـەڵام لەلایەکـەوە چونکـە پارتـی بەرنامەیەکـی نەتەوەیـی کـوردی پەیـڕەو دەکـرد کـە بـەلای شـیوعیەکانەوە لەگـەڵ پرەنسـیپی "یەکپارچەیـی چینـی پرۆلیتاریـای جیهانـی" مارکسـیزم نەدەگونجـا و لەلایەکـی تریشـەوە ژمارەیەکـی زۆری ئاغـا و دەوڵەمەندانـی ئـەو سـەردەمە ئەوانیـش بووبـوون بـە ئەندامـی پارتـی بۆیـە شـیوعییەکان ئـەو حزبەیـان بـە حزبـی دەرەبـەگ و سـەرمایەداران لەقەڵـەم دەدا. لـە هەولێـر کەسـایەتیی دیـار و بەرچـاوی پارتـی کاک عەونـی بـوو و ئـەوەی شـیوعییەکانیش ئامۆزایەکـی ئێمـە کاک جەوهـەری حوسـێنی مـەلای دزەیـی. کاک عەونـی کـە لـەو سـاڵانە گیرابـوو هـەر بـە تۆمەتـی شـیوعییەت گیرابـوو. ئێمـەی منداڵـە شـیوعی فێـر دەکرایـن کـە پارتییـەکان ببینیـن بـە گاڵتـە پێکـردن و قەشـمەری پێیـان بڵێیـن (پاتـری پاتـری) و منـداڵانی ئەوانیـش کـە ئێمـەی شـیوعییان دەدی دوو پەنجـەی خۆیـان سـەرەوژێر لـە شـوێنی سـمێڵ دادەنـا وەک قەشـمەریکردن بـە سـمێڵی سـتالین. چاکـم لەبیـرە لەگـەڵ خورشـیدی برایماغـای دزەیـی (دکتـۆر خورشـید دزەیـی ئەمـڕۆ) کـە ئامـۆزا و هاوکلاسـیش بوویـن ئـەو بـە سـمێڵی سـتالین منـی تـوورە دەکـرد و منیـش بـە وشـەی پاتـری لەجیاتـی پارتـی. کەچـی وا خـۆی ئەمـڕۆ سـمێڵێکی لـەوەی سـتالین گەورەتـری بەرداوەتـەوە.

کاک عەونی نـەک هـەر لـە هەولێـر، بەڵکـو تـا سـاڵانی پەنجاکانیـش دەهاتـە گونـدی دووگردکانـی ئێمـە و دەچـووە گونـدی (دووکەڵـە) ی کاک مشـیر ئاغـای دزەیـی و گونـدی (ئۆمـەراوە)ی کاک برایـم عەلـی ئاغـای دزەیـی بـۆ پەروەردەکـردن و رێکخسـتنی ئـەو ئاغایانـە و جوتیارەکانیـان لەنـاو پارتیـدا. ئێمـەی شـیوعیش لـە دووگردکان قسـوورمان

نەدەکـرد و ژمارەیەکـی باشــمان لــە جوتیارەکانــی خۆمــان کردبــووە ئەندامـی حزبـی شـیوعی. کاک عەونـی بـەوەش ناوبانگـی دەرکردبـوو کـە لـە هەمـوو دانیشـتنێکا قسـەیەکی هەبـوو دووبـارە و سـێبارەی دەکـردەوە دەیگـوت: "جەنـاب، کـورد مەغـدوورە".

پـاش ماوەیـەک کـە تیتـۆی یوگۆسـلاڤیا لە سـتالین هەڵگەڕایـەوە بیرمە حزبـی شـیوعیی عێراقیـش بەیاننامەیەکـی دەرکـرد بـە سـەرناوی (تیتـۆی ئینتیهـازی). بـە پێنـج و دوو رۆژێـک ئـەو قارەمانـە کۆمۆنیسـتە نـاودارەی کـە بـە شـەڕی پارتیزانـی هێزەکانـی هیتلـەری لـە یوگۆسـلاڤیا لـە زەواق نابـوو، بـوو بـە تیتـۆی ئینتیهـازی. دوای تیتۆ بەرپرسـی شـیوعییەکانی هەولێر جەوهـەری حوسـینی مـەلای دزەیـی ئامۆزامـان ئەویـش هەڵگەڕایـەوە لـە حزبـی شـیوعی دەرچـوو و هـەر بـە تـەواوی وازی لـە سیاسـەتیش هێنـا. لەبیرمـە ئێمـەی منداڵـە شـیوعی فێـر دەکرایـن لـە هـەر کوێیەکـی تووشـی کاک جەوهـەر ببیـن لـە دوورەوە بـە پـلار بـە دەنگێکـی بـەرز پێـی بڵێیـن: "هـەزار ئینتیهـازی بـە فلووسـێک" کـە نەشـماندەزانی ئینتیهـازی یەعنـی چـی.

عەونـی یوسـف بەراسـتی رۆڵێکـی کاریگـەری هەبـووە لـە رێکخسـتنی ژمارەیەکـی زۆر لـە جوتیارانـی دەشـتی دزەیـی لەنـاو پارتیـدا و لەنـاو شـاری هەولێریـش کـە زۆرێـک لـە دانیشـتوانەکەی هەیێکـە هەرچەنـدە کـە کوردیـش بـوون بـەڵام بـە تورکمانـی قسـەیان دەکـرد. جێی پەنجـەی کاک عەونـی لـە بزووتنـەوەی ئاشـتییانەی کوردایەتـی کـە چەندیـن جـار لەسـەری کەوتۆتـە زینـدان و دوورخسـتنەوە بـە زەقـی دیـارە بۆیـە پێویسـتە لـە قوتابخانەکانـا لـە وانـەی مێـژووی کـورد بـە وردی باسـی خەباتـی دوورودرێـژی بکرێـت.

## شێخە شەل

شێخە شەل کە ناوی (شێخ محەمەد محەمەد) بوو بەڵام چونکە هەر لە منداڵییەوە لاقێکی شەل بوو بۆیە لە هەولێر ئەو ناوەی بەدوو کەوتبوو. شێخە شەل کە لە خێزانێکی کاسبکاری هەولێرێ بوو ئەندامێکی چالاکی حزبی شیوعیی عێراقی بوو و دوکانێکی زۆر بچووکی لە دوکانەکانی دامەنی قەڵا هەبوو بۆ فرۆشتنی رۆژنامە و دابەشکردنی بە نهێنیی هەندێ بڵاوکراوەی حزبی کە ئەو ریزە دوکانانەش هەمووی مولکی ئەحمەد ئەفەندیی مێردی پوورم بوون. دوکانەکەی لە راستیدا دوکان نەبوو بەڵکو بریتی بوو لە تەنیا چەند پلیکانەیەک کە دەبوایە بۆ چوونە سەربانی دوکانەکانی تر بەکار بهێنرێت بەڵام دیار بوو تەرک کرابوو و چوونەدەری پلیکانەکان گیرابوو و کرابوو بە دوکانێک تەنها جێگای سێ چوار کەسی لێ دەبۆوە. شێخە شەل پیاوێکی باش و دڵسۆز بوو بۆ بیروباوەڕی خۆی و کونە دوکانەکەی بووبوو بە شوێنی دیدەنیی رۆژانەی ئەندامانی حزبی شیوعی کە هەر بە پێوە یەکتریان دەدی. بیرمە ئەمن دەچووم رۆژنامەی (الاساس)ی حزبی (التحرر الوطني)م لەوێ دەکڕی کە سەرنووسەرەکەی شریف الشیخ بوو و هەڵبەت هیچیشی لێ تێ نەدەگەیشتم چونکە عەرەبیم نەدەزانی بەڵکو تەنیا بۆ فیز لێدانم بوو لەناو برادەرەکانم کە بزانن من رۆشەنبیرم و رۆژنامە دەخوێنمەوە. هەروەها چاکم لەبیرە جارێکیان کاک جەمال حەیدەری دەهاتە ماڵمان منیش بەخێرایی کتێبە قورسەکەی کارل مارکس بە عەرەبی (المادیة الدیالکتیکیة)م بردە ژوورەکەی خۆم کردمەوە. کاک جەمال بەلامدا هات گوتی ئەوە لەو کتێبە دەگەی؟ گوتم ئا ئا چۆن تێناگەم! باوەڕ بکەن ئەگەر پرۆفیسۆری زمانی عەرەبیش بووام لەو کتێبە فەلسەفییە هەر نەدەگەیشتم. شێخە شەل لە خۆپیشاندانەکانی ساڵی 1948 بەو

شەلییەی خۆی منی لەسەر شان و ملی خۆی دادەنا و لە پێشەوەی خۆپیشاندانەکان سروودی نیشتمانیم دەگوت.

بێجگە لە کونە دوکانەکەی شێخە شەل شیوعیەکانی هەولێر لە (چاپخانەی حەسەن رەزا)ش دادەنیشتن و لەوێ رۆژنامە و بەیاننامەی حزبییان ئاڵوگۆڕ دەکرد. چاپخانەی حەسەن رەزا کە ناوەکەی ئێستا بووەتە (چاپخانەی مەچکۆ) بۆ ئەو سەردەمەی ساڵانی چلەکان شوێنی دانیشتنی چینی رۆشەنبیرانی هەولێر بوو و بەدەم گەمەی دۆمینە و تاوڵە و چای و حامز خواردنەوە و جگەرەکێشانەوە، باسوخواسی سیاسیی ناوخۆ و دونیاشی لێ تاوتوێ دەکرا. مام حەسەن رەزا و عوسمانی کوڕیم چاک لەبیرە کە خزمەتی میوانەکانیان دەکرد و ئەوان خۆیان هیچ پەیوەندییەکیان بە شیوعییەتەوە نەبوو بەڵام شیوعییەکان ئەوێیان هەڵبژاردبوو. هەرچی پارتییەکان بوون ئەوان کتێبخانەی سەربەستی شوێنی دیدەنی و ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕی حزبایەتییان بوو. خاوەنی کتێبخانەکە مەلا رەئوف مەعروف بوو کە خەڵکی گوندی قشاغلوو بوو و دوکانەکەش لەسەر جادەی گشتی بەرامبەر قەڵا بوو. کتێبخانەکەی ئەو گەورە و فرەوان بوو و هەموو جۆرە رۆژنامەی عێراقی و کۆڤاری میسری و هەندێ پێداویستیی قوتابخانەشی لێ دەفرۆشرا.

جا ئێمەی مناڵ کە ئەو کتێبخانە خۆشەی پارتیەکانمان لەگەڵ کونەکەی شیخە شەلی شیوعییان بەراورد دەکرد وا فێر دەکراین بڵێین ئەوە ئیستیعمار و ئاغا دەرەبەگەکان پارەیان دەدەنێ ئەگینا بۆچی کتێبخانەی پارتییەکان ئەوەندە گەورە و خۆشە و هی شێخە شەلی شیوعیەکانیش دوو پلیکانە و پەڕپووتە. مەلا رەئوف برایەکی هەبوو پێم وایە ناوی ساڵح بوو، هەموو بەیانییان رۆژنامە عێراقییەکانی کە لە بەغداوە سەرلەزوو دەگەیشتن دەخستە سەر باسکی خۆی و جادە بە جادە، دوکان بە دوکان دەگەڕا و بانگی دەکرد بۆ فرۆشتنیان.

لەو ساڵانەی کە لە قۆناخی خوێندنی سەرەتایی بووم لە هەولێر

(1943-1950) چەندیـن گۆزەگۆزمـان لـەم خانـوو بـۆ ئـەو خانـووی کـرێ دەکـرد. سـاڵێک یـان دوان کـە بەتـەواوی لەبیـرم نەماوە لـە خانووی حەسـەن حوسـنی بوویـن لـە کۆڵانـە بنبەسـتەکەی خانەقا. حەسـەن حوسـنی باوکـی بـرادەری دواتریـم دکتـۆر عادیلـی رەحمەتـی بـوو. جـا بـا کورتـە چیرۆکێکـی خـۆم و عادیـل بگێڕمـەوە هەرچەنـدە کـە هـی چلەکان نیـە هـی شەسـتەکانە بـەڵام وا کـژی هاتـووە بـا ئـەم بازدانـەی بـۆ بکـەم. لـە شەسـتەکانی سـەدەی رابـردوو عادیـل کە دیـارە لەسـەردەمی عەبدولکەریم قاسـما ببـوو بـە شـیوعی نێردرابـوو بـۆ خوێنـدن لـە یەکیەتـی سـۆڤیەت و دکتـۆرای نازانـم لـە شـتێک وەرگرتبـوو. کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کـورد لـە ئەوروپـا کۆنگـرەی سـاڵانەی خـۆی هـەر جـارە لـە یەکێـک لـە شـارەکانی ئەوروپـا دەبەسـتا. زۆرێـک لـە خوێندکارانـی کـوردی وڵاتانـی ئەوروپـای رۆژئـاواو رۆژهـەڵات دەهاتـن بەشـدارییان دەکـرد. لـەو کۆنگرانـەش شـەڕە قسـە و حەفتوهەشـت هـەر لـە نێـوان شـیوعییەکان لـە لایـەک و پارتییـەکان و کـوردە ناسیۆنالیسـتە سـەربەخۆیەکانیش لەلایەکـی تـرا دەبـوو. ئەمـن هەنگـی ببـووم بـە پارتـی یـان کوردێکـی سـەربەخۆ بووم چونکـە بـۆ چەندسـاڵێکی کـەم لەنـاو پارتـی مامـەوە. عادیـل ئاگرخـۆر بـۆ شـیوعییەت، مـن ئاگرخـۆر بـۆ کوردایەتـی. عادیـل زۆر شـەڕاوی بـوو و لەسـەر شـیوعیەت و لەسـەر مۆسـکۆ لاری نەدەبـوو لەنـاو کۆنگـرەدا بیـکا بـە شـەڕە لینگـە قۆنـدەرە. ئێمـەی پارتیـش (فازیـل گەنـج عەلـی) مـان هەبـوو کـە کوڕێکـی فەیلـی بەغدایـی زۆر ناسیۆنالیسـت بـوو ئەویـش لـە عادیـل شـەڕاویتر و کـورد واتەنـی هەمیشـە خەنجـەر نیوەکێـش بـوو و خواخـوای بـوو ئاگـری مشـتومڕ لەنـاو کۆنگرەکـەدا پـەرە بسـەنێت و بـێ بـە شـەڕ. بـەڵام بـاش بـوو نەدەگەیشـتە ئـەو ئاسـتە. هـەر شـیوعییەک قسـەی بکردایـە کـە بـە دڵـی کـوردە ناسیۆنالیسـتەکان نەبووایـە فازیـل بـێ پەنجەهەڵبڕیـن و بـێ مۆڵـەت وەرگرتـن لـە بەڕێوەبـەری کۆبوونەوەکـە بـۆی هەڵدەسـتایە سـەرپێ و بـە عەرەبـی دیکـرد بـە هـەرا دەیگـوت " خللینـي اجاوبـه" هەرچەنـدە بەڕێوەبـەر بانگـی دەکـرد فازیـل دانیشـە

خەڵکی تر پێش تۆ ناویان بۆ کۆمێنت نووسراوە کەچی ئەو وازی نەدەهێنا و هەر دەیگوت "لا لا، لازم انی اجاوبە". بەم دوایانە کە لەگەڵ عادیلا بووین بە برادەری یەکتری من لە ئەمەریکا ئەو لە کەنەدا بوو سەردانی یەکتریمان دەکرد و زۆر بە خۆشییەوە باسی ئەو رابردووانەمان دەگێڕایەوە. ئەمجارەیان ئەو ببوو بە مەلاییەکی ئاگرخۆر منیش جەلالی. کە لە ئەنجامی حەفتوهەشتێکی گەرمی سیاسیمان نەدەگەیشتینە یەک و لێک گیف دەبووینەوە ئەو رووی لە رووناکی هاوسەرم دەکرد دەیگوت " رووناک خان بەخوا تۆ لە مێردەکەت ئاقڵتری، تۆ کلیلی ئەقڵی ئەویت، دە تۆزێ کلیلەکە بادە با خوا هیدایەتی بدا. " منیش لە وەراما پێم دەگوت " ئێ عادیل چانییە ئەمن کلیلێکی ئەقڵم هەیە، خۆ تۆ ئەوەشت نییە بۆیە هەروا هاڕەت لێوە دێ" یادی بەخێر کاک عادیل حەسەن حوسنی قسەخۆش.

جا با بگەڕێمەوە بۆ کۆڵانەکەی خانەقا. ئەو کۆڵانە چەندماڵێکی بنەماڵەی گەورەی هەولێری لێ بوو. ماڵی عوسمان ئاغای باوکی کەمال عوسمان و سەلاح عوسمان و لامیعەخان و سامیعەخان کە پەیوەندی خێزانیمان لەگەڵیانا هەبوو. هەر جارێکی دایکم و خوشکم و براژن لە دووگردکانەوە بهاتبانە لامان سەردانێکی سەعدیە خانی خێزانی عوسمان ئاغایان دەکرد. لەپاشان ماڵی شێخ رەئوفی خانەقای باوکی دوو لە برادەرە هاوکلاسە خۆشەویستەکانم مەعروف و سەلاح. پێم وایە ماڵی شێخ جەمیلی باوکی کاک فەتحی برادەریشم هەر لەوێ بوو. ئینجا ماڵی شێخ عومەر و شێخ حوسێنی قازی کە فاروقی شێ عومەریش برادەرم بوو و عەفافە بچکۆلەی خوشکیشیم لە بیر ماوە. نازانم ئەگەر ماڵی کاک حەمەسائیبی نەقشبەندی ئەویش هەر برادەرو هاوکلاسم لەوێ بووبێ. ئینجا ماڵی مەلا سەبری کە ئەویش تەنیا دوو کچی عازەبی هەبوو سەعدیەخان و ساجیدەخان. ماڵێکی تریش بەرانبەر ماڵەکەی ئێمە بوو کچێکی جوانکیلەی تەمەنی منالیی منیان هەبوو ناوی جیهان بوو. ئێستاش شێوەی جیهانی جوان

و دیمەنـی ئـەو کۆلانـە و دانیشـتووەکانیم وەک فیلمـی سـینەمایی وا لەبـەر چـاوە. ئەوەشـم چـاک لەبیـرە کـە کاک فایقـی شـێخ جەمیلـی خانەقـا لەگـەڵ عومـەری عەلـی ئاغـای دزەیـی ئامـۆزام (یادیـان بـە خێـر) زۆر بـرادەر بـوون و شـەو و رۆژ پێکـەوە بـوون پێـم وایـە هەدووکیـان ئەندامـی حیزبـی (هیـوا) یـان (ژ. ک.) یـان (رزگاری) ناسیۆنالیسـت بـوون. سـەعدەدین شـەریفیش گەنجێکـی کوردپـەروەری زۆر نوکتەچـی و گاڵتەبـاز بـوو و لـەوە دەچـێ لـە حیزبێکـی کـوردی تـر بووبـێ چونکـە خـۆی نازنـاوی (گێـزەر)ی نابـووە پـاڵ حیزبـی هیـوا وەک گاڵتەپێکـردن بـە عەزیـز فەتاحـی بەرپرسـی هیـوا لـە هەولێـر کـە کەمـێ بـەژن کـورت بـوو و لەنـاو خەڵـکا بـە عەزیـزە قوتـە ناسـراو بـوو بـەڵام سـەعدەدین لـەوە زیاتـر دەڕۆیشـت دەیگـوت بەژنـی هـەر هێنـدەی گێزەرێکـە و حیزبەکەشـی ناونابـوو حیزبـی گێـزەر. دیـارە عومـەری عەلیاغـا کـە کـوڕە ئاغایەکـی خـاوەن مەڕومـاڵات بـوو لـە وەرزی بەهارانـا هەمیشـە دیـاری لـە گوندەکـەی خۆیانـەوە گونـدی (قەپـڵان) ی ناوچـەی کەندیناوە بـۆ فایـق دەهێنـا بـۆ هەولێـر. ئینجـا سـەعدەدین شـیعرێکی درێـژی گاڵتەجـاڕی بـۆ ئـەو دوو بـرادەرە هەڵبەسـتابوو کـە هەنگـی مـن منـاڵ بـووم و تەنیـا ئـەم کۆپلەیـەم لـێ لـە بیـر مـاوە: "ماسـت و پەنیـر و کاوڕ و خـوری ... ئەمانـە هەمـووی دیـاری عومـەری" وەک پێشـتریش باسـم کـردووە سـەعدەدین لـە پڕێـکا خـۆی کوشـت و کـەس نازانـێ بۆچـی وای کـرد، یـادی بەخێـر کوڕێکـی باڵابـەرزی قـۆزی هەمیشـە دەم بـە پێکەنیـن بـوو.

لەپـاش خانوەکـەی حەسـەن حوسـنی لـە خانەقـا ئیتـر بـۆ سـاڵەکانی دواتـر خانوێکـی مـەلا غەنـی و پـاش ئـەوەش خانوێکـی عەبـۆی تەهـا ئاغامـان بـە کـرێ گـرت. هـەردوو خانـوو لـە سـەر جـادەی سـینەمای حەمـرا بـوون کەمێـک خوارتـر لەوبـەر جادەکـە.

هـەر بـە یـادی سینەما لـە هەولێـر بـا ئـەم چیرۆکـە خۆشـەش بگێڕمەوە. سـینەمای سـەلاحەدین پێـش سـینەمای حەمـرا کرابـۆوە و یەکـەم سـینەما بـوو لـە هەولێـر. نازانـم چ سـاڵێک بـەڵام لـە نیـوەی دووەمـی چلەکانـی

سەدەی رابردوو بوو. ئێمە ئەوسا لە هەولێر کوڕە جوتیارێکی گوندەکەی خۆمان دووگردکانمان لەلا بوو بۆ خزمەتکردن ناوی حەسەنی مام هەباسی بوو. ئەو تازە هاتبووە شار و سینەمای نەدیبوو. شەوێکی هەینی لەگەڵ خۆمانا بردمان بۆ سینەما. فیلمەکە میسری بوو و ئاکتەرەکانیش فاتن حەمامە و پێم وایە موحسین سەرحان بوون. ناوی موحسین لە فیلمەکە حەسەن بوو.

لە گرتەیەکدا حەسەن لە فاتن توورە بوو دەرگای کردەوە چووە دەرەوە و دەرگاکەشی بە توندی لە دوای خۆی راکێشا و چوو دەرگای ئۆتۆمۆبیلەکەی لەسەر جادە کردەوە بڕوات. بەڵام فاتن بەڕاکردن دەرگایماڵەکەی کردەوە و لێرەدا گرتەیەکی پڕ بە شاشە گەورەی فاتن دەرکەوت و رووی لە ئێمەی دانیشتوانی ناو هۆڵی سینەماکە کرد و بە دەنگی بەرز بانگی کرد " حەسەن، حەسەن !!!" حەسەنی ئێمەش کە لەناو هۆڵەکە لە تەنیشت ئێمە بە کڕو بێدەنگی دانیشتبوو و هیچی لێ تێ نەدەگەیشت یەکسەر قیت هەڵسایە سەر پێ و بە دەنگێکی بەرز وەرامی فاتن حەمامەی دایەوە گوتی " بەڵێ !!!". کاکە باوەڕ بکەن لە ریزەکانی پێشەوەی چل بایی وەک دەسرێژی مەترەلۆز یەک بەدوای یەک زڕتمان بۆ دەهات و لەو هۆڵە بەرزەی سینەما دەنگی دەدایەوە خۆشتان دەزانن زڕتی منداڵە قەساب و جامبازان چۆن شیڕەیەکی لێوە دێ. زۆر بەسەر خۆماندا شکاینەوە و بە حەسەنمان گوت " ئێ کوڕە حەسەن تۆ بۆ هەڵسایت و جوابت دایەوە، خۆ بانگی تۆی نەکردووە؟ ؟ دەیگوت " کاکە بە ئیسمی خوای گاسی منی کرد و تەمەشای دوڕ چاوی منیشی دەکرد"

ئەمەش چیرۆکی حەسەنی مام هەباسی و سینەما یادی بە خێر پیاوێکی زۆر باش بوو حەیرانی چاکیشی دەگوت.

## نەورۆزەکانی سالانی دوای جەنگ

لەپاش کۆتایی جەنگ سالی 1945ئیتر بە راسپاردەی بریتانیا حکوومەتی عێراقیش جۆرە نەرمییەکی نواند بەرامبەر ئۆپۆزیسیۆن و مۆلەتی دیوانی (رەسمی) دا بە هەندێ پارتی سیاسی چالاکی خۆیان بە ئاشکرا بکەن و کاندیدی خۆیان بۆ هەلبژاردنەکانی پارلەمانی عیراقیش دابنێن. بۆ ماوەی سێ سالی دوای جەنگ 46 ,47 , 48 مۆلەتی نەورۆزیش دەدرا بە کورد یان بەبێ مۆلەتیش چاوپۆشییان لێ دەکرد. ئەمن لەو ئاهەنگانەی نەورۆزا بوو کە لە هەولێر ناودەنگم وەک دەنگخۆش پەیدا کرد. پێشتر لە قوتابخانەکەما لە کلاسی خۆم هەموو دەیانزانی دەنگم خۆشە چونکە مامۆستای وەرزش و سروود لە وانەی خۆی منی بانگ دەکردە پێش تەختە رەشەکە و ئەوەی لە گۆرانی و سروودا بمزانییا بۆم دەگوتن. یادیان بەخێر دوو لەو مامۆستایانەم نوری ئەمین و جیهاد عەبدولرەزاق بوون کە هەردووکیان خۆشیان دەنگخۆش بوون.

خۆی دەبوایە بە پێچەوانە بووا بەلام هەموو ئاهەنگەکانی نەورۆزەکانی ئەو سالانە زیاتر حیزبی شیوعی نەک پارتی رێکی دەخست. رەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بووبێ کە پارتی تازە دامەزرابوو و شیوعیش ئەو بۆنەیان بە دەرفەت دەزانی دروشمەکانی خۆیانی تێدا نمایش بکەن. پێش رۆژی نەورۆز بە ماوەیەک یەکێک لە ئەندامانی حیزبی شیوعی مندالە دەنگخۆشەکانی قوتابخانەی سەرەتایی هەلدەبژارد بۆ تیپی سروودی نەورۆز. چاکم لەبیرە سالێکیان ئەو کەسەی سەرپەرشتی تیپی سروودی دەکرد کاک مەجید رەئوفی برای شاعیری گەورە دلدار (یونس رەئوف) بوو. لە زۆرترایەتی تیپەکانی سروود ئەمن رۆلی (سۆلۆ)م پێ دەسپێردرا و کۆرسەکەش بۆیان دەگێرامەوە. سالێکیان لە یەک دوو سروودا جەمال خەزنەداریش

لەگەڵما بە جووتە (دویّت) بووین . ئەندامانی کۆرسەکەشم ئەوانەی لەبیرم مابن ئەمانە بوون: ئەحمەد عەبدوڵا، محەمەد ئەحمەد ئەربیللی، کوڕێکی ئەرمەنی برای هۆڤاکیم کریکۆریان کە خێزانێکی شیوعی بوون و بۆ یەکجاری باریان کرد بۆ ئەرمینیای یەکیەتی سۆڤیەت، خورشید ئیبراهیم دزەیی، رەشید حەمەد دزەیی، جەماڵ قادر کەشاف (ناسراو بە جەمال خەزنەدار)، سەیفەدین عەلی جەڕاح، جەماڵ رەشید و هەندێکی تریش کە لە وێنەکانی لام لەگەڵمدان بەڵام بەداخەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. ئەوەش هەرگیز لە بیر ناکەم کە لە نەورۆزێکا بینیم مەولود سالح قازیخانەیی دەمانچەیەکی خنجیلانەی زۆر بچووکی بەستابوو کە (نمرە 5)یان پێ دەگوت. وا میوان هەموو دانیشتوون و چاوەڕێی پێشکەشکاری بەرنامە دەکەن خۆشهاتنی میوانەکان بکات و ئاهەنگەکە بە سروودی نەورۆز بکاتەوە. من کە چاوم بە دەمانچەکەی کاک مەولود کەوت گڕناگەم لێ داگرت ئەگەر ئەو دەمانچەیە لە قەدما نەبەستم گۆرانی ناڵێم مەولودیش هەرچەندە گەورەش بوو ئەویش پێی لە عەردی گیر کرد گوتی ئیللا بیللا نایدەمی. کێشمەکێش ماوەیەکی خایاند و میوانەکان چاوەڕێن و نازانن مەسەلە چییە. لەپاشان گەورەکان چوون بەرۆکی مەولودیان گرت: " ئەرێ مەولود ئەوە عومەر منداڵە خۆ تۆ منداڵ نیت " ئەوە بوو کە چارەیەکی ناوەنجی دۆزرایەوە کە من تەنیا بۆ ماوەی سروود گوتن لەبەردەم میکرۆفۆنا دەمانچەکە ببەستم دوای ئەوە بیدەمەوە بە مەولود و بەمجۆرە پێکهاتین.

## نەورۆزەکەی ساڵی 1948 لە کۆیە و چۆن لەگەڵ مام جەلال یەکتریمان ناسی و بووین بە برادەر

ئەو ساڵە شیوعیەکانی کۆیە داوایان لە شیوعیەکانی هەولێر کرد پاش ئاهەنگی نەورۆزی هەولێر بچن بۆ کۆیە و ئاهەنگەکەی ئەوێ پێکەوە بکەن. وا بزانم لەوێ دوو ئاهەنگ دەگێڕدرا، هی شیوعیەکان و هی پارتییەکان بەڵام لەوە زۆر دڵنیا نیم. لە هەولێر جەماعەتی ئێمە پاسێکیان بەکرێ گرت، پاسی دار کە ئەو زەمانە پێم وایە بۆدییە دارینەکەیان لە نەجەف و کەربەلا دروست دەکرد. هەڵبەت منیشیان بۆ سروودخوێندن لەگەڵ خۆیانا برد. وابزانم ئەمن تاکە قوتابیی سەرەتایی بووم لەناویانا، ئەوانی دی هەموویان لە ناوەندی و دواناوەندی بوون و گەورە بوون و کاک ئەنوەری براشم لەگەلا بوو. هەموومان بە جلی کوردییەوە و بە دەهۆڵ و زوڕنا پاسەکەمان پڕ کردبوو. ڕێگای هەولێر - کۆیە ئەوساکە قیر نەکرابوو و پڕ بوو لە هەوراز و نشێو و گاشە بەردی گەورە گەورە. بەیانی چێشتانگاوێ بەڕێ کەوتین و نزیکی نیوەڕۆ ئینجا گەیشتینە کۆیە. یاپراخ و نان و کەبابیشمان بۆ "ڕێی هاتونەهاتێ" لەگەڵ خۆمانا بردبوو. چەندین جار پاسەکە دەشکا دەبوایە پاڵی پێوە بنێین تا بەگڕ دەکەوتەوە. لەبیرمە گەیشتینە هەورازێکی زۆر ڕک کە وای پێویست کرد هەموومان دابەزین و پاڵ بە پاسەکە وەبنێین تا سەرمان خست، واتا پاسەکە ئێمەی سەرنەخست ئێمە ئەومان سەرخست. کە گەیشتینە کۆیە و باسی ئەو هەورازە سەختەمان بۆ برادەرانی ئەوێ گێڕایەوە گوتیان: "ئەهۆ وەهۆ! ئەوە ئێمە لە کۆیە بەو هەورازە دەڵێین هەورازی کەرتڕێنێ". جا وێنای بکەن ئەگەر ئەو هەورازە کەری بە باری تڕاندبێ ئەدی ناسکە قوتابیی وەک ئێمە کە پاڵمان بە پاسێکیش وەدەنا دەبێ حاڵی ئێمە بەدەست ئەو هەورازەوە چۆن بووبێ و چەندمان لێ بەربووبێ.

بۆ شەو ئێمەیان بۆ نووستن لە قوتابخانەیەک دامەزراند کە ئەتیلیێ atelier (ستودیۆی بۆیەکار)ێکی زۆر جوانی بەدڵی منی لێ بوو و پێم وایە هونەرمەندەکەش مامۆستا جابیر پیرداود بوو ئەگەر لێم تێک نەچووبێ. لە هەموو لایەکی ژوورەکە تابلۆ بوو، بۆیەی رەنگاورەنگ بوو، پەیکەری سەری هەندێ کەسایەتیی ناوداری بواری هونەر و ئەدەبییات بوو کە هونەرمەندە پەیکەرتاشەکان بە گەچ دەموچاویان سواخ دەدان لەپاش ماوەیەک کە وشک دەبووەوە ئیتر لێیان دەکردەوە و کتومت سەری ئەو کەسە دەردەچوو. ئەمن ئەوە یەکەمجار بوو هونەری وا ببینم بۆیە هەرگیز لەیادم ناچێ.

ئەوەی کە دیسان سەرنجی راکێشام شانۆی ئاهەنگی نەورۆزەکە بوو. لە گۆڕەپانی نەورۆزەکە شانۆیەکی زۆر جوانی سەرداپۆشراویان داکوتابوو کە گوڵنگی رەنگاڕەنگی جوان جوان بە هەموو لایەکیدا شۆڕ دەبوونەوە. بەڕاستی نەورۆزەکانی هەولێر هیچ یەکێکیان بیری لێ نەکرابۆوە شانۆیەکی وەک ئەوەی کۆیەی بۆ دابمەزرێنن بۆ نمایشکرنی چیرۆکی کاوەی ئاسنگەر کە لە هەموو ئاهەنگێکی نەورۆزا پێشکەش دەکرا. لەو کۆییانەی کە لەوێ بینیمن و لەبیرم مابن هەندێکیان ئەمانە بوون: دڵدار (یونس رەئوف)ی شاعیر، دڵزار (ئەحمەد دڵزار) ی شاعیر، محەمەد تۆفیق وردیی شاعیر، رەسوڵ محەمەد ئەمین، عومەر محەمەد ئەمین، حەوێز وەهاب و مام جەلالیش. چاکم لەبیرە دڵدار و دڵزار لەسەر شانۆکە بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە شتیان دەخوێندەوە جا شیعر بوو یان وتار ئەوەم لەبیر نەماوە. ئەوەشم لەبیرە کە لە دووریی گۆڕەپانی ئاهەنگەکە ئەسپ سوار بە نەرمەغار خۆیان نمایش دەکرد و منیش لەملاو ئەولا گوێم لە جەماعەتی خۆمان دەبوو دەیانگوت ئەوە مەحموداغای کاکەزیادی دژی شیوعییانە خۆی و پیاوەکانی هاتوون دەیانەوێ نەورۆزەکەمان لێ تێک بدەن.

ئینجا با بێمە سەر چۆنیەتیی ئاشنابوونم بە مام جەلال. بەتەواوی لەبیرم نەماوە چۆن گەیشتینە یەک و کەوتینە قسە، بەڵام چەندین

ساڵ دوای ئەو نەورۆزەی كۆیە مام جەلال هەمیشە بۆ پێكەنین دەیگێڕایەوە كە لەوێ بەغیلیی بە دەنگی من بردووە و لە دڵی خۆیا گوتوویەتی بریا دەنگی ویش وەك دەنگی ئەو منداڵە ناو عومەرە خۆش بوا. ئینجا منیش دانم بۆی پیا دەنا و دەمگوت بەو خوایە مام جەلال منیش بەغیلیم بە تۆ دەبرد كە بەو تەمەنە منداڵییەت ئەو گوتارە سیاسییە ئاگرینانەت پێشكەش دەكرد و لەناو دڵی خۆما دەمگوت بریا ئەمن وەك تۆ ئەو قسانەم بزانییا. هەنگی مام جەلال پانزدە و منیش رەنگە دوانزدە ساڵێك دەبووین. ئەو كورتە ئاشنایەتییەی ئەو ساڵەی كۆیەمان كە بیرم نەماوە چۆن دەستی پێ كرد، بوو بە هەوێنی برادەرایەتییەكی زۆر نزیكی یەكتری دواتریمان و لەو رۆژەوە ئیتر مام جەلال و كاكە شێخ جەنگیی براگەورەشی بوون بە خۆشەویستی هەموو برایەكانم و بنەماڵەكەمان هەم لە بواری شەخسی هەم لە بواری سیاسەتا.

هەر لە ئەنجامی سروودخوێندنم لەو نەورۆزەی هەولێری ساڵی 1948 دوو خەڵاتم پێ بەخشرا كە یەكەم خەڵاتی پاداشتیم بوون لە ژیانما. مامۆستای گەورەی ئەدەبیات و شیعر و زمانەوانی و چاپەمەنی و رۆڵەی خۆبەخشی رێی خزمەتكردنی كورد و كوردایەتی گیوی موكریانی دوای ئاهەنگی نەورۆزەكە هاتە لام بەگەرمی دەستی گوشیم و ماچی كردم. گوتی هەر كاتێكی بۆت كرا وەرە بۆ چاپخانەكەم (چاپخانەی كوردستان كە لە هەمان كاتدا ستودیۆی فۆتۆگرافیشی بوو) تا وێنەیەكی جوانت بۆ بگرم وەك دیاری من بۆ ئەو دەنگە خۆشەت. ئەوە بوو كە ئەو وێنەیەی بۆ گرتم كە تەمەنم دوانزدە ساڵ بوو و ئێستاش شانازیی پێوە دەكەم. یادت بەخێر مامۆستای گەورە مام گیو. خەڵاتی دووەم ئەویش هەر بە بۆنەی ئەو ئاهەنگی نەورۆزەوە بوو. پیرۆزخانی ئەمین رواندزی كە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك بوو لە هەولێر ئەویش ماچی كردم و دوای چەند رۆژێك كتێبێكی لەناو كاغەزی رەنگاورەنگا بە قردێلەی جوان پێچابووەوە وەك دیاری بۆی

ناردم. لەماڵەوە کردمەوە کتێبەکە بە عەرەبی بوو بە ناوی (رحلتان) کە نووسەرەکەی دکتۆر یوسف عبود بوو. ئەوسا باش لە عەرەبی نەدەگەیشتم بەڵام هەموویم خوێندەوە چونکە یەکەم دیاری بوو وەک پاداشتی هونەرەکەم پێشکەشم بکرێت و دڵم زۆر پێی خۆش دەبوو کە بە برادەرەکانم پیشان دەدا. ئەوەی لێی تێ گەیشتبم و لەبیرم مابێ نووسەرەکە کە دیارە ئەوساکە لە وڵاتێکی ئەوروپا دەیخوێند کە پێم وایە سوئید بووە دوو سەفەری بە سواری پایسکل بەناو چەند وڵاتێکی ئەوروپادا کردبوو. ئەوەندەی کە لێی تێ دەگەیشتم بۆ من زۆر خۆش و نوێ بوو. پیرۆزخانیش یادی بەخێر خوشکی دکتۆر وریا و دکتۆر زۆزگ و چەتە و ئازاد و هێڤی و جانە بوو کە هەر هەموویان دواتر بوون بە دۆست و برادەری نزیکی بنەماڵەی ئێمە. باوکیشیان عەقید ئەمین رواندزی پێویست ناکا باسی رۆڵ و هەڵوێستە کوردایەتییەکانی بکەم لەناو بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی ساڵانی سییەکان و چلەکانی سەدەی رابردوودا. هەر گەواهێکی سووک و سادە بۆ رادەی کوردایەتی ئەمین رواندزی ناوی منداڵەکانی بوو. کەم کەس لە بیستەکان و سەرەتای سییەکانا ناوی کوردیی لە منداڵی خۆی دەنا ئەگەر زۆر ناسیۆنالیست نەبوایە.

## ئەبوبەکری جوانەمەرگ

هەر لە ساڵی 48 برادەرێکی هاوکلاس و هاوبیری زۆر خۆشەویستم لەدەست چوو، ئەبوبەکری مەلامحەمەدی فەرهادی (1934 -1948). ئەو بنەماڵە مەلازادەیە کە ئەوانەی لەبیرم مابن ئەم برایانە بوون: مەلا محەمەد، مەلا سادق، مەلا سەعید، مەلابرایم و مەلاعەبدوڵا و بە عەشیرەتیش مەمان بوون. ئەمن تەنها مەلا سادقم نەدیبوو. مەلابرایمی لێ دەربێنی کە شەرواڵ مرادخانیی زۆر جوانی لەبەر دەکرد کە لە بەژن و باڵای کەڵەگەتی دەوەشایەوە و مشکییەکی رەشبەڵەکی زۆر بە

زەوقیشی دەبەستا سیانەکەی دی هەموویان جوبە لەبەر و مەندیلی سپی بەسەر بوون. مەلامحەمەد و مەلابرایم کە شیعریشیان دادەنا تێکەڵ بە بزووتنەوە کوردییە نهێنییەکانی ئەو سەردەمەش بوون و لە چلەکانا لەگەڵ کوردپەروەرانی دیکە کەوتبوونە بەندیخانەوە. مەلا محەمەدی باوکی ئەبوبەکر و باوکی عومەر فەرهادیی رۆژنامەوان و قسەخۆش و نوکتەزان، زانایەکی دوانزدە علمی شەریعەتی ئیسلامیش بوو و وەک مەلای گەورەی کۆیە و مەلا خالیدی مورتکەی مەلایەکی تا رادەیەک لیبەراڵیش بوو. مەلابرایم کە نازناوی شیعری (زەبوون) بوو چاکم لەبیرە پیاوێکی موزەردەڵەی زۆر قۆز بوو شیعری زۆر جوانیشی دەنووسی و مەلا عەبدوڵاش باوکی پسپۆری لێهاتووی زمانەوانیی دکتۆر ئەحمەد فەرهادی بوو کە ئەمیان بەڕاستی شارەزایە لە زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی و ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیویۆرک. بەکورتی بنەماڵەیەکی زانا و رۆشەنبیر و کوردپەروەر.

لە پۆلی شەشی سەرەتایی بووین من و ئەبوبەکر لەسەر یەک ریحلە دادەنیشتین. رۆژێکیان هەواڵێکی دڵتەزێنمان بۆ هاتە قوتابخانە کە ئەبوبەکر مردووە. زانیمان کە لەگەڵ مەلابرایمی مامی ترومبێلیان وەرگەڕابوو و ئەبوبەکری تیا جوانەمەرگ بووبوو.

چاکم لەبیرە لە رۆژی ناشتنی لە گۆڕستانی گەڕەکی تەیراوە کە ئەوسا تەیراوە هەر چەند ماڵێک و چەند کۆلانێک دەبوو ئێمەی قوتابی و مامۆستایانی قوتابخانەکەمان و خەڵکێکی زۆری شیوعی و چەپڕەو لەسەر قەبران بووین. پێشتر کاک عەلی فەتاح دزەیی ئامۆزام کە یەکێک بوو لە سەرکردە شیوعییەکانی هەولێر و شاعیر و نووسەرێکی زۆر بەتواناش بوو، گوتارێکی لاواندنەوەی زۆر ئاگرین و پڕ لە جۆشوخرۆشی بۆ من نووسیبوو کە لەسەر گۆڕی ئەبوبەکری هاوڕێما پێشکەشی بکەم. لاواندنەوەکە دوو لاپەڕە دەبوو بەڵام من یەک دوو وشەم لەبیر ماوە چونکە بۆ منی مناڵ سەرنجکێش بوون: "برام بەکر ... ئەی رۆڵە نەبەردەکەی چینی پاڵە و جوتیار ... ئەی

خەنجەری جەرگی ئیستیعمار ... " ئیتر ناوە ناوە ئەم دووسێ وشەیەم دووبارە دەکردەوە و ئامادەبووەکان و خۆیشمم هەموو دەهێنایە گریان. ئەمڕۆ وا بیری لێ دەکەمەوە لە ئەدەبیاتی ئەقلیەتی هەینێکەمان منالێکی دەدوانزدە سالان بە خەنجەری جەرگی ئیستیعمار دادەندرا، تایهوو وایهوو! پێشان ئەوها (سیاسەت)مان دەکرد. بەلام دیارە بۆ ئەو زەمانە هەر ئەو وشە ئاگرینانە کاریگەرییان دەبوو لەسەر هەستی سەوادی میللەتی رەشورووتی نەخوێندەوار و هەر بەو قسە زلانە خەلک بۆ راپەرین دەورووژێندران.

یادت بەخێر ئەبوبەکری ئێسک سووک. زۆر سوپاسیش بۆ کاک عومەر فەرهادیی برای بۆ ئەو کەرەستە و زانیارییانەی کە بۆی ناردووم.

## سالانی یاخی بوونم لە قوتابخانە

هەرچەندە کە سالانی 48 و 49 و 50 ی خوێندنم لە هەولێر پڕ بوون لە رووداوی سیاسی و کولتووری و پەیوەندی کۆمەلایەتی جیاجیای زۆر زیاتر لە دووسێ سالەکەی بەراییم کە تازە چووبوومە هەولێر و سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنم خەریک بوو دەکەوتە ناو سالانی نەوجەوانییەوە کەچی هێشتا کە بۆ وچانی نیوەی سال لەگەل براکانم کاک ئەنوەر و کاک موحسین و کاک سەعدی دەگەڕاینەوە بۆ دووگردکان کۆنە برینە سارێژ نەکراوەکانم سەر لەنوێ دەکولانەوە و دەهاتنەوە سوێ.

هەلبەت هەنگی بێ ئەوەی لە ئەنجامی وردبوونەوەیەکی فەلسەفییەوە بە بیرمدا هاتبێ، بەلام زۆر جار مندال رەفتارێکی لائیرادی دەکات کە سەلیقە پێی دەکات و خۆی لێی بێ ئاگایە نازانێ ئەمە بەشێکی پێکهاتەی نەفسییەتیەتی کە بە زگماک و بە جینات تێیدا زاوە و دەبێتە رەوشت و سروشتی تاهەتایەی. کە گەورە

بوویت هەنگی بۆت دەردەکەوێ کە ڕەفتارە لائیرادییەکەی منداڵیت هەروا لە خوتو خۆڕایی نەبووە. جا منیش ئەمڕۆ کە بە هۆشیاریی ئەمڕۆم بیر لەوان ڕۆژان دەکەمەوە ئێستا تێ دەگەم کە هەینێکە خۆمم وەک کارمامزێکی لە ژینگە سروشتییەکەی خۆی دابڕابێت و لەناو ماڵێکی ئاوەدانیدا کەیی کرابێ ئەوها دەهاتە بەرچاو. جاری وا بووە - کە خۆیشمان هەمانبووە - کارمامزی بۆ ماوەیەک ماڵیکراو کە شوان لەگەڵ بزنەگەل و مێگەلا دەیبا بۆ چێرینێ کە چاوی بەو ژینگە سرووشتییەی باب و باپیرانی دەکەویتەوە هەر بە سەلیقە خوێنی دەبزوێت و بەستەزمانە سەری لێ دشێوێت ئایا کامەیان ژینگەی ڕاستەقینەی خۆیەتی، دەشت یان دێ، چۆڵەواری یان ئاوەدانی، ئەم بە نەرمی ڕۆیشتنەی مێگەلە و بزنەگەلە یان قۆنگرەو قەڵبەزی ڕەوەمامزی بە پەلە ! بۆیە زۆر بە گومان و دوودڵییەوە بۆ ئێوارە دەگەڵ مەڕو بزنەکان دەگەڕایەوە بۆ ئاوایی.

ئەمن هەموو جارێ کە لە هەولێر بە سەردان دەچووینەوە دووگردکان وەکوو ئەو کارمامزە داماوانەم لێ دەهات، داماو لەنێوان دەشت و شار. کە دەگەیشتینە کۆنە هەوار دوای پشوویەک لەگەڵ دایک و خوشک و براژن و برازاکانم ئینجا لە گەڵ هاوڕێکانی ئاواییم یەکدیگر دەبووینەوەو کووچەو کۆلانەکانی گوند و کەندو جۆم و کەندەڵان و گرد و بستییەکانی دەورپشتی ئاواییمان هەمووی دەکرد. باوەڕم پێ بکەن خوێنەرانی خۆشەویستم، بەتایبەتی لاوانی ئەمڕۆ کە بەم ئەزموونانەدا تێنەپەڕیون، ڕەنگە پێتان سەیر بێ بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم کە بۆنی کاو کادین و تەرس و تەپاڵە و ڕیخ و پشقل و سەرگیندانەکانی دووگردکان کە ڕاستییەکەی بۆنی سروشتی باوی هەموو گوندێکی کوردەوارییە شتێکی کۆنی لەبیرکراوی دەپرژاندەوە ناو کەللەی سەرم کە بە ئینگلیزی ئیستیلاحێکی زۆر جوانیان بۆی هەیە association و کارێکی سایکۆلۆژی وای تێ دەکردم کە هەموو هەست و هۆشمی دەوروژاند. لەناو دڵما دەبوو بە مشتومڕ، دڵی ڕۆمانتیزم دەیئاژۆت، دڵەی دیم ڕیئالیزم. جا منیش وەک کارمامزە

داماوەکە دوای تەواوبوونی وچانەکەمان لە دووگردکان تووشی ئەو دڵەڕاوکێ یە دەبووم کە برا گەورەو دایکم ولاخیان بۆ ئامادە دەکردین تا شارۆچکەی قوشتەپەمان ببات و لە وێ چاوەڕێی پاسێکی دارین بین کە لە کەرکووکەوە دەچوون بۆ هەولێر بە کرێی چەند پەنجاییەک بمانگەیەنێتە هەولێر. هەزار دووعام دەکرد ئەو یەک دوو ڕۆژەی دوای پشووی نیوەی ساڵ بیکا بە باوباران و تۆفان بۆ ئەوەی نە ولاخ لە کەندەکەی ناومالانی دووگردکان بتوانێ دەرباز بێ نە پاسێکیش لە کەرکووکەوە بۆ هەولێر دەربچێت. هەر چۆنێکی بێ چارم نەبوو دەبوایە ڕەگەڵ براکانم کاک موحسین و کاک سەعدی بکەوم بۆ هەولێر و دەکەوتمەوە ژێر باری خەمو خەفەتانەوە. لە دڵی خۆما هەر لێکم دەدایەوە توخوا ئەمەیە ژینگەی سروشتی من یان شاری کۆلان تەنگوتاری بۆن قوڕشینەکانی هەولێر!. کە لە قوشتەپەش لە ولاخەکان دادەبەزین و لە چاوەڕوانی پاسێک دادەنیشتین ئەو دوو جوتیارەی کە تا قوشتەپە لە گەڵمانا هاتبوون لێی سوار دەبوون ڕێی دووگردکانیان دەگرتەوە بەر و منیش تا لێم بزر دەبوون هەر بە قوڕگی پڕ لە گریان و فرمێسک لە چاوا قەتیس ماو چاوم دەبڕییە کەرخی ڕۆیشتنیان و لە دڵی خۆما دەمگوت " بریا لەگەڵتان بوام، چەند بەختەوەرن خۆتان و ولاخەکان دەچنەوە دووگردکان."

لەم ساڵانەی دوایی هەڵبەستێکم نووسی بەناوی (برادەران دوێنێ کە جوان بووم) و وا خەریکم بیکەم بە گۆرانی. چەند دێڕێکی ئەو هەڵبەستە باسی تەمەنی منداڵیم دەکات لە دووگردکان:

ساڵەهای منداڵی و مێردمنداڵیم لە گوندەکەمان
ڕانەبوارد بە پای پەتی و بە رووی بەگەردو بە گەمان
گردو بستی و کەندو جۆم و کەندەڵان و وەرد و شۆ
بەهاران لە مێرغوزاران، هاوینان پەرێزە جۆ
برادەران دوێنێ کە جوان بووم نەمدەزانی غەم چییە
نەمدەزانی ماندوبوون و خەو و واتای دەم چییە
برادەران، برادەوان، برادەران

## له دواییدا خۆم پێ ڕانەگیرا و هەر یاخی بووم

ساڵی48 چەندین جار لە دووگردکان کاتی تەواوبوونی پشووی نیوەی ساڵ کە لەگەڵ براکانم ئامادە دەکراین بمانبەنەوە بۆ هەولێر ئەمن خۆم دەشاردەوە و لەگەڵیانا نەدەڕۆیشتم. تا پاش چەند هەفتەیەک بە خۆشی و بە لێدانیش دەیانبردمەوە بۆ هەولێر. بەڵام لە ئەنجامی دواکەوتنی زۆرم ئەو ساڵە دەمامەوە. ساڵی 49ش بە هەمان شێوە یان لە دووگردکان خۆم دەشاردەوە یان جارێکیان لە هەولێر لەماڵی خۆمان رام کرد و چووم لە ماڵی پوورە حەلیم خانی شێ عەلی ئامۆزای دایکم خۆم شاردەوە و بۆ ماوەیەک نەچوومە قوتابخانە. پوورە حەلیم خانم هاوسەری سەید عەولای تەحسیلدار بوو و خوشکی دلارام خانی هاوسەری کاکەزیادی کۆیە بوو (دایکی دلاوەر و ئاراس و بارزان شێروان). دوو کچ (بەهیجە و ئافتاو) و کوڕێکیشان هەبوو (سەیدە) بەڵام وابزانم تەنها یەکێک لە کچەکان لە پوورە حەلیم خانم بوو ئەوانی دی لە ژنێکی پێشتری سەید عەولا بوون. شێوەی پوورە حەلیم خانم هەرگیز لە یاد دەرناچێ چونکە ژنێکی زۆر جوانی بەژن و باڵا باریکی ئاکاری دەموچاو وردیلەی زۆر ڕێکوپێکی دەم هەمیشە بە پێکەنین بوو. هەرچەندە کە چەند دانەیەکی ئاوڵە بە هەندێ شوێنی ڕووە جوانەکەیەوە هەر مابوو بەڵام بە هیچ جۆرێ کاری نێگاتیڤی نەکردبووە سەر ڕووە جوانە ئەدگار خانەدانییەکەی. بێجگەلە جوانی بەژن و شێوە پوورە حەلیم خانم چێژێکی تا بڵێی بەرزیشی هەبوو لە پۆشینی بەرگی کوردییا. کەمەربەند و کرمۆکە (ژێرچەنە) کۆییانیەکەی نموونەی زەوقێکی هونەرمەندانە بوو کە دیارە زۆر بە زانایی هەڵیدەبژاردن. ئەمن هەر لە منداڵیمەوە ئینسانی جوانم لا خۆشەویست بووە و کە گەورەش بووم جوانییەکەیان لەناو مێشک و هەست هەناوما وەک نەخشی سەربەرد

خۆی جێگیر کردووە. چەن هەفتەیەکیش لە ماڵی پوورە حەلیم خان خۆم شاردەوە بەڵام دیسان هاتن منیان بردەوە و لە ماڵەوە کولێکی لێدانی باشیان بۆ کردم. ئەوساڵەش دیسان مامەوە. بە کورتی ساڵێک لە پۆلی پێنجەم و ساڵێکیش لە پۆلی شەشەم مامەوە، ساڵی 1950 قۆناخی سەرەتاییم تەواو کرد بەڵام ئەو ساڵە لە قوتابخانەی (اربیل الاولی) دەرکرام چونکە لەگەڵ مامۆستا عەلی جوکل ( یادی بەخێر) بەشەڕ هاتم و منیان گواستەوە بۆ (مدرسە اربیل الثانیة) کە بە کوردی هەر دەمانگوت (سانیە). راستییەکەی پێشم خۆش بوو کە گواسترامەوە بۆ ئەوێ چونکە نەوزادی پوورزام و نەجەدەت و نەجاتی کورە پوورزاکانم هەموو لەوێ دەیانخوێند. خۆی (سانیە) هی منداڵی بنەماڵە گەورەکانی هەولێر بوو و کوڕی پارێزگار و شارەوان و بەڕیوەبەری پۆلیس و سەرۆکی تەندروستی و منداڵی کارمەندە پلە بەرزەکانی عەرەبیش هەر لەوێ دەیانخوێند. هەر لەوێ لەگەڵ کامەران قەرەداخی (ئێستا رۆژنامەوان و توێژەری سیاسی بە زمانی عەرەبی) کە کوڕی شێخ مستەفا قەرەداخی موتەسەڕیف (پارێزەر) بوو بووین بە برادەر و تا ئێستاش هەر برادەرێکی خۆشەویستمە. راستە کە قوتابخانەکەی پێشترم ژینگەیەکی زیاتر لادێیانەی هەبوو و هەموو خزمە دزەییەکانم لەوێ دەیانخوێند و لەوێ راهاتبووم بەڵام لە لایەکی ترەوە (سانیة) ش خزمە هەولێرییەکانمی لێ بوو و ئەوەندە هەستم بە غەریبی نەدەکرد.

## برینداركردن و گرتنی كاك ئەنوەری برام لە بەغدا

لە ئەنجامی رێكەوتنی حكوومەتی عیراق و بریتانیا لەسەر پەیمانی پۆرتسمث Portsmouth خۆپیشاندانی نارەزایی تەواوی شارەكانی عیراقی گرتەوە و بەشی زۆریشی لە لایەن حیزبی شیوعییەوە رێك دەخرا. لە هەولێریش خەڵكێكی زۆری شیوعی و چەپڕەو گیران لەناویانا كاك ئەنوەری برام كە ئەندامێكی بەرچاوی حیزبی شیوعی بوو ولە پۆلی پێنجی ئامادەیی بوو كە ئەو زەمانە دوا پۆلی خوێندنی پێش زانكۆ بوو . كاك ئەنوەر كە لە زیندان دەرچوو ئەوساڵەی خوێندنی لەدەست دا كە پێم وایە ساڵی دووەمیشی بوو بۆیە بۆی نەما لە قوتابخانە بەردەوام بێ. ئەوە بوو كە چوو بۆ بەغدا لەوێ لە ئامادەییەكی ئەهلی ئێواران خوێندنەكەی تەواو بكات. لەبیرم ماوە ناوی قوتابخانەكەی (ثانوية تفيض الاهلية) بوو. بەڵام كاك ئەنوەر لەویش لەبەر كاری سیاسی پشتی لە خوێندن كردبوو و دیسان فەرمانی گرتنی دەرچووبوو. ئەو ژوورێكی لای خێزانێكی دیان لە گەڕەكی (سینك) لە قەراخی شەقامی رەشید بە كرێ گرتبوو. شەوێكیان دوو پۆلیس دەچن بیگرن ئەویش لەگەڵیانا دەیكا بە شەڕ، خۆی نادا بە دەست و را دەكا. پۆلیسەكان لەو كۆڵانە تەنگەبەرە دوای دەكەون بەڵام دەزانن كە نایگەنێ یەكێكیان دەمانچە دەردێنێت دەیداتە بە گوللەلان. گوللەیەك بە پشتی دەكەوێت و دەكەوێ. دەیبەن بۆ نەخۆشخانە دوای تیماركردنی چاك دەبێتەوە ئینجا دەیبەن بۆ زیندان و پێم وایە دوو ساڵێكی بۆ دەبڕنەوە بەڵام ماوەی نەخۆشخانەی بۆ حسیب دەكەن هەندە لە زیندان نامێنێتەوە.

## یەکەم جار چوونم بۆ بەغدا و یەکەم جاریش بەشەمەندەفەر سەفەر بکەم

بەغدا بۆ ئێمەی کورد شارێکی گەورە بوو و بینینی بۆ منداڵێکی لەتەمەنی مندا شتێکی خۆش بوو کە بۆ برادەرانمی بگێڕمەوە. ساڵ 1949 بوو و کاکە ئەنوەرم هێشتا لە نەخۆشخانە تیمار دەکرا. خزمێکی زۆر لە هەولێرەوە سەردانیان دەکرد و بۆ ئێوارانیش بۆخۆیان لە کاباریَ خۆشەکان و بارەکانی شەقامی ابو نەواس رایان دەبوارد کە شتی وا لە هەولێرا نەبوو. کاکە ئەنوەر داوای لە کاکە ئەحمەدی برا گەورەکەمان کردبوو دەیەوێ من ببینێ. کاکە ئەحمەدیش کە لەو ماوەیەی تیمارکردنی کاک ئەنوەر بە زۆری هەر لە بەغدا بوو ناردی بەکێک لە هەولێر من ببا بۆ بەغدا. باش بوو (مام حاجی مستەفای دۆرەزە) ی ئامۆزام ئەویش دەچووە بەغدا بۆ سەردانی کاکە ئەنوەر و منی لەگەڵ خۆیا برد. ئیتر بۆ من خۆشی بوو بە سێ خۆشی: سەردانی کاک ئەنوەری برام، سواری شەمەندەفەر، بینینی بەغدا. بەلاّم بۆ منداڵێکی لەتەمەنی من بەغداکە و شەمەندەفەرەکە زۆر گرنگتر بوو تا بینینی براکەم. بیرمە لە هەولێر سواری فارگۆنی کلاس سێی هەرزان بووین کە شوێنی دانیشتنەکەی هەمووی شەپکەداری رەق و تەق بوو و فارگۆنەکەی تەنیشتیشمان پڕ بوو لە هێستر. کلاسی یەک و دوو کە دانیشتنەکانیان لە قوماش و قایش دروستکرابوون ئەوانە بلیتەکانیان زۆر گرانتر بوون. ئێوارە دەرچووین بۆ بەیانی گەیشتینە بەغدا. دواتر بیستم دەیانکوت کە حاجی مستەفای دۆرەزەی ئامۆزام پیاوێکی زۆر قرچۆک بووە بۆیە بلیتی دەرەجە سێی بۆ هەردوکمان بڕیبوو.

لە بەغداش خزمەکانم هەمیشە لە ئوتێل ترۆکادێرۆ Trocadero دادەبەزین کە خاوەنەکەی (عبد متی) برادەرێکی دیانی دزەییەکان

بـوو و لـە کاتـی خـۆی لـە هەولێـر ژیابـوو. ئۆتێلەکـە زۆر خـۆش بـوو و لـە شـەقامی (شـارع النهـر) ی پشـت شـەقامی رەشـید بـوو لـە نزیـک مەیدانـی بەناوبانگـی (حافـظ القاضـی). ئەمـن عەرەبییەکـی تێکشـکاو لـە قوتابخانـە فێـر بووبـووم و تـا دوو رۆژی یەکـەم هـەر لەبـەر دەرگای ئۆتێلەکـە دەوەسـتام و سـەیری هاتوچـۆی خەڵکـم دەکـرد نەدەوێـرام دوور کەومـەوە نەبـادا بـزر ببـم. رۆژێکیـان حـەزم چـووە مـۆز گوتیـان لـەو دیـو جـادە لـە شـارع الرشـید لـەوێ دوکانێکـی مـۆز هەیـە. نـاوی خوایـم لـێ هێنـا و یـەک دوو شـوێنم کـردە نیشـان تـا ئۆتێلەکەمـی پـێ بناسـمەوە. گەیشـتمە شـەقامی رەشـید حەپەسـام. بەسـەر شۆسـتەکەدا دەڕۆیشـتم کـە لای رۆخـی جادەکـەی هەمـووی سـتوون بـە دوای سـتوونی بەردینـی ئەسـتووری جـوان جـوان بـوو. منیـش هـەر سـەیری سـەر دووکانەکانـم دەکـرد کـە هەمـووی نووسـرابوو (الدکتـور فـلان...)، (المحامـی فـلان...)، (مخـزن فـلان...)، (محـل فـلان...). هـەر سـەرم بـەرز کردبـۆوە و خەریکـی خوێندنـەوەی ئـەو ناوانـە بـووم لەپـڕ سـەرم بـە یەکێـک لـە سـتوونە ئەسـتوورەکانی سـەر شۆسـتەکە کـەوت و شـریقەی هـات و لایەکـی نیوچەوانـم خـڕ هەڵگـەڕا. کـە سـەیرم کـرد خەڵکێکـی زۆر پێـم پـێ دەکەنیـن زۆر بەسـەر خۆمـا شـکامەوە. هـەر چۆنێکـی بـێ دوکانـی مۆزفرۆشـەکەم دۆزییـەوە لێـم پرسـی ( مـۆز بێشـقەد؟) کابـرای چاکـەت و دیشداشـە لەبـەرو جامانـەی عەرەبـی وەسـەر گوتـی (موزایـة باربعیـن). ئای...خوایـە گیـان! خـۆ مـن دەمزانـی مـۆز چییـە بـەڵام (موزایـة) م قـەت نەبیسـتبوو دەبـێ ئـەوە چـی بـێ؟. شـەرمم کـرد بپرسـم مۆزایـة چییـە چونکـە زیاتـر قسـەم بکردایـە ئاشـکرا دەبـوو کـە عەرەبـی نازانـم و ئەوەشـم نەدەویسـت. لـە تەشـکی خـۆم دا راسـت گەڕامـەوە. لـە بەدبەختـی و سـەر لـێ شـێوانم کۆڵانـی ئۆتێلەکەشـم لـێ تیـک چـوو، دووسـێ جـار دەچـووم و دەگەڕامـەوە هەمووشـی سـەت مەترێـک لێـی دوور بـووم. بـاش بـوو (الخیـاط مانـو)م کردبـووە نیشـان کـە هـەر لـە تەنیشـت ئۆتێلەکە بـوو ناچـار لـە دوکاندارێکـم پرسـی گوتـم (الخیـاط مانـو) بـێ ئـەوەی

یـەک وشـەی تـر بدرکێنـم کابـرا بـە دەسـت ئیشـارەتی کـرد و تێـی گەیشـتم. هـەر سـوورامەوە ئۆتێلەکـەم کەوتـە بەرچـاو. مـۆزم نەکـڕی، سەریشـم شـکا و بزریـش بـووم کـورد واتەنـی بـۆ سـمێڵ چـووم ریشیشـم لەسـەر دانـا. هـەر بـە یـادی مانـوی خەیـات ئەمەیـان گەنجێکـی زۆر جوانـی چاو و سـمێڵ رەشـی پێـم وایـە ئەرمەنـی بـوو، ئێسـتاش دوای پتـر لـە شەسـت سـاڵ شـێوە جوانەکـەی مانـو هـەر لەبـەر چاومایـە. ئـەوەش یەکـەم سـەفەری بەغـدام و سـەردانی کاکـە ئەنـوەری بـرام.

## بەهەواڵی مەرگی جەودەتی جوانەمەرگەوە دووبارە کۆستم کەوتەوە

بەرلـەوەی دەیـەی چلـەکان بـەرێ بکـەم کـە پـڕ بـوو لـە تێکەڵەیەکـی بەدبەختییەکـەی نۆسـتالگیام بـۆ گوندەکـەم دووگـردکان لەگـەڵ چاوکردنـەوەم بـە دنیایەکـی نوێـی شـار کـە پڕ بـوو لـە ڕووداوی سیاسـی و کولتـووری و پەیوەنـدی کۆمەڵایەتـی نـوێ، بەخـت لـێ نەگـەڕا بـە دڵێکـی شـاد و کامەڕانـەوە بکەومـە نـاو دەیـەی پەنجاکانـەوە. هـەروەک کـە دووسـاڵ پێشـتر لـە سـاڵی 1948 برادەرێکـی خۆشەویسـتم لەدەسـت چووبـوو ئەبوبەکـری مـەلا محەمـەدی فەرهـادی ئەمجارەیـان لـە سـاڵی 1950هەواڵـی مەرگـی چـاوەڕوان نەکـراوی بـرادەرو هاوکلاسـێکی زۆر خۆشەویسـتی تـرم بـۆ هـات، مەرگـی لەنـاکاوی جەودەتـی نافیـع ئاغـا کـە هەردووکمـان پۆلـی شەشـی سـەرەتاییمان تـەواو کردبـوو و خۆمـان ئامـادە دەکـرد بـۆ قۆناخـی دووەمـی خوێندنمـان قۆناخـی ناوەنـدی.

جـەودەت گیـان زادەی بنەماڵەیەکـی گـەورە و خانەدانـی شـاری هەولێـر بـوو، بنەماڵـەی رەشـید ئاغـا. جـەودەت بـرا بچووکـی " قوربانییـە زلەکـەی هەولێـر" رەمـزی نافیـع ئاغـای جوانەمـەرگ بـوو کـە لـە شـەهیدە بەراییەکانـی بزووتنـەوەی ناسـیۆنالیزمی کـوردی بوو. لە بەشـەکانی پێشـتری ئـەم بیرەوەرییانەمـدا بەدرێـژی باسـی رەمزیـم کـردووە. بێجگەلـە رەمـزی

و جەودەت براکانی تریان قەرەنی ئاغا و حیسام ئاغا و سوعاد ئاغا بوون. هەر لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی تا شەشمان تەواو کرد لەگەڵ جەودەتا برادەری گیانی بەگیانی یەکتری بووین هەرچەندە کە لە دووەمین ساڵی پۆلی شەشم من قوتابخانەکەم گۆڕی بۆ قوتابخانەی (سانیە) بەڵام سەرەڕای لێک دابڕانی ئەوساڵەی قوتابخانەکەشمان لەدەرەوەی قوتابخانە هەمیشە پێکەوە دەبووین.

لە پشووی هاوینی ساڵی 1950 چاوەڕێ بووم بۆ پایز ئیتر "ببم بە پیاو" و بچمە قوتابخانەی (سانەوی). چاکم لەبیرە لەگەڵ براکانم لە سەر سەکۆی دیوەخانەکەی دووگردکانمان دانیشتبووین ترومبێلێک لە هەولێرەوە هات کاک عەونی یوسفی تێدابوو. دوای پێشوازی و دۆی سارد خواردنەوە کاک عەونی گوتی تازە لەسەر قەبرانی هەولێر گەڕاومەتەوە. کاک ئەحمەدی کاکم لێی پرسی کێ کۆچی دوایی کردوە کاک عەونی گوتی جەودەتی کوڕە بچووکەکەی نافیع ئاغا ئەمڕۆ مرد. کەمن گوێم لێ بوو حەپەسام باوەڕم نەکرد. دوای کەمێک خۆم لەوان دوورخستەوە لە سووچێکا دانیشتم زۆر بەکوڵ گریام. ئای کە فرمێسکی زۆرم بۆ جەودەتی براو برادەرم ڕشت، جەودەتی جوان، جەودەتی جوانەمەرگ. وابزانم کاک عەونی گوتی کە جەودەت بەم دواییانە دوچاری نەخۆشی کوشندەی لۆیکیمیا (شێرپەنجەی خوێن) بووبوو. یادت بەخێر جەودەت گیانی زۆر بەناز گەورە کراو.

## رۆڵی محەمەد حەسەن (مامۆ) لەناو بنەماڵەی ئێمەدا

**1922 - 1991**

هەر لە ساڵانی چلەکانا کە بەتەواوی نازانم چ ساڵێک بوو کەسایەتییەکی وەک فریشتە بۆ بنەماڵەی ئێمە لە هەولێر پەیدابوو. محەمەد حەسەن کە ئێمەی مناڵ بە مامۆ بانگمان دەکرد و لە پاشانا لەلایەن گەورەکانیشەوە هە بەو نازناوە دەناسرایەوە. مامۆ لە ئێمە هەرچوار برا (ئەنوەر و موحسین و سەعدی و خۆم)کە لە هەولێر دەمانخوێند زۆر گەورەتر بوو و پێم وایە ئەو لە قۆناخی ناوەندی یان ئامادەیی بوو. مامۆ کوڕی خێزانێکی گوزەران مام ناوەنجی بوو کە مام حەسەنی باوکی دوکانێکی چکۆلانەی بامیە فرۆشی لەناو بازاڕا هەبوو بۆیە لەناو سەوادی میللەت هەر بە حەسەن بامیە دەناسرا. بە ڕەچەڵەک بلباس بوون کەوتبوونە هەولێر بەڵام مامۆ کە دواتر ئەوەندە تێکەڵ و نزیکی بنەماڵەی دزەییەکان بوو ئەویش پاشناوی دزەیی خستە سەر ناوەکەی خۆی و بوو بە (محمد حسن دزەیی).

مامۆ پێش ئەوەی پەیوەندییەکی زۆر نزیک لەگەڵ ئێمەی کوڕانی حەمەدەمین ئاغا ببەستێت، لەگەڵ فارس و جەلال و موحسینی کوڕانی مام مستەفای مەلای ئامۆزای باوکم تێکەڵ بووبوو و یارمەتی دەدان لە خوێندنا. کە ئێمەش گەیشتینە هەولێر تێکەڵییەکەی فرەوانتر کرد و ئیتر وردە وردە بوو بە یەکێک وەک ئەندامی بنەماڵەی دزەییان. هەر وەک کە پێشتریش باسم کردووە ئێمەی تازە لەگوندا بۆ شار هاتوو هەرچەندە کە پوورزاشمان لە هەولێرا هەبوون بەڵام ئەمان هەولێری بوون و کولتووریان لەوەی ئێمەی دەشتەکی جیاواز بوو بۆیە سەبووریمان زیاتر بە خەڵکی عەشایری وەک خۆمان دەهات یا خزمیشمان نەبوان کە ماڵی مامۆ یەکێک بوو لەوانە. مامۆ

پیاوێکی زۆر دووربین و وردبین و زیرەک بوو، ئامۆژگارییەکی زۆری دەکردین بۆ خوێندن و شەوان دەهاتە لامان وانەکانیشی لەگەڵمانا دەور دەکردەوە. نەک هەر ئەوەندە، زۆر هاوینیش کاتی پشوو دەهاتە لامان لە دووگردکان دەمایەوە و ئەگەر ئیکمال بواین وانەکانی پێ دەگوتینەوە. براگەورەمان کاک ئەحمەد و رەحمان ئاغای مامم باوەڕیی تەواویان بە مامۆ هەبوو بۆ سەرپەرشتیکردنی ئێمە لە هەولێر و ئێمەش لە قسەی دەرنەدەچووین. هەرچەندە کە هەموو منداڵەکانی ئاغا دزەییەکانی بەرەی بایز کە لە هەولێر دەیانخوێند تەگبیر و پرس و رایان بە مامۆ دەکرد لە هەر کێشەو گرفتێکی تووشیان بوایە بەڵام بە تایبەتی ئێمەی چوار برا (ئەنوەر و موحسین و سەعدی و خۆم) لەگەڵ دوو ئامۆزامان (ئاغای رەحمان ئاغا و بورهانی بایزی رەحمان ئاغا) ئێمە دەبوایە بەتەواوی گوێڕایەڵی مامۆ بین و کاک ئەحمەدی براگەورەمان و مامە رەحمانی ماممان مامۆیان راسپاردبوو کە وەک براگەورە توند بێ لەگەڵمانا.

جا لێرەدا با قسەیەکی خۆشی ئەو سەردەمەی منالیمان بگێڕمەوە کە خۆم بەبیرم نایە براکانم بۆیان گێڕاومەتەوە. دەڵێن کاک بورهانی بایزی مامە رەحمانم (یادیان بەخێر) کە ئامۆزازای ئێمە بوو منداڵێکی زۆر نارەحەت و بەد بووەو بە هیچ جۆرێ حەزی لە خوێندن نەبووە. مامۆ زۆر ئامۆژگاری دەکات بخوێنێ بێ سوود دەبێ. جارێکیان مامۆ پێی دەڵی " کورە بورهان ئەگەر هەر وەها بیکەیتە فشەو نەخوێنی دوایی ساقیت دەبی ئەوجا ئەمن چ جوابی رەحمان ئاغا بدەمەوە!" بورهانیش بە لاسارییەکەی خۆی وەرامی دەداتەوە دەڵێ " کورە ساقیت دەبم نابم بالقوندرە". بورهان هەر بەوەندەش ناوەستێ دەست دەداتە تەباشیرێ و لە دیوارە بە دووکەڵ رەش هەڵگەڕاوەکەی ناندینی ماڵەکەی کە بەکرێیان گرتبوو بە تیپی زۆر گەورە دەنووسێ: بالقوندرە. دوای ماوەیەک رەحمان ئاغا دەچێتە هەولێر و هەموو منداڵەکان و مامۆش بە دەوریدا دادەنیشن. مامە رەحمانم دەڵێ "محەمەد منداڵەکان

لەگەڵ خوێندنا چۆنن؟" مامۆش دەڵێ " وەڵا مامە رەحمان هەموویان باشن تەنها بورهان نەبێ کە بە گوێم ناکات و پێی دەڵێم بورهان بخوێنە دەنا ساقیت دەبی ئەویش پێم دەڵێ ساقیت دەبم نابم بالقوندرە و ئەوەتا بە چاوی خۆت ببینە چۆن لەسەر دیواریشا نووسیویەتی بالقوندرە". مام رەحمان ئاغاش کە سەیری دیوارەکەی کرد و خوێندییەوە دەستی دایە لینگە قۆندەرەیەکی خۆی و لە بناگوێی بورهانی گیر کرد و لەگەڵیا بەتوورەییەوە گوتی "بالقوندرە هەی شەگباب !!" مامە رەحمان زۆر بە تەمەن بوو و ددانی تاقم بوو سینی دەکردە شین. ئەمەش چیرۆکی کاک بورهانی رەحمەتی کە رەحمان ئاغای باپیری ئیتر لە قوتابخانە دەری هێناو بردییەوە دووگردکان. کاک بورهان دەستی لە خوێندن هەڵگرت بەڵام بوو بە کەسایەتییەکی بەتەواوی پێچەوانەی سالانی منداڵیی. هێمن و نەرم و بەرێز و خۆشەویست لای هەموو خزمانی دزەیی و ئی تریش. یادیان بەخێر مامە رەحمان و مامۆ و کاک بورهان.

چاکەی مامۆ لەگەڵ بنەماڵەی ئێمە ئەوەندە زۆرە کتێبێکی تایبەتی دەوێ. هەر بۆ نموونە لە ساڵی 1963کە حکومەتی بەعس هێرشی کردە سەر کوردستان و ئێمە پێنج برا (ئەحمەد، ئەنوەر، موحسین، سەعدی، خۆم هۆمەر) یان لە شاخا بووین لە پێشمەرگایەتی یان لە ئەوروپا دەمانخوێند. لەو ماوەیە دایکم لە خەموخەفەتی ئێمە تووشی شێرپەنجەیەکی زۆر خێرای کوشندە دەبێت. کەسمان لەوی نابێت بیبا بۆ لای دکتۆرێک لە بەغدا. مامۆ دەیبا و لەوێ عیادەی دکتۆرەکە لە نهۆمی دووەمی بالاخانەیەک دەبێ کە ئەسانسۆری لێ نابێ و راستییەکەی ئەو زەمانە ئەسانسۆر هەر زۆر کەم هەبوو. مامۆ دایکم دەکا بە کۆڵیا و دوو نهۆم بەم حاڵەتە سەری دەخات بۆ لای دکتۆر. بۆ هاتنە خوارەوەش هەمان شت. ئەمە بەڕاستی کارێکە کە پیاوەتی و مەردایەتی و دڵسۆزی ئەم مرۆڤە پیشان دەدات. ئێمە هەرگیز نابێ لەبیری بکەین و لەبیریشی ناکەین.

راستییەكەی مامۆ بۆ خزمەتكردنی هەموو دانیشتوانی شاری هەولێر و عەشایری پارێزگای هەولێریش هەمیشە دەست بەسەر سنگەوە بووە. كە بەڕێوەبەری بانكی كشتوكاڵ بوو یارمەتی هەموو خاوەن زەوی و جوتیارانیشی دەدا بۆ سولفە وەرگرتن و لەپاشانیش چەندین جار قەرزەكانیانی دوادەخست كە نەیاندەبوو بیدەنەوە بە بانك. هەر خودی شاری هەولێر لە زۆر بواردا قەرزاری ئەو پیاوەیە. دروستكردنی گەڕەكی ئازادی لە ناوەڕاستی پەنجاكانا كە بۆ ئەو زەمانە گەڕەكێكی بە ستایلی مۆدێرن دەژمێردرا هەمووی بە بیرۆكەو نەخشەی مامۆ بوو. بەڕێوەبردنی زۆر سەركەوتووانەی یانەی ئازادی كە دووەمین یانەی كۆمەڵایەتی بوو پاش یانەی فەرمانبەران لە هەولێر ئەوەش هەر بە ئامۆژگاری مامۆ و شارەزایی ئەو لە بواری ڕێكخستنا هەڵدەسووڕا. جێبەجێكردنی دوو پرۆژەی گەورەی ناوشار، شەقامی شەست مەتری و پرۆژەی گلكەند، هەردووكی بە محەمەد حەسەن سپێردران كە سەبارەت بە دەستپاكی و سەرڕاستی كرا بە سەرۆكی دەستەی جێبەجێكردنی ئەو دوو پرۆژە گەورە چەورە.

هێشتا كە قوتابی ناوەندی و ئامادەییش بوو مامۆ كاریزما و كەسایەتییەكی زۆر سەرنجكێشی پێوە دیار بوو. لە هەر مەجلیسێ دانیشتبا ئەو مەجلیسەی بە قسەی زۆر ماقووڵ و سەلمێنەر و نوكتەی خۆشیش گەرم دەكرد كە خەڵكەكە حەزیان دەكرد گوێی لێ ڕابگرن. لە ساڵانی قوتابخانەشی لە هەموو یارییەكانی سپۆرتا مامۆ دەكرا بە دادوەر چونكە زۆر سەرڕاست بوو و قسەشی یەك قسە بوو بۆیە لەلای هەمووان ڕێزی تایبەتیی هەبوو و خۆشەویست بوو. لە ساڵانی هەشتاكانا بۆ ماوەیەكی كورت كردیان بە ئەمین عامی دارایی لە حوكمی زاتییە كارتۆنییەكەی ئەو سەردەمە، بەڵام كە بینیان قسە لە ڕووە و نارەزایی دەردەبڕێ لایان برد. بەختی هەبوو كە لایان برد زیاتر بمابایەوە وەك شاكر فەتاح دەیان كوشت.

محەمەد حەسەن (مامۆ) گۆڕی پڕ بێ لە نوور، كەسایەتییەكی

خزمەتگوزاری شاری هەولێر بوو پێویستە پەیکەرێکی لە شوێنی یانەی ئازادی لە گەڕەکی ئازادی بۆ بەرز بکرێتەوە.

ئەمن ئەم چەند وشەیەم لەسەر ئەو مرۆڤە قسەخۆشە و خۆشەویستە هەرچەندە زۆر کەمیشە بەڵام هیوادارم توانیبێتم هەرنەبێ هەندێک لە چاکەی ئەو پیاوە بدەمەوە.

## لەبیرناکرێنەکانی دووگردکان

بۆ من چلەکانی سەدەی رابردوو چوارچێوەی تابلۆی ژیانی منداڵیی گوندی دووگردکان و شاری هەولێرێم بوو کە ئەگەر بیانپۆلێنم دەتوانم بڵێم دوو قۆناخی لە زۆر رووەوە لێک جیای سەرایی ئەو ساڵانەی منداڵیم بوون. کە کەوتمە ناو ساڵانی پەنجاکانەوە بە تایبەتی نیوەی یەکەمی پەنجاکان لەوێوە ئیتر دوو قۆناخی تری ئەمجارەیان ساڵانی نەوجوانیم لە کەرکوک و لەپاشانیش لە بەغدا دەستی پێ کرد.

لە بەشەکانی پێشتری ئەم بیرەوەریانەم ئەمن ئەوەی کە لەبیرم مابووبێ لە پەیوەندیم لەگەڵ منداڵانی هاوزای خۆم لە خزم و کەسو دۆست برادەرانی دووگردکان و هەولێرم هەموویم خستۆتە سەر کاغەز. بەڵام ئەو کەسانەی کە لە یادما وەک نەخشی سەر بەرد هەڵکەندراون هەر ئەو منداڵانەی هاوزای خۆم نین. بێجگەلە تەواوی دانیشتوانی دووگردکان بە کچ و کوڕەوە بە ژن و پیاوەوە کە وەک فیلمی سینەمایی وا لەبەر چاومن ناتوانم ژمارەیەک لە کەسایەتی کە لە تەمەنی منا نەبوون فەرامۆش بکەم چونکە هەندێک لەمانە لەناو تەواوی گوندا دیار و بەرچاو بوون و هەندێکیشیان رۆژانە لەگەڵ ماڵی ئێمە ئاغای گوند تێکەڵیان هەبووە.

پێشتر کە کرژی هاتبوو باسیان بکەم یادێکی دوو دۆستی خۆشەویستی خۆم و براکانم کردەوە، یادی ئەحمەد وەیسی و پلکە

سولتان. ئەمڕۆش دوو فرمێسکی وەفاداری بۆ چەند کەسایەتی بە وەفای دووگردکان دەڕێژم کە هەندێکیان تابلۆی ژیانی ئێمەی منداڵانی حەمەدەمیناغای حاجی بایزیاغایان ڕەنگینتر و نەخشینتر کردبوو. هەندێکیشیان کارەکتەری وابوون کە بووبوون بە بەشێک لە ژیانی ڕۆژانەی ئاوایی.

خۆ ئەمن چاک دەزانم کە ڕەنگە هەندێ بەشی ئەم بیرەوەرییانەم بۆ هەندێ خوێنەر نەک هەر خۆش نەبێ بەڵکو وەڕسشیان بکات. بەڵام بیرەوەری واتا یادگار یادگاریش کە موڵکی نووسەرە و کۆلێک عاتیفەی پێوەیە ڕاست ئەوەیە کە بە خۆشی و ناخۆشییەکەیەوە تۆمار بکرێت. لەسەر خوێنەر نییە هەمووی بخوێنێتەوە.

## حاجی کەریم، ناسراو بە (کەریمی عەوڵا ڕەشی)

مام حاجی کەریم کە بە عەشرەت شوان بوو هەر لە کۆنەوە یارو یاوەری باوکم بووە. سەرکارو وەرامباری هەموو زەوی و زار و کاروباری کشتوکاڵ و کۆمەڵایەتی ناو گوند بوو. کە باوکیشم ساڵی 1936 کۆچی دوایی دەکات مام حاجی کەریم وەک مامێکی وەفادار بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی ئێمەی پێنج براو خوشکێک ودایکێک کە هەرە گەورەکەمان کاک ئەحمەدی دوانزدە ساڵان بوو. بێجگەلە دووگردکان حاجی کەریم بە سواری وڵاخ هەموو گوندەکانی تری ئێمەی وەک جانە لە کەندێناوە و هێلاوە لە دەشتی شەمامک بەسەر دەکردەوە هەم لە وەرزی تۆوکردنا هەم لە وەرزی دروێنەکردنا و لەپاشانیش بازاڕکردنی گەنم و جۆکە بۆ پردێ یان بۆ هەولێر. دەبا ئەم قسە خۆشەی حاجی کەریمتان بۆ بگێڕمەوە: جارێکیان کابرایەکی عەرەبی خوێ فرۆش بە باری حوشترەوە دەچێتە دووگردکان بۆ فرۆشتنی خوێکەی. هەندێ لە جوتیارانی گوند لەبەر سێبەری دیوەخانی ئاغا بۆ مامڵەتکردن لەگەڵی دادەنیشن بەڵام هیچ

تێک ناگەن. یەکێک دەنێرن بە دوای مام حاجی کەریما بە حیساب ئەو لەگەڵ کاک ئاغا هاتوچۆی بەغدای زۆر کردووە و عەرەبی فێربووە دەڵێن با ئەو بێ مامڵەت لەگەڵ کابرای عەرەبا بکات. حاجی کەریم دەچێت و لە کابرا دەپرسێ " یابرای نە قەدەر ؟" کە ئەمە ئیستیلاحێکی تورکی زەمانی عوسمانییە واتا ( یابە چەندە). کابرا تێ ناگات و ئەمجارەیان حاجی کەریم دەڵێ " یابرای بێش جحاش؟ " واتا ( یابە جاشک بە چەنێکە). مام حاجی هەر ئەوەندە "عەرەبی"یە فێر بووبوو و یابەکەشی کردبوو بە یابرای.

حاجی کەرێم و کوڕەکانی خۆشەویستی و رێزی تایبەتییان لای ئێمەو لای تەواوی خزمەکانیشمان هەبووە و ئێمە خۆمان بە قەرزاری ئەو پیاوە دەزانین. یادت بەخێر مام حاجی کەریمی پیرێکی جوان و ئێسک سووک.

## کاکە سمە (سمەی کێخوا ئەحمەدی)

کاکەسمە کوڕی کێخوا ئەحمەدی سەرەک عەشیرەتی پاڵانی بوو. کێخوا ئەحمەد کە خۆی و کێخوا وەسمانی برای لە دووگردکان دادەنیشتن بەڵام گوندێکیشیان هەر بەناوی پاڵانیان هەبوو لە لاپاڵ چیای قەرەچووغ روو بە ڕووی شارۆچکەی مەخمور. ئەم کێخوایانە خاوەنی مەڕو ماڵاتێکی زۆر و جووت ئێستری چاک بوون و گەرمیان و کوێستانیان بە مێگەلەکانیان دەکرد. ماڵی کێخوا ئەحمەدی بابی کاکە سمەو کێخوا عەلی کوڕی کێخوا وەسمانی مامی بە سازکردنی ( بەربەسێلی) بن رەشماڵان و پلاو ساواری بە گۆشت بەرخی بەهاران بەناوبانگ بوون. دانیشتوانی گوندی دووگردکان بە زۆری پاڵانین و دەڵێن لە کۆندا دووگردکان هی ئەو کێخوایانە بووە. باب و باپیرانی کاکەسمە تێکەڵییەکی زۆریان لەگەڵ باب و باپیرانی مندا هەبووە و ئەو پەیوەندییەش لەپاش ئەواندا هەر بەردەوام بوو و ئێستاش هەر

وایە. کاکەسمە یاوەری هەمیشەی برا گەورەکانم کاک ئەحمەدو کاک موحسین بوو بۆ هەر سەردانێکی لای خزمان یان لای عەشرەتەکانی تر. کاکەسمە پیاوێکی قۆزی باڵابەرزی رەشتاڵە بوو و لەلایەن هەموو خزمانی دزەیی بە هەموو بەرەبابەکانییەوە خۆشەویست بوو و رێزی تایبەتی لێ دەگیرا. کاکەسمە عەرەبی نەدەزانی بەڵام لە ئەنجامی سەردانی زۆری بۆ بەغدا لەگەڵ کاک ئەحمەدی برام شتێکی لێ تێ دەگەیشت. جارێکیان بە پاسی نەفەرات لە دووگردکانەوە دەچێتە هەولێر و سەربازی عەرەب لە خاڵێکی پشکنینا رایاندەگرن و شروپڕەکانیان دەپشکننەوە. کاکەسمە پریاسکەیەکی پڕ هێلکەی پێ دەبێ کە لەناو کادا هەڵیگرتبوو نەشکێ. سەربازی عارەب پریاسکەکە دەگرێت لێی دەپرسێ " های شنو ؟ " کاکەسمەش بە حیساب عەرەبی فێر بووە و گۆیا دەزانێ هێلکە بە عەرەبی چی پێ دەڵێن دەڵێ " ئەوە ئەبیەزە ئەبیەز خوا عافوت کا ".

لە سەردەمی شۆڕشی ناوشاخا کاکەسمە لەگەڵ کاک ئەحمەدی برام پێشمەرگە بوو و ئەگەر لە دووگردکانیش بوا هەمیشە میوانداری مەفرەزەی پێشمەرگەکانی دەکردو هەموو جۆرە یارمەتییەکی بۆ دابین دەکردن. دیوەخانی کاکەسمە هەمیشە ئاوەلا بوو بۆ هەموو میوانی خزمانی دزەیی و هی تریش و کاکە زیاردی حەماغای کۆیەش میوانی بووە. یادت بەخێر کاکەسمەی قسەخۆش.

## محەمەدی مەولود هەولێری

محەمەد کوڕی مەولود ئاغای هەولێری بوو کە بە ئەسڵ لە بنەماڵەی عوزێرییەکانی هەولێر بوون بەڵام مەولود ئاغای باوکی لەبەر هەندێ هۆی دوژمنداری هاتبووە دووگردکان لەوێ مایەوە و بوو بە یەکەم راوێژکاری باوکم لە کاروباری عەشایریدا. چونکە هەولێریش بوو ئەم پاشناوەی بەسەردا سەپێنرا. ئەمن لە بازنەکانی پێشووی ئەم نووسینانەم بە درێژی باسی چیرۆکی مەولود هەولێری و دایە هەمینەی هاوسەریم کردووە.

محەمەدی کوڕیشی بوو بە راوێژکاری سەرەکی کاکە ئەحمەدی برا گەورەمان و لە هەموو سەردانێکا بۆ هەر لایە یارو یاوەری بوو. سەرەڕای نەخوێندەواریشی محەمەد پیاوێکی زۆر تێ گەیشتوو و قسەزان بوو. با ئەم قسە خۆشەی محەمەدیشتان بۆ بگێڕمەوە کە خۆی بۆ من و براکانمی دەگێڕایەوە: جارێکیان دەچێتە حەج کە لە راستیدا ئەوەندە باوەڕیشی پێ نەبوو بەڵام نازانم چۆن ئیقناعیان کردبوو و بردبوویان. دەڵێ لەوێ لە کاتی "شەیتان رەجمکردنا" سەیری ئەملاو ئەولای خۆمم دەکرد ئەو هەموو کوردە بێ ئەقڵە باخەڵی خۆیان پڕ کردووە لە بەردی ورد و درشت و بە هەموو توانایانەوە دەیانهاوێتە شەیتان و لە گەڵیشیا دەیانگوت " هەی دایکەکەت وەهاو وەها لێ بکەم... دە وەرە دەرێ ئەگەر ئازای هەی مارسی بەدفەڕ" جا دەیگوت منیش کە ئەمانەم دەدی بەزەییم بە میللەتی خۆمانا دەهاتەوە و منیش بە ناچاری و لەسەرەخۆ چەند بەردێکی وردیلەم داوێشتە "بەحیساب شەیتان" و لە دڵی خۆشما دەمگوت " بەو خوایە شەیتان گیان ئەمن بەراستیم نییە بەڵام چی بکەم ئەگەر بەردت تێ نەگرم ئەم کەرانە من بەردباران دەکەن، لێم مەگرە بەخوای دەزانم چ گوناحت نییە" جارێکیشیان لە گوندی هێلاوە دەبێت

کە شێرکۆی کوڕی حیزبی زەحمەتکێشان بووە. ڕۆژێکیان محەمەد دەبینی کوڕەکەی دوو برادەری خۆی لەگەڵ خۆی هێناوەتە ماڵەوە هەردووکیان رانک و چۆغەی سپی زۆر جوان و گرانبەهایان لە بەرە سەرو کڵاشی سپی بێگەردی هەورامانیان لە پێیە و ریشۆڵەی بە وردەگوڵنگی زۆر جوانیش جامانەکەیانی رازاندووەتەوە. محەمەد بەخێرهاتنیان دەکات دەڵێ " ئەرێ برا ئێوە چ کارەن ؟ " دەڵێن " خارە ئێمە زەحمەتکێشین !" لەو ئانە کەرێکی دۆڵابی ئاوکێشان کە منداڵێک سواری بووبوو بەبەر چاویاندا رەت دەبێت. منداڵەکە نەقیزەی لەهەردوو لاملی کەرەکە دەچەقاند و تێی دەخوڕی بۆ ئەوەی خێراتر بڕوات و خوێن لە یەکێک لە برینەکانی دەچۆڕایەوە. محەمەد کە سەیری ئەو دیمەنەی کرد و سەیرێکی ئەو دوو کوڕە خاوێن و باوێنەشی کرد رووی تێ کردن گوتی" کوڕم ئێوەش بەخۆتان دەڵێن زەحمەتکێش ! زەحمەتکێشی بەڕاستی ئەو کەرە بەستەزمانەیە" قسە خۆشەکانی محەمەدی مەولود هەولێری ئەوەندە زۆرە لێرە جێگای نابێتەوە، یادی بەخێر.

## پیرداودئاغا و حەسەنی حاجی مستەفای

پیرداود ئاغا کوڕی حاجی خەلیلی مام زێندینی بوو کە یەکێکە لە بەرەبابەکانی دزەیی. یەکێک لە سێ گەڕەکەکانی دووگردکان ناوی خەلیلاوایە کە زووتر موڵکی ئەو حاجی خەلیلەی باوکی پیرداود بووە. پیرداوداغاش یەکێک بوو لە خۆشەویستەکانی بنەماڵەی ئێمەو ئەمیان پاسەوانیکردنی دیوەخان و ماڵی ئێمەی پێ سپێردرابوو و حەیدەری کوڕیشی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوو. هەرچی حەسەنی حاجی مستەفایە ئەمیان کوڕی حاجی مستەفای پێوە بوو کە تیرەیەکن لە بڵباس. مام حەسەنیش تا کۆچی دوایی کرد یاوەری هەمیشەی کاک ئەحمەدی کاکم بوو و یەکێک بوو لە کەسە نزیکەکان و

خۆشەویستی بنەماڵەی ئێمە. کورەکانیشی بەتایبەتی کاک عەلی و برایم برادەری منداڵی من وبراکانم بوون و پێشمەرگەی دێرینی شۆڕشی ئەیلول بوون. یادیان بەخێر هەموویان.

## حەسەن مێرەم و سابیرە قوتە و مەلا عومەر و عەزەی مام وسوو

حەسەن و سابیر هەردووکیان کاروباری ناو ماڵی ئێمە و حەساریان پێ سپێردرابوو و ساڵانێکی زۆر ئەم کارەی خۆیان زۆر بە جوانی بەجێ دەگەیاند و لە ئێمەوە زۆر نزیک بوون. مەلا عومەر کە نابینا بوو و هەندێ کەس (کۆرە)یان پێ دەگوت گۆپاڵێکی بەدەستەوە دەگرت و پیاوێکی تا بڵێی هەستیار بوو وەک دەڵێن پشیلە بەلایا رەتبوایە هەستی پێ دەکرد. مەلا عومەر کاری دەروازەوانی بن داڵانەکەی ماڵی ئێمەی پێ سپێردرابوو هەرچەندە کە زۆر کاری دیکەشی وەک پەیامنێر بۆناو ئاوایی پێ دەسپێردرا کە هەموو کووچە و کۆڵان و ماڵەکانی گوندی یەک بە یەک پێ دەزانی و سەگیش پێی نەدەڕەوین. یادت بەخێر مەلا عومەر خوا عەوێزەت بکاتەوە لەو نوورەی کە لە ژیانتا لێی بێ بەش بوویت. عەزەی مام وسووش پێشمەرگەی کاک ئەحمەدی برام بوو و لەپاش پێشمەرگایەتیش هەر لەگەڵ کاکم بوو و کاکم و ئێمە هەموومان زۆرمان خۆش دەویست. عەزەش قسەی زۆر خۆش بوو و ئێستاش ماوە لە دووگردکان دادەنیشێ و هەر جارێکی ئێمە براو برازاکانم بچینە دووگردکان بە دیداری شاد دەبینەوە. داوای تەمەن درێژی و تەندروستی بۆ دەکەم.

## شێخ فەرەج و سەکەی کچی

ئەم باوک و کچە دوو کارەکتەری سەرنجکێش بوون لە دووگردکان. شێخ فەرەج بە ئەسڵ خەڵکی هەڵەبجە بوو و نازانم کەی و بۆ کەوتبووە دووگردکان. دوور نیە بیستبیەتی کە ئاغاژنی دووگردکان (کافیەخانی بەرزنجی دایکم) سەیدە و یارمەتی هەموو شێخ و ساداتی دەستکورتی دەدا بۆیە رووی کردبووە ئەوێندەرێ. شێخ فەرەج هەر بە شێوەزاری هەڵەبجە قسەی دەکرد و هەمیشە دیشداشە و چاکەتێکی لەسەرا لەبەر دەکرد و مشکیەکی سووری گوڵنگداری لەسەری دەبەستا. چاوی شین بوو و قەفە سمێڵێکی گەورەی هەبوو و هەرگیز نەیدەهێشت یەک تاڵە مووی سپی نەبە سەری نە بە سمێڵ و ردێنیەوە دیار بێت، هەمیشە لە خەنەی دەنان. تەرپیرێکی زۆر بە زەوق بوو بەناو ئاواییدا دەگەڕا چ ماڵێک ژنی جوانی هەبوا لەوێ هەڵوەستەیەکی بۆ دەکرد و دەکەوتە قسە لەگەڵیانا. خەڵکەکەش پێی راهاتبوون. شەوانیش هەرگیز بە تاریکی نەدەگەڕا هەمیشە فانوسێکی بەدەستەوە بوو. دەنگیشی زۆر خۆش بوو و هەرچەندە کە ماڵەکەی کەوتبووە پەڕگەی گوند لەسەر رێی گوندی باقرتە زۆر جار گوێمان لێ دەبوو قەتار و ئەلاوەیسی و هۆرەی جافی دەچڕی. خولیای چوار شت بوو: جگەرە، چای، ژنی جوان، گۆرانی و دەنگی خۆش.

سەکینەی کچیشی کە لە تەمەنی نەوجوانیدا بوو و زۆر کەس هەر بە (سەکە) بانگیان دەکرد کچێکی باڵا قیت و رێکی زۆر جوان بوو و وەک باوکیشی بە زەوق و گوێمەدێ و بێباک بوو.

سەکە زۆر جار دەهاتە ناو پیاوان لە بەر سێبەری دیوەخانەکەی ئێمە و دەیکردە فشەو گاڵتە لەگەڵ پیاوان. چەندین جار زۆرانبازیشی لەگەڵ هەندێ ئێختیارەکانی گوندا دەکرد کە لە بیرمە مام کەریم هەباس و مام برایم هەمزە بوون و هەموو جاریش دەیدان بە عەردا.

جارێکیان بەهار بوو دیسان لەسەر گردا جەحێڵەکان پشتێنێکیان هێنا سەکینە و مام برایم هەمزەیان سەرتابەخوار پێ پێک بەستایەوە. لە رۆخی گردا خلۆریان کردنەوە بۆ ناو قەرسیلەکەی دامەنی گردی دیوەخانەکە. ئێستەش ئەو دیمەنە سەیرەم لەبەر چاوە کە خلۆر دەبوونەوە جارێک سەکینە جارێک برایم هەمزە بەبن دەکەوتن و بەسەر دەکەوتنەوە. ئەم خەڵکە مردبوون لە پێکەنینان. هەر جارێکیش بارانی زۆر بارییا و کەندی ناومالآن لێورێژ ببوایە ئیتر هاتوچۆ نەدەما لەنێوان گەرەکی ناوەند و گەرەکی خەلیلاوە. سەکینە بە خۆبەخشی دەچووە سەر ئاوەکەو ئەو پیاوانەی کە ماڵیان لەوبەر بواو رێیان لێ گیرابوا سەکینە لە پشتی خۆی دەکردن، لە ئاوەکەی دەدا و دەیپەڕاندنەوە بۆ ئەوبەری کەندەکە. جا پیرداوداغای حاجی خەلیلی کە زۆر مێیاز بوو و سەکینە پەڕاندبوویەوە دەیگوت توخوا سەکینە کیسەی تووتنم لەبیر کردووە بەخێری خۆت بمبەرەوە ئەو بەر و بمهێنەوە. سەکینەش دەیزانی درۆ دەکات دەیگوت بەخوای مام پیرداود دەشزانم بۆ سەگاتیتە بەڵام دەی قەیدی ناکات وەرە پشتێم.

هاوسەرەکەی شێخ فەرەج ناوی زبێدە بوو و خەڵک بە (زبە) بانگیان دەکرد. دوو کوڕ و دوو کچیان هەبوو: ساڵح، کاکل، سەکینە، عیسمەت. سەکینە شووی بە پیاوێکی هەڵەبجەیی کرد و لەوێ دەژییا. جارێکیان بەسەردان هاتبووەوە هەولێر بەداخەوە لەجادە ترومبێلێک لێی دابوو و کوشتی. منداڵەکانی ماون لە هەڵەبجە دادەنیشن. جارێکیان بیستبوویان من لە سلێمانیم هاتن بۆ لام و بەڕاستی دڵم بە بینینیان زۆر کرایەوە. هەزار رەحمەت لە گۆڕی مردووەکانیان بێت.

## دوو ئامۆزام: شاعیرێک و هونەرمەندێک

لەناو خزمە دزەییەکانم ژمارەیەکی زۆر هەن و هەبوون کە سەرباری خزمایەتیمان پەیوەندیی نزیکی برادەرایەتیشم لەگەڵیانا هەبووە. هێشتا لەوەش پتر ئەگەر هەندێکیان خەیاڵی قووڵیان لە نووسین و شیعردانانا هەبووبێ، یان دەنگێکی خۆش لە حەیران گوتن و بەهرەی دانانی حەیرانیشا.

عەلی فەتاح و حوسێنی عەلی ئاغا لەوانە بوون. ئەم دوو خزمەم کاریگەریی زۆریان لەسەر منا هەبووە سەبارەت بە هونەری شیعردانان و تێگەیشتنم لە حەیران و لاوک. بۆیە خۆیان لە شوێنی تایبەتیی یادمدا جێگیر کردووە.

## عەلی فەتاح دزەیی

تەبای هەموو لاوانی کۆتایی سییەکان و نیوەی یەکەمی چلەکانی سەدەی بیستەم عەلی فەتاحیش بە ناسیۆنالیزمی کوردی لەناو پارتییە ناسیۆنالیستەکانی ئەوان ساڵاندا دەست پێ دەکات، لەدوای جەنگا دەبێت بە شیوعی، لەپاشانیش لە ناوەڕاستی پەنجاکانا دەگەڕێتەوە بۆ ناو بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردییەوە. ئەمە پیشەی زۆرترایەتیی لاوانی کوردی ئەو زەمانە بوو کە خۆیشم یەکێک بووم لەوان.

کاک عەلی کوڕی فەتاح ئاغای حەوێز ئاغای ئامۆزای بابم بوو و لە گوندی دووسەرە دادەنیشتن کە ئێستا بووەتە ناحیەی شەمامک. دیارە هەر لە تەمەنێکی زۆر زووەوە بەهرەی ئەدەبییات و شیعری پێوە دیار بووە و ئەوەی کە یارمەتییشی داوە ئەو بەهرەیەی پتر

پـێ بگەشـێنێتەوە لەلایەکـەوە مامۆسـتا مـەلا خەلیلـی سـنجاوی مـەلای گوندەکەیـان بـووە کـە شـاعیرێکی لێهاتـووی سـەردەمی خـۆی بـووە بـە نازنـاوی (موخلیـس) و لەلایەکـی تریشـەوە کاک ئاغـای جـوکل ئاغـای ئامـۆزای کـە ئەویـش بـۆ سـەردەمی خـۆی شـاعیرێکی زۆر دڵتـەڕ بـووە. ئەمـن نامـەوێ بـە وردوباریکـی باسـی ژیانـی ئـەم پیـاوە بکـەم چونکـە ئەمـە هەویرێکـە ئـاوی زۆر دەوێـت و نووسـەرانی پێـش منیـش زۆریـان لەسـەر نووسـیوە و نووسـین و شیعرەکانیشـیان هەڵسـەنگاندووە. قۆناخـی گرینگـی رێچکـەی شـاعیریی کاک عەلـی بـەوەوە دەسـت پـێ دەکات کـە بـۆ ماوەیـەک لەگـەڵ شـاعیری گـەورە عەبـدولا گـۆران پێکـەوە لـە یـەک بەندیخانـە دەبـن. هەردووکیـان لەسـەر شـیوعیەت گیرابـوون. عەلـی فەتـاح لەبـارەی گۆرانـەوە دەڵـێ: "راسـتییەکەی ناسـیاری و ئاشـنایی تـەواوم لەگەڵیـا لـە سـاڵی (1951)دا و، لـە بەندیخانـەی (کەرکـووک)دا دەسـتی پـێ کـردووە. چەنـد مانگێـک لـەم بەندیخانەیـەدا پێکـەوە بوویـن و زۆربـەی کاتـی رۆژ و شـەومان بـە گفتوگۆکـردن لەبـارەی شـیعری کوردییـەوە دەبـردە سـەر." (بڕوانـە: عەلـی فەتـاح دزەیـی، خرۆشـان و رامـان، چاپـی 1987 ل - 7)

عەلـی فەتـاح بـە شیعری کلاسـیکی کـوردی دەسـتی بـە شیعرنووسـین کـردووە ئینجـا لەپاشـان تـا ئەندازەیـەک رووی کردووەتـە نووسـینی شـیعری مۆدێـرن بـەڵام هەرگیـز بەتـەواوی بـەلای (شـیعری ئـازاد)ا نەدەچـوو و پشـتی لـە میتـەر و دوادەنـگ (وەزن و قافیە) نەدەکـرد. کاک عەلـی ئەوەنـدە مەسـت و حەیرانـی شـیعرەکانی گـۆران بـوو کـە سـتایلی ئـەوی لـە زۆر شـیعرەکانیدا بـەکار هێنـاوە. چـوون لـە لادێـش گـەورە و پـەروەردە بووبـوو ژیانـی سـادە و سـاکاری جوتیـاران و دابونەریتـی دەشـتێ و ئـاوازی لاوک و حەیـران لـە شـیعرەکانیدا رەنگـی داوەتـەوە.

ئەمەیان چەند کوپلەیەکە لە یەکێک لەو شیعرانەی.

## یادێکی رابردوو

حەیران، حەیرانی دزەییان چریکەی دڵداری
ئاگر دەخاتەوە کوورەی دەروونی پیاوی پیر
جاحێڵ دەکا بە شێتی خەیاڵی نازداری
کە جووتە شەمامەی باخەڵی دەخاتەوە بیر
لە کوێی ئەی دەشتی قەراجی، ئەی هۆبەی رەشماڵان؟
لە کوێن ئەی شەنگە بێرییەکان، ئەی پۆلی چاوکاڵان؟

***

ئاخ بۆ فیقەی زورنا، رمبەی دەهۆڵ، زرەی کەمبەرە
نزمی شەمامە و چارۆگە و حەیرانی سەرچیایی
کێ دەتوانێ بڵێ: مامەی پیر وا هەڵمەپەرە!
بۆچ کەس هەیە لەو کاتەدا لە خۆی نەبێ بایی؟
پیاو هەتا دەمرێ، هەتا دەچێتە بن خاکی
هەر خۆی دەکا بە قوربانی کچ، بە کۆیلەی داکی
(عەلی فەتاح دزەیی، هەمان سەرچاوە)

عەلی فەتاح هەندێ لە شیعرەکانی لە کتێبێکدا بەناوی (خرۆشان و رامان) ساڵی 1987 بەچاپ گەیاند کە سروشتانە شیعرە زۆر نیشتمانییەکانی تێ نەخستبوو. ئەمەش تەواوی شیعرێکیەتی کە لە پەنجاکانا کاک عزەدین مستەفا رەسووڵ وەری گێرابووە سەر عەرەبی و لە کۆڤاری (الثقافة الوطنية)ی لوبنانیدا بڵاوی کردبۆوە.

بەردێک و جامی سەرێک
کەمێک مێوژ، نان دوو نووردوو
کانییەک و پیرە داربەڕوو

بەردێک، تفەنگێکی پێنج خۆر
سندووقێک گوللەی سەر بەمۆر

کوردێک، با هەر زۆر بێ دۆژمن
ڕێگایان نادا تێپەڕ بن

ئەی مێگەلی گورگ و بەراز
نەمرم لێرە نابن دەرباز

هۆ کوردەکەی پەستەک لەبەر
نەیدەیە دەست دوژمن سەنگەر

ڕێگەیان نەدەی تێپەڕ بن
با دیل نەکرێن منداڵ و ژن

ڕۆژێک، دووان، حەفتەی بردە سەر
نەیدایە دەست دوژمن سەنگەر

بۆمبایەک، دەک کوێر بی بۆمبا
گۆشت و دار و بەردی لێکدا

ئێستاش ئەو چوار گەزە خاکە
لای کوردان پیرۆز و پاکە

بەردێک و جامێکی سەرە
وەک مەزارگای پێغەمبەرە.
(عەلی فەتاح دزەیی، هەمان سەرچاوە.)

شانۆگەرییەکی زۆر سەرنجکێشیش بە ناوی (سوار و کچەمیر) لەو دیوانەیدا هەیە کە بەڕاستی شاکارێکی هونەری ئەدەبییاتە و بەلای زۆر لێکۆڵەرەکانەوە گەیاندوویەتیە ئاستی شیعری گۆران. عەلی زۆر وەستایانە بە هێما هەرچوار پارچەی کوردستانی تێکهەڵکێشاوە کە ئەگەر یەکێکی شارەزا پێت نەڵێ کەس بیری بۆ ئەوە ناچێت کە ئەمە چیرۆکێکی کوردستانی لێک دابچڕاوە. ئەم شانۆگەرییە بۆی هەیە بکرێ بە ئۆپەرێتێکی زۆر سەرکەوتوو ئەگەر کۆمپۆزەرێک موزیکی بۆ دابنێت.

عەلی فەتاح کە ماوەی بەندیخانەکەی تەواو دەکات کە پێموایە سێ ساڵێک دەبوو ئیتر بۆی نامێنێ لە زانکۆکانی عێراقدا وەربگیرێ روو دەکاتە شام و لەوێ کۆلێژی (ماف) تەواو دەکات. هەر لەو ساڵانەی دیمەشقیشی بوو (1953 -1957) کە لە ئەنجامی تێکەڵییەکی نزیکییەوە لەگەڵ بنەماڵە کوردە ناسیۆنالیستەکانی سووریا وەک بنەماڵەی میر جەلادەت بەدرخان و بنەماڵەی حاجۆ ئاغا و کەسایەتیی وەک نورەدین زازا و عیسمەت شەریف وانلی و عوسمان سەبری و جگەرخوێن و قەدری جان و مەمدوح بەگ و زۆری تریش عەلی فەتاح بەتەواوی دەکەوێتەوە ناو ریز و سەر رێچکەی ناسیۆنالیزمی کوردییەوە.

تا دوا هەناسەشی لە ساڵی 1992 عەلی فەتاح دزەیی رۆشەنبیرێکی کوردپەروەری شارەزای نەک هەر مێژووی ئەدەبییاتی کوردی بگرە هی رۆژئاوایی و رووسیش بوو. توێژینەوەی لەسەر مەم وزینی خانی یەکێکە لە شاکارەکانی. شیعری بێگانەشی وەردەگێڕایە سەر کوردی و بڵاوی دەکردەوە. عەلی فەتاح مرۆڤێکی تا بڵێی رۆشەنبیر بوو و خوێنەرێکی ماندوو نەناس بوو بۆ خوێندنەوەی جۆرەها کتێبی ئەدەبییات و رۆشەنبیری و زانیاریی گشتیی بە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی. کاک عەلی دوو جار شیعری بە دیاری بۆ من نووسیوە و جارێکیشیان بۆ نازداری کچم بە بۆنەی لەدایکبوونی لە ڤیەننا. ئەمەیان یەکێکە لەو دیارییانەی کە من ساڵی 1957 لە ڤیەننا

بووم ئەویش لە شامەوە بۆی ناردم:

لە کوێی ئەی دەنگ و ئاوازی براکەی نەوجەوانی من
لە کوێی ئەی بولبولی شیرین جریوەی کوردزمانی من

عومەر ئەی کاکی شیرینم لەبیرت بێ لە غوربەتدا
کە زۆر چاویان لە تۆیە کێوەکانی نیشتمانی من

دیاریی دووەمیشی کە من هەر لە ڤیەننا بووم ئەویش بە سەردان هاتبوو بۆ ئەو شارە و شیعرێکی دووردرێژی زۆر جوانی وەسفی ڤیەننای نووسی بە ناوی (یادێکی ڤیەننا) و بە دەسخەتی خۆی لەسەر رەشنووسەکەی نووسیوە:

بۆ هۆمەر دزەیی

پێم سەیرە ئەو شەقامەی گەڕەکی زانیاری کە ماڵی عەلی فەتاحی لێ بوو و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد بەناوی خۆی نەکراوە، بە ناوی نووسەری گەورە پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار کراوە. خۆی راستتر ئەوە دەبوو کە گۆڕەپانەکەی بەردەم ماڵی کاک مارف لە گەڕەکی تەعجیل کە هەر لە منداڵییەوە لەوێ گەورە بووبوو دەبوایە ئەوە بە ناوی کاک مارف بکرایە و شەقامەکەی ماڵی عەلی فەتاحیش لە گەڕەکی زانیاری ئەمیان بە ناوی عەلی فەتاح بکرایە. ئێستاش نەچووە بچێ.

## حوسێنی عەلی ئاغای دزەیی

ئەمن پێشتر بە کورتی باسی کاک حوسێنم کردبوو لەگەڵ دوو برا دەنگخۆشەکانی تری (جەمیل و فارس) . کاک حوسێنی عەلی ئاغای خورشید ئاغای مامم پڕ بە واتای وشە شۆڕەسوارێکی کەموێنەی بنەماڵەی دزەیی بوو. تا بڵێی قۆز، بەژن وباڵا بەرز و رێکوپێک، دەنگخۆش لە حەیران و لاوکا، دانەری حەیران، هەڵپەڕکێزانێکی لێهاتوو، سوارێکی چاک، راوچییەکی شارەزا و نیشانشکێنێکی کارامە، حیکایەتخوانێکی بەتاموچێژ لە گێڕانەوەدا و پسپۆڕی یاری کلاومستێن و قسەخۆش و مەجلیس گەرمکەر. ئەم هەموو سیفەتەی سوارچاکی جاران لەو پیاوە کۆ بووبوونەوە.

حوسێنی عەلی ئاغا کە لەناو خزمانی دزەیی بە (حوسێنی عەلۆی) ش دەناسرا لە گوندی قەپلانی ناوچەی کەندێناوە دادەنیشت و بۆ ماوەیەکیش لە گوندی (شەحەل)ی هەر لە کەندێناوە دەژییا. کاک حوسێن کە جگە لە خزمایەتی برادەرێکی زۆر نزیکی کاک ئەحمەدی برا گەورەکەمان و راستییەکەی برادەری هەموو براکانم و خۆیشم بوو هەرچەندە کە زۆر لە ئێمەش بەتەمەنتر بوو.

چاکم لەبیرە کاک حوسێن لە چلەکانی سەدەی رابردوو بە سواری وڵاخ لە گوندەکەی خۆیان دەهات بۆ دووگردکانی ئێمە و چەندین شەو دەمایە و کە بە لاوک و حەیران و حیکایەتخوانی ئێمەی هەموو سەرسام دەکرد. لەبیرمە ئەسپەکەی رەش بوو و هەمیشە تاژییەکیشی بۆ راوە مامز و کەروێشک لەگەڵ خۆیا دەگێڕا کە ناوی مسکە بوو و ئەویش هەر رەش بوو. کاک حوسێن چونکە بەژنێکی بۆ پیاوان زۆر جوانی هەبوو جلی کوردی و مشکیی زۆر جوان لێ دەهات. پیاوێکی زۆر بەزەوقیش بوو لە هەڵبژاردنی بەرگی کوردییا. چون دەنگیشی زۆر خۆش بوو بۆیە هەر هەوایەک لەسەری بدابایە دەستی لە بناگوێی دەنا زەنگوڵ زەنگوڵ بەندی حەیرانی خۆش خۆش لە

گەروویدا دەپرژانە هەواوە. کاک حوسێن و کاک جەمیلی براگەورەی کە ئەمیشیان وەستا بوو لە حەیران دانان و گوتنا دۆستایەتیی نزیکیان لەگەڵ لاوکبێژەکانی دەشتی دزەیی (حەمەد ئاغا مەندۆ و عەزیز ئاغا)دا هەبوو و لاوکەکانیان لەوان فێر دەبوون. بەڵام لە حەیران دانان و حەیران گوتنا ئەم دوو برایە لەتەک (زایەر و قوشە و جوامێر) دا پسپۆڕی ئەم ژانرەی هونەری کلاسیکی کوردی بوون. رەسوڵ گەردی هونەرمەند دەیگوت کە هەمیشە دەچوو بۆ لای کاک حوسێن و حەیرانی لێ فێر دەبوو، ئەمانە چەند بەندە حەیرانێکن لە دانانی حوسێنی عەلۆی:

* ئەگەر مردم قەت مەرێن درەنگە.

* قەبرەکم لۆ لێدەن لە مەعبەینی سینگ و مەمکی نازدار حەیرانێ، لێ مەدەن بە کورینگ و بێران، بیرازە، تەنگە.

* ئەوجا ئەمن دەرێم گەلینە، گەلی برا و برادەرینە ئەنگۆ لۆم برینە کۆمەرە کیژەکی تازە مەمک هاتی دەبا ئەوان بێنە سەرینم لەباتی یاسین و تەرقینم لۆم بگرێن بە ئاوازو دەنگە.

ئەمەش حەیرانێکی ترە:

* مرکیە لە من مەفتەن بوو بە تەنێ.

* سەرێ بە هیزار، گێی یێ بەگوارە، بەژنی نەرمۆکە، مامزی لە باسکی، خار لە گەردەنێ.

* سەرێ چەند سارە ئەتو دۆست و گراوێ من بووی ئەمن قەت نەمدەزانی ئەتووم نادەنێ.

ئەمن هەر لە منداڵیمەوە ئەو پیاوەم خۆش دەویست لەبەر کۆلێک سیفاتی کە مرۆڤی پێ خۆشەویست دەبێ. کاک حوسێن کە لە تەمەنێکی زۆر کورتا کۆچی دوایی کرد (تەنیا 55 ساڵ) لەلایەن هەموو بەرەبابەکانی خێڵی دزەیی و عەشیرەتەکانی دیکەی دەشتی دزەییەوە خۆشەویست بوو بە تایبەتی عەشرەتی کاڕەش چونکە دایکی کاڕەش بوو (هەمینە) و دەڵێن ژنێکی ئەوەندە جوان بووە کە هەر بە هەمینە جوان ناسراو بووە. خەڵکێکی زۆر بە مەرگی حوسێنی عەلی

ئاغـای کـه هێشـتا بابیشـی مابـوو سـوێیان بـۆوه.

هـەر بـۆ زانیـاری خوێنـەرە خۆشەویسـتەکانم کاک حوسـێن لـە سـاڵی حەفتـاوە بـوو بـە خەزووریشـم کـە یەکێـک لـە پێنـج کچـە جوانەکانیـم (روونـاس) کـرد بـە هاوسـەر. گۆڕەکەشـی لەسـەر گـردی پیـرداودە لـە تەنشـت گـۆڕی عەلـی ئاغـای بابـی و فارسـی بـرای. یادیـان بەخێـر و هـەزار ڕەحمەتیـان لـێ بـێ.

پێـش ئـەوەی هەولێـر بەجـێ بێڵـم و بـۆ خوێندنـی ناوەنـدی و ئامادەیـی کـە لـە زەمانـی ئێمـەدا پێنـج سـاڵ بـوو بچـم بـوو کەرکـووک حـەز دەکـەم چەنـد تێبینیەکـی کـورت بـدەم لەبـارەی سیسـتەمی خوێندنـی قۆناخـی سـەرەتایی ئـەو سـاڵانە.

هەڵبـەت ئەمـن کـە قوتابیـی سـەرەتایی بـووم واتـا منداڵێکـی هەشـت نۆ دە سـاڵان بـووم هەنگـی بـە هیـچ شـێوەیەک ئـەم تـێ بینیانـەم بـە خەیاڵـدا نەدەهاتـن کـە ئێسـتا وا دەیانخەمـە ڕوو. کـە دواتـر، دوای تەواوکردنـی ئامادەیـی و چوونـم بـۆ دەرەوەی وڵات، ئەوسـا بـۆم دەرکـەوت کـە دەبـێ هـەزار ڕەحمـەت بـۆ گـۆڕی ئـەو مامۆسـتایانە بنێـرم کـە ئـەم سیسـتەمە زانسـتیە و ئـەو بەرنامـە جوانانەیـان بـۆ فێرکردنـی منداڵانـی سـەرەتایی دادەنـا. نازانـم بـەڵام لەوانەیـە سیسـتەمی خوێندنـی ئەوسـاکە لـە عیراقـدا هـەر هەمـان سیسـتەمی بریتانـی بووبێـت، چونکـە بریتانیـا خـۆی ئـەم عیراقـەی لەپـاش وەدەرنانـی تورکـە عوسـمانییەکان دامەزرانـد و ئـەم وڵاتـە تازەیـەی لـە دواکەوتوویـی سـەدان سـاڵ داتەکانـد و سیسـتەمی بـۆ ئـەو زەمانـە مۆدێرنـی بەڕێوەبـردن و پـەروەردەی بریتانیـی لـێ پیـادە کـرد. جـا هـەر لایەنێکـی ئـەو بەرنامـە حەیاتـەی دانابێـت یـادی بەخێـر، ئێمـە قـەرزاری ئەویـن.

بەرنامـەی پـەروەردە نـەک هـەر هەمەگـر بـووو بەڵکـو بـۆ تەمەنـی منداڵـی وەک ئێمـە وردەکاریـی باشیشـی تێـدا بـوو. مێـژوو، جۆگرافیـا، واجیباتـی وەتەنـی، تەندروسـتی، بۆیـەکاری و هونـەرکاری، سـپۆرت و سـروود، ماتماتیـک، ئاییـن، زمانـی کـوردی، زمانـی عەرەبـی، زمانـی ئینگلیـزی ئەمانـە هەمـووی لـە کتێبـی زۆر بەبایەخـی تایبەتـی نووسـراو

و بە وێنە و ڕەسمی پەیوەندیدار دەوڵەمەندکراوەوە بە قوتابیەکان دەگوتران. ئێستاش وێنە جوانەکانی ناو هەندێ لەو کتێبانە و هەڵبەستە کوردییە خۆشەکانم هێشتا هەر لەبەر چاوە وەک:

دوو پشیلەی جوان و ڕێک
هەڵسان و چوونە جێ یێک
بۆ دزیی سەلکێ پەنیر
کەوتنە پیلان و تەگبیر

یان چیرۆکی (دوو مەیموونی چێشتکەر). لە هەمووی سەرنجکێشتر، کە زۆر دواتر هەستم پێ کرد، ئەو وردەکاریانە بوو کە لە وانەی مێژوو و جۆگرافیا پێمان دەگوترا. لە پۆلی پێنج و شەشەوە ئیتر مێژووی ئیسلامەتی و مێژووی ئەورووپامان تا رادەیەک بە وردی دەخوێند. کە چووم بۆ ئەورووپا و چاوم بەو کۆشک و تەلار و موزەخانانە دەکەوت کە چیرۆکی پادشایەتی و خانەدانانی ئەو سەردەمانەیان دەگێڕایەوە و هەرچییەکی لەبارەی شۆڕشی فرانسی و ماری ئەنتوانێت و ژان ژاک رووسۆ و ڤۆلتێر و میرابۆ و رۆبسپیێر و مارام خوێندبوو هەموویم بە چاویش لەو شوێنانەدا بەدی دەکرد و شانازییەکی زۆرم بەخۆمەوە دەکرد کە هەر لە ساڵانی قوتابخانەی سەرەتاییمدا زانیارییەکی باشم لەسەر ئەم مێژووە هەبوو و ئێستاش وا بەچاوی خۆم دەیبینم.

لە وانەی جۆگرافیای سیاسی و سروشتیش هەمان شانازی. باوەڕ بکەن کە ناوی ئەو هەموو چیا و رووبار و شارانەی ئەورووپا و ئەمەریکام لای برادەرە هاوزاکانی ئەورووپام دەهێنا سەریان سوور دەما کە من دەمزانی و ئەوان نەیاندەزانی. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە پێم دەگوتن بۆ نموونە لە بریتانیا شاری شێفیلد و مانچێستەر و بێرمینگهام بە خەڵووزی بەرد بەناوبانگن یان کە شاری سۆلینگن لە ئاڵمانیا بە ئاسن و پۆلا. رەنگە ئێستا بە تەمەنی ئەمرۆم تەواوی ئەم وردەکاریانەم لەبیر نەمابێ، بەڵام کە بە تەمەنی بیست ساڵی تازە چووبووم بۆ ئەورووپا ئەمانەم هەموو دەزانی کە لە قوتابخانەی منداڵیم فێری بووبووم.

بێجگە لە وانەکانی بەرنامەی خوێندن لە قوتابخانەکانی سەرەتایی عیراقا هەندێ چالاکیی دەرەوەی بەرنامەی خوێندنیش (extra curriculum) بایەخی زۆری پێ دەدرا وەک دیدەوانی (کشافە) و چوونە سەیران بۆ راهاتن و فێربوونی ناوی هەندێ دار و درەخت و دیاردەی سروشتی و هەندێ وانەی چۆنیەتیی خوێندنەوەی شیعر. دواتر لە قۆناخی ناوەندیدا شانۆگەری و رەوانبێژی (خیتابە و بلاغە) و هەندێ چالاکیی تریش کە لەبیرم نەماون ئەوانەیش هەمووی بۆ قوتابییەکان بەردەست دەکران کە هەر کەسە بە ئارەزوو و حەزی خۆی هەڵی بژێرێت. بەداخەوە لە سەردەمی ئێمەدا فێرکردنی هیچ ئامێرێکی موزیک لە وانەی (سپۆرت و سروود)دا نەبوو . بەڵام سروودی خۆش خۆشی کوردایەتی و سروودی عەرەبیش فێر دەکراین و هەموو بەیانییان پێش چوونە ناو پۆلەکان هەموو قوتابییەکان لە حەوشی قوتابخانە ریز دەکران و ئەو سروودانەیان دەگوت بێ ئامێری موزیک.

مامۆستاکانمان یادیان بەخێر ئەوانەی کە ئەم دنیایەیان بەجێ هێشتووە نموونەی دڵسۆزی بوون بۆ ئەرکەکانیان و بۆ هەڵوێستی باوکانەیان بەرامبەر بە قوتابییە وردیلەکان. ئەمن نازانم ئەمڕۆ چۆنە بەڵام مامۆستای سەردەمی ئێمە بەڕاستی مامۆستای پەروەردەکار بوون لە هەموو رووێکەوە. کەسایەتیی بەهێز و پەیوەندیی جددییان لەگەڵ قوتابییەکانا هەبوو و لای کەسوکاری قوتابییەکانیش رێزی تایبەتییان لێ دەگیرا. ئەو مامۆستایانە کارەکەی خۆیان ئەوەندە بە هەند وەردەگرت و ئەوەندە باوکئاسا خەمخۆری قوتابییەکانیان بوون کە ئەگەر دوای تەواوبوونی وانەکانی رۆژێک هەر منداڵێکیان دەمی ئێوارە لە جادە بدیبا بۆ بەیانی ئەگەر دارکاریشیان نەکردایە سەرزنشتێکی زۆریان دەکرد و بە کەسوکاریشیان دەگوت کە دوێنێ منداڵەکەی لەسەر جادە بووە. چاکم لەبیرە ئەگەر من و هاوڕێکانم رۆژێکیان پیاسەیەکمان بەناو شارا بکردایە و لە دوورەوە چاومان بە یەکێک لە مامۆستاکانمان بکەوتایە یەکسەر هەر یەکە بە لایەکا پەرتەمان لێ دەکرد و خۆمان دەشاردەوە نەوەک مامۆستا بمانبینێ.

ئاوا بوو خوێندنی زەمانی پێشان کە ئێمە منداڵ بووین. هەموو شتێک زۆر بە جددی وەردەگیرا، قوتابی قوتابی بوو، مامۆستا پەروەردەکار بوو و پلە و پایەیەکی تایبەتی لەناو کۆمەڵگادا هەبوو، سیستەم و بەرنامەی خوێندن زۆر بە شارەزایی و زانستییانە دادەڕێژران، زانست هەرگیز تێکەڵ بە سیاسەت و عاتیفەی قەومی نەدەکرا کە مێژوو بە مەبەستی تایبەت و بۆ بەرژەوەندیی چینێک بنووسرێتەوە. هەرچەندە کە لەپاش ئینگلیزەکان حکوومەتی عیراق کابرایەکی قەومیی عەرەبیی شۆڤینیی سووری (ساطع الحصري) هێنا کردی بە راوێژکاری گشتیی پەروەردەی عیراقی لە بەغدا و بە پێچەوانەی بەرنامەی پەروەردەی ئینگلیزەکان کە جۆرە حیسابێکیان بۆ قەومی کوردیش تێدا کردبوو، ئەمیان هەوڵی زۆری دا بەرنامەکانی خوێندن لە تەواوی عیراقا بعەرەبێنێ (تەعریبی قەومی بکات)، بەڵام خۆشبەختانە بۆی نەچووە سەر و کورد زیاتر بوو بە ناسیۆنالیست.

سەری رێز و پێزانینم بۆ مامۆستایانی ئەو زەمانە دادەنوێنم کە زۆرێکیان جوو بوون و ئینسانی زۆر بەڕێز و خۆشەزیستی شار بوون. هەزار سڵاو و رەحمەت بۆ گۆڕی ئەوانەی ئەم دونیایەیان بەجێشتووە دەنێرم. خۆزگەم بۆ سەردەمە خۆشەکەی جاران کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن the good old days.

بای بای هەولێر، کەرکوک خۆت بگرە هاتم

ئەحمەد عوسمان ناسراو بە ئەحمەد ئەفەندی
(1946 - 1879)

ڕەشید عارف

پیرەمێردی شاعیر

فەیسەڵی ئەحمەد ئەفەندی و هاوسەری
نەفیسە خانی کچی مەلا ئەفەندی

سەعید قەزاز

فائیق هوشیار

مەلا مستەفا بارزانی
1979 - 1903

ڕەمزی نافیع ئاغا
1949 - 1917

برایانی ڕەمزی، سوعاد ئاغا و قەرەنی ئاغا

فەیسەڵی ئەحمەد ئەفەندی، پورزای
هۆمەر دزەیی (1922 - 1943)

نەفسیەخانی کچی مەلا ئەفەندی،
هاوسەری فەیسەڵ (1921 - 2003)

له ڕاستەوە: عاسم حەیدەری، ئەنوەر دزەیی، جەمال حەیدەری، موحسین دزەیی و هۆمەر دزەیی
هەولێر 1948

له چەپەوە: حەمەدەمین پێنجوێنی، عەزیز محەمەد و هۆمەر دزەیی
هەولێر ماڵی کاک عەزیز

له ڕاستەوە: ئەنوەر دزەیی، حەمید عوسمان، موحسین دزەیی و ئەحمەد وەیسی
هەولێر 1948

له ڕاستەوە، ڕەمزی نافیع ئاغا و نورەدین زازا
له بەیروت

ئارامگەی ڕەمزی له هەولێر

دانیشتووەکە مهیب حەیدەری لەگەڵ هۆمەر دزەیی
هەولێر 1956

له چەپەوە: میولەری ئەڵمان، سەنگەری سوعاد ئاغا و موحسین دزەیی
هەولێر

هۆمەر دزەیی و دکتۆر خورشید دزەیی ئامۆزا و هاوکلاسی منداڵیی لە ئاقاری گوندی نۆغەران

عەونی یوسف و ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی برای هۆمەر

هۆشمەندی کوڕی زەید ئەحمەد عوسمان

مەحموودی برای زەید ئەحمەد عوسمان لەگەڵ هۆمەر دزەیی پورزای

زەید ئەحمەد عوسمان
1978 - 1924

جەوهەری حوسێنی مەلای
دزەیی (ئامۆزای هۆمەر)

موشیر ئاغای عەدۆی دزەیی
(1991-1909)

برایم عەلی حەمەداغای دزەیی
(1988-1918)

نەعیمەخانی شێخ مارفی بەرزنجی هاوسەری
ئەحمەد عوسمان

قەدریەخانی ئەحمەد عوسمان ناسراو بە دادەحان (1916 - 2012)

نەوزاد ئەحمەد عوسمان
1940 -

فەوزیەخانی ئەحمەد عوسمان
1929 -

گوزیدەخانی ئەحمەد عوسمان
1999 - 1930

مەحموود ئەحمەد عوسمان
1932 -

فوئاد ئەحمەد عوسمان
1936 -

گیوی موکریانی (1904 - 1977)

وەهبیەخانی ئەحمەد عوسمان
1920 - 2010

زەید ئەحمەد عوسمان دووەم کەس لای دەستە چەپی بارزانی بە قاتە ڕەشەکە کە شاندێکی عێراقی بردبوو بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرکردایەتی کوردا

پراوەکردن بۆ نەورۆزی 1946، هۆمەر لە ناوەڕاستە کۆرسەکەشی لە پشتەوەیە،
لە پەڕگەی لای چەپ مەجید ڕەئووف وەستاوە

نووری ئەمین مامۆستای سروود و سپۆرت

جیهاد عەبدولڕەزاق مامۆستای سروود

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، نەوشیروان مستەفا، قادر حەمەدەمین پەری، دکتۆر عادل حەسەن حوسنی، موئەیەد دزەیی لە ئەمریکا

مام جەلال و هۆمەر دزەیی لە ئەمریکا

مام جەلال و هۆمەر دزەیی لە ماڵی دکتۆر بەرهەم لە نزیک واشنتۆن، لە کۆتایی نۆهەتەکان

مەلا محەمەدی فەرهادی (1894 - 1950)

عەلی فەتاح دزەیی (1928 - 1992)

فایەقی شێخ جەمیلی خانەقا

مەلا برایمی فەرهادی
(1912 - 1980)

پیرۆزخانی ئەمین ڕواندزی
(1928 - 1983)

کوچەیەکی کۆنی ناو شاری بەغدا

کاک ئەنومر دزەیی برای هۆمەر

کارمامزی دەشتی قەراجی

شەمەندەفەرێکی سەردەمی کۆن

نافیع ئاغای ڕەشید ئاغا باوکی جەودەت

محەمەد حەسەن (1922 - 1991)

پۆلی چواری سەرەتایی 1945 - 1946، ریزی ناوەڕاست لە ڕاستەوە: دووەم هۆمەر دزەیی و چوارەم جەودەت نافیعە و لە دانیشتووەکانی سەر ئەرز لە ڕاستەوە سێیەم دکتۆر خورشید دزەیی

سابیری عەلی قادری
(ناسراو بە سابیرە قوتە)
2013 - 1922

حەسەن مێرەم
1978 - 1917

حاجی کەریمی عەولاّ ڕەشی
1972 - 1882

حەسەنی حاجی موستەفا
1980 - 1902

سمایلی کێخوا ئەحمەدی (ناسراو بە کاکە سمە)
2003 - 1926

کێخوا عەلی کێخوا وەسمانی ناسراو بە کاکە
عەلی (1974 - 1905)

محەمەد مەولوود هەولێری
1994 - 1917

ئەوەی چەپ حوسێنی عەلی ئاغایە و ئەوەیتر
ئەحمەد حەمەدەمینی برا گەورەی هۆمەر دزەیی
هەولێر 1942

عەلی فەتاح دزەیی
1992 - 1928

دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: قەدری جەمیل پاشا، هۆمەر دزەیی، عوسمان سەبری.
ئەوانەی دواوە لە ڕاستەوە: عومەر محێدین، عیسمەت شەریف وانلی، نورەدین زازا، قەدری جان،
محەمەد زلفۆ، عیسا زەبیحی، عەلی فەتاح دزەیی، عزەدین مستەفا ڕەسوڵ.
دوانەکەی هەرە دواوە لە ڕاستەوە: جەمشید بەدرخان، ڕەمەزان حوسێن
شام 1957.4.2

مامۆستا ئەحمەد عەلی حەیاوی

مامۆستا بەشیر مستەفا

مامۆستا کەریم یونس

مامۆستا عەلی حوسێن کەسرە

مامۆستا یونس مستەفا

مامۆستا شوعە مەخلووف

## مادبتـان تكريميتـان

اقام الاستاذ المحامي زيد احمد عثمان ظهر امس بداره في الهندية مادبة غداء تكريما للسيد ادريس البارزاني نجل الملا مصطفى البارزاني بمناسبة قدومه والوفد المرافق له الى بغداد ومقابلتهم للسيد رئيس الجمهورية الفريق عبدالرحمن محمد عارف وكان الاستاذ زيد واخوانه يستقبلون ضيوفهم بما جبلوا عليه من لطف ويسبغون عليهم ضروب الحفاوة والتكريم . وقد انتظمت دارة الاستاذ زيد عددا كبيرا من الشخصيات المعروفة باشتغالها بالحقل الوطني والقضايا العامة كان منهم السادة : ادريس البارزاني وحبيب محمد كريم ومحسن ديزه ئي ونافذ جلال وصالح اليوسفي وشوكت عقراوي والاستاذ عبد الرحمن البزاز رئيس الوزراء السابق وبابا علي وفؤاد عارف وعلي السنجري والدكتور عبد الرحمن عبدالله ورشيد نجيب ، وعلي كمال ورؤف احمد واحسان شيرزاد وفرني الدوغره مجي وهادي الجاوشلي واكرم الجاف ومسعود محمد واحمد كمال وكريم مراد وجبار عزيز ومهدي السيد محسن الحكيم وعلي الشعلان وعمر علي وحسين جميل وصادق كمونة والدكتور كاظم شبر وكاظم الرواف والدكتور باقر عبد الغني وعبد الوهاب الامين وخليل جميل والحاج نعمان العاني ، وقد انتهت حفلة الغداء بعد الساعة الثالثة ، وكانت فرصة طيبة اتاح بها الاستاذ زيد احمد عثمان لهذه النخبة التحدث في مختلف القضايا القومية والوطنية ومواضيع الساعة ، وقد ترك الضيوف دار صاحب الدعوة مودعين بمثل ما استقبلوا به من التكريم .

وفي مساء اليوم ذاته اقام الاستاذ فؤاد عارف بداره في شارع المغرب مادبة عشاء تكريمية على شرف السيد ادريس البارزاني حضرها اكثرية الشخصيات التي تناولت الغداء على مائدة السيد زيد احمد عثمان بالاضافة الى عدد اخر من الشخصيات العربية والكردية وكان (( ابو فرهاد )) على سجيته يبالغ في اكرام ضيوفه، ويتحفهم باللطف والاريحية المأثورة عنه ، وفي ساعة متاخرة من الليل خرج ضيوف الاستاذ فؤاد عارف بعد تناول العشاء على مائدته شاكرين له ما لقوه في داره من حفاوة بالغة وتكريم .

صحيفة العرب، السبت ٢١ / ١ / ١٩٦٧م

ڕۆژنامەی (الاتحاد)ی عێراقی باسی ئێوارەخوانێک بۆ ئیدریس بارزانی و شاندی کوردی دەکات لە ماڵی زەید لە بەغدا

بەرگی کتێبەکەی سالّح جەبر

بەرگی کتێبەکەی میوللەر بە ئەڵمانی

کتێبی (خەباتی کورد)ی محمد شێرزاد کە زەید ئەحمەد عوسمان بەو نازناوە بە عەرەبی نووسیویەتی

خانوەکەی مەلا غەنی ئەمرۆ تەنیا کۆشکەکەی ماوە، ژێرەکەی بۆتە دوکان

خانووەکەی حەسەن حوسنی لە کۆلانی خانەقا، ئەمڕۆ هەر ئەوەندەی لێ ماوە

ماڵی محەمەد حەسەن لە چلەکان و پەنجاکان لە گەڕەکی سەعدوناوە

# بەشی 9

## ساڵانی قوتابخانەم لە کەرکووک

## 1950 - 1954

ساڵی 1950 خوێندنی سەرەتاییم لە هەولێر بە هەشت ساڵ تەواو کرد کە خۆی شەش ساڵ بوو. بەڵام وەک پێشتر باسم کردووە دوو ساڵ (لە پێنج و لە شەشا) بۆ ماوەی پچڕپچڕ خۆم دەشاردەوە بەڵکو برا گەورەکانم بەزەییان پێما بێتەوە، لە خوێندن دەرم بێنن و بمنێرنەوە بۆ دووگردکانە حەیاتەکەی خۆم. هەوڵەکانم سەری نەدەگرت و بە هەزار لێدان و کوتان دەیانبردمەوە بۆ قوتابخانە. جا کە دەگەڕامەوە سروشتانە وانەیەکی زۆرم لە دەست چووبوو و ئەو ساڵە بە ساقیت دەمامەوە.

ئەوە بوو کە لە قوتابخانەی (ثانویة اربیل) کە بریتی بوو لە سێ ساڵ خوێندنی ناوەندی و دوو ساڵیش خوێندنی ئامادەیی بۆ ساڵی سکۆلاری 51 - 50 ناونووس کرام. قوتابخانەکەمان لە شوێنی باڵاخانەی ئێستای پارێزگای هەولێر بوو لە دامەن قەڵا، نزیک دەروازەی ئەحمەدییەی قەڵا. سەیر ئەوەیە ئەمجارەیان بە پێچەوانەی ساڵانی خوێندنی سەرەتاییم خوێندنی سانەویم زۆر پێ خۆش بوو. وێ دەچێ لەوێوە بەو تەمەنە کەمێک کامڵتر بووەم ئیتر رەنگی دووگردکان لە هۆش و خەیاڵما خەریک بوو وردە وردە سپیات دەبۆوە. خۆ پێشتریش لەم نووسینانەما گوتوومە کە لە تەمەنی منداڵیما دژایەتی من بۆ خوێندن خودی خوێندن نەبوە بەڵکو تەنها دابڕانم بوو لە دووگردکان و دابڕانم لە ئازادی و رەهایی لادێ و بەسترانەوەم لە

خانوێکی تەنگ و رەشی شار کە بەبێ مۆڵەتی برا گەورە نەمدەتوانی لە دەرگایماڵەکەمان دوور کەومەوە. ئەوە بوو حاڵم لە هەولێر کە من پێی ڕانەهاتبووم چونکە شتی وا لە دەشتێ نەبوو. ئەگەر لە تەمەنی چوونە بەر خوێندنی منا قوتابخانە لە گوندەکەمان هەبوایە چ کێشەم لەگەڵ خوێندنا نەدەبوو. بەڵام کە گەیشتمە قۆناخی ناوەندی ئیتر ئازادی گەڕانو سووڕانم وەک پێشوو سنووردار نەدەکرا و تا رادەیەک بۆم هەبوو بە ئارەزووی خۆم بگەڕێم. هەر ئەو ساڵەش دوو گۆڕان بەسەر ژیانی خوێندنماندا هات. یەک: کاک موحسینی برام بەکالۆریای پێنجی تەواو کردبوو و لە کۆلێژی ماف لە بەغدا وەرگیرابوو ئیتر ئەومان لەگەڵا نەماو چوو بۆ بەغدا. دوو: کاک ئەنوەری براشم چونکی پێشتر لەسەر سیاسەت هەم بریندار کرابوو و هەم دوو ساڵێکیش حوکمی بەندیخانە درابوو کە پێشتر بە درێژیی باسم لێوە کردووە بۆیە ئەویش فەسڵ کرابوو و دەبوایە ئامادەییەکەی لە قوتابخانەیەکی ئەهلی ئێواران تەواو بکات تا بچێتە کۆلێژ. ئەو قوتابخانەیەش لە هەولێر نەبوو لە کەرکووک هەبوو. کاک ئەنوەرم دەبوایە بچێتە کەرکووک و من و سەعدی براشم نەدەکرا بەتەنیا بێ براگەورە لە هەولێرا بمێنینەوە. ئەوەبوو کە لە ماڵەوە بڕیار درا من و سەعدیش لەگەڵ کاک ئەنوەر بڕۆین بۆ کەرکووک و خوێندنمان لەوێ تەواو بکەین. بۆیە پێم وایە تەنها بۆ ماوەی چەند مانگێک لە هەولێر دەوامان کرد و هەرسێ برا (کاک ئەنوەر و کاک سەعدی و خۆم) لەگەڵ بنەوانەکانمان پلکە سوڵتان و مام ئەحمەد وەیسی بارمان کرد بۆ کەرکووک.

وەک گوتم ئەو چەند مانگەی کە لە سانەوی هەولێر دەوامم دەکرد بەلامەوە خۆش بوو. بەڕێوەبەرمان مامۆستا عوسمان قۆجە بوو و مامۆستاکانیشمان هەموویانم لەبیر نەماوە چونکە ماوەیەکی کەم لەوێ مامەوە بەڵام ئەمانەم لەبیر ناچێ: مامۆستا مستەفا حەسەن شەعبان ئامێدی، مامۆستا جەمیل رەشید ئامێدی، مامۆستا یەعقوب یوسف کەساب موسڵاوی، مامۆستا غانم ئەفەندی موسڵاوی، مامۆستا نەشئەت

محەمـەد سـەفوەت هەولێـری و ...

لەوێـوە بـۆم دەرکـەوت کـە مـن زیاتـر مەیلـی ئەدەبییـات و زمـان و مێـژووم هەیـە نـەک وانـە زانسـتییەکان. بـەڵام ئـەوەی کە سـەرنجکێش بوو لـە تاقیکردنەوەکانـی وانـەی (مثلثـات) چەنـد جارێـک سـەتم وەرگـرت. ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە چونکـە ئـەو زانسـتە هونـەری ڕەسمکێشـانی تیایـە و منیـش وەک هونەرمەندێـک نـەک حـەزم هـەر لـە موزیـک و گۆرانـی بـوو بەڵکـو بۆیـەکاری و ڕەسمکێشـانیش یەکێـک بـوو لـە خولیـا دڵخۆشـکەرەوەکانم. لـە ماڵـەوە بۆخـۆم ڕەسـمی جـوان جوانـم بـە بۆیـەی ئـاوی و بـە قەڵەمـی ڕەش دەکێشـا. چاکـم لەبیـرە ئەوسـاڵە نـا بـەڵام دواتـر لـە کەرکـووک وێنەیەکـی زۆر جوانـی مـەلا مسـتەفای بارزانیـم بـە بەرگـی جەنەڕاڵییـەوە کـە لـە مەهابـاد بـووە بـە قەڵەمـی ڕەش کێشـابوو. هـەر وەهـا لەپـاش مردنـی سـتالین سـاڵی 1953 چەنـد وێنەیەکـی زۆر سـەرکەوتووی سـەرکردایەتی نوێـی پارتـی کۆمونیسـت و حکوومەتـی سـۆڤیەتم بـە قەڵەمـی ڕەش کێشـابوو لـە ناویانـا: مالینکـۆڤ، مۆلۆتـۆڤ، بولگانیـن، بێریـا (دواتـر لـە سـێدارە درا). لەسـەر چەنـد کاشـییەکیش بـە بۆیـەی ڕەنگاوڕەنگـی ئـاوی لاسـای چەنـد تابلۆیەکـی بەناوبانگـی هونەرمەندانـی ئەورووپاییـم کردبـۆوە کـە زۆر جوانـم کردبـوو هەرچەنـدە کـە ئێسـتاش نازانـم تابلـۆکان هـی چ هونەرمەنـدێ بـوون.

دوای ئـەو مـاوە کورتـەی خوێندنـی ناوەندیـی هەولێـرم ئیتـر ڕۆیشـتین بـۆ کەرکـووک و ئـەوە یەکـەم جاربـوو لـە ژیانمـدا کـە هەسـتێکی غەریبـی بـۆ هەولێـر دامبگـرێ، بەڵـێ بەڵـێ بـۆ هەولێـرە مۆتەکەکـەم !!! ئـەوەی کـە ئـەو هەسـتەی هێشـتا لـێ تیرتـر کـردم ئـەو خانـووە ناخۆشـە و ئـەو گەڕەکـە بۆگەنـەی مصلـی (مصـەلا) بـوو لـە کەرکـووک کـە کاک ئەنـوەری براگەورەمـان پێـش ئێمـە چووبـوو بـە کرێـی گرتبـوو. ئێسـتاش تـێ ناگـەم کاک ئەنـوەرم بـۆ ئەوێـی هەڵبژاردبـوو. لـەوە دەچـێ ئەویـش کـە شـارەزای کەرکـووک نەبـووە گەڕەکـی چـاک و خراپـی لێـک نەکردووەتـەوە. خانووەکـە دوو نهـۆم بـوو بـەڵام تـا بڵێیـت تەنـگ

و دیـوار رەش و پەنجـەرە بچـووک بـوو و مـن زۆر جـار دەمگـوت بەوخوایـە خـودی جنۆکـە خۆیشـی لێرە لـەم خانـووە دەترسێت و شێت دەبێ. کۆلانەکـە ئەویـش زۆر تەنـگ بـوو و بـە شـەو تاریـک دەبـوو و زۆر جـار گوێمـان لـە هـاوار هـاواری یەکێـک دەبـوو کـە بانگـی دەکـرد (دەوریـە، دەوریـە) لەپاشـانا دەنگـی دەبـڕا و تەنهـا گوێمـان لـە مرخـە مرخـێ دەبـوو کـە کاک ئەنـوەری برامـان دەیگـوت ئـەوە دیـارە چەنـد کەسـێ دەیانـەوێ یەکێـک رووت بکـەن و قوڕگیـان گرتـووە تـا هـاوار نـەکات. ئیتـر ئێمـەش بـە جـارێ دەتۆقیـن. گەڕەکـی مصلـی بـە زۆریـی گەڕەکێکـی تورکمانـان بـوو.

کاک ئەنـوەرم خـۆی لـە ئامادەییەکـی ئەهلـی ئێـواران دەسـتی بـە دەوام کـرد و مـن و کاک سـەعدیش لـە (متوسـطة مصلـی) ناونـووس کرایـن کـە بەڕیوەبەرەکـەی پیرەمێردێکـی کـوردی زۆر ئێسـک سـووک بـوو (قاسـم بێـگ). قوتابییـەکان بەگشـتی بـە تورکمانـی قسـەیان دەکـرد و منیـش تورکمانیـم نەدەزانـی. کوردێکـی ئێسـک سـووکم دەسـکەوت (کەریـم عەبدولجەبـار) کـە بوویـن بـە بـرادەری خۆشەویسـتی یەکتـری. چەنـد هاوکلاسـێکی دیانیـش بـوون بـە بـرادەرم کـە لـە گـەڵ ئـەوان و لەگـەڵ تورکمانەکانیشـا بـە عەرەبـی قسـەمان دەکـرد. دەتوانـم بڵێـم کـە لەوێـوە و لـە ئەنجامـی بەکارهێنانـی رۆژانـە عەرەبییەکـەم خەریـک بـوو بـاش بچەسـپێ.

چیرۆکێکـی ئـەو سـاڵەم لەبیـر ناچـێ چونکـە تـا سـاڵانێکی زۆر دواتریـش هـەر ویژدانـی دەکولاندمـەوە. کوڕێکـی تورکمانـی نـاو سـەباح عوسـمان لـە کلاسـەکەمانا بـوو. رۆژێکیـان لێمـان بـوو بـە شـەڕ کـە پێـم وایـە زیاتـر گوناهـی مـن بـوو. ئێمـە هەردووکمانیـان بـرد بـۆ لای قاسـم بەگـی بەڕێوەبـەر. مـن کـە هیـچ بەڵگەیەکـی سـەلمێنەرم نەبـوو خۆمـی پـێ رزگار بکـەم بوختانێکـم بـۆ سـەباح هەڵبەسـتا بـۆ ئـەوەی قاسـم بەگـی کـورد بـۆ لای خـۆم رابکێشـم. گوتـم " ئەفەنـدی هـەر جارێکـی مـن بـە کـوردی قسـە بکـەم سـەباح گاڵتـەم پـێ دەکات و دەڵـێ بـە کـوردی

قسە مەکە !!" سەباحی داماویش سەری سوورِ ما بەو بوختانەی من و هەر سویندی دەخوارد (بە تورکمانی) کەشتی وا نەبووە و دەیگوت "ئەفاندی قورعان حەقیچن بێلە بیر حەکات دێمامشەم" کە کوردییەکەی ئەمەیە" ئەفەندی بەحەقی قورئان قسەی وام نەکردووە" پاش ماوەیەک لەگەڵ سەباحا ئاشت بووینەوە و بووین بە برادەریش بەڵام ئەوسا راستییەکەم هەر پێ نەگوت، هێشتا منداڵ بووین شەرمم دەکرد. سەباح بەراستی کورێکی زۆر باش بوو بەڵام من تێی نەگەیشتبووم. تا ساڵانێکی درێژ دواتر من لە ئەوروپا گەڕابوومەوە بە رێکەوت لە بەغدا تووشی سەباح عوسمان بووم. یەکتریمان لە باوەش گرت و چووین لە چایخانەیەک دانیشتین باسی منداڵێمان دەکرد، هەڵبەت بە عەرەبی. چونکە ویژدانم ئاسوودە نەبوو ویستم ئەو بارە گرانەی گوناهکاری لە کۆڵم بکەمەوە. پێم گوت " سەباح گیان داوای لێ بووردنت لێ دەکەم کە ئەو ساڵە لە شەڕەکەی قوتابخانەمان من درۆم کرد کە تۆ بەمنت گوتبێ بە کوردی قسە نەکەم. زۆر شەرمەزارم و لەوساوە تا ئێستاش کە بەبیرم دێتەوە ویژدانم دێتەوە سوێ و ئێستا دەمەوێ راستییەکەت پێ بڵێم". یەکسەریش هەڵستام ئەم لاو ئەولایم ماچ کرد و کردمان بەپێکەنین.

لە تورکمانەکان دوو هاوکلاسی دیکەشم خۆش دەویست یەکێکیان ناو (یالچین)ێک بوو، پێم وایە یالچین بەهائەدین، کە رۆژێکیان لە یاری فوتبۆلا تۆپێک بە سگی کەوت و بردیان بۆ نەخۆشخانە و بەداخەوە هەر ئەو شەوە لەوێ گیانی لە دەست دا. یەکێکیش ناوی مەسرور بوو، کورتیلەیەکی رەنگ پەمەیی کە زۆر نوکتەچی و عەنتیکە بوو.

تا لە گەڕەکی مصلی بووین ئەوەندە رقم لە کەرکوک دەبۆوە هەزار رەحمەتم بۆ هەولێر دەنارد.

بەڵام باش بوو ئەوەندە لەو خانووەی مصلی نەماینەوە و ئەمجارەیان خانوێکی باشمان بە کرێ گرت لە گەڕەکی راقیتری (شاترلو) لە

نزیک ( ئاسکی داگرمان) واتا (کۆنە ئاسیاوەکە). ئاستی رۆشەنبیری و رابواردنی کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی شاترلو زۆر بەرزتر بوو لە گەڕەکە شەعبییەکان. لەوێوە ئیتر دیدم بەرامبەر بە کەرکووک گۆڕا.

ساڵی 1951 کە ساڵێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ من شوکور بەسەر چوو. بۆ ساڵی دواتر واتا 52 کە کەوتمە پۆلی دووی ناوەندییەوە ئیتر هەم رزگارم بوو لە گەڕەکی مصلی و هەم لە قوتابخانەکەشی (متوسطة مسلی). خانوەکەی شاترلومان پێم وایە هی ئەفسەرێکی عەرەب بوو، زەعیم رمزی، کە ئەگەر لێم تێک نەچووبێ لە بنەماڵەی الشاوی بوو وماڵەکەی خۆیشی هەر بەتەنشت ئەوەی ئێمەوە بوو. گەڕەکی شاترلو کەوتبووە سەر رێی کەرکووکی نوێ (کرکوک الجدیدة New Kirkuk). ئەمەشیان گەڕەکێکی مۆدێرن بوو و ئۆفیسەکانی کۆمپانیای نەفتی IPC لێ بوو لەگەڵ چەند ریزێک خانووی جوان جوانی زۆر سادە کە لە رووی ئەندازەی ئارکیتێکتوورەوە زۆر جیاوازییان هەبوو لە خانووی ئاسایی دانیشتوانی شار. ئەو خانووانە بۆ کارمەندە بریتانییەکان و بۆ کارمەندی پایە بەرزی عیراقیش تەرخان بوون ئەوانەی کە لەگەڵ بریتانییەکان کاریان دەکرد. زۆر لەوانەش ئاشوری عیراقی یان کوردستانی بوون. لەبەر ئەوە گەڕەکی شاترلوش کە نزیک ئەو گەڕەکە (کەرکوک الجدیدە)یە بوو ئەویش جێی دانیشتنی کۆمەڵانی ئاشووری و کلدانی و ئەرمەنیش بوو و وەک گوتم لە رووی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاستی رۆشەنبیری و بگرە تەنانەت لە پۆشینی جلوبەرگ و مۆدەی سەرو توالێتی کچ و کوڕەکانیشیانەوە زۆر جیاواز بوون لەوەی سەوادی دانیشتوانی کەرکوک بە کورد و تورکمانیشیەوە. بۆ نموونە تی شێرت T- shirt و کراسی رەنگاوڕەنگ و پانتۆڵی تەسک یان شۆرت و سەرو قژی بە بوکلە کە مۆرکی کوڕە نەوجەوانەکانی شاترلو و کەرکووکی نوێ بوو لە گەڕەکە شەعبیەکانی کەرکووکا هەر عەیب بوو و هەندێ کەسوکاری پارێزیاری منداڵانی ئەو گەڕەکانە هەر

نەشیاندەهێشت کوڕەکانیان شتی وا لەبەر کەن یان قژیان بەو شێوەیە تواڵێت بکەن چونکە بەلای ئەوانەوە ئەمە ڕەفتارێکی ژنانە بوو. ئەمن دڵم بەو مۆدە تازانە زۆر خۆش دەبوو و یەکسەر پەیڕەوم دەکرد بێ کێشە لەگەڵ برا لەخۆم گەورەترەکانم کە بە پێچەوانەوە یارمەتیشیان دەدام چونکە ئەوانیش حەزیان لە کولتووری مۆدێرنی ڕۆژئاوا دەکرد و هەمووشمان ئاشقی موزیکی کلاسیک بووین.

کەرکووکی نوێ شەقامەکانی پان و پۆڕ و زۆر پاگژ بوون. تۆ ئەگەر ئێواران بەوێدا پیاسەیەکت بکردایە و ئەو هەموو کچ و کوڕە جوان و جەحێڵانە بە جلی مۆدێلاتی ئەوروپاییت بدیایە وا بە جووتە دەگەڕێن یان یاری تێنس دەکەن یان بە سواری پایسکل و ڕۆڵەر سکەیت ( پێڵاوی چەرخدار) تیژ بەلاتا ڕەت دەبن و دەچوونە فرۆشگای بەناوبانگی ئۆرۆزدی باک، خۆ هەر لەتوابێ لە شارێکی ئەروپادا نەک لە کوردستان گەشت و گوزەر دەکەیت. جا منێکی کە لە گوندێکی ڕەقوتەقی دەشتی دزەییەوە و لە هەولێرێکی ئەو زەمانە زۆر دواکەوتوو و پارێزیارەوە هاتبووم کە، بێجگەلە سەفەرە چەند ڕۆژییەکەی ساڵی 49 ی بەغدام، لە حەیاتی خۆما ژنێک یان کچێکی بە جلی مۆدەم نەدیبوو بێ عەباو پێچە (من باسی ژنی لادێ ناکەم کە ئەوان هەر بە جلی کوردییەوە بوون و عەباو پێچەیان هەر نەشدیبوو) دەڵێم لەپڕێکا ژنە ئینگلیزو هەندێ ژنە کریستیانەکانی خۆمانیشم دەدی ترومبیل داژۆن و سواری پایسکل دەبن ئەمانە هەمووی چاوی منیان کردەوە کە "نەخێر!!! کورە دیارە دنیایەکی تریش هەیە ئەمن لێی بێ ئاگام." هەستی ناسک و تەنکی هونەرووەریم زۆر زوو دەلەرییەوە بە هەر شنە بایەکی کە لێی بدابا.

بۆ هونەرمەند، بۆ شاعیر، بۆ بیرمەند، بۆ ڕۆشەنبیر ئەم دونیایە خەیاڵییە کە لە ئاسمانا بەدوایدا دەگەڕێت ئەوەتا وا لەبەردەمیا بۆی ئاوەلا کراوەتە سەر گازی پشتەوە. بۆیە لەو ساڵەوە 1952ئیتر کەرکووک بوو بە قۆناخێکی وەرچەرخان لە ژیانی مندا و تا لەوێوە

ئیتر هەستم کرد خۆم بناسم و بزانم کە بەڵێ من جیاوازم و بووم بە دژەباو.

کاک ئەنوەری برا گەورەمان هەر لە ئامادەییە ئەهلییەکەی ئێواران دەوامی دەکرد و من و کاکە سەعدیشم لە مصلی رزگاریمان بوو و گواستمانەوە بۆ (المتوسطة الشرقية) کە بەڕێوەبەرەکەی پێم وایە فاتیح بەگ ناوێک بوو. بایسکلێکیشمان کڕی کە بەیانییان کاکە سەعدیم منی لەپشت خۆی سوار دەکرد بۆ قوتابخانە و ئێوارانیش کاکە ئەنوەرم پێی دەچوو بۆ قوتابخانەکەی خۆی. ئەوەی کە لە ناو شاری کەرکووکیشا سەرنجی رادەکێشام ئەو هەموو گالیسکانە بوون کە دوو وڵاخ رایدەکێشاو بە پەنجاییەک یان دووان دەیبردی بۆ شوێنی مەبەست. ئەوەش بۆ من شتێکی نوێ بوو و لایەنێکی تری شارستانییەتی پێشکەوتووی بۆ دەردەخستم. پێشتر لە سەفەرەکەی بەغدام گالیسکەم بینیبوو بەلام دڵم خۆش بوو کە ببینم لە شارێکی کوردیشدا ئەم دیاردەی" تێکنۆلۆژیای پێشکەوتوو" هەیە. لە هەولێر شتی وا نەبوو.

لە کەرکووک ئەمن حەیران و سەرسامی ئەو دنیایە بۆ من تازەیە بووم کە بۆ منی هونەرمەند و شاعیر کە تازە دەستم پێ کردبوو خۆم لە شیعردانانیش بدەم جیهانێکی تەلیسماوی پڕ لە خەون و خەیاڵی قەیفەیی و پەمەیی بوو. پێشتر هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد ئەو خەون و خەیاڵە رۆژێک لە رۆژان لێم بێت بە راستی و لە شارێکی کوردنشیندا بە چاوی خۆم ببینم.

کەرکووک بۆ من هەر ئەوەندە نەبوو. لەو ساڵەوەو لە دوو سێ ساڵی دواتریش تا 54 کە پۆلی چواری سانەویم تەواو کرد و چووم بۆ بەغدا ساڵی پێنجەم لەوێ تەواو بکەم هەندێ لە خۆشەویسترین برادەرانی رێچکەی ژیانم پەیدا کرد کە ئەوانەی مابن تا ئێستاش نزیکترین برادەرمن، دارا ئەدیب (1982 - 1935)، کیسرا ئەدیبی برای و ئەرجومەندی مەلا سدیق. هەروەها لەوانەی کە هەر لەو ساڵانەی

کەرکووکم بووین بە برادەری نزیک و خۆشەویستی یەکتری، عەبدوڵا کانی مارانی و وریا کانی مارانی برای و عەبدلقادری مەلا ئەسعەدی کانی مارانی ئامۆزایان، نوری شێخ جەمیلی تاڵەبانی، عیرفانی برای، تەحسین تاڵەبانی، عەدنانی فەتاح ئاغای کاکەیی و سەنخیرۆ بۆحەننا و سارگۆن و جۆزێف، سەروەر و ئەنوەری کاکە حەمەی دەرویش خاوەنی ئوتێل شەهرەزاد و سیروانی عەبدوڵا بەگی جاف و هەندێکی تریش کە بە داخەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. سڵاوی زۆرم بۆ ئارامگای ئەوانەی لەو ماوەیە ئەم دنیایەیان بەجێ هێشتووە و خۆشەویستی و هیوای زۆرم بۆ تەندروستی و تەمەن درێژیی ماوەکان.

هەر لەو ساڵانەدا ماڵی کاکەی حاجی مەحمودی کۆیی و ماڵی تایەرەفەندی براگەورەی کاک عومەر دەبابە کە هێشتا پێکەوە دەژییان و ماڵی کاک ئیبراهیم ئەحمەد ئەوانیش هەر لە کەرکووک بوون و پەیوەندیی نزیکمان پێیانەوە هەبوو بە تایبەتی لەگەڵ کاکە دەبابە و کوڕانی کاکەی حاجی مەحمودی (مەجید و دڵشاد و نەجات و تەیمور و نەوزاد). عومەر هەڵمەتیشم لەوێ ناسی بەڵام ئەوسا ئەو نزیکاتییەمان نەبوو کە ئێستا لە ئەمەریکا هەمانە. مەزهەری شێخ سەدری کۆیی ئامۆزای دایکم ئەویش لەوێ دەیخوێند و لەگەڵ ئیبراهیم سابیر مام خدر و باقی تەقی و جەمیلی ئاوڕەحمان شەرەف کە هەموویان کۆیی بوون و وەک ئێمە لە کەرکووک دەیانخوێند ئەوانەش گشتیان برادەری نزیکمان بوون. جەوهەر هیرانیش لەو ساڵانە لەکەرکووک بوو و لەگەڵ ئەویشا ئاموشۆمان هەبوو. کاکە سەعدی و خۆم هەرگیز ئەو رۆژە خۆشانەش لەبیر ناکەین کە لەگەڵ برادەرێکی زۆر نزیکی ترمان لە شەقامەکانی شاترلو و کەرکووکی نوێ بەسەر دەبرد، ئازاد مەحمود شەوقی، یادی بەخێر و هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێ.

خزمە دزەییەکانم لە ئاغاکان بە تایبەتی ئەوانەی دانیشتووی ناوچەی کەندێناوە کە لە کەرکووکەوە نزیک بوون زوو زوو سەردانی ئەو شارەیان دەکرد بۆ رابواردن و گەشتوگوزار. کەرکووک مەلهای لێ

بـوو و زۆر جـار هونەرمەنـدی سـوری و لوبنانـی دەهاتـن لـەوێ گۆرانییـان دەگـوت. ئـەو خزمانـەم لـە ئوتێـل شـەهرەزادی کاکـە حەمـە دادەبەزیـن کـە کەوتبـووە سـەر رێـی بەغـداو ئوتێلێکـی زۆر خـۆش بـوو. کاکـە حەمـە و کاک نەشـئەتی هاوبەشـی کـە هەردووکیـان خەڵکـی سـلێمانی بوون و یەکەمیـان خزمایەتییەکی نزیکـی لەگـەڵ کاک ئیبراهیـم ئەحمـەدا هەبـوو خۆیـان ئوتێلەکەیـان بەڕێـوە دەبـرد و بیرمـە حەمـە غەریبیـش بەرپرسـی هەمـوو کاروبـاری ئوتێلەکـە بـوو. دەبـا لێـرەدا چیرۆکێکـی خـۆش و سـەیری بەڕاسـتیتان بـۆ بگێڕمـەوە کـە پتـر لـە 25 سـاڵێک دواتـر رووی دا بـەڵام بنەچـەی شـانۆگەرییەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو سـاڵانەی کەرکووکـم:

لـە سـاڵانی 1980 - 1975 ژنـم هێنابـوو و ماڵـم لـە شـاری رێدینـگ Reading ی ئینگلتـەرە بـوو لەنزیـک لەنـدەن. رۆژێکیـان لەگـەڵ رووناس خانـی هاوسـەرم چوویـن بـۆ قوتابخانەیەکـی فێربوونـی شـۆفێری بـۆ ئەوەی رووناس مۆڵەتـی لـێ خوریـن وەرگـرێ.

کـە دانیشـتین لای کابـرای ئینگلیـز و روونـاس نـاوی خـۆی دایـێ و پاشـناوەکەی دزەیـی بـوو کابـرا هـەر سـەیری ناوەکـەی دەکـرد و لێـی ورد دەبـۆوە. لەپاشـانا رووی کـردە روونـاس و گوتـی ئـەم نـاوە (دزەیـی) بـۆ مـن غەریـب نییـە و لـە ناوێکـی کـوردی دەچـێ. رووناسـیش بـە سەرسـوڕمانەوە گوتـی چاکـت پێـکا مـن کـوردم بـەڵام تـۆ چوزانـی ئـەم نـاوە کوردییـە؟ کابـرا گوتـی تـۆ دەبـێ کـوردی دەشـتی هەولێـر بیـت چونکـە بنەماڵـەی دزەیـی لـەو دەشـتە نیشـتەجێن. کابـرا پێـدا چـوو و گوتـی ئەمـن لـە سـەرەتاکانی سـاڵانی پەنجاکانـا شـۆفێری ولیـەم ئیگلتـن William Eagleton بـووم لـە کەرکـووک کـە ئۆفیسـێکی رۆشـەنبیری لـەوێ کردبـۆوە. گوتـی ئیگلتـن پەیوەنـدی و ئاشـنایەتییەکی زۆر نزیکـی بـە ئاغاکانـی دزەییـەوە هەبـوو و زۆر جـار بەهـاران دەچووینـە گوندەکانیان و ئێمەیـان دەبـردە راوە مامـز ( راوە ئاسـک) لـە چیـای قەرەچـووغ و لـە دەشـتی قەراجـی. کابـرا دەسـتی پـێ کـرد نـاوێ هەنـدێ لـەو ئاغایانـە

بێنیێ: هاواری برایم ئاغا و تەلعەتی مشیر ئاغا و حەمەدەمینی قادری پاشا و برایانی جەمیل و حوسێن و فارسی عەلی ئاغا گوتی ئەمانە هەموویان رەفیقی ولیەم ئیگلتن بوون. ئینجا رووناسیش پێی گوت ئەوانەی باسیان دەکەیت حوسێن بابمە و جەمیل و فارس مامەن و ئەوانی دیش هەموویان ئامۆزای بابم و هی عومەری مێردمن. ئینجا کابرا واقی ورما و نەیهێشت بڕۆین بۆ ماوەیەکی درێژ پرسیاری ئەو خزمانەی لەمن دەکرد. رووناس لە سەرەتای پەنجاکانا تازە لە دایک بووبوو. دنیا سەیرە، هەندێ جار چەند بچووک دەبێتەوە.

جا با بگەڕێمەوە بۆ کەرکووک. بێجگەلە کاکە حەمەی شەهرەزاد مەلا سدیق بلوکێنیشم چاک لە بیرە کە کیۆسکێکی چکۆلانەی چاپەمەنی و پێم وایە پاکەت و شقاتە و ساردەمەنی فرۆشیشی هەبوو ئەویش هەر لە نزیک ئوتێلەکەی کاکە حەمە. مەلا سدیق کوردێکی زۆر ناسیۆنالیست بوو و پێم وایە ئەندامی پارتی بوو و بە نهێنی کاری حیزبایەتی خۆی دەکرد. من و کاک سەعدی برام پاش رۆیشتنی کاک ئەنوەری براگەورەمان بۆ خوێندنی پزیشکی لە تورکیا ئەگەر جارێک رێگای دووگردکان و کەرکووک بە باران و تۆفان بگیرایە و کەس نەبوا مانگانەمان بۆ بێنیێ دەچووین چەند دینارێکمان لە مەلا سدیق یان لە کاکە حەمەی شەهرەزاد بە قەرز وەردەگرت.

بێجگەلەمانە بنەماڵەیەکی تری کۆیی کە هەر لە کۆنەوە لە سەرەتای چلەکانا لە هەولێر دۆست و برادەری بنەماڵەی ئێمە بوون، ماڵی سەبری عەبدوڵا دارۆغا کە لە کاتی خۆیدا بەڕێوەبەری پۆلیس بوو ئەوانیش ماڵیان لە کەرکوک بوو. یەکێک لە ئامۆزکانی ئێمە، عەبدوڵای سەلیم ئاغای دزەیی کچێکی لێ خواستبوون (نەسرین خان) و دواتریش کاک ئەنوەری برامان ئەویش کچێکی لێ خواستن (فائیزە خان).

ئەمانە بوون بازنەی برادەرو و ئاشنا و خزمانمان لەو چەند ساڵەی کە لە کەرکووک دەمانخوێند. ژیانێکی خۆش و نوێ بوو بۆ من.

## دارا ئەدیب (1982 - 1935)

سالی 1952 لە زۆر رووەوە ژیانی گۆڕیم، کەرکووک دنیایەکی نوێ بوو بۆ من، کۆلێک برادەری نوێم پەیدا کرد، لەو تەمەنی نەوجوانییەمدا دەستم بە حەزحەزۆکی لەگەڵ کچانیش کرد، چاوم کرایەوە بۆ موزیکی رۆژئاوایی و موزیکی کلاسیک و بۆ ماوەیەک وانەی ئامێری کەمانچەشم لای مامۆستایەکی ئەرمەنیی وەردەگرت. لە خوێندنیشا بەتەواوی کەوتمە سەر رێچکەی حەزو ئارەزوو و خەونبینین بە پاشەڕۆژێکی رۆشەنتر، بە بڕوانامەیەکی بەرز لە زانکۆیەکی ئەوروپاییدا. بەلام لەمانە لە هەمووی خۆشتر بۆمن ناسینی کوڕە لاوێک بوو کە ئەوسا و ئێستاش کەسی ترم وەک برادەر هێندەی ئەو خۆش نەویستووە: دارا ئەدیب (دارای ئەدیب ئەفەندی) هەزارجار یادی بەخێر.

دارا وەک فریشتە لە ژیانی مندا پەیدا بوو. گەنجێکی قۆز و جوان و بالابەرز، خەلکی سلەیمانی کە خۆشم هەر لە منداڵیمەوە حەزم لە برادەراتی سلێمانییان دەکرد و لە بنەماڵەیەکی زۆر بەڕێز و خانەدان و رۆشەنبیریش بوو. لە پۆلی دووی ناوەندی لە (المتوسطة الشرقية) لە کەرکووک هاوکلاس بووین و هەر یەکسەر بووین بە برادەری گیانی بە گیانی یەکتری. ئەمن ناتوانم هەر وا سەرپێیی بەلای ئەو خانەوادە بەڕێزەدا تێپەڕم کە کاریگەرییەکی زۆری رۆشەنبیریی لەسەر رێچکەی ژیانی مندا هەبووە.

فاتمەخانی دایکی دارا ژنێکی زۆر جوانی چاو و برۆ رەشی رووخۆشی کچی سەعید ئاغای هەمەوەند بوو. ئەدیب ئەفەندی هاوسەری کە پوورزاشی بوو ئەویش کوڕی عەزیز بەگی ئەفسەرێکی سەردەمی عوسمانییەکان بووە. ئەدیب ئەفەندیش پیاوێکی زۆر قۆزی ئاکار جوانی بەژنوبالا مام ناوەنجی بوو. منداڵەکانیان سێ کچ

(نەبیهە و لوتفیە و نەزیرە) و سێ کوڕ (یوسف و دارا و کیسرا) هەر هەموویان خوا جوانیەکی سەرنجکێشی پێ بەخشیبوون. ئەدیب ئەفەندی کە وەک (مدیر واردات) لە بەغداوە گواسترابۆوە بۆ کەرکووک ئۆتۆمۆبیلێکی ئەمەریکی مارکەی (ستەدی بێکەر Study Baker) ی رەنگ سەوزی هەبوو کە شۆفێر بۆی لێ دەخوڕی. راخستنی ناومالیان نموونەی زەوق بەرزیی خێزانێکی بورژوازی upper class بوو کە بە تابلۆی گرانبەهای بۆیەکارانی ئەوروپایی و پەیکەری برۆنز و شووشەواتی سەردەمانی بەسەرچووی بارۆک و رۆکۆکۆی ئەوروپاییەوە رازێندرابۆوە. لە ژووری میوانان و کاتی نانخواردنیش لەسەر سوفرە لە گرامۆفۆنێکی (هیس ماستەرس ڤۆیس his Masters voice ) ەوە سەدای دەنگو ئاوازی مازورکا و پۆلۆنێزەکانی شۆپان و سیمفۆنیەکانی برامز و بالێکانی چایکۆفسکی لەگەڵ تازەترین گۆرانی ئیتالی و ئەمەریکای لاتین بە ئیسپانی و بە ئینگلیزی شەپۆل شەپۆل بەرز دەبۆوە و ئەتمۆسفێرێکی بورژوازییەتی رۆژئاوایی دەئافراند.

فاتمەخان نەک هەر (خانمە خاتوون lady) بوو، کابانێکی تا بلێیت پسپۆڕ بوو لە چێشت لێنانیشا. ئەمن زۆر جار لە قوتابخانە لەگەڵ دارا بۆ نانی نیوەڕۆ دەچووم بۆ مالی ئەوان و فاتمە خان زۆر بە گەرمییەوە پێشوازی لێ دەکردم و دیار بوو چونکە خۆی عەشایر بوو پێی خۆش بوو کوڕەکانیشی دۆستایەتی لەگەڵ کوڕە عەشایری وەک ئێمەدا بکەن بەتایبەتی کە یەکێک لە ئامۆزاکانی باوکی من (حەوێز ئاغای سلێمان ئاغای دزەیی) کچە ئاغایەکی هەمەوەندی هێنابوو (دایکی کانەبی حەوێز ئاغا و رەشیدی حەوێز ئاغای دزەیی). پەیوەندیەکەم لەگەڵ دارا و بنەماڵەی دارا ئەوەندە بەتین بوو کە دارا و کیسرای برای بوون بە خۆشەویستی هەموو براکانم و زۆرجار بۆ پشووی بەهاران لەگەڵ ئێمە دەهاتنە دەشتی دزەیی و دەمانبردن بۆ راوە ئاسک لە دەشتی قەراج.

منێکیش کە هەر لە منداڵیمەوە مەستی شاری سلێمانی و

دانیشتوانەکەی بووم هاتنی دارای سلێمانی بۆ ناو ژیانم وەک بڵێیت پڕکردنەوەیەکی لێواولێوی ئەو حەزو ئارەزووەی ساڵانی منداڵیم بوو. جا لێرەدا ئەم قسانە وا تیم دەکەنەوە بۆ لادانێکی کورتی پێویست لە بابەتە سەرەکییەکەمدا.

ئەمن هەر لە منداڵیمەوە کە ئەوسا هەستم پێ نەدەکرد بۆ، بەڵام ئێستا بە تەمەنی ئەمڕۆم وا شانازی پێوە دەکەم کە بەڕاستی زۆر هەستیار بوویم و شتێکم یان یەکێکم خۆش ویستبا دەبێ چەندین هۆ و فاکتەری لە پشتا هەبووا کە، هەنگی نا، بەڵام ئێستا دەتوانم شییان بکەمەوە.

سلێمانی بۆ من مێژوو بوو، شیعر بوو، زمانی کوردی پاراو بوو، ژیانی کۆمەڵایەتی کراوە و سروشت و رەوشت و دەستور و نەریتی تا رادەیەک لیبەڕاڵی دانیشتوانەکەی بوو بە ژن و پیاویەوە. خەڵکی سلێمانی پەپوولە و هەنگ ئاسا چێژ لە هەموو گوڵێکی جوان و بۆنخۆشی گوڵستانی ژیان وەردەگرن. خەڵکی سلێمانی رێز لە هەموو گەورەپیاوانی مێژووی کورد دەگرن ئەگەر لە بواری کولتور، ئەدەبیات، کۆمەڵایەتی یان سیاسەتا خزمەتی گەل و ولاتی خۆیان کردبێت و هەرگیز لە روانگەیەکی تەسکی چینایەتییەوە ئەو کەسایەتیانەیان هەڵنەسەنگاندووە چونکە بە چاوێکی واقیعبینانە روانیویانەتە کولتوور و تراذیسیۆنە جیاجیاکانی سەردەمە جیاجیاکانی مێژوو.

خەڵکی سلێمانی لە هەموو دەور و زەمانێکی کە ئەم بەشەی کوردستان پێیدا تێپەڕ بووبێ هەڵویستی سیاسییان هەبووە و بە جۆرێک یان بە جۆرێکی تر دەریانبڕیوە ئەگەر بە کردەوەش بۆیان نەلوابێ هەر نەبێ بە نوکتە و گاڵتە کوڵی دڵی خۆیان هەڵڕشتووە.

جا ئەمن لەپاش گەورەبوونم ئینجا تێی گەیشتم بۆچی هەر لە منداڵیمەوە ئەڤینداری سلێمانی بوویمە. دارا ئەدیب یەکەم برادەری تەمەنی نەوجوانیم بوو کە خەڵکی سلێمانی بێت هەرچەندە کە لە

قۆناخـی خوێندنـی سەرەتاییشـمدا بـرادەری خۆشەویسـتی سـلێمانیم لـە هەولێـرا هـەر هەبـوون بـەڵام بـۆ ئـەو مـاوە درێـژە نـا کـە وەک لەگـەڵ دارا هەمبـوو.

ئـەم چەنـد کۆپلـە هەڵبەسـتەم کـە بەشـێکە لـە شـیعرێکی درێژتـرم (هەڵوەسـتەیەک لەسـەر گۆڕسـتانانی کوردسـتان) ئاوێنـەی ڕەنگدانـەوەی هەسـت و هۆشـی منـن:

گردی سەیوان

گردی سەیوان، قەرزارتم
قەرزاری هەر تەڵە گیایە و
هی خاک و بەردو دارتم
لەو ڕۆژەی دە لانکییان ناوم
بە لایلایەی شاعیرانی
شاری هەڵمەت و قوربانی
بۆ سەربەخۆیی و یەکبوونی
کوردستان فرچکیان داوم
لەو ڕۆژەی چوومە فێرخانە
سروودی ئەو شاعیرانە
بەسەر کورد و کوردایەتی
بۆ یەکیەتی و مەردایەتی
بە ژێی دڵم لێدراون
لەگەڵ خوێنما تێکەڵاون
ئەمڕۆکە ئەو شاعیرانە
وا لەناو دڵی تۆدانە
بۆیە هەستی کوردایەتیم
سەرچاوەی وا لە سەیوانە
دەسا چۆن قەرزارت نەبم؟
تا هەم، سوپاسبارت نەبم!

## پوورزاکانم، مەحمود، فوئاد، نەوزاد، کوڕانی ئەحمەد عوسمان

لە بەراییەکانی پەنجاکانی سەدەی بیستەما پوورزاکانم (مەحمود و فوئاد و نەوزادی ئەحمەد عوسمان) هەرسێکیان لە قوتابخانەی هایسکوڵی نموونەیی ئەمەریکایی لە بەغدا کە ناوی (كلية بغداد Baghdad College) بوو دەیانخوێند یان خوێندبوویان. خۆی زۆرێک لە منداڵە بنەماڵە و بەرپرسی گەورەی دەوڵەت و منداڵە بازرگان و دیان و جووە دەوڵەمەندەکانی عێراق لەو هایسکوڵە دەیانخوێند کە تاکە سانەوی بوو لە عێراق وانەکانی بە زمانی ئینگلیزی بێت و بەرنامەی پەروەردەی ئەوەی ئەمەریکایی بێت.

زۆرێکیش لەو خێزانە عێراقیانە بۆ پشووی هاوینان یەکێک لە خانووە جوانکیلەکانی هاوینە هەواری سەلاحەدینیان بەکرێ دەگرت کە سەر بە وەزارەتی مەسایفی عێراقی بوون و لەسەر شێوەی ئارکیتێکتووری زۆر جوانی وڵاتە رۆژئاواییەکانا بنیاد نرابوون. ئەو خانووانە بە شێوەیەکی وا سادە و دڵڕفێن دروست کرابوون کە لەگەڵ ژینگە سروشتییەکەی هاوینەهەوارا بگونجێت. هەموویان یەک نهۆم بوون و لە بەردی رەنگی سروشتی خۆی ساز کرابوون، دیواری حەوشیان نەبوو بەڵکو هەموو دراوسێکان کە ئێواران لە باخچەی ماڵەکەیان دادەنیشتن زۆر لێک نزیک بوون و تەنیا پەرژینێکی گوڵ گوڵی لێکی دەکرنەوە و ئەگەر پێشتر یەکتریشیان نەناسیبا چاکوچۆنیان لەگەڵ یەکترا دەکرد و کچ و کوڕیشیان دەبوون بە برادەری یەکتری. ئەو سەردەمە سەفەرکردنی دەرەوەی وڵات وەک ئیستا ئەوەندە باو نەبوو و عێراقی لە هاوینا دەهاتنە کوردستان بۆ حەسانەوە.

پوورزاکانیشم بۆ پشووی هاوینان یەکێک لەو خانووانەی مەسیفیان بەکرێ دەگرت و لەوێش لەگەڵ هەندێ لە هاوکلاسەکانی خۆیان هی

(کلیة بغداد) یەکدیگر دەبوونەوە. حەزیشیان دەکرد منیش ماوەیەکی ئەو چەند مانگەی هاوین لەوێ لەگەڵیانا بمێنمەوە.

ئەو زەمانە، سەردەمی مەلیک و سەردەمی کەریم قاسم و تەنانەت سەردەمی سەدامیش مەسیف بەڕاستی مەسیف بوو. خانووی مەسایفی سادە و جوان، مەلەگا بۆ پیاوان و بۆ ژنان، ساحەی تێنس کە کچ و کوڕ وێکڕا یارییان دەکرد. ئێواران سینەما و باڕ و کاباریی خۆش خۆش هەبوون کە تیپی موزیکی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتیش نمایشیان تێدا دەکرد و لە هەندێ لەو باڕە هەوای کراوانەدا (open air) لەبەر تریفەی مانگەشەو و درەوشانەوەی ئەستێرە گەشەکانا کچ و کوڕی گەنج دانسیشیان دەکرد. ئێوارەش هەبوو کە کچ و کوڕی برادەری یەکتری بە نۆرە لە ماڵی یەکێکیان کۆ دەبوونەوە پارتییان دەکرد و لەسەر ئاوازی موزیکی گرامۆفۆن تا درەنگانی شەو دانسیان دەکرد. ئەوسا مەسیف دوو ئوتێلی لێ بوو کە بەڕاستی ئوتێل بوون، ئوتێل پیرمام و ئوتێل سەلاحەدین. سەرڤیسێکی زۆر پرۆفێشناڵ و ژوور و قەنەفەکانی دانیشتنی لۆبی و ریستۆرانت و بارەکانیان هەمووی فێرست کلاس بوو.

## لەیلا پۆڵ مەلەک

**ئەشقە یەک لایەنەکەم بۆ ئەو کچە ئاسووری یە**

لە مەسیف لەو ئێوارە دانسانەی کە لە سەرەوە باسم کرد و کە هەندێ جار لە ماڵی پوورزاکانیشم ساز دەکرا خێزانێکی ئاسووریی برادەریان هەبوو، ماڵی دکتۆر مەلەک، کە کوڕەکانیان لەگەڵ ئەواندا لە (كلية بغداد) بوون. دکتۆر مەلەک لە کەرکووک دادەنیشت و لەوێ زیاتر بە (دکتۆر مەلیک) دەناسرا خەڵکی شاری ورمێی ئێران بوو و لە دوای تیرۆرکردنی مار شەمعون لەلایەن سمکۆی شکاکەوە لەگەڵ زۆر خێزانی تری ئاسووری ئێرانیان بەجێ هێشتبوو و لە کەرکووک نیشتەجێ بووبوون. دوو کوڕ (جۆرج و جێمس) و سێ کچیان هەبوو (ئەلیس و بیاتریس و لەیلا) کە هەردوو کوڕەکان لەگەڵ پوورزاکانم لە هایسکووڵە ئەمەریکاییەکەی بەغدا (كلية بغداد) دەیانخوێند. ئەوانیش هەموو هاوینان خانووێکیان لە مەسیف بەکرێ دەگرت. ئەمن لە خۆمەوە بەولاوە ناتوانم باسی کەسی تر لەو گرووپە بکەم کێ حەزی لە کێ دەکرد. ئەوەندە دەڵێم کە بۆ ئەو ساڵانە (54، 53، 52) ئەم ئێوارە دانسانە و بە ڕۆژیش مەلە و یاریی تێنس کردن و هەڵسوکەوت و ڕەوشتی زۆر لیبەراڵی هەندێ لەو خێزانانە لە مەسیف شتێکی نوێ بوو بۆ من و لەگەڵ ژیانە نوێکەی کەرکووکم و برادەراتی و تێکەڵیم لەگەڵ سلێمانییانیش کە پێشتر باسم کردووە وردە وردە منیان لە ژیانە سادە و ساکارە جوتیارییانەکەی دەشتەکەی پیرە هەولێرێ دادەبڕی و بەرەو ساڵۆناتی پڕ لە بریسق و باقی بورژوازییەتی ڕۆژئاواییان تێ دەکردمەوە.

ئەمن لە کەرکووک ماڵی دکتۆر مەلەکم پێ دەزانی چونکە لەسەر ڕێی قوتابخانەم بوو لە سەرەتای گەڕەکی شاترلوو ئەو گەڕەکەی کە من و کاک ئەنوەر و کاک سەعدیی براشم لێی

دەژییایـن. لەسـەر دەرگای ماڵەکەیـان نووسـرابوو (الدکـتـور پـول ملـک). لەیـلا لـە قوتابخانـەی ناوەنـدی کچـان بـوو لـە کەرکـووک و مـن و دارای بـرادەرم نیوەڕۆیـان دوای وانەکانـی خۆمـان بـە پەلـە پـڕووزێ خۆمـان دەگەیانـدە بـەر دەرکـی قوتابخانەکەیـان سـەیری هاتنـە دەرەوەی کچەکان بکەیـن. ئەمـن لـەوێ لەیـلام کەوتـە دڵـەوە. لەیـلا، باریکەلەیەکـی رەشتاڵە و پێموایـە لـە تەمەنـی خۆمـا بـوو، شـانزدە سـاڵی. جـا لـە مەسـیف بینیـم کـچ و کوڕەکانـی دکتـۆر مەلـەک هەموویـان بـرادەری پوورزاکانـی منـن. دڵـم خـۆش بـوو و ئومێدێکـم هاتـەوە بـەر لەگـەڵ لەیـلا ببیـن بـە ئاشـنا.

لـەو ئێـوارە دانسـانەی کـە لـە سـەرەوە باسـم کـرد چەنـد کـوڕ و کچی تریـش بەشـدارییان تێـدا دەکـرد بەتایبەتـی ماڵـە کریسـتیانێکی دیکـەش کـە موسـڵاوی بـوون وەک ماڵـی جەببـووری غـەززوول. رامـزی کـوڕی جەببـووری ئەویـش لەگـەڵ پوورزاکانـم لـە هایسـکوولە ئەمەریکاییەکـەی بەغـدا بـوو و ئەوانـەی کـە لـەو بنەماڵـە خـۆش گوزەرانـە لەبیـرم مابـن رامـز و ( ئیڤێـت) ی خوشـکی و فائیـزی بـرای بچووکیـان بـوون. ئەوانیـش لەگـەڵ خوشـکەکانیان بەشـدارییان لـەو ئێـوارە دانسـانەدا دەکـرد. چەنـد ماڵێکـی دیکەشـم لـە مەسـیف لەبیـرە کـە ئاسـتی رۆشـەنبیرییان زۆر رۆژئاواییانـە بـوو لەناویانـدا: بوشـرا پەرتـۆ، هەنـا پەرتـۆي خوشـکي، مەیـادة عەلـي مەزلـوم و موئەیـەد و مومتـاز ئەحمـەد شـەوقی کـە باوکیـان بەڕێوەبـەری مەسـایفی عێـراق بـوو.

هـەر جارێکیـش نـۆرەی ماڵـی پوورزاکانـم بوایـە بـۆ دانسـپارتییەکەی ئێـواران بـۆ مـن جەژن بـوو. بێجگەلـە سینەما، ئـەوە یەکـەم جـارم بـوو لـە مەسـیف و پێشـتریش لـە کڵەبەکـەی نیـو کەرکـوک دانـس و مانـس ئـاوا لەبەرچـاوی خـۆم بەزیندوویـی کـوڕ و کـچ لـە باوەشـی یەکتریـدا دانـس بکـەن ببینـم. هـەر بـۆ زانیاریـی خوێنـەرە خۆشەویستەکانیشـم دانسـی ئـەو سـەردەمانە هـی سـەرەتای پەنجاکانـی سـەدەی رابـردوو وەک دانسـی ئەمـڕۆ نەبـوو. چەنـد دانسـێکی لـێ بتـرازێ کـە دانسـکەرەکان کەمێـک لـە باوەشـی یەکتـری دوور دەکەوتنـەوە بـێ ئـەوەی دەسـتی

یەکتریش بەر بدەن، یان بەریشیان دەدا ئەگینا دانسکردن بەگشتی لەباوەشگرتن و زۆر جاریش ئەگەر حەزحەزۆکێی تێ بکەوتایە بە جۆرێک یان بە جۆرێکی تر ڕوومەتا دەبوو یان هەر نەبێ لێک نزیک دەبوونەوە. بەڵام ئەم جۆرەی دوایان لەو دانسپارتییانەی مەسیف ئاوا بەزەقی نەدەبوو.

ئێوارەیەکیان لە دەرەوە بووم کە گەڕامەوە بۆ ماڵ (ماڵی پوورزاکانم) بینیم وا دانس و هەرایە. کچ و کوڕەکانی دکتۆر مەلەک و زۆری تریش لەوێ بوون و دانسیان دەکرد لەیلا نەبێ. لەیلا لەگەڵ هەندێ دەستەخوشکی هاوزای خۆی لە لایەکا دانیشتبوون سەیریان دەکرد و جاروباریش دەچوونە دەرەوە و دەهاتنەوە. ئەوان هیچ کامێکیان دانسی نەدەکرد ڕەنگە چونکە بە تەمەن لە دانسکەرەکان منالتر بوون، نازانم. منیش کە هیچم لە دانس نەدەزانی دانیشتم و هەر تەماشام دەکردن و ناوە ناوەش وەک هەر کوڕە نەوجوانێکی تازە خەتی سمێڵ داناو دەبوایە هەر گەرووی خۆم بگوشم تا زاری پڕ بووم لە شیرناوی خەیاڵی ئیرۆتیک و حەسرەتی نامرادی بەتاڵ بکەم. بە خەیاڵ منیش لەیلام لە باوەشا بوو و لەوانی کەش دانسم باشتر دەکرد. ئەوەندەی بە پەنهانی و لابەلا سەیری لەیلام دەکرد بزانم داخوا ئەویش بە تیلی چاوان و لە ژێرەوە سەیرێکی من ناکات! کەچی نەمدی و نەمدی. ئەو لەگەڵ دەستەخوشکەکانی هەر تریقەی پێکەنینیان بوو و منیش هەندێ جار لە دڵی خۆما دەمگوت ئەوە ڕەنگە بە من پێبکەنن کەوا گێل و وێل دانیشتووم و وەک کوڕەکانی دی دانس نازانم.

ئەو هاوینەی مەسیفم تەواو کرد و لەیلا ئاوڕێکی لە مەجنون نەدایەوە. منیش شەرمم دەکرد دەسپێشخەری بکەم بچم بۆ لای بڵێم تۆم خۆش دەوێ. هەر لەو ڕۆژانەی مەسیفا شیعرۆکەیەکی بێ سەروبەرم لەسەر لەیلا بۆ هات بۆ ئاوازێکی گۆرانییەکی دانسی ڤاڵس کە لەو دانسپارتییانەدا گوێم لێ دەبوو. بەداخەوە تەنها ئەم

چەند دێڕەی شیعرەکەم لەبیر ماوە و ناوی گۆرانییەکشم لەبیر نەماوە بەڵام تەواوی مێلۆدییەکەم لەبیرە.

ئەسمەرێکی خوێن گەرم
بەرو باخەڵی نەرم
کە بەلایا تێ ئەپەڕم
زۆری لێ ئەکەم شەرم

***

چوومەوە بۆ ماڵ ئێوارە
تێکەڵ ببوون کچ و کوڕ
ئەویان وا لەناو دیارە
لە جێگای خۆم مام سەرسوڕ
بە ئاوازی تانگۆ و رومبا و
ڤاڵس و سامبا و پێکەنین

---

هەنگی تەمەنم پازدە شانزدە ساڵێک دەبوو. نزیکەی رۆژانەش لەیلام لە پیاسەی دەمی ئێواران و لە کافتریای ئوتێلەکان و لای تێنسکۆرت دەدی بەڵام وەک بڵێی نووشتەی لێ کرابێ نە هەلاوێک نە تەماشایەک نە خەندەیەک و هەر سەریشی هەڵنەدەبڕی. لە شوێنێکا بیدیبایە کە من وا لەوان نزیک دەبمەوە خۆی لەگەڵ دەستە خوشکەکانی خەریک دەکرد بۆ ئەوەی تەماشام نەکات. پشووی هاوین بڕایەوە و منیش کەوشم دڕا هیچم پێ نەبڕا. گڕی خۆشەویستیشم بۆ لەیلا هەست و هەناومی داگرتبوو.

لە کەرکووک سەربردەی ئەو چیرۆکەم لەگەڵ لەیلا بۆ دارا ئەدیبی برادەری گیانی بەگیانیم گێڕایەوە. ئەویش گوتی کورە خۆ ئەو خۆیشی دڵی چووەتە کچێکی ناو (شیرین) کە لەگەڵ لەیلا لە یەک قوتابخانەی ناوەندیی کچانن لە کەرکووک. جا وەک

پێشتریش باسم کرد من و دارا زۆر جار لە کاتی بەربوونی قوتابخانەی کچان دەچووینە لای قوتابخانەکەیان هەر بۆ ئەوەی چاوێکمان بە دڵبەرەکانمان بکەوێت و من کزە ئومێدێکیشم هەبوو کە رەنگە لەیلا لە کەرکووک هەڵوێستێکی تر بەرامبەرم بنوێنێ کە من بۆ ئەو بێگانە نیم و رەفیقی براکانیم بەڵام سەت خۆزگە بە رۆژەکانی مەسیف. دیار بوو شیرینیش هەمان بەزمی بە دارا دەکرد و یەک مەرحەباشی لێ نەدەکرد. بە درێژایی ساڵانی کەرکووکمان من و دارا کە شەیدای ئەو دوو کچە بووین کەچی نە شیرین ئاگای لە فەرهاد بوو و نە لەیلاش لە مەجنون. دوو عاشقی فاشیل.

ساڵ سووڕایەوە و ئاگری خۆشەویستیم بۆ لەیلا ئەمجارەیان بوو بە هەوێنی شیعرێکی زۆر تەڕتر و لە رووی هونەری شیعریشەوە زۆر رێکوپێکتر کە وابزانم ساڵی 1953 بۆ ئاوازی گۆرانییەکی ئیسپانی دانسی رومبای کوبی زۆر بەناوبانگی ئەو زەمانە دامنا (Amado Mio ئامادۆ میۆ) واتا (خۆشەویستەکەم). تایتلی شیعرەکەم کرد بە (لەیلا پۆڵ مەلەک) کە وەک تایتلە ئەسڵییەکە لە پێنج بڕگەوە پێک هاتووە و زۆر بە وردیش شیعرە کوردییەکەم بڕگە بە بڕگە لەگەڵ ئاوازەکە دەگونجاند، راستییەکەی نەک هەر لەگەڵ ئاوازی بە زمانە ئیسپانییەکە بگرە بە چەندین زمانی دیکەش کە بۆ ئەو مێلۆدییە زۆر خۆشە بە کەمێک دەسکاریی ئاوازەوە وشەی بۆ داندراوە. لەو شیعرەم من ئەمانەم هەموو لەبەرچاو گرتبوو کە تەمەنیشم هێشتا هەر شانزدە ساڵێک دەبوو. لە ساڵانی پەنجاکانا ئەم گۆرانی و موزیکە رۆژئاواییانە لە کەرکووک زۆر باو بوون. لە کەرکووک من و کاک سەعدیی برام گرامۆفۆنێکمان کڕیبوو و هەرچی گۆرانیی نوێ دەرچووبایە لە دوکانەکەی نائیل یەعقوبی (یادی بەخێر) دەست دەکەوت.

ئەم گۆرانییەم لە ساڵی 53 وە هەڵگرتووە و تا ئەمساڵ تۆمارم نەکردبوو. ئێستا دوای ئەم هەموو ساڵە لەگەڵ دکتۆر عەبدوڵا جەماڵ سەگرمە تۆمارمان کرد و وا بەتەماین بڵاوی بکەینەوە. دەقی شیعرەکە:

## لەیلا پۆڵ مەلەک

(لەسەر ئاوازی ئامادۆ میێۆ)

لیریکی کوردی: هۆمەر دزەیی

ئاواز: دۆریس فیشەر/ ئالن رۆبێرتس

لەیلا پۆڵ مەلەک   تۆ دڵت پێکاوم
بە تۆوە گیرساوم   تۆی ژینی من
من بۆت نەماوم   شەو بۆت گریاوم
زەردەخەنەکەت   بۆی سووتاوم

***

چاو کارمامزی دەشتێ   بەژنت لاولاوە
ئای کە لەو جوانییەی   خوا بە تۆی داوە
کیژۆلە رەشتاڵە
وا لەبەر چاومایە   ئەم رووە جوانە
شەونمی مەمکت   بۆ من دەرمانە
شیرنەی شانزە ساڵە

***

لەیلا پۆڵ مەلەک   ئەم لێوە نیانە
مژێکی بۆ من   ئاوی ژیانە
لەیلا پۆڵ مەلەک   ئەی فریشتەی کوشتە
ئەو جێی تۆی لێ بی   بۆم بەهەشتە

***

ئاخۆ ئەبێ رۆژێ   بێمەوە یادت
جێم گرتبێ لەناو   دڵەی بێدادت
یان ئەبمە نامرادت
لەیلا پۆڵ مەلەک   دەوەرە باوەشم
بتوێوە لەناو گیان و لەشم

***

کە ساڵی 1953قۆناخی ناوەندییم تەواو کرد، چاوم بڕیبووە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا (معهد الفنون الجميلة) بۆ ئەوەی لەوێ موزیک بخوێنم. ئەو پەیمانگایە قوتابیی دەرچووی ناوەندیی وەردەگرت. نامەیەکی زۆر جوانم بۆ کاک ئەحمەدی براگەورەکەم نووسی و هەوڵێکی زۆرم لەگەڵیدا کە بمنێرێ بۆ ئەوێ بەڵام بێ سوود بوو، ئەوە دووەم جار بوو کە دڵم بەنامرادی سارد بێتەوە. جاری یەکەم کە خوێندنی سەرەتاییم تەواو کردبوو هەوڵم دا منیش تەبای پوورزاکانم بچم لە بەغدا لە هایسکوولە ئەمەریکاییەکە (كلية بغداد Baghdad College) بخوێنم بەڵام ئەوساش کاکم نەیهێشت. ئێستا وای لێک دەدەمەوە دەڵێم رەنگە کاکم بیری بۆ ئەوە چووبێ کە ئەو قوتابخانە پڕ لە منداڵە بورژوازییە و لە بەغداش بۆ منداڵە عەشایری وەک ئێمە دەست نادات، ئیتر نازانم.

ئەوە بوو کە ساڵی سکۆلاری 1953-1954 بە نابەدڵییەکەوە گواستمەوە بۆ ئامادەیی کوڕانی کەرکووک (اعدادية كركوك للبنين). چاکم لەبیرە بەڕێوەبەرەکەمان مامۆستا حوسێن سەعید بوو، یادی بەخێر پیاوێکی کوردی زۆر باش بوو.

لەو ساڵە بەدوا جگە لە خوێندنی خۆم خولیاشم بۆ موزیک و شیعر دانان هەر گڕی دەگرت. کەمانێکم کڕی و چەند وانەیەکی کەمانم لای پیرەمێردێکی ئەرمەنی (کریکۆر) وەرگرت. دەستیشم کرد بە شیعر نووسین کە زیاتر بۆ گۆرانیم دادەنان و گۆرانییەکانیش هەندێ ئاوازی بیانیی زۆر باوی ئەو سەردەمە بوون. وشەم بۆ سێ گۆرانی دانا یەکێکی ئیسپانی یەکێکی عەرەبی و یەکێکی تورکی. ئسپانییەکە (ئامادۆ میۆ) بوو هەڵبەستەکەیم بۆ لەیلا داناوو بە تایتلی (لەیلا پۆڵ مەلەک). عەرەبییەکە (یاعوازل فلفلو) گۆرانییەکی زۆر باوی سەرەتای ساڵانی پەنجاکان بوو لەلایەن هونەرمەندی میسری فەرید ئەترەش. ئەمەشیان تایتلی (ماچم دەوێ)م بۆ دانابوو. ئەم گۆرانییەم دواتر (1954) بۆ بەشی کوردیی ئێستگەی رادیۆی عێراق

لە بەغدا تۆمار کرد. هەرچی ئاوازە تورکییەکە بوو (جەمیلە) ئەمیان تانگۆیەکی زۆر رۆمانتیک بوو کە هەم بە دەنگ و هەم بە ئامێر لە جیهانا ناوی دەرکردبوو. منیش وشەی زۆر رۆمانتیکم بۆ ئەم ئاوازە خۆشە نووسی و هەر بەناوی (جەمیلە) لەوساوە 1953 لای خۆم هەڵمگرتبوو. ئەمساڵ (2016) لە ستودیۆی دکتۆر عەبدوڵا جەمال سەرگەرمە تۆمارم کرد و بە سەرپەرشتیی موزیکاڵی خۆی بەنیازین بۆ بەرایییەکانی ساڵی 2017 بڵاوی بکەینەوە. تایتلەکەیشم گۆڕی و لەجیاتی جەمیلە کردم بە (ئورزولا Ursula). بۆیەش ناوەکەم بۆ ئەوە گۆڕی چونکە چەند ساڵێک دواتر لە ڤییەنا چیرۆکێکی رۆمانسیم لەگەڵ کیژۆڵە نەمساوییەکدا هەبوو کە ناوی (ئورزولا) بوو. زۆر سەیرە ناوەڕۆکی ئەو شیعرەی کە لەساڵی 53 لە کەرکووک هەروا بەخەیاڵ بۆ ئەو تانگۆ جەمیلەیەم دانابوو، پێنج ساڵ دواتر لە ڤیەننا لەگەڵ ئورزولا بوو بە ڕاستی. خۆ ئەمن لە 53 یەک جاریش دانسم نەکردبوو و هەر نەشمدەزانی بیکەم. شیعرەکەشم لە خۆشیی ئاوازەکە هەر ئاوا بەخەیاڵ دانابوو. جا سەیرەکە لەوەدایە ساڵی 1958 لە ڤییەنا لە دانسکلوبی بەناوبانگی شار (ڤۆلکس گارتن Volksgarten) لەژێر ئاسمانی شین و هەوای ئازادا کە لەوێ ئورزولام ناسی و لە دانسا بەڕاستیش لە باوەشما بوو، ئەوەی پێنج ساڵ پێشتر (میوز muse) ی فریشتەی شیعر و هونەر و فەرهەنگ بە دیاری پێشکەشی کردبووم هەمووی لەگەڵ ئورزولا هاتە دی کە دەتگوت هەر کتومت بۆ ئەوم داناوە بۆیە تایتلەکەم گۆڕی بۆ ناوی ئەو. شایانی ئاماژەشە کە هەر ئەو دانسەش بوو بە هەوێنی رۆمانسێکی بەتەوژم بەڵام کورتخایەنی من و ئورزولا.

ئەمەش دەقەکەیەتی:

**تانگۆ ئوررزولا**

**لیریک: هۆمەر دزەیی**

**ئاواز: ئاوازی تانگۆیەکی کۆنی تورکی بە ناوی جەمیلە کە نازانم کێ داینـاوە)**

ئوررزولا
فەرموو با بچینە ناو
ژووری دانسی رازاو
هەڵپەڕین لەسەر ئاوازی تانگۆ
ئوررزولا
دەستم بگرێ کەمەر
شەو هەتاکو سەحەر
هەڵپەڕین لەسەر ئاوازی تانگۆ
باسکت باوێ سەر ئەستۆم
بەئەسپایی بە گوێچکەم بڵێ من هی تۆم
شل شل پشتت لەگەڵ
ئاوازی تانگۆ بچەمێنەوە بۆ ئەژنۆم
ئوررزولا
نە تۆ منت ناسیوە
نە من تۆم بینیوە
هەست دەکەم دڵمان
بە یەک گەییوە
ئوررزولا
داخەکەم کورتە شەو
توخوا مەڕۆ بۆ خەو
هەڵپەڕین لەسەر ئاوازی تانگۆ

ئورزولا
ئیمشەو تۆ شاجوانی
دڵکەشی هەمووانی
هەڵپەڕین لەسەر ئاوازی تانگۆ
چاو هەڵبڕە، گوێ بگرە
بۆت ئەڵێم گۆرانی
شوێنێکی رۆمانتیکە
لە باوەشم بە تا بەیانی
ئورزولا
بەو شەماڵی فێنک
بەو کراسی تەنک
با لە سنگم چەقێ
جووتە مەمک
ئورزولا
لێوی تەڕوپڕت
مەمکی توند و خڕت
هەڵمژم لەسەر
ئاوازی تانگۆ

***

کاک سەعدیی برام و من چوار ساڵ لە کەرکووک خوێندمان 54 51-. ساڵی یەکەم کاک ئەنوەری براشمان لەگەڵا بوو بەڵام دواتر ئەو بەکالۆریای وەرگرت چوو بۆ تورکیا لەوێ کۆلێژی پزیشکیی تەواو کرد.

## چۆن مام جەلال منی لە حزبی شیوعی دەرهێنا

هەر جارێکی مام جەلال لە کۆیەوە یان لە هەولێرەوە بچووبا بۆ بەغدا و زۆر جار لە گەڕانەوەشیا لە ماڵی ئێمە لە کەرکووک لای دەدا. مام جەلال و کاکە سەعدیم پارتی بوون، من و دارا ئەدیبی برادەریشم شیوعی بووین. زەکیی کوڕی حاکم عەبدولڕەحمان سەعید بەرپرسی من و دارا بوو لە ڕێکخستنا و وا بزانم هەفتەی جارێک دەچووین بۆ ماڵەکەی و لەگەڵیا کۆ دەبووینەوە.

ڕۆژێکیان دیسان مام جەلال ڕێی کەوتە کەرکووک و وەک پیشەی خۆی لە ماڵی ئێمە لە شاترلوو پەیدا بوو. مام جەلال ئەم جارە شتێکی نوێی پێ بوو و لەگەڵ کاک سەعدی و منا دانیشت گوتی پارتی بڕیاری دا کە هەموو یەکیەتی و ڕێکخراوە کوردیەکانی سەر بە پارتی (یەکیەتیی قوتابییانی کوردستان، یەکیەتیی لاوانی کوردستان و یەکیەتیی ئافرەتانی کوردستان) کە پێشتر لەناو یەکیەتییە گشتییە عێراقییەکاندا بوون و سەر بە حزبی شیوعیی عێراقی بوون گوتی ئیتر جیا دەبنەوە و دەبن بە ڕێکخراوانی سەربەخۆی کوردستانی. زۆر بەجوانی بۆ منیشی روون کردەوە بۆچی کورد ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیەوەی نەبێ، بۆچی هەر دەبێ پاشکۆی عێراق و حزبی شیوعیی عێراقی بین کە هەرگیزیش حیسابی جددیمان بۆ ناکەن. حزبی شیوعی بەمە زۆر تێک چوو بوو و هێرشی زۆری دەکردە سەر پارتی. ئەمن قسەکانی مام جەلالم زۆر پێ لۆژیک بوو و گوتم ئەمن هەر لە بەیانییەوە بە حزبی شیوعی دەڵێم کە من لەمڕۆ بەدوا دەبمە ئەندامی ڕێکخراوە کوردستانییەکان و هیچ پەیوەندیەکم بە ڕێکخراوە عێراقیەکانەوە نامێنێ.

هەر لەو سەفەرەی کەرکووکی و لادانی لە ماڵی ئێمە مام جەلال ئەمجارەیان فێری ئەلف بای لاتینیشی کردم بۆ نووسینی زمانی

کوردی لەجیاتی ئەلف بای عەرەبی وەک کوردەکانی تورکیا و سووریا.

بۆ بەیانی کە چووم بە قوتابخانە و هەواڵەکەم بە دارا گوت ئەویش زۆری را لێبوو و چووین بۆ لای موسلیح جەلالی کە ئەویش شیوعی بوو و لە قوتابخانە لەگەڵمانا بوو. کە پێمان گوت ئێمە بە چاکی دەزانین رێکخراوە کوردستانییەکان سەربەخۆیی خۆیان هەبێت و چیتر پێویست ناکات وەک لکێکی رێکخراوە عێراقییەکان بمێننەوە. داواشمان لێ کرد ئەویش کە کوردە با لەگەڵ ئێمە پشتگیری لەو هەنگاوە بکات و هەموومان بچینە ناو ئەم رێکخراوە کوردستانیانەوە. موسلیح زۆر تووڕە بوو و گوتی ئەمە خیانەتە و تێکدانی ریزی نیشتمانییە، ئەمە هەمووی ئیستیعمار پێیان دەکات، ئێوە نەکەن شتی وا بکەن ئەگینا حزب سزاتان دەدا. گوێمان نەدایە و لەو رۆژەوە ئیتر من و دارا پەیوەندیمان بەو رێکخراوانە و بە حزبی شیوعیشەوە پچڕا هەرچەندە کە من خۆم هەنگی نەبووم بە ئەندام لەناو پارتیشا و بیرم نەماوە دارا ئەوسا بووبێ بە ئەندام یان نا.

ساڵی 1954 پۆلی چواری خوێندنی ئامادەییم لە کەرکووک تەواو کرد و ئەوە دوا ساڵیشم بوو لەو شارە خۆشەی کوردستان، چونکە بۆ پۆلی پێنجەم کە خوێندنی سانەوی لە زەمانی ئێمەدا هەر پێنج ساڵ بوو چووم بۆ بەغدا و بەکالۆریاکەم لەوێ وەرگرت. وەک پێشتریش گوتوومە کەرکووک لە ژیانی مندا لە زۆر رووەوە قۆناخی وەرچەرخان بوو، لەوێ چاوم کرایەوە و بوو بە رێخۆشکردنێک بۆ تێگەیشتن و حەزلێکردنی ژیانی رۆژئاوا. یەکێک لە هاوکلاسەکانم کە بووین بە برادەری نزیکی یەکتری سانخیرۆ یۆحەننای ئاشووری بوو کە هەر بە سانخۆ بانگمان دەکرد. کوڕێکی باریکەلەی ئاتلێتیک کە لە سپۆرتا زۆر لێهاتوو بوو و بیستم کە سانەویی تەواو کرد بە بورس نێردرا بۆ ئاڵمانیای رۆژهەڵاتی ئەو زەمانە دکتۆرا لە سپۆرت بخوێنێ ئیتر لەوساوە تا ئێستاش ئاگامان لێک بڕا. سانخۆ برایەکی

لەخۆی گەورەتری هەبوو (ولیەم) کە ئەکۆردیۆنژەنێکی باش بوو و لە کلوبی کۆمەڵایەتیی کۆمپانیای نەفت لە گەڕەکی (کەرکووکی نوێ) شەوان ئەکۆردیۆنی دەژەنی. دوو برادەری ئاشووری تریشم خۆشدەویست سەرگۆن و جۆزێف کە وەک خۆم جلی بۆ ئەو زەمانە زۆر هاوچەرخیان هەڵدەبژارد و سەروقژیشیان بەشێوەی مۆدێرن توالێت دەکرد. ئەو ساڵەی دواییم لە کەرکووک ساڵی خوێندنی 54 جۆرە ناوبانگێکم وەک دەنگخۆش پەیدا کرد. لە بۆنەکانی قوتابخانە هەمیشە من سۆلۆسینگەری گۆرانیی کوردی و میسری و جارێکیش ئینگلیزی بووم بە گۆرانیی بەناوبانگی ئەو سەردەمە perhaps perhaps perhaps. لە گۆرانییە کوردییەکانا کۆرسیشم هەبوو بۆیان دەگێڕامەوە. جارێکیان کۆرسەکەم ئەم برادەرانەم بوون کە راستییەکەی هیچ کامێکیان دەنگخۆش نەبوون بەڵام چی بکەم کەسی ترم دەست نەکەوت: (دارا ئەدیب، تەحسین شێخ حەبیب تاڵەبانی، نووری شێخ جەمیل تاڵەبانی). لە هەندێ لەو ئاهەنگانەدا ولیەم ئەکۆردیۆنی بۆ لێ دەدام، هەندێ لەو وێنانەی کەوا لەم بەشەدا بڵاوم کردوونەتەوە هی ئەو بۆنانەی سانەوییەکەی کەرکووکی ساڵی پەنجاو چوارمن.

بۆ گێڕانی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی 1954یش بیستبوومان کە حکوومەت مۆڵەتی دیوانی (رەسمی) دەدات. شاندێکی قوتابییانی کوردی کەرکووک کە یەکێکیان کاکە سەعدی برام بوو چوون بۆ لای موتەسەڕیف (پارێزگار) و داوای مۆڵەتیان بۆ ئاهەنگەکە لێ کردبوو. پارێزگار بەڕێز رەشید نەجیب بوو کە مرۆڤێکی زۆر کوردپەروەر و شاعیر و خاوەن مێژوویەکی کوردایەتیی پاک بوو و لە هەڕەتی لاویدا هەمیشە یەکێک بووە لە نووسەرانی رۆژنامەی (ژین) و (گەلاوێژ). رەشید نەجیب زۆر بە رووخۆشی و دڵخۆشییەوە پێشوازی لە دەلەگاسیۆنەکە دەکات و زۆر بەجوانی تێیان دەگەیەنێت کە خۆی لەوانی پێ خۆشترە یادی نەورۆز بکرێت بەڵام دەڵێ

ئەو مۆڵەتەی گێرانی بە ئاشکرای ئاهەنگی نەورۆز کە دەرچووه بە داخەوه کەرکووک ناگریتەوه و ئامۆژگاریيان دەکات بچن بۆخۆیان بەبێ هەرا و بەخشکەیی بێ دەعەواتی رەسمی یادی نەورۆز بکەنەوه. راستییەکەی ئەمن لەبیرم نەماوه چیمان کرد بۆ ئەو رۆژه بەڵام لەبیرمه هەمووومان جلی کوردیمان لەبەر کردبوو و یەکێک لەو وێنانەی ئەم بەشەش هی رۆژی نەورۆزەکەی ئەو ساڵەی کەرکووکه. حکوومەت لە سلێمانی و لە هەولێریش مۆڵەتی دابوو بۆ گێرانی ئاهەنگەکە بەڵام لەوه دەچێ لە پلانیدا بووه شاری کەرکووک دوور راگرێت لە بۆنەی وەها کە هەستی ناسیۆنالیسیزمی کوردی لێ بتەنێتەوه.

ئاهەنگەکانی بە بۆنەی نەورۆز لە شارەکانی کوردستانا مەرج نەبوو هەمووی لە رۆژی 21ی ئادارا بگێردرێن، هەر شارەو بەپێی کەشوهەوا و بەپێی هەلومەرجی خۆی و بە لەبەرچاوگرتنی هاتنی میوانی شارەکانی دی رۆژێکی نزیکی لەو رۆژەوه هەڵدەبژارد. جا ئێمەش لە کەرکووک شاندێکمان پێک هێنا و پاسێکمان بەکرێ گرت چووین بۆ ئاهەنگی نەورۆزەکەی سلێمانی کە لە تووی مەلیکا دەکرا. تووی مەلیک لە پەنجاوچوارا لە چۆڵەوارییەکی دووری شار بوو. رەنگە نیوەی دانیشتووانی سلێمانی بەژن و پیاو و منداڵەوه رژابوونە ئەوێ و ئەوه یەکەم جاریش بوو چاوم بە دوو گۆرانیبێژی ناوداری ئەو زەمانە بکەوێت: (رەشۆل و قالەی حاجی حسێن). ئەمەی دواییان شیعرە خۆشەکەی (گوڵی سەربەستی)ی بە دەنگە زوڵاڵەکەی دەچڕی و لە کاتی گوتنا چەپکەگوڵێکی سووریشی بەدەستەوه گرتبوو. یەکێک لە وێنەکانی تری ئەم بازنەیەم چەند کەسێکی دەلەگاسیۆنەکەین بۆ سلێمانی کە لە رێگای چوونا گرتوومانە.

لەپاش نەورۆزەکەی سلێمانی ئێمە هەندێکمان چووین لەوەی هەولێریشا بەشداریمان کرد. ئەگەر ماوەی درێژ و تەمەنی بەناوساڵا چوویی لێی تێکەڵ و پێکەڵ نەکردبم هەر لەدوای ئەو نەورۆزەی هەولێریش بوو کە کاکە ئەحمەدی برا گەورەمان هەموو ئەو میوانە

کوردانەی کە لە بەغداوە هاتبوون بۆ نەورۆزەکەی هەولێر لەگەڵ زۆرێک لە سەرکردایەتیی پارتی کە عەونی یوسف و پێموایە مام جەلال و عومەر دەبابەشی لەگەڵ بوون ئەوانەی هەموو بانگهێشت کرد بۆ دووگردکان و لەوێش ئاهەنگەکە تا درەنگانی شەو بە گۆرانی و شەوچەرە و خواردن و خواردنەوە و مشتومڕی سیاسی درێژە پێ درا. لە میوانەکانی بەغدا حەبیب محەمەد کەریم و ید اللەم لەبیر ماوە.

## عومەر دەبابە

دەبا لێرەدا نەورۆز بەجێ بێڵین و یادێکی پێشمەرگەیەکی دێرین، تێکۆشەرێکی ماندوونەناس، مرۆڤێکی قسەخۆشی ئێسک سووک بکەمەوە کە ماوەیەک لەو ماوەیەی کە ئێمەی لێ لە کەرکووک بووین ئەویش لەوێ دەژیا. بەتەواوی نازانم بۆ لە کەرکووک دادەنیشت کە خۆی کۆیی بوو، بەڵام ڕەنگە لەلایەن پارتییەوە بۆ کاری ڕێکخستنی حزبی لەوێ داندرابووبێ: کاکە عومەر مستەفا کە زیاتر بە (عومەر دەبابە) ناسراو بوو و پێم وایە هەنگی دەبێ ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی بووبێت. لەو ماوەیەی کەرکووک کاکە سەعدی برام و من پەیوەندییەکی نزیکمان بە کاکە دەبابەوە هەبوو و هەمیشە لە ڕۆژانی ویکەندا لەگەڵ ئەو و لەگەڵ کاک عەبدوڵا کانی مارانی و کاک ئازاد مەحمود شەوقیی هونەرمەندا بەیەکەوە دەبووین. هەروەها هەر جارێکی کاک ئەحمەدی برامان و دایک و خوشک و براژنمان لە دووگردکانەوە بهاتبان بۆ کەرکووک لەگەڵ بنەماڵەی تایەر ئەفەندیی براگەورەی کاک عومەرا بەتایبەتی لەگەڵ هەمینە خانی خوشکیان و منداڵەکانی، کاکەمەم و سلێمان دیدەنی و هاتوچۆیان دەبوو کە کاک عومەریش هەر لەگەڵ ئەواندا دەژیا. کاک عومەر زۆر جار لە وەرزی بەهارانا لەگەڵ کاک ئەحمەدی برامان دەچووە

دووگردکان یان لەگەڵ خزمە دزەییەکانی ترمان دەچووە گوندەکانی ئەوانیش بۆ راوەمامز لە دەشتی قەراجی.

ئەوسا ئەمن نە لەناو حزبی شیوعیی عیراقیدا مابووم، نە بووبووم بە پارتیش. کاکە سەعدیی برام و کاک عومەر دەبابە ئەوان پارتی بوون، خولیای من زیاتر بەرەو هونەرە جوانەکانی دەبردم تا سیاسەت. راستە کوردایەتیم لا مەبەست بوو بەڵام حەزم لە خۆبەستنەوە بە ڕێنمایی و کۆبوونەوە و کاروباری رۆژانەی حزبی نەبوو، حەزم دەکرد بە کەماڵی ئازادی و رەهایی بژیم، هونەرمەندانی جیهانیش بەگشتی هەر وان.

لێرەوە ئیتر، بای بای کەرکووک، بەغدا خۆت بگرە هاتم.

حوسێنی عەلی ئاغای دزەیی (خەزووری هۆمەر)

فارسی عەلی ئاغای دزەیی

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، حەمە جەلال سالح، ئەرجومەند سدیق، عەلی سمایل ئاغا دزەیی و هیوا مستەفا بەهجەت

له چەپەوە: کیسرا ئەدیب، دارا ئەدیب و هۆمەر دزەیی. لە پشتەوە: سەمیرە حوسێن ئاغا خوشکەزای دارا و کیسرا

جەمیل عەلی ئاغای دزەیی

فاتمەخانی سەعید ئاغای هەمەوەند
1989 - 1902

ئەدیب عەزیز
1972 - 1900

کیسرا ئەدیب
- 1936

دارا ئەدیب
1982 - 1935

لە چەپەوە دارا ئەدیب و هۆمەر دزەیی،
کەرکووک 1952

لە چەپەوە هۆمەر دزەیی و دارا ئەدیب،
بەغدا 1954

لە چەپەوە دارا ئەدیب و هۆمەر دزەیی
کەرکووک 1952

هۆمەر دزەیی لە پشت مایکرۆفۆن، کۆرسەکەی دانیشتووی دواوەی لە چەپەوە، دارا ئەدیب،
تەحسینی شێخ حەبیب تاڵەبانی، نووری شێخ جەمیل تاڵەبانی، قوتابخانەی ئامادەیی کەرکووک 1954

دانیشتووەکان لە چەپەوە دووەم کەس دارا ئەدیب، وەستاوەکان لە ڕاستەوە یەکەم کەس هۆمەر دزەیی، کەرکووک نەورۆزی 1954

لە چەپەوە، هۆمەر دزەیی، مەحموود ئەحمەد عوسمان، نەوزاد ئەحمەد عوسمان، چایخانەی مەچکۆ هەولێر

لە چەپەوە، مەحموود ئەحمەد عوسمان، دکتۆر بەرهەم ساڵح، نەوزاد ئەحمەد عوسمان، هۆمەر دزەیی

لە چەپەوە، هۆمەر دزەیی، سەرمەد ئەنوەر سائیب (ئامۆزای شەماڵ سائیب)
مەسیف سەلاحەدین 1952

لە چەپەوە، فوئاد ئەحمەد عوسمان، هۆمەر دزەیی، ڕامز جبوری غەزووڵ،
مەسیف سەلاحەدین 1952

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی و دارا ئەدیب
بەغدا، ئەبونەواس 1954 یان 1955

له چەپەوە: هۆمەر دزەیی و دارا ئەدیب
بەغدا 1954 یان 1955

له چەپەوە: هۆمەر دزەیی، دارا ئەدیب و نووری کانەبی دزەیی
کەرکووک 1954

کیژۆڵه نەمساویی ئورزولا

هۆمەر دزەیی پێشوازی لە مام جەلال دەکات لە فڕۆکەخانەی واشنتۆن، ساڵی 1998

لە چەپەوە: هۆمەر، کاک ئەحمەدی برا گەورەی و سەعدی برای

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، دارا ئەدیب و سەمیرە حوسێن ئاغا خوشکەزاری دارا

لەسەر ڕێی کەرکووک - سلێمانی بۆ نەورۆزی 1954 . لە ڕاستەوە: عەزیز حوسێن دزەیی، سەعدی دزەیی، ئیبراهیم سابیر، عوسمان بەگی جاف، هۆمەر دزەیی، عەبدوڵا کانی مارانی و عەبدولقادر کانی مارانی. دانیشتووەکەش شوفێری باسەکەیە

ڕۆژی نەورۆزی 1954 لە کەرکووک، وەستاوەکان لە چەپەوە: عەزیز خۆشناو، عیرفان تاڵەبانی، نەناسراو، نەوزاد، مامۆستایەک، دڵشاد کاکە، نەناسراو، هۆمەر دزەیی. دانیشتووەکان لە چەپەوە: جەمیل جەلال، دارا ئەدیب، نەناسراو، عومەر هەڵمەت

سەیرانێکی دەروپشتی کەرکووک لە ڕاستەوە: عومەر دەبابە، هۆمەر دزەیی، عەزیز حوسێن دزەیی، منداڵەکانیش برازاکانی کاک عومەر و وریا و شوانی برازای هۆمەر دزەیی، 1954

ئاهەنگێکی ئامادەیی کەرکووک، 1954 لە ڕیزی ناوەڕاست هۆمەر دزەیی بە بلووزە سپییەکە، لەخوار ئەویش ولیەم بە ئەکۆردیۆنەکەیەوە. ڕیزی پشتەوە لە ڕاستەوە: دووەم کەس دارا ئەدیب، سێیەم عیرفان تاڵەبانی.

دووەمی دەستەڕاست ڕەشید نەجیب پارێزگاری کەرکووک لە پەنجاکانا لەگەڵ جەواهیر لال نەهرۆ لە دەلهی 1957

دیمەنێکی کۆنی مەسیف سەلاحەدین

مامۆستا مستەفا حەسەن شەعبان

مامۆستا نەشئەت محەمەد سەفوەت

دیمەنێکی کۆنی شاری کەرکووک

دیمەنێکی کۆنی شاری کەرکووک

دیمەنێکی باوەگوڕگوڕ لە پارێزگای کەرکووک

ئاگرەکەی کەرکووک

دیسکۆ فۆلکسگارتن لە ڤیەننا، ساڵی 1958

بزووتنەوەیەکی دانسی تانگۆ

# بەشی 10

##ساڵێکی قوتابخانەم لە بەغدا
## 1954 - 1955

ساڵی خوێندنی 1954 تەواو بوو من دەرچووم بۆ پۆلی پێنجەم و کاکە سەعدیی براشم کە ئەو لە پۆلی پێنجەما بوو تەواوی کرد، ئەو بەکالۆریای وەرگرت و لێی دا رۆیشت بۆ لەندەن بۆ خوێندنی زانکۆ. من بەتەنیا مامەوە. ئەوسا کاکە موحسینی برام ئەویش لە دواساڵی کۆلێژی ماف بوو لە بەغدا و بە ژن و ماڵ بوو. ئەوە بوو کە لە ماڵەوە بڕیار درا منیش بچم بۆ بەغدا بۆ ماڵی ئەو و دوا ساڵی ئامادەییم لەوێ تەواو بکەم. هەر واشی لێ هات.

کاک موحسین خانووێکی خۆشی بەکرێ گرتبوو کە خاوەنەکەی (دکتۆر عەبدوڵا ئیسماعیل البستاني) مامۆستایەکی خۆی بوو لە کۆلێژی ماف. خانووەکە لە گەڕەکێک پێموایە (الصرافیة) بوو پێش پردەکەی شەمەندەفەر (جسر الصرافیة) و زۆر نزیکی کۆلێژی ماف. کاک موحسین دەڵێ ئەو ناوەی کە ماڵەکەی ئێمەی لێ بوو پێیان دەگوت (منطقة الممیز) دوای ئەوە ئیتر گەڕەکی (الوزیریة)ی دەوڵەمەندەکان بوو. ناوەندی رۆشەنبیریی بریتانیش (المرکز الثقافي البریتاني) هەر زۆر لە ماڵەکەمانەوە نزیک بوو و بۆ من زۆر باش بوو چونکە هەر بە پیادەیی دەچووم بۆ ئەوێ هەم بۆ خوێندنەوەی رۆژنامە و کۆڤارە ئینگلیزییەکان کە زمانە ئینگلیزییەکەمی پێ چاک بکەم و هەم بۆ گوێگرتن لە بەرنامەیەکی موزیکی کلاسیک کە هەفتانە مامۆستایەکی بریتانی پێشکەشی دەکرد. مامۆستاکە لە پێشان بە ئینگلیزی کورتەیەکی بابەتی پارچە موزیکە کلاسیکەکە و

کەمێکیش ژیننامەی کۆمپۆزەرەکەی بۆ دەگێڕاینەوە ئینجا لە پاشان قەوانە قیرەکەی دەخستە سەر گرامۆفۆنەکە و بۆی لێ دەداین. ئێمەش فێر کرابووین بێدەنگ دابنیشین نقەمان لێوە نەیەت تا چێژ لە کارە موزیکاڵەکە وەرگرین. هەندێ جاریش پیانیستی ناوداری ئەرمەنی عێراقی خانم بیاتریس ئۆهانێسیان دەهات بە پیانۆی ناوەندەکە چەند پارچەیەکی موزیکی کلاسیکی پێشکەش دەکردین.

خێزانی ئێمە لەو ساڵە لە بەغدا ئەمانە بووین: کاک موحسینی برام، نەجیبە خانی هاوسەری، رەمزیە و ئاوازی برازامان کچانی کاک ئەحمەدی برامان کە منداڵ بوون و ئەوساڵە لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی بە زمانی فرەنسی دەیانخوێند و ژنە رەبەن بەڕێوەیان دەبرد (مدرسة راهبات التقدمة الاهلية للبنات) و خۆم. بنەوانیشمان (پلکە ئاجەری حەمەد مەلای) خەڵکی گوندی پیرداود و پیاوێکیشمان بۆ خزمەتکردن لابوو (حەمیدی کوڕی پیرۆزی دایکی کاکە) کە بە ئەسڵ خەڵکی گوندی کەڵکەسماق بوو. ژوورێکی چکۆلانەش لە سووچێکی باخچەکەی پێشەوە هەبوو کە کاک موحسین هەروا بە پیاوەتی دابووی بە کوڕێکی ئیسماعیل ناوی هەولێری کە کاری ئوتوچیاتیی دەکرد و لەگەڵ (سەلما)ی خوشکیا کە کیژۆڵەیەکی نەوجەوانی ژیکەڵە بوو پێکەوە دەژیان و سەلماش ماڵەکەی ئێمەی بۆ پاک دەکردینەوە.

باشترین قوتابخانەی ئامادەییش لە بەغدا (الاعدادية المركزية) بوو کە تەنیا خوێندکاری لە خوێندنا پلە بەرزی وەردەگرت. منیش پلەکانم هەمووی باش بوون ماتماتیک نەبێ بەڵام بیرمان لێ کردەوە کە زمانی عەرەبیی کوردان وەک ئەوەی عەرەبەکان خۆیان باش نییە و لەوانەیە ئەمە لێم ببێ بە گرفت بۆ وەرگرتنم لەو ئامادەییە ئاست بەرزەی بەغدا. بۆیە کاکە زەیدی پوورزام (زەید ئەحمەد عوسمان) کە پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ کەسایەتییە سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییە عەرەبەکانی بەغدادا هەبوو گوتی خۆم

دەتبەم بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئوستاد علاو الدین الریس کە برادەرمە. باش بوو یەکسەر وەریانگرتم و دڵیشم زۆر خۆش بوو کە بینیم مامۆستا رەفیق حیلمی سەرۆکی حیزبی هیوای مێژوویی و مارف خەزنەداری دۆستی لەمێژینی بنەماڵەکەمان ئەو دوو کوردە لەو قوتابخانەیە کارمەند بوون.

ئەعدادییەی مەرکەزییە لە هەموو بوارێکا قوتابخانەیەکی ئاست بەرز بوو. مامۆستاکانی هەر یەکە لە بواری خۆیدا بەڕاستی بژاردە بوون. بێجگە لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، علاو الدین الریس، ناوی ئەم چەند مامۆستایانەم لەبیر ماوە: (محمد سرور - مامۆستای عەرەبی، عزیز شلال عزیز - مامۆستای ئینگلیزی، .... الدروبی - مامۆستای سپۆرت). ئەوەی لەبیرم مابێ ئێمە چوار کورد بووین لەو قوتابخانەیە: (نەجیب بابان - برای مەحمود بابانی وەزیری زەمانی مەلەکییەت، هوشیاری کاکە زیادی کۆیە، دارا ئەدیبی برادەرم و خۆم). لە خۆشبەختیی منا ماڵی دارا بە حوکمی پۆستەکەی ئەدیب ئەفەندیی باوکی، ئەوانیش لە کەرکووکەوە گواستبوویانەوە بۆ بەغدا. من و نەجیب لە بەشی ئەدەبی بووین بەڵام لە دوو شوعبەی جیاجیا، هوشیار و داراش لە عیلمی. لە شوعبەکەی منا کوڕێکی بەداخەوە نابینای لێ بوو کە بەیانییان یەکێک دەستی دەگرت بۆ ناو کلاسەکە ناوی نصیر بوو و وەک زۆرترایەتیی نابینایان لەرادە بەدەر زیرەک بوو. لە قوتابییەکانی کلاسەکەی خۆم کە لەبیرم مابن هەندێکیان ئەمانە بوون: (لوئەی سەعد ساڵح -کوڕی سەرۆکی (حزب الاحرار) ی زەمانی مەلەکییەت، غازی شاکر، هشام نصرت، یوسف شاکر السویدي -پێم وایە برازای یان خزمێکی نزیکی سەرەک وەزیرانی پێشووی عێراق توفیق السویدي بوو).

دەبا ئەم چیرۆکە خۆشەی خۆم و زمانی عەرەبیتان بۆ بگێڕمەوە، خۆی راستە لەقسەکردنا پێمەوە دیار بوو کە عەرەب نیم، بەڵام لە نووسینا فەرموون ئەمە چیرۆکەکەیە:

مامۆستای زمانی عەرەبیمان (محمد سرور) پیاوێکی خرپلەی سودانی بوو و زۆر شارەزا بوو لە زمان و ئەدەبی عەرەبیدا. دیار بوو مامۆستا سرور کە (ئینشا)کانی ئێمەی دەخوێندەوە بۆی دەرکەوتبوو کێ لە نووسینا باشە کێ زۆر باش نییە. ڕۆژێکیان پشکنەری گشتیی پەروەردەی عێراق (محمد بهجت الاثری) کە ئەمیش ئەدیب و نووسەرێکی ناوداری عێراق بوو بۆ پشکنینەوەی سالانەی پەروەردە هاتە قوتابخانەکەی ئێمە. لە وانەی زمانی عەرەبییا هاتە کلاسەکەمان و داوای کرد گوێ بداتە ئینشای یەکێک لە قوتابییەکان. مامۆستا سرور بەبێ سێ و دوو لێ کردن رووی کردە من و گوتی: " قم یا عمر" واتا (عومەر هەڵسە). منیش دوو لاپەڕە کاغەزەکەی بەردەمم هەڵگرت و چوومە پێش تەختە ڕەشەکە بۆ خوێندنەوەی ئینشاکەم. بیرم نەماوە بابەتی نووسینەکەم چی بوو، بەڵام لەبیرمە کە وەسفی سروشتی زۆر تێدابوو. بە عەرەبییەکی زۆر ڕەوان و زمانێکی زۆر پاراو و متمانەیەکی تەواو بەخۆما پەیپەرەکەم پێشکەش کرد. دیار بوو هەردوو مامۆستا بە سەرنجێکی وردەوە هەستی خۆیان دابووە نەک هەر ناوەرۆک بەڵکو شێوەی پێشکەشکردنیشم. کە لێ بوومەوە ئوستاد محمد بهجت زۆر بەگەرمی دەستی پیرۆزبایی گوشیم و سوپاسی مامۆستا سرور و کلاسەکەمانی کرد و ڕۆیشت. مامۆستا سروریش کە لە خۆشییانا خەریک بوو باڵ بگرێ بۆم هات و ئەویش بەگەرمی دەستی گوشیم ئینجا رووی کردە کلاسەکە و ئەم چەند وشەیەی بە شێوەزاری عەرەبیی سودانی خۆی گوت کە ئێستاش وەک خۆی لەبیرم ماوە: " یا ولاد اختشوا، ده گای من الگبل و بیکتب عربي احسن منکم، اختشوا ". کوردییەکەشی ئەمەیە: "کوڕینە شەرم بکەن لە خۆتان، ئەمە لە شاخستانەوە هاتووە و عەرەبی لە ئێوە باشتر دەنووسێ، شەرم بکەن".

کاک موحسینی براشم باسی هەندێ لە برادەر و هاوکلاسە کوردەکانی کۆلێژی مافی خۆی بۆ کردووم کە من خۆیشم

هەندێکیانم هەمیشە دەدی و دەمناسین. دەڵێ ئەوانە هەموویان هاوکلاسی ئەو نەبوون، هەبوون پێش یان پاش کلاسی خۆی بوون، بەڵام وەک کورد بەزۆری لە کۆلێژا پێکەوە دەبوون. ئەمانە هەندێکن لەوانەی کە کاک موحسین باسی کردوون بەڵام زۆریان لەو ساڵەی کە من لە بەغدا دەمخوێند ئەوان کۆلێژیان تەواو کردبوو و لەوێ نەمابوون: (نیهاد نورەدین، ئیبراهیم قەرەداخی، مەعروف رەئوف، جەلال زێوەر، بێباک جاف، ئافراسیاو جاف ( ئەمیان کوڕی شاعیری کوردپەروەر ئەحمەد موختار جاف بوو)، ئەکرەم یامولکی، ئەحمەدی حاجی ساڵح باوکی دکتۆر بەرهەم سالح، ئەحمەد زرنگ، ئەحمەد عەبدولجەبار، مام جەلال تاڵەبانی، تەحسین رەئفەت ( ئەمیان تورکمان بوو بەڵام دۆستایەتی زیاتر لەگەڵ کوردەکانا بوو)، جەوهەر و رەقیبی حوسێنی مەلای دزەیی، ئەنوەر و عەولا پاشای دزەیی، ئەنوەر شێخ عەزیزی بەرزنجیی خاڵۆزامان، نازم یونس، موحسین ساڵح موختار).

بەغدا ئەوسا بۆ من شارێکی خۆش بوو. هێشتا هیچ وڵاتێکی دەرەوەم نەدیبوو کە بتوانم لەگەڵ بەغدا بەراوردی بکەم. بەڵام ئەوەی کە لە بەغدا دەمدی لە شارە گەورەکانی کوردستانا وەک کەرکووک و هەولێر و سلێمانی نەمدەدی. بە دەیان سینەمای مۆدێرنی جوان جوان کە لۆجەکانیان پڕ دەبوو لە کچی ناسک ونازداری بێ عەباوپۆشی، بە دەیان کابارێ و مەلها هەرچەندە کە منی قوتابی بۆم نەبوو بچمە ئەو تەرزە جێگایانە مەگەر ئەوها جاروبار لەگەڵ چەند خزمێکی لە هەولێرەوە هاتووم نەبێ، ئۆرۆزدی باک لە شارع الرشید کە کچ شتیان پێ دەفرۆشتی و دەتتوانی بە ئەسانسۆر سەرکەویت بۆ نهوومی دووەم کە ئەوە یەکەم جارم بوو لە دوکانێکا کچ شتم پێ بفرۆشێت و یەکەم جاریش بوو سواری ئەسانسۆر ببم، مەغازەی بە ناوبانگی (حسو اخوان)یش هەر ئەوها. ئۆتۆبوسی سووری دوو نهۆمی کتومت وەک ئەوانەی لەندەن کە لە سینەما دەمدی و کە سوار دەبووین بۆمان هەبوو لەتەنیشت کچێکی بەدڵی خۆمان دابنیشین

ئه‌گه‌ر جێگاكه‌ی ته‌نشتی چۆڵ بوا، ئه‌و هه‌موو ریستۆرانت و باڕانه و مه‌زگووفه‌كه‌ی ئه‌بو نه‌واس كه له‌گه‌ڵ دارا ئه‌دیبی برادەرما دوو بیره‌ی سارديشمان له‌گه‌ڵا نۆش ده‌كرد. شه‌وانیش دوای سینه‌ما فه‌شافیش (تكه) و میعلاگ (سی و جگه‌ر) فرۆشه‌كانی سه‌ر شه‌قامه‌كان، (كبة برغل) كوبه‌ی ساواری عمو فتاح و سه‌ندویجی (مخ و لسان بارد) ی عمو الیاس له باب الشرقي. له‌سه‌ر شۆسته‌كانی (شارع الرشید) یش لێره و له‌وێ و لای سینه‌ماكان فرۆشیاری سودانی هه‌بوون كه به ئیستیلاحی عیراقیان (فستق عبید)ی گه‌رمیان ده‌فرۆشت كه بۆی دكردیته ناو پارچه كاغه‌زێكی لوولدراوی كۆنه ڕۆژنامه‌كان و ته‌نكه دووكه‌ڵێكی سپیاتی بۆنخۆشیش له لووله‌یه‌كه‌وه به‌ره‌و حه‌وا هه‌ڵده‌كشا و من زۆرم حه‌ز لێ بوو. ئه‌مرۆكه‌ش له هه‌ر شارێكا بم به‌دوای ئه‌و بسته‌یه‌دا ده‌گه‌ڕێم كه به ئینگلیزی پێی ده‌ڵێن (پی نه‌تس pea nuts) به‌ڵام هه‌رگیزیش تامی فستق عه‌بیده گه‌رمه‌كه‌ی شارع الرشیدی نییه. كوره ئه‌دی ئه‌و هه‌موو كچ و ژنه بێ عه‌بایانه كه پۆل پۆل له بازاڕی زیوینگران له شارع النهر ده‌گه‌ڕان و ده‌سووڕان ! ئه‌دی دوو ریستۆرانته به ناوبانگه‌كه‌ی (شریف و حداد) و (العاصمة) به‌رامبه‌ری یه‌كتری له‌سه‌ره‌تایی پرده‌كه‌ی حافظ القازی كه بۆنه تایبه‌ته‌كه‌ی برنجی عه‌نبه‌ری عه‌ره‌بی زاری رێبواری به‌وێدا ره‌تبووی پڕ ده‌كرد له چێژی خه‌یاڵپلاو. ریكلامی كۆمپانیا بازرگانییه‌كان له به‌رزایی باڵاخانه به‌رچاوه‌كانا كه نووسینه‌كان و تابلۆكانیان به گلۆپی ره‌نگاوڕه‌نگ پێ ده‌بوون و ده‌كوژانه‌وه. ئه‌مانه هه‌مووی بۆ من نوێ بوون و تا ده‌هات چاویان به دونیادا زیاتر ده‌كردمه‌وه.

ده‌با لێره‌دا چیرۆكێكی خۆشی شه‌رمنی و كه‌مزانی خۆممتان بۆ بگێڕمه‌وه له حه‌ز حه‌زۆكێی ساڵانی هه‌رزه‌كاریما له به‌غدا. له‌گه‌ڵ كیژۆڵه‌یه‌كی ره‌شتاڵه‌ی خوێن زۆر شیرینی وه‌ك خۆم نه‌وجوانا كه رۆژانه دوای قوتابخانه له وێستگه‌ی ئۆتۆبوسی ناوچه‌ی (المیدان)ی به‌غدا چاوه‌ڕوانی پاسه‌كه ده‌بووین و هه‌ر سه‌یری یه‌كتریمان ده‌كرد.

باوەڕیم بەهەستی خۆما هەبوو کە چەندە ئەمن دڵم چووەتە ئەو کچە نەشمیلانەیە ئەویش رەنگە زیاتریش. ئەو کە سوار دەبوو دیار بوو بەمەبەست شوێنێکی چۆڵی هەڵدەبژارد و منیش دەچووم لە تەنیشتی دادەنیشتم. بەڵام ساڵ تەواو بوو و ئەمن جەسارەتم نەکرد دوو قسەی لەگەڵا بکەم. جارێکیان بڕیارم دا بە نووسین لێی نزیک ببمەوە. ئەوە بوو کە شەوێکیان لە ژوورەکەی خۆما نامەیەکی پڕ لە سۆزی خۆشەویستی و تا رادەیەک ئیرۆتیکیشم بۆ نووسی کە بۆ رۆژی دواتر بێدەمێ. کە دیسان لەناو ئۆتۆبوسا کەوتینە تەنشت یەک چەندی کردم نەمزانی چۆن بێدەمێ. بیرم کردەوە شتێک بەردەمەوە و خۆم شۆڕ کەمەوە بە بیانۆی کە شتەکەم لەژێر کورسییەکەی پێشما بدۆزمەوە ئیتر بە ئەسپایی نامەکە بخەمە ناو لایەکی پێڵاوەکەیەوە کە لە تەنیشت پێی منا بوو. قەڵەمێکم بەردایەوە و خۆم شۆڕ کردەوە بەدوایدا بگەڕێم کەچی دیسان نەوێرام و نەوێرام نامەکە بخەمە لایەکی پێڵاوەکەیەوە، لە بەدبەختیما قەڵەمەکەشم بۆ هەڵنەگیرایەوە چوونکە بۆ دوور خلۆر ببۆوە. پرسیارم کردبوو کچە ناوی (جوهەینە) بوو و کچی ئەفسەرێکی سوپای عیراق بوو. ماوەیەکی زۆر دواتر کە رۆیشتم بۆ ئەورۆپا بیرم لەگەڵ خۆما دەکردەوە بەخۆمم دەگوت " کورە هەی داوەشێیت هەزار جاری ئەو کچە خۆ بە ئاشکرا چاوەڕێی وشەیەکی دەکرد لە دەمتا دەربێت و بەو خوایە نامەکەشی بە دڵەکوتێیەکی خۆشەوە هەڵدەگرتەوە، ئەوە بۆ ئەوها دەمچەفت و شەرمن و ترسنۆک بوویت ئەو زەمانە ؟!؟!". لەوساوە ئیتر جوهەینەم نەدییەوە بەڵام رەنگ و روخسارە شیرینەکەی هێشتا بەتەواوی لەبەر چاومایە. ئەوەی لەگەڵ جوهەینە بەسەرم هات دوو سێ ساڵ پێشتر لەگەڵ لەیلا پۆل مەلەکی کچە ئاشووریش لە مەسیف سەلاحەدین و لە کەرکووکیش بەسەرم هاتبوو بەڵام سەدا سەد لەوە دڵنیام بووم کە جوهەینەش منی خۆش دەویست، هەرچی لەیلایە ئەمیان نا.

هەر ئەو ساڵەش بۆ یەکەمجار لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستا

تەلەڤیزیۆن لـە بەغـدا دەرکـەوت ئەویـش بـە بۆنـەی کردنـەوەی پیشـانگایەکی پیشەسـازی بریتانـی بـوو لـە بەغـدا. خـۆی هـەر خۆشـیش بـوو بـۆ منـاڵ و گەنجـی کـورد بـە فیـزەوە لای برادەرەکانیـان بڵێـن بەغدام دیـوە و باسـی ئـەو شـت و شـوێنانەیان بـۆ بکـەن کـە لـە کوردسـتانا نیـن. لەوانەیـە کـوردی ئێـران بـۆ تـاران، کـوردی تورکیـا بـۆ ئەسـتەمبوڵ و کـوردی سـوریا بـۆ دیمەشـق ئەوانیـش وەک ئێمـەی کـوردی عیـراق لەگـەڵ بەغـدا هـەروا بووبـن.

خوێنـدکارە کوردەکانـی بەغـدا کـە لـە هەمـوو کۆلێژێـکا هەبـوون بـە تایبەتـی لـە (دار المعلمیـن العالیـة) و کۆلێـژی مـاف و کۆلێـژی پزیشـکی بـۆ هەنـدێ بۆنـەی کولتـووری کۆلێژەکەیـان داوایـان لـە منیـش دەکـرد بچـم گۆرانـی بڵێـم و هەڵپەڕکێیـان لەگـەڵا بکـەم.

جـا لیـرە بـا بـە پتـر وردەکاری باسـی تۆمارکردنـی گۆرانییـە کوردییەکانـم بکـەم بـۆ بەشـی کـوردی رادیـۆی بەغـدا.

یەکێـک لـە شـیعری گۆرانیـی کـە سـاڵی پێشـتر، سـاڵی 53 لـە کەرکـووک دامنابـوو گۆرانیـی (ماچـم دەوێ) بـوو کـە وشـەکانیم بـۆ گۆرانییـە بەناوبانگەکـەی فریـد الاتـرش (یـا عـوازل فلفلـو) دانابـوو. ئەمـەش دەقـی گۆرانییەکەیـە کـە چاکـم لەبیـرە لەگـەڵ چەندیـن گۆرانـی تریـش لـە 24/ 12 / 1954 ( ئیـوارەی کریسـمز) لـە بەشـی کـوردی رادیـۆی بەغـدا بۆیـان تۆمـار کـردم و بـۆ رۆژی دواتـر 25 ی مانـگ جـارێ سـییانیان لـێ بـڵاو کـردەوە کـە یەکێکیـان ئەمـە بـوو.

**گۆرانی ماچم دەوێ**

وشە کوردییەکان: هۆمەر دزەیی ئاواز: فرید الاترش

ماچ ماچ ماچم دەوێ
لە یاری خۆم دەوێ
لە چاوڕەشێم دەوێ
خەوم لێ ناکەوێ
بەبێ یارم شەوێ
ماچ ماچ ماچ ماچم دەوێ

***

ئەی هاوار چی بکەم
چیم لێ قەوماوە
هیچ سەبرم نایێ
یارم تۆراوە
ناوەکەی هەردەم
لەسەر زارمە
وێنەشی دایمەن
لە خەیاڵمە
با بگریم بۆ یارم
تا وشک ئەبێ زارم
قوربانت بێ ماڵم
هەر لەدووت دەناڵم
ماچ ماچ ماچ ماچم دەوێ

***

لە دووریی یارم
بۆیێ غەمبارم
چەند نەخۆش کەوتم
نەیپرسی حاڵم
تۆرانی وەهام
قەت نەدیتووە
خۆشم نازانم
من چیم کردووە
وەرەوە بە میوانم
فێنک کەوە گیانم
چیت گوت بیڵێ خانم
عەبدی تۆم بە ئیمانم
ماچ ماچ ماچ ماچم دەوێ

چۆن چەند گۆرانییەکم بۆ بەشی کوردی رادیۆی بەغدا تۆمار کرد

شێخ حوسێنی قەرەداخی کە لە بەشی کوردی رادیۆی بەغدا بەرنامەی هەبوو لەگەڵ براکانم برادەر بوو. جا شێخ حوسێن کە منی دی وا بۆ خوێندن لە بەغدام داوای لێ کردم بچم چەند گۆرانییەک بۆ بەشی کوردی تۆمار بکەم. منیش گوتم با داوا لە کاک ئەحمەدی برا گەورەم بکەم بزانم دەستوورم دەداتێ شتی وا بکەم. لە کاکمم پرسی ئەویش رەزامەندی دەربڕی بە دوو مەرج کە ناوی تەواوی خۆم نەدەم و پارەش وەرنەگرم بۆ گۆرانییەکانم.

بۆ چەند گۆرانییەکم موزیسیانەکانی رادیۆکە داوایان لێ کردم ئەگەر کۆرسێکم لەگەڵا بێ بۆم بگێڕنەوە گۆرانییەکە خۆشتر دەردەچێ. منیش گوتم باشە بەیانی کۆرسێک لەگەڵ خۆما دێنم. بۆ رۆژی دواتر ئەوەندەی گەڕام کەسم دەست نەکەوت ناچار بە دڵساردی بەتەنیا ملم شۆڕ کردبوو دەگەڕامەوە بۆ وێستگەی رادیۆکە لە گەڕەکی (صالحیة)ی ئەوبەر پردەکەی حافظ القازی کە لە پڕێکا بینیم ئەم برادەرانەم وا بەرامبەرم دێن: ئەحمەد عەلی کاکەخان دزەیی، عەبدولا کانی مارانی، یوسف جەمیل میران، شەمسەدین موفتی، پێم وایە عەبدولقادر کانی مارانیش. وەک یانەسییم بۆ دەرچووبێ گوتم کوڕینە جارێ وەختی چاکوخۆشی نییە یاڵلا بەگەڵم کەون دەی بۆ وێستگەی رادیۆ بۆ گێڕانەوەی گۆرانییەکانم. گوتیان کورە ئاخر ئێمە نەدەنگمان خۆشە نە گۆرانییەکانیش دەزانین. هەر چۆنێک بێ پێم سەلماندن کە زۆر ئاسانە من هەر شتێکم گوت با ئەوان لە دوای من دووبارەی بکەنەوە و بۆشیان دەنووسمەوە نەوەک لەبیریان بچێت. هەر واشمان کرد. ئەوەبوو کە رۆژی 24ی مانگی 12ی ساڵی 1954 چەند گۆرانییەکیان بۆ تۆمار کردم و رۆژی دواتر 25ی مانگ سیانیان بڵاو کردەوە. یەکێک لە گۆرانییەکان (ئەی بە زوڵف و روخسارت سەنەم و چین و ماهی تابم) ی شیعری

وەفایی بوو. ئەوسا من یەکەم هونەرمەند بووم ئەو گۆرانییە لە رادیۆ بڵێم، محەمەدی مامڵێ و دواتریش فوئاد ئەحمەد و لەوانەیە ئی تریش چەند ساڵێک درەنگتر لە رادیۆ گوتییان. من بە منداڵی ئەم گۆرانییەم لە تەکیە و حوجرەکانی گوندی هەڵەجەی ماڵە خالانم فێر بووم. ئاوازەکەی فەقێیانەیە و هەمیشە فەقێکان دەیانچڕی. گۆرانییەکی تریشم (ماچم دەوێ) شیعری خۆم بوو کە پێشتر لە کەرکووک نووسیبووم و لەسەر ئاوازی گۆرانییەکی فرید الاترش دامنابوو. ئەوانی دیکەم هەمووی فۆلکلۆری کوردی و غەزەلیاتی شاعیرانی کلاسیک بوون و ئاوازدانەرەکانیان نەناسراو بوون. رۆژی تۆمارکردن و رۆژی بڵاوکردنەوەی گۆرانییەکانم لە رادیۆی بەغدا بە دەسخەتی خۆم و بە ئەلفبای لاتین لە دەفتەرێکی بیرەوەرییەکانم یادداشت کردووە و ئێستاش هەڵمگرتووە.

## کۆنسێرتی هونەرمەندی گەورەی تورک مونیر نورەددین لە بەغدا

یان هەر لە کۆتایی ساڵی 54 بوو یانیش کەوتبووینە ناو ساڵی 55 ەوە کە گەورەترین هونەرمەندی دەنگخۆش و ئاوازدانەری تورک مونێر نورەدین سەلجووک هاتە بەغداو کۆنسێرتێکی لە هۆڵی (قاعة الملک فیصل) گێڕا. من بلیتی جێگایەکی باشم بڕی و چووم بۆ کۆنسێرتەکە کە هۆڵەکە بەتەواوی پڕ بووبوو لە گوێگران. ئەوەش بۆ من شتێکی تازە بوو و پێشتر نەچووبوومە هیچ کۆنسێرتێکی ناو هۆڵی وا رێک وپێک. شتی وام بەس لە سینەما دەدی بۆیە دڵم زۆر خۆش بوو کە ئەوەی هەر لە سینەما دیومە ئێستا وا بە زیندوویی بەچاوی خۆم دەیبینم وەک کە پێشتر سەبارەت بە دانسیشا بەسەرم هاتبوو.

## بنەماڵەی رەشید جەودەت

هەر لەو ساڵەی بەغدام (ساڵی سکۆلاری 1955 - 1954) ئاشنایەتیم لەگەڵ خانەوادەیەکی کوردی زۆر کوردپەروەری بەڕێزا پەیدا کرد، بنەماڵەی رەشید جەودەت کە خەڵکی سلێمانی بوون و لە بەغدا دادەنیشتن. کاک موحسینی برام و نەجیبەخانی هاوسەری زووتر دەیانناسین و پەیوەندییان لەگەڵیانا هەبوو بەڵام بۆ من نوێ بوون هەر دوور بە دووری ناوبانگیانم لە کاک ئەنوەری برام بیستبوو کە لە تورکیا پێکەوە لەگەڵ گوڵزاری کچی رەشید جەودەت پزیشکییان دەخوێند.

مام رەشید ئەفسەرێکی خانەنشینی پێم وایە هی سەردەمی عوسمانلی و لەپاشانا هی شێخ مەحموود و عیراقیش بوو. دوکانێکی چەکفرۆشیی کردبۆوە لە بەغدا و کوردێکی لە رووی سیاسییەوە سەربەخۆی زۆر ناسیۆنالیستی چاونەترسی قسە لەڕوو بوو. هەموو عەرەبەکان لە بەغدا سڵیان لە قسەکانی دەکردەوە. مەحموود جەودەتی برای وا بزانم لە سییەکانی سەدەی بیستەم لە بەغدا کارمەند دەبێت، وەکوو بیستوومە دەڵێن رۆژێک بەڕێوەبەرەکەی سووکایەتی بە کورد دەکات یان شتێکی لەو بابەتە، مەحموود جەودەتیش سێ و دووی لێ ناکات هەر یەکسەر دەمانچە هەڵدەکێشێت دەیداتە بەر گوللان و دەیکوژێ. مەحموود جەودەت دادگایی کرا و لەسێدارە درا. شاعیرانی کورد ئەو نیشتمانپەروەرەیان لە شیعرەکانیانا لاواندووەتەوە و شاری سلێمانییش زۆر بە گەرمییەوە پێشوازیی لە تەرمەکەی کرد کە بردیانەوە بۆ شار. جا مام رەشیدی براشی لەو کورد پەروەرتر و لەویش تووڕەتر و دەمارگیرتر بوو و هەزار قسەی بە عەرەبان دەگوت. جارێکیان لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول هێشتا لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسما بوو پیاوانی ئەمنی عێراقی دەچنە دوکانەکەی لە بەغدا پێی دەڵێن:

"راپۆرتمان بۆ هاتووە تۆ چەک و فیشەک دەنێری بۆ متمردە کوردەکان و پەیوەندیت لەگەڵیانا هەیە." پێیان دەڵی: "بە داخەوە پیر بوویمە و دەستی لەرزۆکم داری تفەنگ ناگرێ ئەگینا بە خوای ئێستا ئێرە جێگای من نەدەبوو، دەبوایە ئیلتیحاق بکەم بەو قارەمانانەی ئێوە ناویان دەنێن (متمرد)." ئەمنەکان کە دەزانن ئەو پیاوە قسەی لەگەڵا ناکرێت وازی لێ دێنن و دەڕۆن.

مام رەشید و هاوسەری پێنج کوڕ و سێ کچیان هەبوو، خوسرەو، دارا، فەرەیدون، جەودەت، سامان، گوڵزار، نازدار، نەرمین. پەروینی برازای مام رەشید تاکە منداڵی شەهید مەحموود جەودەتی برای ئەویش لەگەڵ دایکیا هەر لەماڵی ئەوانا دەژییان. بنەماڵەیەکی زۆر رۆشەنبیر و کوردپەروەر کە لەگەڵ ئێمە لە بەغدا و دواتریش تێکەڵییەکی زۆر دۆستانەمان لەنێوانا هەبوو.

ماڵی رەشید جەودەت لە گەڕەکی (الوزيرية)ی خۆشگوزەرانان بوو لە بەغدا. لەولاتر گەڕەکی صلیخ بوو کە هەر جارێکی بەوێدا رەت دەبووم کۆنە برینم دەکولانەوە چونکە (كلية بغداد Baghdad College)ی لێ بوو، ئەو هایسکوولە ئەمەریکاییەی کە پێنج ساڵ پێشتر هەوڵی زۆرم دابوو لەوێ بخوێنم بەڵام کاک ئەحمەدی کاکم رێی نەدامێ لەوێ بخوێنم.

کاتی تاقی کردنەوەکانی بەکالۆریا هات و من بەتەواوی خۆم ئامادە کردبوو و لەگەڵ هاوکلاسێکی عەرەبما (غازی شاکر) کە ئێواران دەهاتە ماڵمان پێکەوە هەڵبەستی عەرەبیی شاعیرانی سەردەمی جاهیلیمان لەبەر دەکرد و گوێمان لێک رادەگرت. ئەمن حەیرانی شیعری سەردەمی جاهیلیی عەرەبی بووم (ئەدەبی پێش ئیسلام).

ئەمانەی خوارەوە چەند دێڕێکی شیعری رۆمانتیکی جیاجیای ئەو زەمانەن کە هەر ئەوەندەم لەبیر ماوە و ئێستاش چێژیان لێ وەردەگرم:

أَمُرُّ عَلى الدِيارِ دِيارِ لَيلى

أُقَبِّلَ ذا الجِدارَ وَذا الجِدارا

وَما حُبُّ الدِيارِ شَغَفنَ قَلبي

وَلَكِن حُبُّ مَن سَكَنَ الدِيارا

***

واهاً لِرَيّا ثُمَّ واهاً واها

هِيَ المُنى لَو أَنَّنا نِلناها

***

عيون المها بين الرصافة و الجسر

جلبن الهوى من حيثُ ادري ولا ادري

***

إِنَّ العُيونَ الَّتي في طَرفِها حَوَرٌ

قَتَلنَنا ثُمَّ لَم يُحيِينَ قَتلانا

يَصرَعنَ ذا اللُبِّ حَتّى لا حِراكَ بِهِ

وَهُنَّ أَضعَفُ خَلقِ اللَهِ أَركانا

***

أَسِربَ القَطا هَل مِن مُعيرٍ جَناحَهُ

لَعَلّي إِلى مَن قَد هَوَيتُ أَطيرُ

***

لە شیعری پێداهەڵگوتنیش بە رێگای هێرشکردنە سەر (المدح عن طريق الذم) ئەمەیانم لەبیر ماوە:

أنت كالكلب في حفاظك للود

و كالتيس في قراع الخطوبِ

أنت كالدلو، لا عدمناك دلوًا

كثير العطايا قليل الثقوب

چوون باسی شیعرم هێناوەتە گۆڕێ با ئەم چەند کۆپلە شیعرە لە ئینگلیزییەوە تەرجومەکراوەی کاک بورهان نەجمەدین بەرزنجیی خالۆانم (کوڕە ئامۆزای دایکم) بێنمەوە یاد کە ئەوسا ساڵی 1955 لە بەغدا بۆی دەخوێندمەوە منیش کە بێجگە لە کوردی ئاشقی شیعر و ئەدەبی بێگانەش بووبووم لای خۆم دەمنووسیەوە و تا ئێستاش هەر بە دەستخەتەکەی ئەوسام هەڵمگرتووە. کاک بورهان لە بەشی ئینگلیزیی (دار المعلمین العالیة) بوو و هەردووکمان دەستی شیعرنووسینمان پەیا کردبوو، جا ئەو بە نازناوی (چۆڵی) شیعری دادەنا و شیعری ئینگلیزیشی وەردەگێڕایە سەر کوردی. ئەمەیان ستانزایەکە لە هەڵبەستێکی هەشت ستانزایی شاعیری ئینگلیز (جۆن گەی John Gay 1685 - 1732) کە کاک بورهان کردبووی بە کوردی. من کە ئیمڕۆ کوردییەکە لەگەڵ ئینگلیزییەکە بەراورد دەکەم لەوانەیە بۆچوونێکی ترم لەبارەی تەرجومەکەوە هەبێت. خۆی هەر تەرجومەی هەڵبەست لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر هونەرێکی تایبەتە بە وەرگێڕانی هەڵبەست کە لە تەرجومەکردنی بابەتانی دیکە جیایە.

Black - Eyed Susan

سوزانی بەڵەک چاو

ئۆ سوزان، سوزان ئاواتی ژینم
هیوام هەر تۆیە دەرمانی برینم
بێرە هەڵمژم فرمێسکی چاوت
تا ئاگری دڵم بکوژێنی راوت
تاقە غونچەکەم
گەرچی دائەبڕێین،
دوایی پێک ئەگەین
ئەی سروەی شەماڵ، تۆ شاهید ئەکەین
قیبلەی دڵم بیت تا ئەمخەنە خاک
گشتی هی تۆ بێ، گیان و دین سەرپاک
بەلاگێڕ ئەکەم.

ئەمەشیان چەند کۆپلەیەکە لە پارچە شیعرێکی ناسکی کاک بورهان خۆی کە پێم وایە هەر ئەو ساڵە دایناب‌وو و منیش لای خۆم هەڵمگرتبوو، بەڵام رەنگە هەندێ وشەم بۆ نەخوێندرابێتەوە چونکە دەستخەتەکە پتر لە شەست ساڵ کۆنە ئیتر وا وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە:

به عیشوە و ناز
وەک مەلی راز
پڕ لە ئاواز
گوڵی نازناز
دڵی بردم
***
خونچەی لێوی
سینە و سێوی
ترێی مێوی
خۆخی نێوی
مەستی کردم
***
قژی زێڕین
روومەت گوڵی
گەردەن زیوین
قەدی شلی
تێ ئاڵاندم
***
پرشنگی چاو
راوی زاری
مژیم بەتاو
ئاوی داری
خوێنی ژاندم
منو سوسو

لەتەک کێوێ
مات بووین هەردوو
چۆن نەشێوێ؟
ئارامی دڵ

***

تیشکی شادی
لەنێو گوڵزار
تینی زیادی
کەژی بەهار
بۆ جەرگی کول.

***

لە قوتابخانە ئەمن تەنها لە ماتماتیک ( ریازیات) دەترسام. جا لە دوا تاقی کرنەوەی بەکالۆریای پۆلی پێنج نیگەران بووم لە ماتماتیک ئیکمال بم. بەڵام خۆش بەختانە کاک خالیسی خاڵۆزام (شێخ خالیس شێخ جەواد بەرزنجی) کە ماتماتیکی دەخوێند لە کۆلێژی (دار المعلمین العالیة) لە چەند هەفتەی پێش تاقی کردنەوەکانا دەهاتە لامان و یارمەتیی دەدام لە ماتماتیک. ئێستاش منەتباری خاڵە خالیسم کە وای کرد یان 61 بوو یان 59 (چاکم لەبیر نەماوە) لە ماتماتیک وەرگرم کە خۆم دەترسام هەر نەیگەیەنمە پەنجاش و ئیکمال ببم. بەم جۆرە بەکالۆریام بە سەرکەوتوویی و بە یەک ساڵ وەرگرت. بۆیە دەڵێم بە یەک ساڵ چونکە بەکالۆریای سەردەمی ئێمە بەڕاستی ئاستێکی بەرزی هەبوو و بەگاڵتە نەدەهاتە دەست. زۆر خوێندکاری عێراقی یان بە دوو ساڵ یان بەناچاری بە چەند ساڵێک لە قوتابخانە ئەهلیەکانی ئێوارانا تەواویان دەکرد. بەکالۆریای عێراقی ئەوسا یەکسان بوو بە بڕوانامەی (ئۆلێڤڵ O Level)ی بریتانی.

بەداخەوە بەری ئەو سەرکەوتنە بێ وێنەیەم وا بەئاسانی بۆ نەڕنا، بۆچی؟

له چەپەوە: هۆمەر دزەیی، دارا ئەدیب
(ئەبونەواس بەغدا 1955)

له ڕاستەوە: هۆمەر دزەیی، ئەمیر حەوێزی، ئەوەی بەرامبەر هوشیار کاکەزیاد
(ئەبونەواس بەغدا 1955)

کافتریای کۆلێژی )دار المعلمین العالیة( بەغدا 1955 . لە ڕاستەوە: دووەم کەس مامۆستای ئینگلیزی، هۆمەر دزەیی.. شەشەم کەس خالیس جەواد. لە هەرە دەستە چەپا بە جلی کوردی مەجید ئاسنگەر

سەعدی دزەیی، برای هۆمەر

موحسین دزەیی، برای هۆمەر

لە چەپەوە: پلکە ئاجەری حەمەد مەلای، رەمزیە دزەیی، نەرمین رەشید جەودەت، ئاواز دزەیی، منداڵەکەش، سامان رەشید جەودەت

له چەپەوە: قەدریە دزەیی خوشکی هۆمەر، موحسین دزەیی، نەجیبە دزەیی هاوسەری موحسین، هۆمەر دزەیی

کافتریای کۆلێژی (دار المعلمین العالیە) دانیشتووانی پێشەوە لە چەپەوە: سنۆبەر سدیق، هۆمەر دزەیی، مەجید ئاسنگەر، مامۆستای ئینگلیزی، حۆرییە عەلی ئاگا - 1955

کۆلێژی پزیشکی لە بەغدا، 1955 لە چەپەوە: بورهان نەجمەدین بەرزنجی، کەمال خورشید، ئەنوەر عەزیز دزەیی، خورشید ئیبراهیم دزەیی، تاریق حەمدی، فوئاد زەکی هەناری و هۆمەر دزەیی

شێخ بورهان شێخ نەجمەدین بەرزنجی

نەجیب بابان

کاک موحسینی برام و نەجیبە خانی هاوسەری و قەدریە خانی خوشکم و برازاکانم و خۆم لە ماڵی ڕەشید جەودەت لە بەغدا

دیمەنێکی کۆنی بەغدا، ئۆرزدی باک لە دەستە چەپایە

فستق عەبید فرۆشێکی شۆستەکانی (شارع الرشید)

صوبەی زیوینگر لە (شارع النهر) لە بەغدا

ئەعدادییەی مەرکەزییەی بەغدا لە سالآنی پەنجاکانا

شێخ خالص شێخ جواد
بەرزنجی

دەستنووسی پشتەوەی وێنەکەی شێخ خالص

# بەشی 11

## بۆ سێیەم جار دڵساردبوونەوەم
## پلانی بێ دەسەڵاتیم بۆ هەڵبژاردنی خوێندنی پاشەڕۆژم
## چوونم بۆ تورکیا بۆ خوێندنی پزیشکی

### زمانی گیانی داهێنانم و بیست دانەساڵی ڕەبەق وێڵ و سەرگەردانیم

هاوین بوو دەمی ئێوارە لەماڵەوە لە دووگردکان دانیشتبووین لەپڕێکا مام پیرداود ئاغای نۆبەداری دیوەخانەکەمان خۆی کرد بە حەوشەی ماڵەکەمانا پسوولە کاغەزێکی هەڵدەشەقاند و لەگەڵیا بانگی دەکرد: "عومەر مزگێنی، ناجیح بووی". پاسی هەولێر گەیشتبوو و ئەو پسوولە کاغەزەی هێنابوو نازانم کێ لە بەغداوە تەلەگرافی بۆ برادەر و ڕاوێژکاری زمان شیرینی بنەماڵەکەمان لە هەولێر محەمەد حەسەن مامۆ (یادی بەخێر) لێ دابوو کە دەرەجاتی بەکالۆریا دەرچووە و عومەر ناجیحە.

جگە لە خۆم، دایکم و کاک ئەحمەدی برا گەورەم کە داربەدەستی بنەماڵەکەمان بوو هێندەی یەک دونیا دڵیان خۆش بوو کە منێکی بەمنداڵی هەمیشە سەرکەش و یاخیبووی ئێستا وا بە پێچەوانەی زۆر لە خزمانی خۆمان بە یەک ساڵ قۆناخە زۆر سەختەکەی خوێندنم بڕی و تەبای سێ برا لەخۆم گەورەترەکانم، ئەنوەر و موحسین و سەعدی، منیش دەرگای خوێندنی باڵای زانکۆم بۆ کرایەوە.

وەک هەمـوو سـاڵ ئـەو هاوینـەی 1955یـش دایـک و خوشـک و براکانـم، سـەعدی نەبـێ کـە لـە ئینگلتـەرە دەیخوێنـد، لـە دووگـردکان یەکدیگـر بووبوونـەوە. دیـار بـوو دوو پـلان و تەگبیـری لێـک دوور لەژێـرەوە دادەڕێـژران: مـن لەلایـە و کاک ئەحمـەد لـە لای خۆیـەوە پلانمـان دادەنـا بـۆ خوێندنـی بـاڵای مـن کـە لـە پاییزا دەستی پـێ دەکـرد.

ئەمـن وەبیـر کاکمـم هێنایـەوە کـە پۆلـی سێی ناوەندیم لـە کەرکووک تـەواو کردبـوو و داوام لـێ کردبـوو بچـم لـە بەغـدا لـە (معهـد الفنـون الجميلـة) موزیـک بخوێنـم. ئـەو کاتـە ئـەو بـە قسـەی خۆشـی بـاوک ئاسـا پێـی سـەلماندم کـە باشـترە بڕوانامـەی بەکالۆریـای ئامادەیـی وەرگـرم کـە زۆر گرنگتـر و بەرێزتـرە لـە بڕوانامـەی ناوەنـدی و ئەوسـا بەکەیفـی خـۆم حـەزم لـە چـی بـوو ئـەوە بخوێنـم. ئـەم قسـانەی خۆیـم وەبیـر دەهێنایـەوە و داوام لـێ کـرد بچـم یـان لـە ڤیەننـا یـان لـە ئیتالیـا موزیـک بخوێنـم. ئـەوە پـلان و خەونـی مـن بـوو لـەو هاوینـەی پێـش کردنـەوەی زانکـۆکان لـە سـەرەتای پاییـزا. نامەیەکیشـم بـۆ کۆڤـاری مانگانـەی بەناوبانگـی ئەوسـای میسـری (الكواكـب) نووسـیبوو کـە لـە هـەر ژمارەیـەکا چەنـد لاپەڕەیەکـی هـەرە دوایـی تەرخـان بـوو بـۆ پرسـیاری خوێنەرەکانـی لـە هـەر بوارێـکا بـێ. ئەگـەر بەهەڵـەدا نەچووبـم بەرپرسـی ئـەو لاپەڕەیـە نـاوی طـرزان بـوو و زۆر جاریـش بـە نوکتەیەکـی خـۆش وەرامەکانـی دەدایـەوە. پرسـیارەکەی مـن ئەمـە بـوو: "ایـن يوجـد احسـن معهـد لدراسـة الموسـيقى الكلاسـيكية فـي العالـم؟" وەرامەکـەش لەگـەڵ پرسـیارەکە لـە کۆڤارەکـەدا بـڵاو کرایـەوە کـە ئەوهـا بـوو: "فـي رومـا، علـى ايـدك الشـمال وانـت رايـح." دیـارە ناوەکەشـمیان بەهەڵـە بـۆ خوێندرابـۆوە و نووسـیبوویان: عمـر دزهيتـي، اربيـل -العـراق.

ئەمـن بـە پلـەی یەکـەم ڤیەننـا و ئەگـەر ئـەوەش نەبـوو رۆمـام لـە خەیاڵـی خۆمـا دانابـوو. بـەڵام دیـار بـوو خەونـی مـن و پلانـی کاک ئەحمـەدم زۆر لێـک دوور بـوون. هـەر وەکـوو پێشـتر باسـم کـرد دیـار بـوو خوێندنـی موزیـک بـۆ بنەماڵەیەکـی خانەدانـی خێڵەکیـی وەک ئێمـە

تابوو taboo بووە، هێڵی سوور بوو. بۆم دەرکەوت کە کاکم دەبێ پێشتر کە پۆلی سێی ناوەندیم تەواو کردبوو ئەو لە خەیاڵی خۆیدا وای دانابووە جارێ با بەقسەی خۆش ئیقناعم بکات سانەوی تەواو بکەم ئینجا لەپاشان هەر خۆم لەگەڵ گەورەبوونما جۆری بیرکردنەوە و ئەقڵیەتم دەگۆڕێت و موزیکم هەر لەبیریش نامێنێ. جا کاکم دەبێ پێی سەیر بووبێ کە وا سانەویم بە ساڵێک و پلەیەکی ئەوها باش تەواو کردووە کەچی هەر سوورم لەسەر خوێندنی مۆسیقای بێ قیمەت و دەمەوێ خۆم خەسار بکەم و ناوی خانەوادەش بزڕێنم. ئەمە لێکدانەوەی خۆم بوو بۆ هەڵوێستی کاک ئەحمەد بۆیە کێشەکەی نێوانمان بوو بە جیددی. ئەو ئەم سێ بژارەی خوێندنی لە پێش دانام:

1 -کۆلێژی ماف لە بەغدا 2 -کۆلێژی ماف لە دیمەشق 3 -کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی ئانکەرە لە تورکیا.

تێ گەیشتم بۆچی کاک ئەحمەد ئەو شوێنانەی بۆ من هەڵبژاردووە. بەغدا کە هەر عێراق بوو و نزیکی خۆی بوو بەئاسانی دەیتوانی کۆنترۆڵم بکات. دیمەشق شاعیر و نووسەری لێهاتوو کاک عەلی فەتاح دزەیی ئامۆزامانی لێ بوو کە لە کۆلێژی ماف دەیخوێند و منی زۆر خۆش دەویست چونکە هەم هونەرمەند بووم هەم وەک خۆی شاعیریش بۆیە بوونی ئەو لەوێ دڵنیایەک بوو بۆ کاک ئەحمەدی برام. ئانکەرەش کاک ئەنوەری برامی لێ بوو کە لە کۆلێژی پزیشکیی دەیخوێند و بە حیساب ئەویش لەوێ دەیتوانی بەئاسانی گوێم راکێشێ. ئەمانە هەمووی سیناریۆی کاک ئەحمەدی براگەورەکەمان بوو کە لەجێی بابمان بوو و سروشتانە هەموو بڕیارێکی پەیوەندیدار بە خانەوادەکەمانەوە دەبوایە بە دواقسەی خۆی یان بە رەزامەندیی ئەو بوایە.

بۆ منیش هەرسێ بژارەکان بەرەواژی خەون و خەیاڵە دێرینەکەم بوون و هەستم دەکرد کە فێڵم لێ دەکرێت و ئەوە چەند ساڵە

هەڵدەخەڵەتێندرێم. یاخی بوونەکەی منداڵیم سەری هەڵدایەوە و زۆر بەتوندی و سووربوونەوە هەرسێ بژارم رەت کردەوە. بە درێژایی هاوینەکە مشتومڕ و کێشمەکێش لەنێوانماندا بەردەوام بوو و لە بەدبەختیشم کەسێک لە براکانم یان دایک و تاکە خوشکم لەگەڵ منا نەبوون. زۆر سروشتیش بوو بۆ ئەو زەمانە کە دەبێ لەگەڵ براگەورە بن و دەبێ هەر قسەی براگەورەش سەرکەوێ. ئەو سەردەمە کێ حەددی هەبوو لە کێشەیەکا لەگەڵ براگەورە لای ئەو نەگرێت. لە براکانم تەنیا کاکە سەعدیم لەوێ نەبوو ئەو لە ئینگلتەرە دەیخوێند. هاوین تەواو بوو و کاکە ئەنوەرم کە چاوەڕێی دەکرد پێم بسەلمێنن و لەگەڵ ئەوا بچم بۆ تورکیا بەڵام کە زانی من ناچم ئەویش پشووی هاوینی تەواو بووبوو و خۆی و فائیزەخانی هاوسەری و شلێری کچیان و وەسفییەی کارەکەریان لێیان دا چوونەوە ئانکەرە. ئەو زەمانە خەڵکی کوردستان بە شەمەندەفەر لە مووسڵەوە دەچوون بۆ تورکیا. راستە شەمەندەفەر لە بەغداوە تا هەولێر هەبوو، بەڵام هەولێر - مووسڵ نەیبوو. من خۆم راگرت و پێداگریم کرد کە دواجار بتوانم کاک ئەحمەد ئیقناع بکەم بەڵام ئەو لە من عینادتر و ئەو براگەورە. کەسوکارم و کاک محەمەد حەسەن ناسراو بە (مامۆ) لەگەڵما دانیشتن و پێیان گوتم کە ئیتر پایزە و کاتی قەبووڵ کردن لە هەر زانکۆیەک بێ وا خەریکە بەسەر دەچێت و کاک ئەحمەد بڕیاری ناگۆڕێت. گوتیان با ساڵێکی خوێندنم لەدەست نەڕوات باشترە بۆم بچم بۆ ئانکەرە و پزیشکی بخوێنم کاک ئەنوەری براشم لەوێ یارمەتیم دەدات لە خوێندن و بۆ خۆم ببم بە دکتۆر کە هەموو کەس خەون بە دکتۆرییەوە دەبینێ.

ئەمجارەش دڵیان نەرم کردم بەناچاری و بەدڵساردییەوە لە موسڵەوە ملی رێگای شەمەندەفەرم گرت بۆ ئانکەرە.

## ساڵە بەدبەختییەکەی ئانکەرام لە کۆلێژی پزیشکی
## 1955 - 1956

سەفەری شەمەندەفەرم پێ خۆش بوو. ئێستاش هەر وام و سەفەری بە ترێنم لە هەموو ڕێگایەکی دیکەی گواستنەوە پێ خۆشترە. لەبیرمە لە مووسڵ دەرچووین و ترێنەکە بە سنووری سووریا و تورکیادا دەڕۆیشت و لە شاری نسیبین و مەیدان ئەگبەز دەوەستا. کە کەوتینە ناو خاکی تورکیاوە گوندەکانی کە لەسەر ڕێمان بوون زۆر جوانم دەهاتنە پێش چاو چونکە بانەکانیان هەمووی جزیری بوون و بە قرمیدی سوور سەر گیرابوون. من خانووی وەهام لە سینەما دەدی و خانووەکانی جوتیارەکانی کوردەواریشم دەهاتنەوە بەرچاو کە هی ئەوانیش جزیری بوون بەڵام ئەو قرمیدە سوورە جوانەی تورکیایان نەبوو. هی کوردەواری هەر بە قوڕەسوور سواخ دەدران.

گەیشتمە ستاسیۆنی ترێنی ئانکەرە و کاکە ئەنوەری برام و ئامۆزاکانم محۆ سەرسۆر و ئەحمەد فەتاح کە گشتیان لە کۆلێژی پزیشکی ئانکەرە بوون ئەوانە هەموویان بەپیرمەوە هاتبوون و چووین بۆ ماڵی کاکە ئەنوەر کە لە گەڕەکی (جێ بە جی)ی نزیک کۆلێژی پزیشکی بوو. ماڵەکەیان ئەپارتمانێکی خۆش بوو لە نهۆمی ئەرزی و ئەدرەسەکەشمان بەم جۆرە بوو: (تەللی کایا سوکاغی، مستەفا ئونسال ئەپارتمانی، ئیچ جێ بە جی، ئانکەرە Telli Kaya Sokagi, Mustafa Unsal Apartmani, Ic Cebeci, Ankara )

ئەپارتمانەکەی کاک ئەنوەری برام لە ئانکەرە بە کرێی گرتبوو لە نهۆمی ئەرزیی باڵاخانەیەکی پیموایە چوار نهۆمیدا بوو. ئەپارتمانەکە خۆش بوو و گەڕەکەکەش کراوە و کشومات و شەقامەکانیشی پان بوون. خێزانی ئێمە لەوێدا ئەمانە بووین: کاک ئەنوەر کە وابزانم دوو ساڵێکی مابوو کۆلێژی پزیشکی تەواو بکات، فائیزەخانی هاوسەری،

شلێری کچیان کە تەمەنی سێ ساڵێک دەبوو و وەسفیەی کارەکەریان کە کچێکی نەوجوانی گوندەکەی خۆمان بوو. هەروەها گوڵزارخانی کچی رەشید جەودەت ئەویش پزیشکیی دەخوێند و لەگەڵ ئەوانا دەژیا. دۆستایەتیی ئێمە لەگەڵ بنەماڵەی رەشید جەودەت کە پێشتر باسم کردووە بەو گوڵزارخانەوە دەستی پێ کردبوو. ئەو سەردەمە لە سەرەتای پەنجاکانا زۆر دەگمەن بوو کچێک بە تەنیا بۆ خوێندن بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات. کە کاک ئەنوەری برام بە ماڵ و منداڵ بوو لە ئانکەرە ئەو کچە کوردە دەبینێ بەتەنیا هاتووە داوای لێ دەکات بچێ لەگەڵ ئەوانا بژیت، ئیتر هەر واش بوو.

مایەوە بۆ من چی بخوێنم. من بەشی ئەدەبیم تەواو کردبوو بەڵام کۆلێژەکانی پزیشکی لە تورکیا ئەدەبیشیان وەردەگرت. کاک ئەنوەر و محۆ سەرسۆر و ئەحمەد فەتاحی ئامۆزاکانمان پێیان وابوو یان پزیشکی یان کشتوکاڵ بخوێنم. کاک سەلاحەدین مستەفا، کە ئامۆزای پوورزا هەولێرییەکانم بنەماڵەی ئەحمەد عوسمان بوو، هاتبوو ماستەر یان دکتۆرا بکات لە کشتوکاڵ و گوتی ئەگەر بڕیاری کشتوکاڵت دا ئەمن هەموو یارمەتییەکی پێویستت دەدەم. هەڵبەت ئەمانە هیچیان دڵی منیان خۆش نەدەکردەوە چونکە بە نابەدڵی و بە ناچاری هاتبووم بۆ تورکیا، دواجار بڕیارمان کەوتە سەر پزیشکی.

خۆم ناونووس کرد، ساڵی یەکەمی کۆلێژی پزیشکی بە زمانی ئەکادیمی لە تورکیا پێی دەڵێن (فێ کا بێ FKB) کە سێ تیپی یەکەمی ئەم سێ وشانەن: فیزیک، کیمیا، بیۆلۆژی. بیۆلۆژیش هەڵبەتا زوولۆژی و بۆتانیک (زیندەوەر و رووەک) دەگرێتەوە. وانەکانی ئەو ساڵی یەکەمە لە کامپوسە سەرەکییەکەی کۆلێژی پزیشکی نەبوو لە گەڕەکی جێ بە جێی کە ماڵەکەی خۆشمان لەوێوە نزیک بوو. کلاسەکانی فێ کا بێ هەمووی لە گەڕەکی وابزانم (باکانلکلار Bakanliklar) یان (کاڤاکلیدەرە Kavaklidere) یان (باهچەلی ئێڤلەر Bahceli Evler) بوو و زۆر دوور بوو لە ماڵی ئێمە و دەبوایە هەموو

بەیانییـان بـە ئۆتۆبـوس بچمـە ئـەوێ. بەرنامـەی حەفتانـەی لێکتـوورەکان (محازەرە)کانـم بـە دەسـتی خـۆم و بـە نووسـینی تورکیـی لاتیـن لـە پسـوولە کاغەزێـکا نووسـیبووەوە و تـا ئێسـتاش ماومـە کـەوا لێـرەدا بـۆ مێـژوو دایـان دەنێـم.

وانەکانـی کۆلێـژی پزیشـکی هەمـووی بـە زمانـی تورکـی بـوون. ئەمـن تورکیـم نەدەزانـی بـەڵام زۆر بـە زوویـی و بەبـێ مامۆسـتا فێـری بـووم و تارادەیـەک لـە وانـەکان دەگەیشـتم. زوولـۆژی و بۆتانیـک (حەیـوان و نەبـات)م پـێ خـۆش بـوو بـەڵام فیزیـا و کیمیـا نـا.

ژیانـی کۆمەڵایەتیمـان لـە ئانکـەرە تـا ئەندازەیـەک ناخـۆش نەبـوو. کوردێکـی زۆری بـە تایبەتـی هەولێـری لـە ئانکـەرە و لـە ئەسـتەمبۆڵ دەیانخوێنـد، ئەوانـەی ئانکـەرە کـە لەبیـرم مابـن بێجگـە لـە ماڵـی خۆمـان ئەمانـە بـوون کـە دواتـر هەموویـان بـوون بـە پزیشـک و بەداخـەوە ئەمـڕۆ زۆریـان لەناومانـا نەمـاون: محەمـەد سەرسـۆر دزەیـی (ناسـراو بـە محـۆ سەرسـۆر)، ئەحمـەد فەتـاح دزەیـی، باقـی دەبـاغ (باقـی هاشـم چەلەبـی)، عەدنـان یاسـین ئەسـعەدی، سـوبحی داود ئاغـا یەعقوبـی، موحسـین دۆغرەمەچـی، سـالم رەفعـەت دۆغرەمەچـی، سـالم حەیدەری، سـەلاحەدین مسـتەفا، جەمـال قـادر حەمـاوی، جەمـاڵ عەتـاوڵا ئاغـا، گوڵـزار رەشـید جـەودەت، محەمـەد نەجیـب سـەعدی. ئەمانـە هەمـوو بـرادەری نزیکـی یەکتـری نەبـوون هـەر چەنـد کەسـێک و گرووپـی خـۆی هەبـوو، ئەگینـا تەنهـا جاروبـار بەرێکـەوت یـان بـە بۆنەیەکـەوە یەکتریمـان دەدی. بێجگـە لەمانـە ماڵـی ئێمـە و دزەییەکانـی تـر و باقـی دەبـاغ تێکەڵـی و گەڕانمـان لەگـەڵ ژمارەیەکـی زۆریـش لـە کوردەکانـی تورکیـا هەبـوو. دیـار بـوو نەریتێکـی سـاڵانە هەبـوو کـە کۆمەڵانـی خەڵکـی هـەر شـارێکی تورکیـا ئەگـەر ژمارەیـان لـە ئانکـەرە زۆر بـووا شـەوێکیان هەڵدەبـژارد بـۆ ئاهەنـگ و گۆرانـی و هەڵپەڕکـێ و خواردنـی تایبـەت بـە شـارەکەی خۆیانـەوە. بـۆ نموونـە دەیانگـوت ئیمشـەو (دیاربەکـر گێجەسـی) یـان (دێرسـیم گێجەسـی) یـان (مالاتیـا گێجەسـی) هەیـە کـە بـە کـوردی واتـا

شەوی ئەو شارە هەیە و ئیتر ئەوەی حەزی بکردایە بلیتی دەبڕی و بەشداریی دەکرد. ئەم رابواردنانە بەڕاستی خۆش بوون و ئێمەی کوردی باشوور تەنها دەچووینە شەوارەکانی شارە کوردییەکان.

ئەمن بێجگە لە ئەرکی خوێندنم مامۆستایەکی کەمانیشم گرت (حەسەن ئۆیزچیڤی) هەفتانە دەهاتە ماڵمان و وانەی کەمانی پێ دەگوتم. هەروەها کاک باقی دەباغ کە هەرگیز لەبیری ناکەم منی برد بۆ قوتابخانەیەکی فێربوونی دانس و لەوێش چەند کۆرسێکی دانسی تانگۆ و رومبا و ڤاڵس و فۆکستڕۆتم وەرگرت. ناوی قوتابخانەکەش پێم وایە (جاڤگا Cavga) بوو لە گەڕەکی قزل ئای Kizil Ay.

## باقی دەباغ (باقی کوڕی هاشم چەلەبی 1968 - 1933)

لەو ساڵی سکۆلارەی کە لە ئانکەرە بووم، ئەگەر لەسەرەوە پێشم وەدیار نەبووبێت، لەناو دڵمەوە بریندار بووم. خەونە نەهاتەدییەکەم لەناوەوە هەناوی دەهاڕیم. نە خوێندنەکەم بە جددی وەردەگرت نە رابواردنە کۆمەڵایەتییەکان کە خۆشیش بوون دڵیان دەدامەوە. بیرو خەیاڵی من دونیایەکی تریان دەهێنا بەر چاوم کە زۆر جیاواز بوو لەوەی تێیدا بووم. یەک تاکە سەبووری و دامرکێنەرەوەی هەستی پڕ بە نامرادیی هەڵچووم گەنجێکی قۆزی ئێسک سووکی قسەخۆشی خاوەن زەوقی وەک خۆم بوو: باقی دەباغ.

کاک باقی (سەت هەزار جار یادی بەخێر) کوڕی هاشم چەلەبی دەباغ بوو، دەباغەکانیش لە بنەماڵە ناودارەکانی بورژوازیی باڵای upper bourgeoisie شاری هەولێرن. کوڕە لاوێکی زیرەک، جوان، زمانزان، قسە رەوان، دۆن جوان و کوردپەروەرێکی چالاکوان. هەرچەندە کە لە لایەکەوە جۆرە تێکەڵییەکی خزمایەتیش لەنێوان ئێمەی دزەیی و دەباغەکانی هەولێرا هەبوو بەڵام من و ئەو پێشتر ئاشنای یەکدی

نەبووین. جا لە ئانکەرە هەر بە یەک دانیشتن بووین بە هۆگری یەکتری. دیار بوو گەلێک شتی وێکچوو باقی و منی دەگەیاندە یەک. هەر باقی بوو مامۆستای کەمانی بۆ گرتم، هەر باقی بوو منی لە قوتابخانەی فێرکردنی دانس ناونووس کرد، هەر باقی بوو لەگەڵ خۆیا دەیبردم بۆ دانسکلووبەکان کە هەر نەبێ بۆ چەند ساتەکاتێک خەم و پەژارەم دەڕەویەوە. لەوێ ئەو دانسانەی کە باقی لەگەڵ هەر خانمۆڵەیەکا بیکردایە بە تایبەتی تانگۆ هەموو دانیشتووەکانی سەرسام دەکرد. بەکورتی باقی لە زۆر چالاکیی هەمەجۆر و هەمەرەنگا وەک کوردایەتی و پلەیبۆیاتی هەمیشە سەرتۆپ بوو.

بەڵام دیاربوو دونیای من و دونیای باقی لە تورکیا نەبووە. لە ئەنجام، نە باقی خوێندنەکەی لە تورکیا تەواو کرد نە من. ئەو بە دڵساردییەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و لە کۆلێژی پزیشکی بەغدا تەواوی کرد بەڵام داخی گرانم زۆر زوو ساڵی 68 جوانەمەرگ بوو. توخوا 35 ساڵ کەی تەمەنە! وێنەی ئەو کوڕە جوانە زەردەسەمەرە لە یادی منا تا هەتایە نەخشێکی سەر بەردی گەوهەرە. پێشتر (مەئموون) ی براشی کە ئەویش کوڕەلاوێکی قۆزی دەم هەمیشە بەخەندە و پێکەنین بوو لە پێشمەرگایەتی هاوینی 1963لە شاڵاوێکی بەعسا بە جوانکەیی شەهید بووبوو. منیش ئەوەی بەسەرم هات، کافر بە حاڵم نەبێت، هەنگاو بە هەنگاو بۆتانی دەگێرمەوە.

ناوبانگی هونەرمەندی کوردی دەنگخۆشی ئەوسەردەمەی تورکیا جەلال بەگی دیاربەکریم بیستبوو کە بە تورکی نازناوی (شەرق بولبولی جەلال گوزەلسەس)ی پێ بەخشرابوو واتا (بولبولی رۆژهەڵات جەلال دەنگخۆش). جا بۆ من خەنیخۆشی بوو کە لە شەوارەی شەوی دیار بەکرا بە دیدەنی شاد بووم و ئەویش شەوارەکەی بە چەند گۆرانییەکی دڵڕفێن رازاندەوە. لە ئاهەنگێکی شایی برادەرێکیشمان کە خەڵکی سیوەرەک بوو لە ئانکەرە داوا لە منیش کرا گۆرانییەکی کوردی باشوور بڵێم بەڵام پێیان گوتم بە موزیسیانە تورکەکان نەڵێم

کە کوردییە گوتیان بڵێ ئەمە گۆرانییەکی عەرەبییە. هەر واشمان کرد. هەر ئەو ساڵانەش هونەرمەندێکی لاوی تورک (زەکی مورەن) ناوی لەسەر هەموو زاران بوو و دەنگی لە هەموو وێستگەکانی رادیۆ دەزرنگایەوە. مەبەستی گەورەم دیدەنی ئەو هونەرمەندەش بوو کە لە ئەستانبۆڵ دادەنیشت. منیش ئەو شارە مێژووییەی مێترۆپۆلی دوو ئیمپراتۆراتی بیزەنت و عوسمانلیم نەدیبوو. کە هاوین داهات بەر لەوەی پشووی گەورە دەست پێ بکات و بگەڕێینەوە بۆ کوردستان چووم بۆ ئەستانبۆڵ و چەند شەوێک مامەوە. زەکی مورەن هەموو شەو لە نایت کلەبی (بەبەک کازینۆسی Bebek Kasinosi) ئاهەنگی گۆرانی پێشکەش دەکرد. بلیتێکی گرانم بڕی و شەوێکیان چووم. زەکی مورەن وەک نەریتی خۆی سێ چوار جار لە کاتی هەر پشوویەک لەپشت پەردە تۆکسیدۆ رەنگاوڕەنگە بە بریسقوباقەکەی خۆی دەگۆڕی و سوورە و سپیاوێکی باشیشی دەکرد ئینجا دەهاتەوە سەر ستێجەکە. ئەو شەوە کەوتمە ناو دونیایەکی خەیاڵی و لەگەڵ هەر چەپڵە لێدانێکیشا خەم و پەژارە هەناوی ئەنجن ئەنجن دەکردم. خۆمم دەهاتەوە بەرچاو بۆچی من لە کۆمەڵگایەکی پارێزیاری دواکەوتووا پەیا بوویمە. لە دڵی خۆما دەمگوت خۆ هیچ دوور نەبوو ئەگەر ژینگەم بۆ بڕەخسایە منیش ئێستا وەک ئەو هونەرمەندە بە مرازی خۆم دەگەیشتم. لە خۆشم رادەدی چونکە ئەوسا لە هەرەتی لاویما متمانەم بەخۆم هەبوو. هەزار بیری بەگژیەکدا چوویم بۆ دەهاتن کە ناخیان دەهەژاندم. بیری ژیان و ژینگە لادێییە سادە بۆن پشقل و تەرس و تەپاڵەکەی دووگردکان کە بە منداڵی ئاشقی بووم و لە شاری هەولێرا بۆی دەگریام لەلایەکا و، ئەو دیمەن و دیکۆرە سەرسوڕمێنەی باخچەکەی کازینۆی بەبەک و بۆن گوڵاوی شانێل و کریستیان دیۆری ئەو هەموو کیژە جوانە پەل رووتانەی سەر مێزەکان کە بە کزەبای شەماڵا شەپۆل شەپۆل تێکەڵ بە دەنگە تەلیسماوییەکەی زەکی موران و ئاوازە ئاسمانییەکانی ئۆرکێستراکە

دەبوون لەلایەکی ترەوە. ئیتر لە نائومێدیا پەرداخ بەدوای پەرداخا بیرەم ئاوا دەکرد. پێش تەواوبوونی ئاهەنگ لەکاتی پشووێکا خۆم گەیاندە پشت پەردەو تەوقەیەکی گەرمم لەگەڵ ئەو هونەرمەندە بەڕاستی گەورەیە کرد و پێم گوت کە من خوێندکارێکی کۆلێژی پزیشکی عیراقیم و لە ئانکەرەوە هەر بە مەبەستی ئەم ئاهەنگەی تۆوە هاتووم. لەبیرم ماوە بەتوندی دەستی گوشیم و گوتی " جانم شەکەرم چۆک مەمنون ئۆلدم" کە بە کوردی واتا " گیانەکەم، نوقڵەکەم، زۆر خۆشحاڵ بووم."

مابوو کوردە عیراقیەکانی ئەستەنبۆڵ بەسەر بکەمەوە. ئەوانەی کە لەوێ بوون و لەبیرم مابن ئەمانە بوون: خالید ئیسماعیل دزەیی خزمی خۆم، تەحسین نورەدین، جان پۆڵس، ئازاد جەمیل سائیب، جەمیل لەتیف، جەبار شێخ تاهیر. پێم وایە ئەم سیانەی دواییان هاتبوون چەند کۆرسێک لە پەروەردەکردنی تووتن بخوێنن لە شاری سامسون لە کەناری دەریای رەشا.

لە ئانکەرە خانەی ئۆپرا هەبوو کە من پێشتر هیچ ئۆپرایەکم نەدیبوو بەڵام زۆرم لەسەریا خوێندبۆوە. بیستم کە ناودارترین سۆپرانۆی تورک کە ناوبانگی جیهانی دەرکردبوو (لەیلا گەنجەر Leyla Gencer 1928 - 2008) بۆ ماوەیەک لە ئۆپرای ئانکەرە دەست بەکارە. شەوێکیان چووم بۆ گوێگرتنی هەرچەندە کە لەبیرم نەماوە چ ئۆپرایەک بوو و هیچیشی لێ تێنەدەگەیشتم بەڵام چێژم لە هەندێ ئاریاکانی وەردەگرت. لەیلا گەنجەر کە باوکی تورک و دایکی پۆلۆنی بووە نەک هەر دەنگخۆش بەڵکو ژنێکی زۆر جوانیش بوو و زۆرترایەتی ساڵانی ژیانی لە ئیتالیا بەسەر دەبرد و بە 79 ساڵی لە میلانۆ کۆچی دوایی کرد. هەروەها لەو شتانەی کە لەبیرم دەرناچن و بۆ ئەو زەمانە و بۆ ئەو تەمەنەی من دەوڵەمەندکردنی باری رۆشەنبیریم بوون دیدارێکی سەرپێیم بوو لەگەڵ ئاکتریسی سینەمای فرانسی مارتین کارۆل. لە رۆژنامەکانا خوێندمەوە کە مارتین

کارۆل بۆ کردنەوەی فیلمێکی نوێی خۆی هاتۆتە ئانکەرە و فلانە شەو لە سینەمایەک (پێم وایە بویوک سینەما بوو) خۆی ئامادە دەبێ. ئەو شەوە چووم بۆ سینەماکە و بینیم لە لۆجێکی پێشەوە لەگەڵ پیاوێکی تر کە دەیانگوت مێردیەتی دانیشتوون و خەڵکەکەش بە بەردەم لۆجەکەیاندا تێ دەپەڕین و تەوقەیان لەگەڵا دەکرد. منیش تەبای ئەوان و لەگەڵ تەوقەکردنیشا بە ئینگلیزییە شڕەکەی ئەوسام لەگەڵ ئەوا وێرام بڵێم من کوردم هەرچەندە کە هەستم کرد ئینگلیزییەکەی ئەویش ئەوەندە لەوەی من باشتر نەبوو. قژی زەرد و ڕەنگی لەبەر هەتاو مەیلەو هەڵکڕوزاو بوو و من زۆر جوانم نەهاتە بەرچاو. هەرچۆنێکی بێ ئەوەش بۆمن ئەزموونێکی نوێی خۆش بوو.

تاقی کردنەوەکانی کۆتایی ساڵ دەستیان پێ کرد. وەک پێشتر باسم کردووە کلاسی یەکەمی کۆلێژی پزیشکی کیمیاو فیزیک و حەیوان و نەبات بوو کە بە تورکی پێیان دەگوت فێ کا بێ. ئەمن حەزم لە زوولۆژی و بۆتانیک (حەیوان و نەبات) هەبوو و لە هەردوکیان دەرچووم بەڵام ڕکم لە کیمیاو فیزیک دەبۆوە و لەو دووە ئیکمال مامەوە.

پشووی هاوین دەستی پێ کرد. کاک ئەنوەری برام و خێزانی لەبەر هەندێ کاری تایبەتی دەبوایە ماوەیەک لە ئانکەرە بمێننەوە. ئەمن خۆم بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستان ئامادە کرد و دیار بوو کاک جەمال قادر حەماویش بلیتی بۆ هەمان ڕۆژ بڕیبوو ئیتر پێکەوە بە شەمەندەفەر بۆ موسڵ بەڕێ کەوتین. ئەمن دەبوایە لە دووگردکان دوای پشوویەکی کورت ئیتر دەست بە پێداچوونەوەی کتێبەکانی کیمیا و فیزیکم بکەم بۆ ئەوەی لەسەری پایزا بگەڕێمەوە بۆ ئانکەرە و ئیکمالییەکەم تەواو کەم. بەڵام بێ ئەوەی لای کەس بیدرکێنم لە دڵی خۆما بڕیارم دابوو جارێکی تر بۆ خوێندن چاوم بە تورکیا نەکەوێتەوە و بە یەکجاریش دەست لە خوێندنی پزیشکی هەڵگرم.

## تیربوونی کێشەم لەگەڵ کاک ئەحمەدی براما

هاوینـی 1956 تـەواو بـوو و کـە کاک ئەحمـەدی بـرام زانـی ئەمـن بڕیـارم داوە نەچمـەوە تورکیـا بـۆ تەواوکردنـی خوێندنـم، نێوانمـان بەتـەواوی تێـک چـوو و لێمـان بـوو بـە دەمەقاڵـێ، ئـەو پێداگـر، مـن یاخـی. هەرچەنـدی محەمـەد حەسـەن مامـۆ و کاک موحسـینی بـرام هەوڵیـان لەگەڵـم دا هەرنەبـێ بچـم ئیکمالیـم تـەواو بکـەم و دەربچـم بـۆ پۆلـی دوو، مامـۆ پێـی دەگوتـم: "ئـێ دە تـۆ جـارێ ئیکمالییەکـەت تـەواو کـە و ببـە بـە پۆلـی دووی پزیشـکی ئینجـا لەپاشـان کەیفـی خۆتـە چـی ئەکەیـت، هەرنەبـێ دوو سـاڵی پزیشـکیت دەبێـت و هـەر کاتێکـی ئارەزووت کەوتـەوە سـەری دەتوانـی بـۆی بگەڕێتـەوە" بـەڵام ئەمجارەیان کـەس نەیتوانـی بمهەژێنێـت و پێـم دەگوتـن یـان ڤیەننـا یـان دەنـا هـەر بەتـەواوی دەسـت لـە خوێنـدن هەڵدەگـرم. کاک ئەحمەدیـش کـە بینـی بچووکترین بـرای قسـە لـە قسـەیدا دەکات ئەویـش هێنـدەی تـر پێداگریی لەسـەر قسـەی خـۆی کـرد کـە هـەر خۆیشـی عادەتێکـی ناحـەزی عینادیی هەبـوو، چـۆن دەبـێ قسـەی بـرا بچـووک سـەرکەوێ! هاوینـی 56 تـەواو بـوو، پاییـز بەسـەر چـوو، سـاڵ سـووڕایەوە و زسـتانی 1957یشـمان بـەڕێ کـرد ئەمـن هـەر مامـەوە و ئـەو سـاڵەی خوێندنـم لەدەسـت چـوو. بـە درێژایـی ئـەو سـێ وەرزە لەگـەڵ کاک ئەحمـەدا قسـەمان نەبـوو. نـەک هـەر قسـەمان نەبـوو، دڵمـان پـڕ بووبـوو لـە کینـە بەرامبـەر یەکتـری و ئەمـن هەسـتم دەکـرد کـە بـە دڵ رکـی لـە مـن دەبـۆوە و ئەمنیـش بـە دڵ رکـم لـەو دەبـۆوە وەک دەڵێـن دڵ ئاوێتـەی دڵـە. نـەک هـەر ئەوەنـدە، دیـار بـوو بـۆ سـزادانی مـن دایـک و خوشـک و کاک موحسـینی براشـمی تـێ گەیاندبـوو دەبـێ ئەوانیـش بایکۆتـم بکـەن. جـا هەتـا ئـەو لـە مـاڵ بوایـە کـەس لەبەرچـاوی ئـەو بـە شـێوەیەکی راسـتەوخۆ قسـەی لەگـەڵ منـا نەدەکـرد و ئامۆژگاریشـیان کردبـووم تـا بکرێـت نەیەمـە پێـش چـاوی.

بەڵام کە سەفەری دەکرد ئیتر هەڵسوکەوتی ئەوانیش لەگەڵما نۆرماڵ دەبۆوە. کەواتە لەو سێ وەرزەدا لە ماڵەبابی خۆم - کە بابیش نەمابوو - و لەو ماڵەی کە لێی لەدایک بووبووم لە دووگردکان تا براگەورەم لە ماڵ بوا ماڵ بۆ منێکی بیست ساڵی جەهەننەم بوو و کە ئەویش لەوێ نەبوا ئۆخەیەکی فەرامۆشیم دەهاتەوە بەر. هەندێ جار بیرم دەکردەوە خۆ بەشی من لەو ماڵ و موڵکەی کە لە بابمانەوە بۆمان ماوەتەوە، کە تێکڕا زیاتر لە 30 هەزار دۆنمێک زەوی کشتوکاڵ دەبوو، بە قانوون بەیەکسانی دابەش دەکرێت بەسەر خوشک و برا و دایکا ئیتر بۆچی بەشی خۆم جیا نەکەمەوە و نەیفرۆشم و لە رووی داراییەوە بۆ خۆم ئازاد نەبم! بەڵام ئەوسا ئەوەش بەبێ رەزامەندیی سەرەک خێزان وا ئاسان نەبوو و کەس لێتی نەدەکڕی ئەگەر براگەورە قەبووڵی نەکردبا. بێجگە لەوە بە تەمەنی ئەوسام ئەگەر باسی فرۆشتنی بەشە موڵکی خۆم بشکردایە لەوانەیە چینێکی خۆشیشم لێ بدرابا و کەسیش لە ماڵەوە پشتی نەدەگرتم. هەرچۆنێک بێ باش بوو ئەوەم نەکرد دەنا بەخوای ساڵێکی نەدەبرد فلسێکم نەدەما و دەکەوتمە کۆڵانان.

زۆر سروشتانە و بێ ئەوەی خۆم بە تەمەنی ئەوساکەم هەستی پێ بکەم ئەم هەموو رەفزە یەک بەدوای یەکدای حەز و ئارەزووم لەلایەن برا گەورەکەمەوە منی خستبوە حاڵەتێکی رەوانی کە دیارە لەژێرەوە کارێکی نێگاتیڤی دەکردە سەر باری سایکۆلۆژیم و بەخشکەیی لە ناوەوەم بنەمای پێکهاتەی کەسایەتیمی character makeup دادەڕشت.

وەک دەڵێن ئەوەی چوو، چوو. ئەمن کە ئێستا وا لێرەدا ئەم قسانە دەکەم بە لێکدانەوەی ئەمڕۆم گەیشتوومەتە ئەو دەرەنجامە کە ئەو هەڵوێستەی کاک ئەحمەدی برام بەرامبەر بە من لە روانگەی کۆمەڵگای زەمانی خۆیەوە و بە تێگەشتنی خۆی بێ گومان بۆ بەرژەوەندیی من بووە ئەگینا کەس هەیە خراپەی برای خۆی بوێ؟

بەڵام لەبیریشمان نەچێ کە بەداخەوە لە زۆر حاڵەتا ئەوەی کە سەرەک خێزانی ئەو زەمانە بۆ کوڕ و کچ یان خوشک و برابچووکی خۆی بە چاکەی تێ دەگەیشت لە راستیدا نەک هەر چاکە نەبووە بەڵکوو بێ ویژدانی و زوڵمێکی روون و ئاشکرا بووە. هەر بۆ نموونە، تۆ وەرە بیرێ لە نەریتی کۆمەڵایەتیی دواکەوتووی جاران (ژن بە ژن) بکەرەوە بۆت دەردەکەوێ چەندەها کیژی ناسک و نازدار بەنابەدڵی و گریـن و زارینەوە دراون بە پیاوێک کە هەر نەشی دیبوو و کوڕیش بە هەمان شێوە. ئەمە گۆیا دایک و باوک (بە پلەی یەکەم باوک) چاکە و بەرژەوەندیی منداڵەکانی خۆیانیان ویستووە. هەروەها لەبیرمان نەچێ کە لە کولتووری جاراندا (سەر خستنی قسەی خۆت ) واتا رازیکردنی ئیگۆ ego ی سەرەک خێزانی ئەو زەمانە زۆر لەپێش خۆشەویستی و بەرژەوەندیی ئەندامانی خێزانەکەی دەهات و ئەو (خۆ رازی کردنە) ی بە سەرکەوتن و بردنەوە دەزانی با سەرکەوتن بەسەر ماڵ و منداڵی خۆیشی بوا ! جا ئەوەی کە پەیوەندیی بە منەوە هەیە - پاشەڕۆژیش دەری خست - نیاز پاکییەکەی کاک ئەحمەدی براگەورەم کە لە کولتوورێکی دواکەوتووی ئەو سەردەمەوە هەڵقوڵابوو بە خراپە و بەدبەختی بەسەر مندا شکایەوە چونکە ئەو لە دنیایەکدا دەژیا کە هەبوو، منیش خەونم بە دنیایەکەوە دەدی کە هێشتا نەهاتبوو بەڵام هات. دوور نییە ئەگەر کاک ئەحمەد لەم رۆژگارەی ئەمڕۆدا بژیایا کە ئێمەی وا تێدایـن هەڵوێستی لەگەڵما هەڵوێستێکی هاوچەرخی ئەم سەردەمەی ئێستامان دەبوو و هیچ کێشەیەکمان نەدەبوو. بۆیە حەز دەکەم خوێنەرە بەڕێزەکانم لەو راستییە ئاگادار بکەم نەوەکوو وێنەیەکی تەماوییان لە کەسایەتیی پیاوێکی گەورەی وەک ئەحمەد حەمەدەمین بێتە بەرچاو. دەمەوێ بزانن کە من ئەمڕۆ ناتوانم گلەیی شەخسیم لە کاکی رەحمەتیم هەبێ چون رەنگە لە ئەنجامی قسەکانی سەرەوەم وا هەست بکرێت کە دەبێ هەر خودی ئەو لەپشت شکستهێنانی پاشەڕۆژم بووبێت و هەر خودی ئەو هۆی وێڵ

و سەرگەردانی و ژیانی قەرەج ئاسا و بە فیڕۆدانی بیست دانە ساڵی ڕەبەقی تەمەنم بووبێت. ڕاستە ئەوەم هەموو بەسەر هات بەڵام ئەمن -هەنگی نا - بەڵکوو ئەمڕۆ خۆم بە بەختڕەش و نامرادی کۆمەڵگای پارێزیاری دواکەوتووی ئەو سەردەمە دەبینم کە کاک ئەحمەدیش بێ ئەوەی خۆی هەڵیبژاردبێ پەروەردەی ئەو کۆمەڵگایە بووە، هەرچەندە کە ئەو لەچاو زۆر خزمان و عەشایری دیکەشا بە پێشکەوتن خوازیش دەناسرا. دیارە ململانێی من لەگەڵ براکەما نەبووە، لەگەڵ کولتوور و ترادیسیۆندا بووە و دەبوایە برای منیش تەبای سەرەک خێزانانی ئەو سەردەمە کۆیلەی داب و نەریت بێ. کورت و کرمانجی ئەمن دژەباو بوومە، ویستوومە بەر ئاوەژووی ئاوەڕۆ مەلە بکەم. ئەمن ئەوڕۆکە کە بە ژیانی خۆمدا دەچمەوە خۆم بە (توانایيەکی بابردوو) wasted talent دەبینم.

مام جەلال چاکی بۆ چووبوو کە لە بیرەوەرییەکانی کە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) چەند بەشێکی لێ بڵاو کردوەتەوە دەڵێ: "هۆمەری دزەیی ئەگەر لەناو میللەتێکی دیکە، نەک کورد، هەڵبکەوتایە دەبوو بە هونەرمەندێکی لە ئاستی جیهانی ." لێرەشدا دەمەوێ دووپاتی بکەمەوە کە منیش لەم ڕووەوە متمانەی تەواوم بە خۆم هەبوو.

هەموو شت لەپڕێکا گۆڕا. لەپڕێکا وەکو "افتح یا سمسم" دەروازەم بۆ خرایە سەر گازی پشت. لە سەری بەهارا (بەهاری 1957) نازانم کاک محەمەد حەسەن مامۆی زمان شیرین و قسە ڕەوان و کاک موحسینی براشم چۆن توانیبوویان کاک ئەحمەد ئیقناع بکەن. بیستم کاک ئەحمەد پێی گوتبوون: "مامۆ، خۆ ئەمن سوور دەزانم کە ناشخوێنێ بەڵام قسەی تۆ ناشکێنم، چی ئەتۆ بڕیاری لەسەرا بدەیت با وابێ." واقیعەنیش پێش بینییەکەی ڕاست دەرچوو. ماوەی بیست دانە ساڵی خشت دەستم لە خوێندن هەڵگرت. بەڵام بۆ؟ وەرام بە دوادا دێ.

پێیان راگەیاندم کە کاک ئەحمەد رازی بووە بچم بۆ ڤیەننا بەڵام بەدەر لە موزیک هەر شتێکی تر بمەوێ با ئەوە بخوێنم. منیش رازی بووم و گوتم بەتەمام زانستی سیاسەت بخوێنم. ئیتر بەم جۆرە و بەو هەندە لەبەردانانە لەلایەن هەردوولامانەوە پێکهاتین و لەگەڵ کاک ئەحمەدیش ئاشت بووینەوە.

بە تێگەیشتن و لێکدانەوەی خۆم لەدڵی خۆما دەمگوت دەڵێی خەونەکانم وا خەریکە ببن بە ڕاستی! دەستم بەوە کرد خۆم بۆ سەفەر ئامادە بکەم. دانیشتم بیر لە جۆری سەفەرکردنەکەم بکەمەوە. چەند نەخشەیەکی نەمسا و ئەوروپام کردەوە و بیرۆکەی سەفەری بە پاپۆرم لە خەیالا گەڵاڵە بوو. دامنا بە ئۆتۆبوس لە بەغداوە بچم بۆ شام و لەوێ چەند شەوێک لای کاک عەلی فەتاحی ئامۆزام کە لە کۆلێژی مافی زانکۆی دیمەشق بوو، بمێنمەوە و ئەو شارە مێژووییەش ببینم لەپاشان بە تاکسی بچمە بەیروت. یەک دوو شەو لەو شارە خۆشە بەناوبانگەش بم و سواری پاپۆڕ بم بۆ ئیتاڵیا. ئینجا لەوێشەوە بە ترێن بۆ ڤیەننا. من وەک هونەرمەند و شاعیر حەزم لە دنیا بینین بوو و دەمزانی بە فڕۆکە دەرفەتی بینینی ئەو وڵاتانەم بۆ ناڕەخسێت. دامنابوو ئۆتۆبوس، تاکسی، پاپۆڕ و شەمەندەفەر هەمووی بۆ ئەو سەفەرەم بەکار بێنم بەس فڕۆکەی تیا نەبێت. ئێستاش هەر حەزم لە فڕۆکە نییە و سەفەری بە شەمەندەفەرم لە هەموو جۆرە سەفەرێکی دیکە پێ خۆشترە.

پێشنیارەکەم بە براکانم گوت و ئەوانیش هیچ لارییان پیشان نەدا و گوتیان ئارەزووی خۆتە.

چووم بۆ بەڕێوەبەرایەتیی سەفەر و ڤلاتنامەی عێراقی لە بەغدا بۆ تەواوکردنی کاروباری پاسپۆرتم. سەرم سووڕ ما کە گوتیان لە تەحقیقاتەوە (ئاسایشی ئەوسای عیراق) بۆمان هاتووە کە تۆ قەدەغەی سەفەرت لەسەرە. گوتیان بۆمان نووسراوە (عمر محمد امین) شیوعیە و مەنعی سەفەری لەسەرە. یەکسەر چووم بۆ دەزگای (تحقیقات) و

داوای روونکردنـەوەم کـرد کـە سـاڵی پێشـتر چووبـووم بـۆ تورکیـا و لـەوێ دەمخوێنـد هیـچ لـە گـۆڕێ نەبـوو ئێسـتا چـۆن لەپڕێـکا وا بوویـم بـە شـیوعی. تەماشـای ئەوراقیـان کـرد و گوتیـان تـۆ عومـەر محەمـەد ئەمینـی خەڵکـی کۆیسـنجاقیت و شـیوعییەکی کۆنیشـی. ئینجـا بـۆم دەرکـەوت کـە نـاوی مـن لەگـەڵ نـاوی ناسیاوێکی خـۆم (کاک عومـەر محەمـەد ئەمیـن)ی کۆیـی کـە لـە کۆیـە زیاتـر بـە عومـەر حەمەشـین دەناسـرایەوە هەرچەنـدە کـە خـۆی سـوورکەلەش بـوو ئاڵـۆز بـووە کـە فیعلـەن شـیوعییەکی کـۆن بـوو. ئەوەنـدەی هەوڵـم دا تێیـان بگەیەنـم کـە راسـتە ناومـان یەکـە بـەڵام مـن ئـەو عومـەرە نیـم و مـن خەڵکـی هەولێـرم و زۆر لـە عومـەرە کۆییەکـە بـە تەمـەن بچووکتریشـم، بـەڵام داوایـان لـێ کـردم دەبـێ بچمـەوە هەولێـر هەمـوو بەڵگـەی پێویسـت و شـایەتیش لەگـەڵ خۆمـا بێنـم ئینجـا معامەلەکـەم بـۆ تـەواو دەکـەن. لاحەولـە وەڵا!

## چووم بۆ لای سەعید قەزاز

نازانـم چـۆن ئەقڵـم بـەوە شـکا بچـم بـۆ لای سـەعید قەزاز کـە وەزیری ناوخـۆی عێـراق بـوو و دەمزانـی دۆسـتایەتیی لەگـەڵ کاک ئەحمـەد و کاک موحسـینی براکانـم و کاک زەیـدی پوورزامـا هەبـوو. چەنـد ئاسـان بـوو ئـەو زەمانـە کـە بـێ مۆڵـەت وەرگرتنـی پێشـوەخت و بـێ کێشـە و بێ پشـکنینەوە چـووم بـۆ وەزارەتـی ناوخـۆ بـۆ لای بەڕێوەبـەری نووسـینگەی وەزیـر کـە پێـم وایـە (فوئـاد الونـداوي) بـوو و پیاوێکـی کەڵەگەتـی زۆر بەنەزاکـەت و بەڕێـز بـوو. لای خـۆی داینـام و لێـی پرسـیم: بۆچـی هاتوویـت؟ منیـش گوتـم: ئەگـەر بکـرێ جەنابـی وەزیـر تـێ بگەیەنیـت مـن بـرای ئەحمـەد و موحسـین دزەیـی و پـوورزای زەیـد عوسـمانم دەمـەوێ بـۆ خوێنـدن بچـم بـۆ نەمسـا کەچـی ئـەم گرفتـەی سـەفەرم لەگـەڵ (تحقیقـات)ا تـووش بـووە، بـۆ ئـەوە هاتـووم. چـوو بـۆ ژووری وەزیـر و دوای ماوەیەکـی کـورت هاتـەوە گوتـی: فەرمـوو بچـۆ بـۆ لای

جەنابی وەزیر. ئەوە یەکەم جارم بوو سەعید قەزازی ناودار ببینم. پیاوێکی جوامێری جوان و بەشەخسییەت و رووخۆش بوو. سڵاوم کرد و ئەویش زۆر بەگەرمی وەری گرتمەوە و هەواڵی براکانمی لێ پرسیم. من هەر بە پێوە بووم گوتی: گرفتەکەت چییە. کە منیش بۆم روون کردەوە بە پێکەنینێکەوە گوتی: خۆ تۆ شیوعی نیت؟ گوتم نەخێر بەگم. زەنگێکی بۆ فوئاد وەنداوی لێ دا کە هات پێی گوت تەلەفۆن بۆ (تحقیقات) بکات و مەنعی سەفەری لەسەر لابەرن. زۆر سوپاسم کرد و لە کاتی رۆیشتنما پێی گوتم کە ئەچیت بۆ ئەورووپا بخوێنە خۆت خەریکی شتی تر نەکەیت. لەگەڵ فوئاد وەنداوی چووینە ژوورەکەی ئەو و لەوێ تەلەفۆنی بۆ تحقیقات کرد و پسوولەیەکیشی دامێ کە بۆ بەیانی ببەم بۆ لایان و ئیتر معاملەکەم تەواو دەبێت، هەر واش کرا.

هەر لە بەغدا بەر لە سەفەرم لەگەڵ مام جەلالدا یەکتریمان بینی، مام جەلال داوای لێ کردم کە گەیشتمە ڤییەننا ئیتر خۆم ئامادە بکەم بۆ مانگی حەوت بچم بۆ مۆسکۆ بۆ بەشداری کردن لە فێستڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهانی کە هەر دوو ساڵ جارێک لە وڵاتێکی بەرەی سۆسیالیستا دەگێڕدرا. مام جەلال چەند ساڵێک پێشتریش داوای لە کاک ئەحمەدی برام کردبوو رێگا بە من بدا لەگەڵیا بچم بەشداریی لە فێستیڤاڵەکانی بوخارێست و وارشۆدا بکەم، بەڵام کاکم رازی نەبووبوو گوتبووی جارێک هێشتا منالە بۆ ئەم سەفەرانە. مام جەلال پێی گوتم کە ئەو خۆیشی لەگەڵ دەلەگاسیۆنێکی کوردی و عێراقی بە شێوەیەکی نهێنی خۆیان دەگەیەننە مۆسکۆ و گوتی لەوێ لەگەڵ تۆ یەکدیگر دەبینەوە. هەروەها داواشی لێ کردم کە ژمارەیەکی زۆر لە ئاڵای بچووک بچووکی کوردستان وەک دەمبوس بۆ یاخە لە نەمسا بە کردن بدەم و لەگەڵ خۆما بیانبەم و گوتی لە مۆسکۆ پارەکەت دەدەینەوە. لێم پرسی: باشە مام جەلال ئەمن لە ڤیەننا چۆن خۆم بگەیەنمە مۆسکۆ چۆن ڤیزەم دەدەنێ، ئەمن کێم؟

گوتی من نامەیەکت دەدەمێ کە تۆ نوێنەری (یەکیەتیی قوتابیانی کوردستان)یت ئەوە ببە بۆ کۆمەڵەی قوتابیانی نەمساوی سەر بە پارتی کۆمونیستی نەمسا ئەوان سەفەرەکەت بۆ رێک دەخەن. ئەوە تەگبیرمان بوو. {ئەوە لای خۆی بەڵێنم بە سەعید قەزاز دابوو خۆم بە شتی تر خەریک نەکەم !}

دواتر مام جەلال نامەکەی بۆ هێنام کە بە ئینگلیزی نووسرابوو و مۆری (یەکیەتیی قوتابیانی کوردستان)ی پێوە بوو. دوای ئەوە مام جەلال گوتی حەز دەکەم بتبەم بۆ لای کاک هەمزە عەبدوڵلا. لەگەڵ ئەو و ئەحمەد عەلی کاکەخان دزەیی ئامۆزام چووین بۆ لای کاک هەمزە کە پێم وایە سکرتێری پارتی بوو و لە ماڵێک لە بەغدا خۆی حەشار دابوو، چونکە حکوومەت بەدوایدا دەگەڕا بیگرن. جاری یەکەمم بوو کاک هەمزەی ناوداری پارتی ئەو زەمانە ببینم و دڵم زۆر پێ خۆش بوو. کاک هەمزە گوتی بوەستە سروودێکی خۆشت فێر بکەم. دەستی پێ کرد خۆی سروودەکە بڵێت بۆ ئەوەی من ئاوازەکەی هەڵگرم. کە هەستی خۆم داین دەنگی تا بڵێیت خۆش بوو. نازانم شیعر و ئاوازی سروودەکە هی کێ بوو، بەڵام لە شیعرەکە دەردەکەوێ کە هی سەردەمی کۆماری کوردستانی مەهاباد بووە و لەوانەیە شیعرەکە یان هی هێمن یان هی هەژار بووبێ. ئەم چەند دێڕەم لەبیر ماوە بەڵام ئاوازەکەیم بەتەواوی لەخەیاڵایە.

نیشتمانم رەنگینە
بەهەشتی سەر زەمینە
خاکم وەکو ئاڵاکەم
رەنگ سوور و سپی و شینە
لە سایەی پێشەوا دا
زۆر بە ئازا و بە مەردی
ئەیپارێزن ئەم خاکە
بەچکە شێرانی کوردی

سروودەکەم بەتەواوی یەکسەر ئەزبەر کرد و ماڵاواییم لە کاک هەمزە کرد.

لەبیرم چوو ئەوە بڵێم کە لە هەولێر ماڵاواییم لە دایک و خوشک و براژن و برازاکان و خزم و کەسوکار و خەڵکی دووگردکان کرد چنگێک خاک و وردەبەردی دووگردکانم لەناو توورەکەیەکی چکۆلانە گرێ دا و خستمە ناو جانتاکەمەوە کە لە دوورە ولاتیشا هەمیشە هەر لەگەڵما بێت. راستییەکەی خۆم ئەوەم نەدەزانی لە شۆپانی هونەرمەندی پۆلۆنی فێر ببووم. شۆپان ( 1810-1849) کە پۆلۆنیای جێهێشت و بەیەکجاری باری کرد بۆ فرانسا چنگێک خاکی ولاتەکەی خۆی لەگەڵ خۆیا بردبوو.

کۆمپانیای گەشتوگوزاری ناوداری بریتانی تۆماس کووک Thomas Cook ئۆفیسێکی لە بەغداش هەبوو. هەروەها کۆمپانیایەکیش هەبوو بە ناوی نێرن Nairn کە پێم وایە رۆژانە دووجار خەڵکی بە ئۆتۆبوسی گەورە گەورەی پڕ لە حەسانەوە دەگواستەوە بۆ دەرەوەی عیراق. چووم بۆ تۆماس کووک و بلیتی ئۆتۆبوس و پاپۆڕ و شەمەندەفەرم هەموویم لایان بڕی و پارەشم هەر لای ئەوان گۆڕیەوە. دوو پاپۆڕی ئیتالی هەفتانە لە نێوان بەیروت و ڤینیسیا هاتوچۆیان دەکرد ( ئێسپێریا و ئێنۆتریا Esperia and Enotria). من ئەوەی دووەمیانم بەرکەوت. بلیتەکەی ئۆتۆبووسم بەغدا -دیمەشق بۆ رۆژی هەینی رێکەوتی 1957\4\19 کاتژمێر یەکونیو بوو.

ئەو گەشتەم لە بەغداوە تا شاری ڤینیسیای ئیتالیا بە (ئۆتۆبوس - تاکسی - پاپۆڕ - ترێن) هەموویم بە وردی بە ئەلفبای لاتین کە لە سەرەتای پەنجاکانا مام جەلال لە کەرکووک فێری کردبووم لە دەفتەرێکی رەنگاورەنگی بیرەوەرییەکانمدا تۆمار کردووە. ئەو دەفتەرەم ئێستاش ماوەو وا لێرەدا وردەکاری تەواوی سەفەرەکەم دەگۆڕمە سەر ئەلفبای کوردی عەرەبی. بەڵام نازانم بۆچی لە ڤینیسیا کۆتاییم بە نووسین هێناوەو ئیتر باسی چوونم بە ترێن لەوێوە بۆ ڤیەننا نەکردووە.

ئەمن هەر ئەو کوردییەی شەست ساڵی تەواو لەمەوپێشم بە پنتکبەندییەکەشیەوە وا بەبێ دەسکاری دەخەمە روو. بەڵام لەم نووسینەی ئەمڕۆمدا هەر روونکردنەوەیەکی ناو دەقەکە کە بە پێویستم زانیبێ ئەوەیانم خستۆتە ناو کەوانەی تایبەتەوە واتا ئەمەیان قسەی ئێستامە و لە دەسنووسە ئۆریجیناڵەکەمدا نییە. لە ئۆریجیناڵەکە وشەی (ئۆغر)یشم لەباتی سەفەر بەکار هێناوە چونکە وام دەزانی کە وشەیەکی کوردی پەتییە، نەمدەزانی تورکییە.

**له چەپەوە: ئەحمەد فەتاح دزەیی ئامۆزای هۆمەر، هۆمەر، ئەنوەر دزەیی برای هۆمەر، محۆ سەرسۆر دزەیی ئامۆزای هۆمەر ، ئەنکەرا 1955 - 1956**

**هۆمەر دزەیی له بەردەم ماڵەکەی ئەنکەرەیان 1955-1956**

**له ڕاستەوە: ئەنوەر دزەیی برای هۆمەر، فایزە خانی هاوسەری ئەنوەر، کاک ئەحمەدی برا گەورەی هۆمەر، ئەنکەرا، سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو**

باقی هاشم چەلەبی دەباغ
1968 - 1933

محەمەد حەسەن ناسراو بە مامۆ،
1991 - 1922

لە چەپەوە: باقی دەباغ، هۆمەر دزەیی...... لە ئێوارەخوانێکی باڵوێزخانەی عەرەبستانی سعودی لە ئەنکەرە

تیپی هەڵپەڕکێی دیاربەکر

هۆمەر دزەیی، ئەنکەرا 1955

مامۆستای کەمانم حەسەن ئۆزچیڤی

هۆمەر لەگەڵ تیپی هەڵپەڕکێی دیاربەکر لە ئاهەنگی (شەوی دیاربەکر)

سۆپرانۆی تورک لەیلا گەنجەر

هونەرمەندی تورک زەکی مورەن

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، جەلال بەگی دیاربەکری، ......، ........

خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی لە تورکیا، دانیشتووەکان لە چەپەوە: خالید دزەیی، ئەنوەر دزەیی-وەستاوەکان لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، ئەحمەد فەتاح دزەیی، محۆ سەرسۆر دزەیی، جەمال قادر حەماوی.

خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی لە ئەنکەرا، دانیشتووەکان لە چەپەوە: محەمەد نەجیب سەعدی، ئەنوەر دزەیی، مەحموود کانەبی دزەیی (لە ئەڵمانیاوە هاتبوو). وەستاوەکان لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، ئەحمەد فەتاح دزەیی، محۆ سەرسۆر دزەیی

هۆمەر لەگەڵ خوێندکارانی کوردی عێراق لە ئەستەمبوڵ. لە چەپەوە: جەبار شێخ تاهیر، جەمیل لەتیف، تەحسین نورەدین، نورۆش، هۆمەر دزەیی، ئازاد جەمیل صائیب.

هۆمەر لە ئاهەنگی شایی برادەرێک لە ئەنکەرا، مانگی بەفرانباری 1955

له ڕاستەوە: د. بەرهەم ساڵح، مام جەلال، هۆمەر دزەیی لە بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا لە واشنتۆن

موحسین دزەیی برای هۆمەر و قەدریەخانی خوشکی هۆمەر

زەید ئەحمەد عوسمان، پورزای هۆمەر
1978 - 1924

ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی بە چواردە پازدە ساڵی

موحسین دزەیی برای هۆمەر، 1932 - ......

هۆمەر بە پازدە ساڵی

هۆمەر بە حەڤدە ساڵی

گۆڕی ئەحمەد حەمەدەمین برا گەورەی هۆمەر لە دووگردکان

ئەحمەد حەمەدەمین
1976 - 1925

لە چەپەوە: هەمزە عەبدوڵڵا، ئەحمەد حەمەدەمین برای هۆمەر، حەمەی حاجی تایەر، کەمال محێدین، هۆمەر دزەیی، روشدی عەلی شەریف، مامۆستا عەباس حسین. وەستاوەکانی دواوەش لە چەپەوە: عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف، عەلی عەسکەری. لە سەیرانێکی بەهاری 1968 لە دەرەوەی بەغدا

هومەر گیان

بە دڵێکی پڕ بەختیاری یەوە ئەم
وێنەیەتان پێشکەش دەکەم

بۆ یادگاری.

براتان

٦/٨/٩٥٧

مام جەلال ئەم وێنەیەی لە 6/ 8/ 1957 لە مۆسکۆ پێشکەش کردم (ئەم نووسینەی دەستی خۆی پشتی وێنەکەیە)

ئەحمەد عەلی کاکەخان، ئامۆزای هۆمەر
1932 - 2014

ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، برای هەرە گەورەی هۆمەر (1925 - 1976)

موحسین دزەیی، برا گەورەی هۆمەر
1932 -

« Oğirim le Bexdawe ta Wiyena »

— Homer

- Bexda: 19 - 4 - 959

Roji heyni bo kaatjimêr 1,30 le otêleme
Güyne îstgey «Nêrin». Ewaney le wê
bün: Kakim, Muhsîn, Kak Zeyid,
Semed, Mehmud û Hajiyar, Dr. Xalid
Nemjad, Emin, Şemzi, Cemal Salê,
Marif û Saîb, Kakenwer, Ehid.
Mezher. Mejid.
Kajmêr 2,.. be rê ketîn, jimarey
cêgem 12 bü, zor zor germa bü, le
firokekaney Bexda 2 deqîqe rawes-
tayin. A paszportiyan morkird
kaatjimêr 3,.. gerjiştîne (Felüje)

ئۆرجینالّی دەستنووسی بیرەوەرییەکانی ئەم سەفەرەی هۆمەر لە بەغداوە تا ڤیەننا

تۆماس کووک
1892 - 1808

لۆگۆی کۆمپانیای نێرن کە لە هەموو جانتاکانی
موسافیرەکان دەدرا

کۆمپانیای تۆماس کووک بۆ گەشتوگوزار

یەکێک لە ئۆتۆبوسەکانی کۆمپانیای نێرن

وێستگەی شەمەندەفەری مووسڵ لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو

کۆڤاری (الكواكب)ی میسری ساڵانی پەنجاکان

# هۆمەر دزەیی

## پرۆفایل

زادەی دوو بنەماڵەی خانەدانی کورد، ئاغاکانی دزەیی لە باوکەوە ؛ ساداتی بەرزنجیش لە دایکەوە ، هۆمەری دزەیی ساڵی 1937 لە گوندی دووگردکان لە دەشتی دزەیی (ئەمڕۆ دەشتی هەولێر) لە دایک بووە .

پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی لە بەغدا ساڵێک لە کۆلێژی پزیشکی ، زانکۆی ئانکەرا دەخوێنێ. بەڵام ئەوەی بە دڵ نابێت دەچێتە زانکۆکانی ڤیەننا و پاریس و ڕێدینگی بریتانی زمانانی بێگانە دەخوێنێت و دواتر بەکالۆریۆسی بە پلەی شەرەف لە زانستی سیاسەت لە زانکۆی ڕێدینگ وەردەگرێ. دەچێتە ئەمەریکاش و ساڵێک کۆرسە سەرەکییەکانی پەیوەست بە بڕوانامەی ماجستێر لە زمانانی بێگانە لە زانکۆی جۆرج مەیسن دیسان بە پلەی هەرە بەرز تەواو دەکا .

هۆمەر لە ساڵانی شەستەکانی پێشمەرگایەتی یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی ڕادیۆی دەنگی کوردستان لە ئەشکەوتی گردە ڕەشی لای ماوەت و هەر لەوێشدا ئێوارەیەکیان لە ژێر داربەڕوویەک دادەنیشێت و ئاواز بۆ ئەو هەڵبەستەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دادەنێت ( من پێشمەرگەی کوردستانم ، ئامادەی جەرگەی مەیدانم ) و ڕۆژانە لە ڕادیۆکە بڵاو دەکرایەوە. دەیان ساڵ دواتریش هۆمەر یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا بەشی کوردی لە واشنتن و هەفتانە بەرنامەیەکی هەبوو لەسەر کولتور و کەلەپووری کوردی. دواتر دەکرێتە سەرۆکی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا و چەندین خەڵاتی دەستخۆشانەی پێ دەبەخشرێ .

هۆمەری دزەیی هەم گۆرانیبێژێکی خۆشەویستی کوردە ، هەم شاعیر و نووسەر و زمانەوان و ڕۆژنامەوان و سیاسەتکاریشە کە مام جەلال تاڵەبانی سەرکۆماری عیراق کردی بە ڕاوێژکاری سیاسیی خۆی .

هۆمەری دزەیی بە نزیکەی دە زمانی بێگانە قسە دەکات و چەندین کتێبی چاپکراو و ئەلبومی گۆرانی هەیە.

# Homer Dizeyee

## Profile

Descending from two noble Kurdish families, the House of Dizeyee on his father's side, and the revered House of Barzinjee on his mother's, Homer Dizeyee, the youngest of nine siblings, was born in 1937 in the village of Dugirdkan located in the vast Dizeyee plateau, the Dashti Dizeyee in the district of Arbil, southern Kurdistan.

Upon graduating high school in Baghdad, Homer began studying at the medical college of Ankara University in Turkey. Uninspired there, he soon left for Vienna, then Paris, and on to Reading, England, where he studied foreign languages and politics, completing with Bachelor of Arts degree with honors from the University of Reading.

Homer went on to complete the first year of a Master's program in Foreign Languages at George Mason University in Virginia, United States.

In the 1960's, Homer returned to Kurdistan to join Peshmerga "freedom fighters" with his comrades establishing the clandestine broadcasting station Dengi Kurdistan (Voice of Kurdistan) in the Girda Resh cave near the township of Mawet. While there, he wrote the music for the resistance anthem " Min peshmergay Kurdistanim" by the famous poet and veteran politician, Ibrahim Ahmad. Decades later, together with his colleagues, Homer Dizeyee established the Kurdish Service of the Voice of America (VOA) in Washington D.C. He hosted a much praised weekly program that focused on Kurdish oral literature. In 2000 Homer became the chief of VOA's Kurdish Service and was awarded numerous prizes.

In addition to being a renowned and loved Kurdish singer, Homer Dizeyee is a poet, songwriter, author, linguist, journalist, and politician. His last post was serving as a senior political advisor to the late Iraqi President Jalal Talabani, his close friend since 1948.

Homer Dizeyee speaks ten languages and sings in most of them.

**دەزگای فام**

**بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

## لیستی کتێبەکانی دەزگای فام

1. پێگەیشتن، بیرەوەرییەکانی میشێل ئۆباما/ نووسینی: میشێل ئۆباما/ لە ئینگلیزییەوە: هێما ئەحمەد.
2. تیۆری فستقI، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: فهد عامر الاحمدي/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
3. زانکۆ بەخێرهاتنت دەکات، ڕێبەر بۆ فێرخوازانی زانکۆ/ نووسینی: جاسم بن هارون الهارون/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی
4. زازانا، ڕۆمان/ نووسینی: کامەران خۆشناو.
5. ئەتەکێتی سەردەمییانە، چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ڕۆژانە بۆ گەیشتن بە لووتکە، ئەتەکێت/ نووسینی: دۆرسیا جۆنسن، لیڤ تایلەر/ لە ئینگلیزییەوە: کۆمەڵێك وەرگێڕ.
6. پێغەمبەر و پێغەمبەرناسی، ئایینی/ نووسینی: سەرحەد یونس محەمەد.
7. هێزی ئێستا، ڕۆحانی/ نووسینی: ئێکهارت تۆڵێ/ وەرگێڕانی: بنار جەبار.
8. جثثُ أحلام، شعر، نركز ادريس شكر.
9. ضجيج أبْكَمْ، شعر، إليسا حاجو.
10. زنجیرەی ڕەوشتە باشەکان، منداڵان (8 کتێب)/ لە ئینگلیزییەوە: کەوسەر تەها.
11. زنجیرەی خێزانەکەم، منداڵان (4 کتێب)/ لە ئینگلیزییەوە: کەوسەر تەها.
12. نیل بە سارای سیناوە، گەشتنامە/ نووسینی: کەریم کاکە.
13. سەما لەگەڵ ژیان، ژیاندۆستی/ نووسینی: مەهدی ئەلموسەوی/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
14. دەمەوێ بژیم، ژیاندۆستی/ نووسینی: مەهدی ئەلموسەوی/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
15. چوار ڕێککەوتنەکە، پەرتووکی ژیرییەتی شارستانییەتی تۆڵتیکەکان، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: دۆن میگێل ڕیز/ لە ئینگلیزییەوە: کاژین ئەحمەد.
16. ڕێکخستن، هونەری ژاپۆنییەکان بۆ نەهێشتنی ئاڵۆزی و ڕێکخستنی ماڵ، هونەری ڕێکخستنی

ماڵ/ نووسینی: ماری کۆندۆ/ لە ئینگلیزییەوە: هێما ئەحمەد.

17. ئەقڵییەت، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: کارۆڵ دوێك/ لە ئینگلیزیەوە: بنار جەبار.
18. ئاشتی لە هەموو هەنگاوێکدایە، گەشەپێدانی ڕۆحی/ نووسینی: تیك نیۆت هان/ لە ئینگلیزییەوە: بنار جەبار.
19. کوردستان لە سیاسەتی ڕۆژئاوادا، خوێندنەوەی ستراتیژی/ نووسینی: سەروەر حەمە ئەحمەد.
20. مرۆڤی بێخود، فیکری/ نووسینی: د. عەلی شەریعەتی/ لە فارسییەوە: بەڵێن ئەنوەر.
21. بە بەتاڵی بمرە، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: تۆد هێنری/ لە ئینگلیزییەوە: کۆمەڵێك وەرگێڕ.
22. حەکایەتی کوردی، ئەفسانەی کوردەواری/ نووسینی: م. ب. ڕوودینکۆ/ وەرگێڕانی: ڕەنجدەر ئازاد عەزیز.
23. سێ کچەکەی حەوا، ڕۆمان/ نووسینی: ئەلیف شەفەق/ لە تورکییەوە: فەرهاد چۆمانی.
24. دواهەمین کاتژمێری ئێمە، زانستی (فیزیا)/ نووسینی: مارتن ڕیس/ لە ئینگلیزییەوە: بنار جەبار.
25. مرۆڤ زەوی نەدۆزیوەتەوە، ڕۆمان/ نووسینی: دڵزار حەسەن.
26. ژووری ڕووداوەکان، یادەوەرییەکان لە کۆشکی سپییەوە، بیرەوەری/ نووسینی: جۆن بۆڵتن/ لە ئینگلیزییەوە: کۆمەڵێك وەرگێڕ.
27. تیۆری فستق1، (چاپی دووەم) گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: فهد عامر الاحمدي/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
28. تیۆری فستق2، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: فهد عامر الاحمدي/ لە عەرەبییەوە: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
29. ڕازەکانی گێڕانەوە، خەیاڵی مێینەیی و زمانی ژمانە لەناو ڕۆماندا، ئەدەبی/ نووسینی: نووری بێخاڵی.
30. بازنەکەی دایکم، گەشەپێدانی مرۆیی/ نووسینی: علی بن جابر الفيفى/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
31. زۆرە و هەرگیزیش بەش ناکات، ژیانی تایبەتیی دۆناڵد ترەمپ لەسەر زاری برازاکەیەوە. بیرەوەری/ نووسینی: ماری ئێڵ ترەمپ/ لە ئینگلیزییەوە: یادگار ئیسماعیل و کۆڤان ڕزگار دۆڵەمەری.
32. ڕێگاکانی ڕێگریکردن لە دووگیانی، تەندروستیی پزیشکی/ نووسین و ئامادەکردن: ڕۆشنا خەتتاب جەوهەر و ئەمیرە کەریم مام ڕەش.
33. ئەو ڕۆژانەی مەرگی خۆمم بینی، کۆڕەوی ساڵی 1991 بە گێڕانەوەی منداڵی، بیرەوەریی کۆڕەو/ نووسینی: هەژار مەجید.
34. سمینارم هەیە، فێرکردن/ نووسینی: د. فەرهاد عەلی مستەفا.
35. شەهرەزاد وەئاگا دێتەوە، کۆمەڵەچیرۆك/ نووسینی: کۆمەڵێك نووسەر/ لە عەرەبییەوە: سەنگەر زراری.